# مێژووی سەلجوقییەکان



٤٧٠-٧٠٤کۆچی / ١٠٧٧-١٣٠٤ز

دەروازەیەک بۆ مێژووی عوسمانیەکان

دکتور
محمد سهیل طقوش

وەرگێڕانی
دەوەن حەسەن

دكتور محمد سهيل طقوش

# مێژووی سەلجوقییەکان

٤٧٠-٧٠٤ کۆچی / ١٠٧٧-١٣٠٤ ز

دەروازەیەك بۆ مێژووی عوسمانییەکان

وەرگێڕانی

دەوەن حەسەن

- ناوی کتێب: **مێژووی سەلجوقیەکان**
- نووسینی: **دکتور محمد سهیل طقوش**
- وەرگێڕانی: دەوەن حەسەن
- دیزاینی ناوەوەو بەرگ: **خەلیل هیدایەت مام شێخ ٤٩٢٤٢٦٣**
- نرخ ( ٦٠٠٠) دینار
- چاپی یەکەم : ٢٠١١
- لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان
  ژمارەی سپاردن (٦٤٦) ساڵی ٢٠١١.
- شوێنی چاپ : چاپخانەی ڕۆژهەلات-هەولێر ٠٧٥٠ ٤٦٣٩٥٣١


**بەڕێوەبەری هونەری دەزگا**

**سەلام محەمەد رەسول**

**راوێژکاری دەزگا بۆ بەشی مێژوو**

**د. محەمەد عبدالله کاکەسوور**

# بەشی یەکەم

# سەلجوقیەکان

# بنەچەیان – دامەزراندنی دەوڵەتەکەیان لە خوراسان

## بنەچەی سەلجوقیەکان

کاتێ توێژینەرێك لە مێژووی ئاسیای بچووك دەکۆڵێتەوە، (١) دەبینێ تاج رادەیەك ئەم مێژووە لە چاخەکانی کۆن و ناوەڕاستدا جولانەوەی گەلانی کۆچەری و شارستانی لەناو ئاسیا و ئەوروپادا کاری تێکردووە، لە هەمان کاتدا ئەوەش دەبینێ چۆن ئەو وڵاتانە گەشاونەتەوە یاخود تووشی ئاستەنگ هاتووە لە دوای هەر شەپۆلێکی نوێی داگیرکەران، بەڵام ئەم باسە لە بەرەنگاربوونەوەو رووبەڕوو بوونەوەی ئەو شەپۆلانە نادوێ کە لەسەدە جیاجیاکاندا بۆ ئەو وڵاتە هاتون، بەڵام تەنها هەندێ لە ڕووداوەکانی دوای سەرهەڵدانی ئیسلام دەکاتە مەبەست. دەبینین موسڵمانە توورکەکان دیارترین ئەو گەلانەن بۆ ئەم وڵاتە کۆچیان کردووە. ئەگەر ڕووداوە مێژووەکان لە ئاسیای بچووك لە سەدەی شەشەمی زاینی بپشکنین، دەبینین ئەو ڕۆڵەی هۆزە کۆچەرییە تورکانە دەیانبینی کاریگەری زۆری هەبووە، ئەو هۆزانە لەلای عەرەب و فارسەکان بە ((ئەلغوز)) (٢) ناسرابوون.. کەنیشتەجێی بیابانە بەربلاوەکان و دەشتاییەکاندا بوون، کە لە سنووری چینەوە دەسپێدەکات تا دەگاتە کەنارەکانی دەریای خەزەر(٣)، کۆچکردنی ئەو تورکانە بۆ کەناری ڕووباری ((جەیحون)) (٤)، لەپێش و دوای فەتحی ئیسلامی (٥)، بەردەوام بوو سروشت و ژینگە،ژیانێکی بەسەردا سەپاندن لەژیانی بیابان دەچوو.

## مێژووی سەلجوقیەکان

ئـەوەی جێگـای گوتنـە زۆربـەی دانیـشتوانی دەشـتاییەکانی سـەرووی ڕووبـاری جەیحون و ئەودیوی هەموویان بەبنەچە تورکن یا مەغولن، لـەو دیـو ڕووبارەکـەوە (٦). شارانێك دامەزران سیستەمی ئـەو شـارانە لـە سیـستەمی دەوڵەتـەکانی شـار دەچوون، کە جۆرە سەقامگیری و شارستانیەکیان هەبوو. کارێکی ئاسان نەبوو بۆ دانیشتوانی دەشتاییەکان دزەبکەنە ناو ئـەو شـارانەوە و پەیوەنـدی پتـەو لەگـەڵ دانیشتوانەکاندا ببەستن، بۆیە کە ڕوویان کردە ناوچـە ئیـسلامیەکان و پەیوەنـدی بازرگانیان لەگەڵ موسڵمانەکاندا بەست، ئەمەش بەر لەوەی بە ئیسلام بێن بەهۆی بازرگانەکان و پیاوانی ئاینی سۆفی مەزهەب. لە ئەنجامی ئـەم پەیوەندییـە تونـدو تۆڵە هەر لەسەدەی چوارەمی کۆچیەوە / دەیەمی زاینی، هەندێ زانیاری لەبارەی هـۆزە تورکەکانـەوە : بنەچـەیان، جێگایـان، داب و نـەریتیان کەوتنـە دەسـتی موسڵمانەکانەوە. لەناو ئەو کۆمەڵە تورکانەدا کە موسڵمانەکان لەنزیکەوە ناسیانن ((تغزغز)) یان ((ئوغوز)) بوون کە عەرەبەکان بە ((غوز)) ناویـان دەبـردن (٧)، وا دەردەکەوێت ئەو ((غوز))انە لە سەدەی سـێیەمی کۆچـی / نۆیـەمی زایینـی، ئـەو هێزە یەکگرتوانەیان کە لە سەدەی شەشەمی زاینی پێکهێنـا بـوو لـە دەسـتیان دا (٨)، بۆیــە لــە ڕووی سیاســیەوە لــە کۆمەڵــە تورکــەکانی دیکــە بایــەخیان و کاریگەرییان کەمتر بوو..

دواجار ئەم هۆزانە ((غوز)) بەرەو باشووری ڕۆژهەڵات دەستیان بەکۆچ کردن کرد، لەسەردەمی دەسەڵاتی سامانیەکان (٩) ئـەو کۆچـکردنە پـەرەی سـەند، هۆکـاری ڕاستەقینەی ئەم کۆچکردنە زۆربوونی ژمارەی دانیـشتوان و بەرتەسـکی ڕووبـەری لەوەڕگا بوو،..(١٠) ئاینی ئیسلام لەنێوان تورکاکانـدا بڵاوبـووەوە کـاتێ دەوڵـەتی سامانی لە هەردوو سەدەی سێهەم و چـوارەمی کۆچـی / نۆیـەم و دەیـەمی زاینـی ناوەڕاستی ئاسیای خستە ژێر دەسەڵاتی خۆیەوە. جوگرافیا زانـەکانی موسـڵمانان ڕەگەزی تورکیان بە دوژمنی موسڵمانان لە قەڵـەم دەدا، بـەڵام ئـەم بارودۆخـە لـە سەدەی چوارەمی کۆچی / دەیەمی زاینیەوە گۆڕا (١١)، لەساڵی ٣٤٩ کۆچی/٩٦٠ زاینی یەکەم. ئیمارەتی تورکی ئیسلامی دامەزرا، ئـەویش دەوڵـەتی ((قـەراخانی)) بوو (١٢)، هەروەها لە هەمان سەدەدا تورکەکانی ((غوز)) کە لە ئاوڕێژی ڕووبـاری

## مێژووی سەلجوقیەکان

((سەیحون)) (١٣) جێنشین بوون بەئیسلام بوون. میرەکەیان هەر بەئیسلام بوونی ئەو شارە موسڵمانەی ڕزگارکرد کە باجی بە کافرەکان دەدا (١٤)، کاتێ هێشتا ((ئەلب ئەرسەلان)) میرێکی گەنج بوو، کتێبێکی دەرکرد بەناوی ((مولك نامە))وە، کە تیایدا دەنگ وباسی تورکمان و سەلجوقیەکانی تیادا بەیان کردبوو. کەتیایدا دەڵێ لە تۆمارکردنی ڕەچەڵەك و بنەچەیاندا، سوودی لە میر ئینانغ بەگ وەرگرتووە، کەیەکێك بووە لە کەسایەتیە دیارەکان و شارەزای ڕەگ و ڕیشەیان بووە. لە ڕاستیدا ئەو کتێبە نەگەیشتۆتە دەستی ئێمە، لە چەند زانیارییەکی بەولاوە کە سەرچاوەکان پشتیان پێ بەستووە سەبارەت بە ڕەگەزوبنەچەی سەلجوقیەکان و دابو نەریتیان...سەلجوقیەکان لە هۆزی ((غوز))ی تورکیەوە شۆڕبوونەتەوە، دەگەڕێنەوە بۆ باپیرە گەورەیان کە ((سەلجوقی کوڕی دەقاق))ە (١٥)، ئەو ((دەقاق))ە، وەزیری ((خاقان بیغو)) بووە (١٦)، کە یەکێکە لە ((خان))ەکانی تورکستان (١٧)، و فەرماندەی سوپاکەی بووە (١٨)، وا دەردەکەوێت ناکۆکی کەوتۆتە نێوانیانەوە بەهۆی ئەو هێرشانەی ((بیغو)) بۆ سەر خاکی ئیسلامی، بەلاّم ئەو ناکۆکیە زۆری نەخایاند بە ڕازیکردنی ((دەقاق)) چارەسەرکرا کە تا کاتی مردنی لە خزمەتی گەورەکەیدا بوو. (١٩)، ئێرەیی بردنی ((دەقاق)) بە ئیسلام، وایکرد گوشار بخاتە سەر ((بیغو)) تا سنوورێك بۆ دەستدرێژیەکانی بۆ سەر ناوچە ئیسلامیەکان دابنێ، ئەمە ئەنجامێکمان دەخاتە دەست، کەوا ((دەقاق)) یەکەم کەس بووە لە هۆزی ((غوز)) بووە بە موسڵمان. هەروەها هۆزەکەشی لە پێشەنگی ئەو هۆزانە بووە کە ئسلامیان قەبوڵ کردووە (٢٠)، بەلاّم ئاشکرایە، سەلجوقی یەکەم سەرۆکی ((غوز)) بووە دەربارەی ((بیغو))ی بەجێ هێشتووەو بووە بەئیسلام، وەکو دواتر روونی دەکەینەوە. لەگەڵ میللەتەکەیدا لە تورکستان دەرچووە و چۆتە شاری ((جەند)) (٢١)، کە دەکەوێتە ئاوڕێژی ڕووباری سەیحونەوە و پەیوەندی لەگەڵ موسڵمانەکاندا بەستووە، زۆربەی مێژوو نووسان لەو باوەڕەدان کەوا سەلجوقیەکان لە سامانیەکانەوە کە دەسەلاّتداری ناوچەکە بوون، بوونەتە ئیسلام. سەلجوق سەرۆکایەتی هۆزەکەی بۆ ((دەقاق))ی باوکی بەجێهێشت، زیرەکی و ئەمەکداری

تیا دەرکەوت، بۆیەکە ((بیغو)) لە خۆی نزیك کردەوە و بە فەرماندەی سوپا دایمەزراند و نازناوی ((صوباشی)) پیّ بەخشی (٢٢)، هۆزەکەی مل کەچی بوون و پێی ڕازی بوون، ژنەکەی بیغو ئەمەی پیّ ناخۆش بوو، مێردەکەی هاندا بیکوژیّ، بەلاّم ((بیغو)) منداڵی نەدەبوو، ژنەکەی لەوەترسا، سەلجوق سوود لەم بارە وەرگریّ و هەوڵی کوشتنی بداو جێگاکەی داگیربکات (٢٣)، کە سەلجوق بەمەی زانی کە لە نێوان بیغو و ژنەکەیدا هەیە، لەگەڵ هۆزەکەیدا تورکستانی بەجێهێلاّ، لە دەشتاییەکانی قرغیزەوە خۆی گەیاندە ئەو ناوچەیەی شاری ((جەند))ی لێیە لە دۆڵی خوارووی ڕووباری سەیحون.. بارودۆخی سیاسی لە ولاّتی ئەودیو ڕووبارەوە لەبار بوو بۆ ئەوەی سەلجوق و دەستوپێوەندەکانی بەشداری کاروباری سیاسی بکەن، لەو کاتەدا ((سامانیەکان)) لەشەڕی ((قەرخانیەکان))دا بوون سەبارەت بە دەسەلاّت، ڕۆژ لە دوای ڕۆژ هێزی سەلجوق پەرەیدەسەند، تا لە ناوچەکەدا ناوبانگی دەرکرد وناسرا. دەربارەکەی بووە پەناگەی چەوسێنەران و زوڵم لێکراوان، سامانیەکان داوایان لێکرد لەو شەڕەیاندا لەگەڵ(( هارون کوڕی ئەیلەکی قەرەخانی))دا بەرپابوو بوو چونکی هەندیّ لە ولاّتەکەیانیانی داگیرکردبوو. سەلجوق بە هانایانەوە چوو و لە شەڕەکەیاندا بەشداری کرد. وەکو هاوپەیمانی سامانیەکان. بەلاّم لە هەل دەگەڕا بۆ چاککردنی باری هۆزەکەی خۆی، ئەمە بە یەکەم پەیوەندییەکی لەو جۆرە دەژمێردرێت لەنێوانی سەلجوقیەکان و سامانیەکاندا و بەیەکەم تاقیکردنەوە دادەنرێت لە دەستێوەردانی سیاسیەوە..(٢٤)، ئەم یارمەتیدانە کاریگەرییەکی باشی هەبوو لە دەروونی سامانیەکاندا بۆیە ڕێگایان بە سەلجوق و دەستوپێوەندەکانی دا بە ولاّتەکەیاندا تێپەڕن و لە کەنارەکانی ڕووباری سەیحون بمێننەوە لە بەرامبەر ئەوەدا بەڵێنی پاراستنی ناوچە سنووریەکانیان بدەن. سەلجوق شاری ((جەند))ی بۆ خۆی و ئەوانەی لەگەڵیدا بوون کردە بنکەی خۆی و دوای ئەوەی بە تەواوی لە تورکستان کۆچیان کرد لە ناوچەکەدا بلاّوبوونەوە. سەلجوق و ئەوانەی لەگەڵیدا بوون بە پێی مەزهەبی حەنەفی بوون بە ئیسلام، هەر وەکو پێشتر وتمان لە سامانیەکانەوە وەریانگرتبوو، دواجاریش لە دەوڵەتەکەیاندا بووە باو و پەیڕەویان کرد.(٢٥)، ئیتر

## مێژووی سەلجوقیەکان

لەشاری ((جەند))ەوە سەلجوق لەپێناو ئاینەکەیدا دەستی بە جیهاد کرد، تورکە بت پەرستەکانی داگیرکرد و کاربەدەستانیانی لەناوچەکە دەرکرد، دانیشتوانی ناوچە نزیکەکانیشی لە هێرشەکانیان دەپاراست.. (٢٦)، سەلجوق تا مردنی لەشاری ((جەند)) پارێزگاری لە بەرژەوەندی هۆزەکەی دەکرد، سێ کوڕی هەبوو : بیغوئەرسەلان بە ئیسرائیل ناسرابوو، لەگەڵ میکایل و موسا، هەندێك دەڵێن چوار کوڕی هەبووە ئەویش ((یونس)) بووە. (٢٧)، زانیاری وردو بەڵگەی باوەڕپێکراومان لەلا نییە کە بارودۆخی کوڕەکانی سەلجوق دواتر مردنی بەچی گەیشتووە. ئەوەی بەمسۆگەری ئاشکرایە ئەوەیە کەوا هۆزەکەی، ناوی سەلجوقی بوو، ناوی هۆزەکە و بە سەلجوقی ناسران. وا دەردەکەوێت کوڕەکانی سەلجوق نەیانتوانی لەگەڵ موسڵمانەکاندا بە تەبایی بژین، بۆیە کە ناوچەکەیان بەجێ هێلاَ و بەرەو باشوور کۆچیان کرد. وا دەڵێن کەوا لە سەدەی پێنجەمی کۆچیدا / یانزەهەمی زایینی، دەسەلاَتداری شاری ((جەند)) لەگەڵ کورەکانی سەلجوقیدا دوژمنایەتی سەختیان لەنێواندا بووە (٢٨)، سامانیەکان بواریان پێ داون و لە دەوروبەری ((نوربخاری))، (٢٩)، جێگایان بۆ دابین کردوون لە ساڵی ٣٧٥ کۆچی / ٩٨٥ زاینی دا،(٣٠) لەسەدەی پێنجەمی کۆچیدا کەوتنە نزیك سەرچاوەکانی ئاو، کە خاك و زەوییەکی بە پیتیان هەبوو، ماڵەکانیشیان هەر لە ((نوربخاری)) مابوونەوە کە وەرزی زستانیان لەوێدا بەسەر دەبرد. لە هاوینیشدا لە سەمەرقەند دەبینران ((٣١))، (٣٧٥ کۆچی /٩٨٥ زاینی).. سەلجوقیەکان تا لەناوچوونی دەوڵەتەکەیان وەکو هاوپەیمانێك لەگەڵ سامانیەکاندا مانەوە. چوونە پاڵ هێزەکانی ((ئیسماعیل کوڕی نوحی سامانی)) دژی قەرەخانیەکان، سەرەڕای دەسکەوتی سیاسی بەتەمای دەستکەوت و تالاَنی بوون لەسەر نەریتی هۆزە کۆچەریەکان. توانیان سوپای ((صوباشی)) ڕاوبنێن لە نزیکی کەناری ڕووباری ((زرفشان))دا، دواتریش بەسەر سوپای ((ئەیلەك خان)) دا لە نزیکی سەمرقەند لەساڵی (٣٩٤ کۆچی / ١٠٠٤ زاینی) سەریکەون و هەژدە فەرماندەی سوپایان لێ دەستگیربکەن. دواجار پەیوەندیان بە قۆناغێکی ساردا تێپەڕی، سەلجوقیەکان بەوە ڕازی نەبوون دیلەکان بەدەستی ((مونتەسر))ەوە بدەن نەکو لە ((فدیە)) بێ

بەش ببن، ئەمە گومانی لەلای مونتەسر پەیدا کرد، هەستی بەوەش کرد کەوا دەیانەوێت لەگەڵ ((ئەیلەك)) دا بگونجێن، بۆیە لێیان دوور کەوتەوە، بەڵام دەبینین جارێکی کە دەبنە هاوپەیمانی ((مونتەسر)) کاتێ کە سوپاکەی ((ئەیلەك)) لەساڵی ٣٩٥ کۆچی/ ١٠٠٥ زایینی، شکستی هێنا.. دواجار گەڕانەوە سەربازگاکانی خۆیان دوای ئەوەی بەشی خۆیان دەسکەوت و تالآنیان بەرکەوت..(٣٢).

**پەیوەندیەکانی سەلجوقی – غەزنەوی**

**لەسەردەمی سوڵتان مەحمودی غەزنەویدا :**

دوای ئەوەی سامانیەکان لە کۆتاییەکانی سەدەی چوارەمی کۆچی لەسەر شانۆی ڕووداوەکان نەمان، غەزنەوییەکان جێگای سەلجوقیەکانی گرتەوە (٣٣)، سەلجوقیەکان لەو ماوەیەدا هێزێکی سوپای نیزامیان پێکەوەنا جێگای سڵ لێکردنەوە بوو، وا دەردەکەوێ کەوا ئیسرائیلی کوڕە گەورەی سەلجوق، سەرکردایەتی دەکرد، کە لە ئاستی ((عەلی تەکین)) بوو کە ڕووبەڕووی دەسەڵاتی مەحمود غەزنەوی ڕاوەستاو ((بوخارا))ی داگیرکرد، هەروەها ((قەدرخان یوسف)) سەرکردەی قەرەخانیەکان و پاشای ڕۆژهەڵات، (٣٤). ناچار سەرکردەی غەزنەوی بۆ سەر ولآتی ئەودیو ڕووبار لەشکرکێشی بکات تاکو عەلی تەکین لەسەر دەسەڵات لابدات، بیانوی ئەم لەشکرکێشیەی ئەوەبوو کەوا دانیشتوانی بوخارا و شارەکانی ئەودیو ڕووبار پەنایان بۆ بردووە تاکو لە جەوری((عەلی تەکین)) ڕزگاریان بکات، ئەمەی دوایی نەیهێشت نێرراوەکانی بەناو خاکەکەیدا تێپەڕن کاتێ بۆ لای پاشاکانی تورکستانی ڕۆژهەڵات دەچوون.. (٣٥)، لەئەنجامی ئەو لەشکرکێشی و هێرشەدا عەلی تەکین هەڵهات، لەگەڵ هێزەکانی غەزنەویدا ڕووبەڕوو نەبوونەوە. بەڵام ئیسرائیل خۆی و سوپاکەی لە ئەشکەوتەکاندا خۆیانیان مەڵاس دا تا ڕووبەڕوو نەبنەوە لەگەڵ سوپاکەی مەحمود غەزنەویدا..(٣٦)، دوای ئەم لەشکرکێشیە مەحمود غەزنەوی هێزو توانای سەلجوقیەکانی بۆ دەرکەوت، هەستی بە مەترسی کرد کە ڕەنگە جێگای مەترسی دەوڵەتەکەی بن، بڕیاری لەناوبردنیانی دا، قەدری خان پاڵپشتی لێکرد و هانیدا.. هەردووك لە دەرەوەی

سەمەرقەند، (٣٧). لەساڵی(٤١٩ کۆچی / ١٠٢٨ زاینی) بۆ دیاریکردنی بنەمای لێك گەیشتنیان کۆبوونەوە و ناوچە سنووریەکانی نێوان دەوڵەتی غەزنەوی و قەرەخانیان دیاریکرد، لەسەر ئەوەش رێککەوتن کەوا لەبارەی ئەمانەوە وتووێژ بکەن :-

- هێزەکانیان یەك بگرن بۆ وەرگرتنەوەی وڵاتی ئەودیو رووبار لە ژێر دەستی عەلی تەکین و بدرێتە ((بیغان تەکین))کە کوڕی دووەمی قەدرخانە.
- ژن وژن خواستن بکەوێتە نێوانیانەوە تا لەیەکتر نزیك ببنەوە. ((بیغان تەکین)) زەینەبی کچی مەحمود ببێتە هاوسەری و قەدرخانیش کچی خۆی بە محەمەدی، کوڕی دووەمی مەحمود بدات (٣٨) هەرچی مەسەلەی سەلجوقیەکانە ئەوا لە وتووێژەکانیاندا باسی لێوە کرابوو، قەدرخان، نائارامی خۆی سەبارەت بە بەهێزبوونیان و زۆربوونی ژمارەی سەربازەکانیانی دەربریبوو هەروەها دەست بەسەرا گرتنی ئەو لەوەرگایانەی لە بوخارا و سەغد و سەمەرقەندان. داوای لە مەحمود کردبوو لەناویان بەرێت بەر لە چوونی بۆ داگیرکردنی هیند. مەحمود لە هێزو توانای سەلجوقیەکان ئاگادار بوو و دەیزانی لە پەرەسەندندان، پێویستی بەوە نەبوو لەمبارەوە ئاگادار بکرێتەوە، چونکی هەر لەو کاتەوە هاتبوونە ناوچەکە، سەرنجی ئەم لایەنەی دابوو. بەمجۆرە، پەیدا بوونی سەلجوقیەکان وەکو هێزێکی نوێ لەسەر شانۆی سیاسی لەبەرچاو دەگیرا، ئەو بارودۆخەشیان لەبەرچاو بوو کەبەسەر ناوچەکەدا دێ لە ئەنجامی پەرەسەندنی سەلجوقیەکان. غەزنەوییەکان ترسی ئەمەیان لەدڵدا بوو، بۆیە مەحمود بڕیاریدا فێڵ بەکاربهێنێ بۆ دەستگیرکردنی ئیسرائیل و دەستوپێوەندەکانی، داوای لێکرد لە نزیکی کەناری رووباری جەیحون چاویان بەیەکتر بکەوێت تا رێکەوتنێکی دۆستانە و یارمەتیدانی یەکتر لە نێوانیاندا ببەستن، (٣٩)، سەلجوقیەکان بەم فێڵە خەڵەتان، بڕوایان بە نامەکەی مەحمود کرد، ئیسرائیل و چەند کەسێکی نزیکی و گەورە پیاوانی هۆزەکەی بۆ چاوپێکەوتنی غەزنەوی چوونە شوێنی دیاریکراو، ئەویش زۆر بەگەرمی پێشوازی لێکردن، لەڕادەبەدەر بەرامبەر ئیسرائیل رێزی نواند، دواجار داوای لێکرد پەیمانێك ببەستن لەنێوانیاندا بۆ ئەوەی هاوکاری یەکتر بکەن

## مێژووی سەلجوقیەکان

بۆ لەناوبردنی هەر سەرپێچیەك کە لە دژی دەوڵەتی غەزنەویدا لە خوراسان سەرهەڵدەدا، (٤٠)، ئیسرائیل ئەمەی بەچاك زانی نەیزانی چ پیلانێکی بۆ دانراوە، مەحمود لەسەرەوە خۆشەویستی و ڕێزی دەنواند، بەلام مەبەستی خەڵەتاندنی بوو، پێی گوت ((لەلایەن ئێمەوە بۆ خزمەتکردنی ئێوە کەمو کوری نابێ )) (٤١). مەحمود سێ ڕۆژ خزمەتی کردن، خواردنەوەیەکی زۆری پێدان تا خەویان لێکەوت، ئەوجار بەزنجیر دەستو پێیان بەستنەوە و بۆ بەندیخانەیان بردن، ئیسرائیل لە هیند لە قەڵای ((کالنجەر)) حەوت ساڵ بەند بوو، وەکو بارمتەیەك لەو قەڵایە داینا بوو کە سەلجوقیەکان ئارامی ناوچەکە تێکنەدەن، مەحمود هەندێك لە دەستوپێوەندەکانی کوشت و هەندێکی دیکەشیانی بۆ خوراسان نارد. (٤٢)، ئەم ڕووداوە کارێکی خراپی لە دەروونی سەلجوقیەکاندا بەجێهێلا، بڕیاری تۆڵەسەندنەوەیان دا.. میکائیلی کوری سەلجوق لەجێگای ئیسرائیلی برای سەرکردایەتی سەلجوقیەکانی بەدەستەوە گرت، هەستی کرد هێزو توانای سەلجوقیەکان ناگاتە تواناوهێزی غەزنەوییەکان، واچاکە و ژیرانە ترە لەگەڵیاندا ڕێك بکەوێت، بۆیە دانی بەخوداگرت، دەستی بە خۆ تەیارکردن کرد، داوای لە سوڵتان مەحمود کرد ڕێگا بدات لەڕووباری جەیحون بپەڕێتەوە بۆ ((نسا)) (٤٣) و((باورد)) بڕوات.(٤٤) چونکی شوێنەکەیان خراپەو لەوەرگاکان بەشی مەڕومالاتەکانیان ناکات، ئەم داوایە لە ساڵی ٤١٨ کۆچی / ١٠٢٨ زاینی بوو ((٤٥)).

فەرمانڕەوای ((طوس)) (٤٦) لە داواکەی سەلجوقیەکان ئاگادار بووەوە، ئامۆژگاری مەحمودی کرد داوای سەلجوقیەکان قبوڵ نەکات، چونکی دەبنە هۆی مەترسی بۆ دەوڵەتی غەزنەوی چونکی سوارەو ژمارەیان زۆرە (٤٧)، مەحمود ئامۆژگارییەکەی فەرمانڕەوای ((طوس))ی پشتگوێ خست، چونکی لەو بڕوایەدا بوو سەلجوقیەکان دوای ڕوداوەکانی ئەم دواییە لاوازبوون، بەتایبەتی سەرکردایەتیەکی بەهێزیان نییە بیانپارێزێ دوای بەدیلکردنی ئیسرائیل و ئەوەی بەسەر سەرکردەکانیاندا هاتووە نابێتە هۆی ئەوەی ڕاپەڕن و ئێستا دەستدرێژی بۆ سەر دەوڵەتی غەزنەوی ناکەن، لە ئەنجامی ئەم بۆچوونانەدا وەلامی

فەرمانڕەوای دایەوە : ((من گوێیان پێ نادەم و جێگای مەترسی نین بۆمن)) (٤٨) دواجار ڕێگای پێ دان و لە هەرێمی خوراسان لەنێوان ((نسا)) و ((باورد)) دا جێگیربوون. (٤٩) وادەردەکەوێت ئەوانەی سەر بە ئیسرائیل بوون لە ڕووبارەکە پەڕینەوە، ئەوانەی سەر بە میکائیل بوون، لەهەرێمی ئەو دیو ڕووبار مانەوە. ئەمە لە میانی ئەو ڕووداوانەدا دەردەکەوێت کە دواتر ڕوو دەدەن. سەلجوقیەکان هەر لەوکاتەوە بوون بەئیسلام، لەژێر کاریگەری و فشاری ڕووداوە سیاسیەکان و بارودۆخی ئابوریدا هەوڵی ئەوە دەدەن جێگا و خاکێك بەدەست بهێنن تا کۆچ بکەن و تیایدا نیشتەجێ بن، ئەو ئاواتەیان هاتەدی کە لە ڕووبارەکە پەڕینەوەو بەرەو خوراسان ڕۆیشتن. لەڕاستیدا مەحمود هەڵەی کرد کاتی ڕێگای بە سەلجوقیەکاندا لە ڕووبارەکە بپەڕنەوەو بەرەو خوراسان بچن، دواجار لەو بڕیارەی خۆی پەشیمان ببووەوە (٥٠)، چونکی ئەو پەڕینەوەیە وایکرد بە ئازادی لە لەوەرگاکانی ((دندانقان)) هاتوچۆ بکەن و بڵاببنەوە (٥١)، ئەوە سەرەتای قۆناغێکی نوێ بوو لە ژیانیاندا، ڕێگای دامەزراندنی دەوڵەت و تەنگەتاوکردنی دەوڵەتی غەزنەوی بۆ ئاسانکردن. هەر کە سەلجوقیەکان لەناوچە تازەکاندا نیشتەجێ بوون، توانا سەربازییەکانی خۆیان پەرەپێدا و لە هەلێ دەگەڕان هێرش بەرنە سەر خاکی دەوڵەتی غەزنەوی، وا دەردەکەوێت ئەوانە ژیانی ئارامیان نەدەویست و گەڕانەوە سەر سروشتی کۆچەریانەی خۆیان، دەستیان بە ئاژاوەنانەوە کرد. خەڵکانیان تەنگەتاو دەکرد و هێرشیان دەکردە سەر شارو دێهاتەکانی دەوروبەر، ناچار دانیشتوانەکە داوایان لە مەحمود کرد دووریان بخاتەوە. مەحمود بەدەنگیانەوە هات و ساڵی ٤١٩ کۆچی / ١٠٢٨ زاینی بە فەرماندەیی لەشکرێکی گەورە لە غەزنەوە، (٥٢)، بەڕێگای ((بوست))دا (٥٣) بەرەو ((طوسی)) کەوتە ڕێ. لەگەڵ بەرپرسانی شارەکە کۆبووەوەو ڕاستی هەڵویستەکەیان پێ ڕاگەیاند، مەحمود فەرمانی بە فەرمانڕەوای شارەکە دا لەشکر ئامادە بکاو سەلجوقیەکان لە ناوچەکە دوور بخاتەوە.لە ((ڕەبات فراوە)) لەشکری غەزنەوی و سەلجوقی بەرەنگاری یەکتر بوونەوە. (٥٤)، شەڕێکی سەخت لە نێوانیاندا بەرپابوو، لەشکرەکەی مەحمود سەرکەوت و چوارهەزار سوارەی

سەلجوقی تیایدا کوژران، ژمارەیەکی زۆریشی بەدیل گیران، ئەوەی ڕزگاری بوو بەرەو ((بلخان)) (٥٥) و ((دیهستان)) هەڵاتن (٥٦) میکائیل لە یەکێ لە شەڕەکانیدا دژی تورکە بت پەرستەکان لە هەرێمی ئەودیو ڕووبار کوژرا. وا دەردەکەوێت مردنەکەی بەر لە مردنی مەحمود بووە لەساڵی ٤٢١ کۆچی / ١٠٣٠ زاینی. سێ کوڕی هەبوو، ئەمانە بوون : بیغو، جفری، توغرل بەگ. ئەمەی دوایی بووە جێنشینی، کە سەرلەنوێ هۆزە سەلجوقیەکانی یەکخست و کردنیە هێزێکی دەستوەشێن لە هەرێمی ئەودیو ڕووبار، لەم کارەیدا ((جفری)) برای یارمەتیدەری بوو. توغرول بەگ و جفری، دوو سوارەی ئازاولێهاتوو بوون. لە کاروباری سەربازیدا سەریان دەردەچوو، هەمیشە لە شەڕوبگرەو بەردەیەکی بەردەوامدا بوون لەگەڵ بەهێزترین میرانی ئاسیای ناوەڕستدا لە وێنەی ((ئەیلەك خان)) لە ((بوخارا)) و ((بوغراخان)) لە ((کاشغەر)) (٥٧). لەناو هۆزەکانی سەلجوقیدا دەسەلاتێکی زۆریان هەبوو، لە کاروکردەوەیاندا ئەوەی دەردەخست سەلجوقیەکان لەسەر دەستیاندا دەگەنە پۆپەی هێزوتواناییان، دامەزراندنی دەوڵەتی سەلجوقیان بە ئامانج کردبوو، بەردەوام بوون بۆ بەدیهێنانی ئەم خەونەیان و لە هەلێك دەگەڕان هێرش بەرن بۆ سەر دەوڵەتی غەزنەوی لە ناوچەی خوراسان و هەرێمی ئەو دیو ڕووبار، لەپێشدا خۆیان لە بەگژا چوونی دوژمنەکانیان لادەدا، کاتێ لە هێزی خۆیان دڵنیا بوون، کەوتنە ڕووبەڕوو بوونەوەی دوژمنەکانیان (٥٨).

## لەسەر دەمی سوڵتان مەسعودی غەزنەوی شەڕی دلزانقان و دامەزراندنی سەڵتەنەی سەلجوقی:

سەلجوقیەکان هەلی مردنی مەحمود غەزنەویان قۆستەوە، غەزنەوییەکان توانا و هێزیان دای لەکەمی بەهۆی پەیدا بوونی ناکۆکی لە نێوان هەردو کوڕەکەیدا((محەمەد و مەسعود)) لەسەر دەسەلات، بۆیە سەلجوقیەکان توانیان دەست بەسەر ناوچە نزیکەکانی خۆیاندا بگرن و دەسەلاتیشیان لە هەموو لایەکی هەرێمی ئەودیوو ڕووبار بلاوکردەوە.. عەلی تەکین، فەرمانڕەوای بوخارا، هەستی

## مێژووی سەلجوقیەکان

بە گوشاری سەلجوقیەکان کرد، هەوڵی بڵاو بوونەوەیانی دا و بەگژ یەکتریاندا بکات. یوسف کوڕی موسای کوڕی سەلجوقی کردە سەرکردەی هەموو ئەو تورکانەی لەلای ئەو کاریان دەکرد و نازناوی ((ئەمیر ئینانغ بیغو))ی پێ بەخشی، بەڵام یوسف کاتێ لە نیاز و مەبەستی عەلی تەکین گەیشت، وازی لە پلە و پایەکەی هێنا، لە ئەنجامدا عەلی تەکین کوشتی، ئەم کارەی لەلای کوڕە مامەکانی بووە جێگای تورەبوون و نارەزایی، بە تایبەتی لەلای ((توغرول بەگ))و((جفری)) بڕیاری تۆڵەسەندنەوەیان دا. عەلی تەکین لەهێرش بردنە سەر سەلجوقیەکان دەستپێشخەری کرد، بڵام شکستی هێناو بەرەو دواوەوە بووەوە ئەمە لەساڵی ٤٢١ کۆچی/١٠٣٠ زاینیدا روویدا. هەردووك توغرول و جفری فەرماندەی لەشکرەکەیان ((ئەلب قرا))یان کوشت لەگەڵ هەزار کەسی دیکەدا.
فەرمانڕەوای بوخارا کۆڵی نەدا، هەر بەهیوای سەرکەوتنەوە بوو، سەر لەنوێ هێزەکانی ڕیکخستەوە و هێرشی بردەوە سەر سەلجوقیەکان، ئەمجارەیان سەرکەوتنی بەدەست هێنا و دەستی بەسەر موڵکەکانیاندا گرت و ژمارەیەك ژن و منداڵی بە دیل گرت، بەڵام دواجار لێیان خۆش بوو و بەرەڵڵای کردن، پارە و دیاریشی پێدان...
لە زستانی ساڵی ٤٢٣ کۆچی/١٠٣٢ زاینی، سەلجوقیەکان ئارام و بێ دەنگ بوون، بەڵام لە پایزی ئەو ساڵەدا هێرشەکانیان لەوەوبەر بەربڵاوتر کردەوە.مەسعودکە جێنشینی باوکی بوو، دوو دڵ بوو لەوەی ببێتە فەرماندەی سوپا یان نەو ((سوباشی)) کی ڕاسپارد ئەو ئەرکە بخاتە سەرشانی خۆی، بەڵام لەخۆی بەتواناتر نەبوو، نەیتوانی ئەو هێرشە کتو پڕانە بەربەست بکات کەلەبیابانەکانەوە هێرشیان دەهێنا، هەروا نەیتوانی ڕێگا لەو تورکانە بگرێ کە لە سوپاکە دەکشانەوە، بەردەوام خوراسان بۆ ماوەی سێ ساڵ سەلجوقیەکان هێرشیان بۆ دەهێنا،لەدواییدا((جفری)) توانی غەزنەویەکان لە ناوچەکانی باکور دەربکات و شاری ((مەرو))(٥٩) داگیر بکات.سەرتاپای باکووری خوراسان کەوتە ژێر دەسەڵاتیەوە، هەردوو برا توغرول و جفری هاتنە ناو پایتەختی خوراسانی کۆنەوە و هەڵسوڕانی کار و باری حکومەتیان لە نێو خۆیاندا دابەشکرد.توغرول کارو باری

## مێژووی سەلجوقیەکان

بەڕێوەبردنی لە ئەستۆ گرت،جفری ئەرکی پاراستنی هەرێمەکەی خستە سەرشان،(٦٠)

لەو کاتەدا ((هارون کوڕی تونتاش))فەرمانڕەوای خوارزەمی (٦١) سەلجوقیەکانی بۆ لای خۆی هێنا، تاخۆی پێیان بەهێز بکات و ببنە پاڵپشتی، لەگەڵ غەزنەویەکاندا دووژمنایەتی هەبوو، سەلجوقیەکان ئەمەیان بەهەل زانی،بەدەنگ داواکەی ((هارون))ەوە چوون، کە زەوی و زارێکی زۆری لە نزیکی ((شەرا خان و ڕەبات ماش)) پێ دابوون،بەڵام دواجار پشتی لێ کردن و لەگەڵ ((شا مەلەك))ی فەرمانڕەوای شاری ((جەند)) ڕێککەوت،لەناویان بەرێ،چونکی دوژمنیەتی کۆنی لەنێوانیاندا هەبوو.(٦٢).

دوای ئەم ڕووداوانە،سەلجوقیەکان داوایان لەوالی ((نیاپور)) سوری کوڕی موعتەز کرد(٦٣)، ڕێگایان بدات لە نزیکی شاری نیابور نیشتەجێ ببن پەیمانی ئەوەشیاندا هێمن و ئارام بن هەروەها بەڵێنی ئەوەشیان پێدا لە کوژانەوەی شۆڕشەکاندا یارمەتی دەوڵەتی غەزنەوی بدەن وببنە یارمەتیدەری سوڵتان مەسعودی غەزنەوی.

والی ئەم داوایەی سەلجوقیەکانی بە سوڵتان گەیاند،کە لەشاری ((جرجان)) (٦٤) بوو، بەڵام داواکەیانی بەدواوە داو وەڵامێکی قورسی دانەوە،کەوتە بیری لە ناوبردنیان (٦٥)،سوپایەکی بە فەرماندەی ((بکتغدی))نارد تاکو ڕۆڵەکانی بیابان لە ناو بەرێ و لە خوراسان دووریان بخاتەوە، بەڵام سەلجوقیەکان شکستیان بە سوپاکەی غەزنەوی هێنا و مەسعود ناچار بوو بەرەو هیند بڕوات،بەڵام ڕاوێژکارەکانی ئەم خواستە سیاسیەیان پێ باش نەبو و لەئەنجامی گوێ پێنەدانی هێزو توانای سەلجوقیەکانیان وشیار کردەوە ئامۆژگاریان کرد خوراسان بۆ ئەو سەرکێشانە بەجێ نەهێڵێ، بەڵام بە قسەی نەکردن، ناوچەکەی چۆڵکرد و کەوتە ڕێکخستنی کار و باری هیند و ئارامکردنەوەی بارودۆخی ئەوێ دوای ئەوەی هەندێ گێرە شێوێنی تیادا ڕوویدا.(٦٦).

## مێژووی سەلجوقیەکان

بەمجۆرە لە هەرێمی خوراسان بۆ سەلجوقیەکان رێگا چۆلکرا. بارودۆخەکەیان بۆ لەبار بوو تا خۆیان بەهێز بکەن و دەسەلاتیان بسەپێنن و لەبەرامبەر غەزنەویەکاندا سەلتەنەتێك دامەزرێنن،(٦٧)

سەرکەوتنی سەلجوقیەکان و ئەو بۆ شاییەی لە ئەنجامی دەرچوونی هێزەکانی غەزنەوی خوراسان هێنایە ئاراوە، پالپێوەنەرێك بوو لەپەلە کردنی جارِدانی دامەزراندنی سەلتەنەتەکەیان. توغرول بەگ بە فەرماندەی سوپاکەیەوە خۆی گەیاندە ((نیساپور))و سالی ٤٢٩ کۆچی/١٠٣٨ زاینی داگیری کرد، لەسەر تەختی مەسعود دانیشت و جارِی سولتانی خۆیدا، فەرمانی دەرکرد بە ناوی ئەوەوە خوتبە بدرێت، هەروەها لە((مەرو))و ((سرخس))یش (٦٨) شاری ((بەلخ)) (٦٩) بووە بەهێزترین بنکەی لە رۆژهەلاتدا.((نیساپور))یش یەکێك بوو لە بنکە گرنگەکانی لە رۆژئاوا،(٧٠) بەمجۆرە توغرول بەگ جارِی سەلتەتی سەلجوقی دا، نامەیەکی خەلیفەی عەباسی ((قائم بأمرالله)) لە سالی (٤٢٢ کۆچی/ ٤٦٧ کۆچی ـ ١٠٣١ـ١٠٧٥) نارد تیایدا، باردۆخی سیاسی بەچی گەیشتووە ئاشکرا دەکات و داوای لێدەکات دان بنێ بە دەولەتە تازەکەیدا.(٧١).

مەسعودی غەزنەوی ئەم بارودۆخەی لە خوراسان نەسەلماند، بەدەسەلاتدارێتی سەلجوقی رازی نەبوو،بۆیە بریاریدا لەناویان ببات و سنووریّ بۆ دەسەلاتیان دابنێ،بەلام ئەوان بەسەر سوپاکەیدا زالّ دەبوون کە لەسەر یەکە دەینارد لە دواییدا بریاریدا خۆی فەرماندەیی سوپاکە بکات، سالی ٤٢٩کۆچی/١٠٣٨زاینی، بە سوپایەکی گەورەوە کە ژمارەی بە سەد هەزار سەرباز و سێ سەد فیل دادەنرێ لە غەزنەوە، بەرێگای ((بست ـ تکیناباد))دا چووە ناو خوراسانەوە (٧٢)،توغرول بەگ لەشاری ((طوس))بوو،لە جفری برایەوە دوور بوو،مەسعود پلانێکی دانابوو،هەردوو براکە پێکەوە نەبن و یەکە یەکە دەستی خۆی بوەشێنێ.یەکەمجار روویکردە((طوس))و هێرشی بردە سەر شارەکە،بەلام نەیتوانی بچێتە ژوورەوە،پلانە سەربازیەکەشی سەرنەکەوت،وای دانابوو لە نزیکی ((سرخس)) هێرش بکاتە سەر سەربازگەکانیان،بەلام توانی شاری ((بەلخ))و((نیساپور)) لەدەستیان دەرهێنێ، گەرانەوەی ئەو دوو شارە بۆ ماوەیەك بوو،جارێکی کە دوو

براکە هێزەکانیان کۆکردەوە لە ((دندانقان)) هەردوو سوپاکە ڕووبەڕووی یەك بوونەوە،شەڕێکی سەخت لە نێوانیاندا پەیدا بوو سەلجوقیەکان شەڕێکی ئازایانەیان کرد و بالادەستر بوون.پلانێکی سەربازی تۆکمەیان بەکارهێنا لە کۆتاییدا سەرکەوتنیان بەدەست هێنا، بیرە ئاوەکانی دەرەوەی قەلای((دندانقان))یان پڕکردەوە، دواجار لە قەلاکە دەرچوون لەدەرەوەی قەلاکە بۆسەیان بۆ غەزنەویەکان دانا، کە سوپای غەزنەوی ماندوو گەیشتنە ناوچەکە پێویستیان بە ئاو هەبوو،بیرەکانی ناو قەلاکە بەشی نەدەکرد،کاتێ لە قەلاکە دەرکەوتن و بەدوای ئاودا دەگەڕان،لە پڕێکدا سەلجوقیەکان هێرشیان کردە سەریان،شلەژان و سەریان لێ تێکچوو.ئەوانیش پەیتا پەیتا هێرشیان دەبرد،لە ئەنجامدا شکستیان هێنا، (٧٣) شەڕەکە لە مانگی ڕەمەزانی ٤٣١کۆچی/حوزەیرانی١٠٤٠زاینی ڕوویدا.

کاتێ مەسعودی غەزنەوی سوپاکەی بەو شکستیە بینی لەشەڕەکە کشایەوە،بەوە ڕازی بوو گیانی خۆی قورتار بکات،چونکی زۆری نەمابوو ژیانی لەدەست بدات.بەوجۆرە هەرێمی خوراسانی وەکو نێچیرێکی ئاسان کەوتە ژێر دەسەلاتی سەلجوقیەکانەوە.(٧٤).

**ئەنجامەکانی شەڕی دندانقان:**

- شەڕی دندانقان دەسەلاتی غەزنەویەکانی لە خوراسان کۆتایی پێ هێنا،توغرول بەگ لە شوێنی شەڕەکەداتەختی دەسەلاتی دانا و لەسەری دانیشت.گەورە پیاوان یەکە یەکە پیرۆزبایی ((ئیمارەتی خوراسان))یان لێدەکرد.

– توغرول بەگ نامەی بۆ میرەکانی دەوروبەر نارد هەوالی سەرکەوتنی پێ ڕاگەیاندن.

- هێزەکانی سەلجوقی،هێزە شکست خواردووەکەی غەزنەویان تاکو کەنارەکانی ڕووباری جەیحون ڕاونا،بە مەبەستی ئەوەی ناچاریان بکەن هەلبێن بۆ ئەو دیو ڕووبار دووریکەونەوە، تا بە تەواوەتی سەرکەوتنی خۆیان بسەلمێنن.

- شەڕەکە بووە هۆی دامەزراندنی دەسەلاتێکی ئیسلامی نوێ،ئەم شەڕە بەشەڕە بەیەکێك لە شەڕە گەورەو یەکلاکەرەوەکان دەژمێردرێ لە مێژووی

## مێژووی سەلجوقیەکان

ئیسلامیدا،ئەنجامەکانی جیهانی ئیسلامی تێپەڕاند و لەسەر جیهانی چاخەکانی ناوەڕاست کاریگەری هەبوو.(٧٥)

ـ مەسعود لەو نامانەیدا کە بۆ (قەرەخانیەکان)ی نارد، هیوای ئەوەی لێ کردبوون لە لەشکرکێشی داهاتوویدایارمەتی بدەن بۆ ڕیشەکێشکردنی دەسەلاتی سەلجوقیەکان، بەلام شکست هێنانەکەی بە جۆرێ ورەی پێ بەردابوو ئارەزووی بەرەنگار بوونەوەی نەما،وای بەخەیالدا هات کە نەك دەبێ((بەلخ)) بەجێ بهێلێ، بەلکو دەست لە ((غەزنە))ش هەلگرێ،گەرچی سەرکردەکانی سوپاکەی و گەورە پیاوانی دەولەت هەولی ئەوەیان دابوو ڕازی بکەن و ئەو مەترسیانە لەدلێ دەرکات بڕیاریدا بەیەکجاری لە هیند بکشێتەوە.(٧٦).

ـ هۆزە سەلجوقیەکان،دوای سەرکەوتنیان ئەو زەویو زارانەی دابەشکرد کە دەستیان بەسەرا گرت شاری((مەرو)) کەوتە بەشی ((جفری)) لەوێ نیشتە جێ بوو، کردیە پایتەختی دەسەلاتەکەی بەشێکی زۆری خوراسانیشی بۆ خۆی برد((ئەبو عەلی حەسن کوڕی موسا کلان)) ((بست)) و ((هەرات))ی (٧٧) بەرکەوت لەگەل((سەجستان))دا(٧٨) ((قاورد))ی کوڕە گەورەی ((جفری)) ویلایەتی ((طةبەس))و(٧٩) دەوروبەری ((کرمان))ی (٨٠) بەرکەوت ((ئیبراهیم کوڕی ینال)) ((هەمەدان))ی (٨١) بەرکەوت ((یاقوتی کوڕی توغرول بەگ)) ((ئەبهەر))و(٨٢) ((زنجان)) (٨٣)و دەوروبەری ((ئازەربایجان))ی (٨٤) بۆخۆی برد.((قوتلومش کوڕی ئیسرائیل))(جرجان و دامغان)ی (٨٥) بەرکەوت..

لە ڕاستیدا بیرۆکەی دابەشکردن لەگەل بیرۆکەی ئێرانیداناگونجێ،ئەمە کارێکی نامۆ بوو بەلای سەلجوقیە پێشەنگەکانەوە،بەلام بەرپرسە سەلجوقیەکان مەبەستیان دەورەدانی سەلتەنەتی غەزنەوی بوو، تا نەهێلن خوراسان جارێکی کە دەستیان بکەوێتەوە، هەروەها ڕێگای جەیحون مسۆگەر بکەن بۆ ئەوەی کۆچبەرانی نوێ ((غوز)) بێن..

– سالی٤٢٩کۆچی /١٠٣٨زایینی، بە سەرەتای ڕاستەقینەی دامەزراندنی سەلتەنەتی سەلجوقی دادەنرێت لە خوراسان.

چونکی توغرول بەگ لەو ساڵەوە کاری سیاسی و سەرکردایەتی بەڕێوەبردنی دەست پێکرد،دان پێدانانی خەلیفەی عەباسی دوا کەوت بۆ ساڵی ٤٣٢کۆچی/ ١٠٤١زاینی، کە هیچی لە واقیعەکەی نەگۆڕی ، دان پێدانانێك بوو بە ئەمری واقیع،تەنها بە ڕواڵەت بوو تا ڕەواییەك بە سەڵتەنەتەکەدا بدات و خەڵکی لێی ڕازی بێ، چونکە خەلافەت ئەو هێزە مادییەی نەبوو ڕێگای دست تێوەردان و بەشداری لە ڕووداوە سیاسیەکان بکات. خەلیفە ئاسایی دانی دەنا بە سوڵتانی سەرکەوتوو و دەوڵەتی سەرکەوتوودا(٨٦).

ـ دامەزراندنی دەسەڵاتی سەلجوقی کاریگەری گەورەی کردە سەر مێژووی ڕۆژهەڵاتی ئیسلامی و ڕۆژئاوای ئاسیا بە شێوەیەکی تایبەتی،مێژووی ئیسلامی بە شێوەیەکی گشتی،چونکی ئەم دەسەڵاتە بەشداری کرد لە ئاراستەی ڕووداوە سیاسیەکان لە ڕۆژهەڵاتی ئیسلامیدا،هەروەها کاریگەری هەبوو لە نەخشە کێشانی فراوانبوونەوەی بەرەی جیهانی نەسرانی بۆ بڵاوکردنەوەی ئاینی ئیسلام.(٨٧)

ـ ئەو سەرکەوتنانەی توغرول بەگ بەدەستی هێنا هانی دا بەرەو عێراق بکشێ، کە ناو جەگەی جیهانی ئیسلامی بوو تاکو دەست بەسەر خەلافەتی ئیسلامیدا بگرێ و دەوڵەتێکی سەلجوقی فراوان دامەزرێنێ، ئەم بۆچوونە ئاسایی بوو،هەرکەسێك پێشی ئەو خوراسانی خستبێتە ژێر دەسەڵاتی خۆیەوە، بیری بۆ ئەوە چووە ڕوو لە ڕۆژئاوا بکات تاکو بەغدا داگیر بکات و خەلافەتی عەباسی لەناو بەرێت.

ـ هەوڵەکانی سامانیەکان و سەفارییەکان و غەزنەویەکان نموونەی دیار و ئاشکران،سەرەڕای ئەوەش ئامانجی توغرول بەگ ڕزگارکردنی خەلافەت و مەزهەبی سوننە بوو تاکو نەکەونە ژێر دەسەڵاتی (بوەیهیە شیعەکانەوە).(٨٨)

**کشانی سەلجوقی بەرەو عێراق:**

سەلجوقیەکان سیاسەتی فراوانکردنی دەسەڵاتی خۆیان لە ئێران بەردەوام پێدا بەمەبەستی لەناوبردنی هێزی بوەیهیەکان تاکو دەسەڵاتیان بە عێراق بگات، ساڵی ٤٣٢کۆچی/١٠٤١زاینی (٨٩) ((ڕەی))یان داگیرکرد و بۆ ساڵی دواتریش چوونە ناو (جرجان و تەبەرستان)ەوە(٩٠) هەروەها ساڵی ٤٤٢کوچی/١٠٥٠زاینی ((ئەسفەهان))یان داگیرکرد توغرول کردیە پایتەختی خۆی (٩١) دوای چوار ساڵ

## مێژووی سەلجوقیەکان

هەرێمی ئازەربایجانی (٩٢) هێنایە ژێردەسەڵاتی خۆیەوە، بەمجۆرە دەوڵەتی سەلجۆقی گەورە لە خوراسان و ئێران دامەزرا،سوپاکەیان ئامادە بوو بچێتە ناو عێراقەوە.بارودۆخی ناوخۆی بەغدا ئەوکاتە ئاڵۆز بوو ئاژاوە و نائارامی تێدابوو ئەمە ڕێگای ئاسان کرد بۆ سەلجوقیەکان تا بچنە ناو بەغداوە و عێراق بدەنە پاڵ دەوڵەتەکەیانەوە.چونکی خێزانی بوەیهیەکان ناکۆکی تێکەوتبوو،لە نێوان میرەکانیاندا ململانێ پەیدا بووبوو سوپاش نارێکی و دووبەرەیکی تیادا بڵاو بووەوە.(٩٣)

لەساڵی ٤٢٤کۆچی/١٠٣٣زاینی، بە ئاشکرا ململانێ و ناکۆکی کەوتە نێوان ((جلال الدولە بوەیهی))و نێوان ((برازاکەیەوە)) ناوی ((ئەبی کالیجار))بوو، بەغدا بووە شوێنی ئاژاوە و ناکۆکی مەزهەب و خێزانی. بەناوی کالیجارەوە خوتبە دەدرا (٩٤) کە ((جلال و لدەولە))لە ساڵی٤٣٥کۆچی/١٠٤٤زاینی کۆچی دوایی کرد،کوڕەکەی نەیتوانی دەسەڵات بەدەستەوە بگرێت،((ئەبو کالیجار))ئەم هەلەی قۆستەوە دەسەڵاتی بەدەستەوە گرت و ساڵی ٤٣٦کۆچی/١٠٤٥زاینی بەغدای کردە شوینی خۆی.(٩٥)

لەئەنجامی ئەم ململانێ و ناکۆکیەی ناو خێزانەکان و بە هۆی شۆڕشی بەردەوامی سەربازەکان،ئەمن و ئاسایشی بەغداتێکچوو،خەلیفەی عەباسی((القائم بامرالله)) هەستی بەم لێکترازان و دۆخە ئاڵۆزە کرد، زانی دەوڵەتی بوەیهی توانای بەڕێوەبردنی کارو باری لە عێراقدا بۆ ناکرێ. کە سەلجوقیەکان لەعێراق نزیك بوونەوە ((ابو الحارسی ارسلان بساسیری)) کە فەرماندەیەکی بوەیهیە تورکە شیعە مەزهەبەکان بوو،بەسەر بەغدا و دەورووبەرەکەیدا دەسەڵاتی هەبوو،بەجۆرێك لەسەر مینبەرەکانی عێراقەوە بەناوی ئەوەوە خوتبە دەدرا (٩٦) خەلیفەی عەباسی و شای بوەیهی نەیاندەتوانی هیچ بڕیارێك بدەن پەیوەندی بە کارو باری دەوڵەتەوە هەبێ بەبێ ڕەزامەندی ئەو،ببوە جێگای مەترسیەکی ڕاستەقینە بۆ خەلافەتی عەباسی و دەوڵەتی بوەیهی،بەتایبەتی دوای ئەوەی خۆی دایە پاڵ فاتمیەکان و پەنای بۆبردن (٩٧) لەم کەشو هەوا نائارامەدا هەر لایەنێك بۆ بەرژەوەندی خۆی دەکۆشا خەلیفەی عەباسیش،بڕوای بە دەور و بەرەکەی

ئەما. وایدەبینی بەرژەوەندی ئەو لەوەدایە بچێتە پاڵ ئەو لایەنەی بەهێزە و سەرکەوتووە بەتایبەتی سوننە مەزهەب بووپەنای بۆ سوڵتانی سەلجوقی برد داوای یارمەتی لێکرد دژی ((بەساسیری)) (٩٨) توغرول ئەمەی بەهەل زانی لەگەڵ سوپاکەی رووی لە بەغدا کرد،ساڵی ٤٤٧کۆچی/١٠٥٥زاینی چووە ناو بەغداوە خەلیفەش دانی بە دەسەڵاتیدا نا و داوای کرد لەمەولا لەخوتبەکان ناوی ئەو بهێنن.(٩٩)

بەمجۆرە سەلجوقی دەسەڵاتی لە عێرق دامەزراند و بوونە هاوسێی بیزەنتیەکان.

ڕزگارکردنی خەلافەتی عەباسی لەلایەن سەلجوقیەکانەوەبەسەرکردایەتی توغرول بەگ و پاراستنی مەزهەبی سوننە لە جیهانی ئیسلامیدا بە چاوێکی ترەوە تەماشان دەکرد،بەمە توانی جۆرە یەکیەتیەك بۆ موسڵمانەکان بەدی بهێنێ کە زۆر پێویستیان بەم لایەنە هەبوو. عێراق و ئێران بوونە یەکەیەکی گەورە کە سوڵتانی سەلجوقی سەرکردایەتی سیاسی دەکرد.(١٠٠)

بە کورتی سەلجوقیەکان دەستیان گرت بە سەر خوراسان و ئێران و کرمان و عێراق دا،بەرەو وڵاتی شام و ئاسیای بچوکیش دەستیان درێژکرد،بەسەر پێنج ماڵی دەسەڵاتداردا دابەش بوون هەر ماڵێك و دەسەڵاتی بەسەر لایەنێکدا هەبوو سەلجوقیەکان فەرمانڕەوایی خوراسان و رەی و چیاکان و عێراق و جزیرەو ئەهوازیان دەکرد،سەلجوقیەکانی کرمان،فەرمانڕەوایی ناوچەی کرمانیان دەکرد،لەعێراقیش سەلجوقیەکان هەبوون،هەروەها سەلجوقیەکانی شام وسەلجوقیەکانی ڕۆم هەبوونکە بابەتی ئەم لێکۆڵینەوەن.

## پەراوێزەکانی بەشی یەکەم

١ـ ئاسیای بچووك:تورکیای ئێستا.

٢ـ ئوغوز، بە زمانی عەرەبی ((الغز)):لە هۆزەکانی تورکن،بەڵام دواتر ئەم ناوە بەم هۆزە گەورەیە وترا کەلە سەدەی شەشەمی زایندا هەموو هۆزەکانی لە ئیمپراتۆریەتێکدا یەکخست،کە لەچینەوە تا دەریای ڕەشی گرتەوە و تاکو سەدەی هەشتەمی زاینی بەردەوام بوو:العرینی، السید الباز:المغول ص٣٠ـ٣١

٣ـ دەریای خەزەر:دەریای قەزوینە،دەریایەکی بەرین و گەورەیە دەریای دیکەی بەدەمەوە نییە، دەریای تەبەرستان و جرجان و ئابسکونە،لەلای ڕۆژهەڵاتەوە چیای موقان و تەبەرستان و چیای جرجانە،تا بەرامبەر دهستان دەڕوا لەوێدا ئابسکون هەیە،دواجار بەرەو ڕۆژهەلات دەکشێ تا ولاتی تورك،لە باکورەوە دەگاتە ولاتی خەزەر گەلێ ڕووباری تێ دەڕژێ،لە ڕۆژئاوایەوە ((لانە))لە چیای قبجاق.. الحموی، شهاب الدین ابوعبدالله یاقوت:معجمم البلدان ج١ص٣٤٢ـ٣٤٣

٤ـ ڕووباری جەیحون:جەیحون ناوی دۆڵی خوراسانە لە ناوەڕاستی شاری جیهان،ئەم ڕووبارەی پیادا دەڕوات کە بەناوی ئەوەوە ناو نراوە،بە گەلێ ولاتدا تێدەپەڕێ و دەڕژێتە گۆلی خوارزەمەوە،لە زستاندا دەیبەستێ: هەمان سەرچاوە:ج٢ص١٩٦ـ١٩٧

٥ـ فامبری،ارمینیوس:تأریخ بخاری ص١٢٧

٦ـ مەبەست ڕووباری جەیحونە

٧ـ ابن فضل الله العمری: مسالك الابصار وممالك الامصارـص٣٩

٨ـ لە نەخشەکانی ئورخون ئاماژەیان بۆ کراوە لەسەدەی هەشتەمی زاینی بەناوی((تغزغن))ەوە یانی دە هۆزەکە ئوغوزیشی پێ دەوترێ،طوقوز،یانی نۆ هۆزەکە:العرینی ص٣١..

٩ـ برایان تومین(ت٥٥٢ز)و ئەستامی (ت٥٧٦ز) لە سەدەی شەشەمی زاینیدا،دوو دەوڵەتی سەربەخۆیان دامەزراند یەکەمیان بەناوی دەوڵەتی تورکی باکور،دووەمیان بە دەوڵەتی تورکی ڕۆژئاوا ناسراوە،ئەم دەوڵەتەی دوایی لە دۆڵی ڕووباری سەیحون لەگەڵ موسڵمانەکاندا بەشەڕ هاتن. دانیشتوانەکەی لە دە هۆز پێکهاتووە، پێنجیان لە باکوری ڕووباری(ئەیلە)دان،پێنجی دیکەیان لە باشوورەوەیە،بەهۆی ئەو شەڕانەوە کە(خان)ەکانی ڕۆژئاوا لە دژی موسڵمانەکان بەرپایان دەکرد بوونە هۆی دابەشکردنی دەوڵەتی تورکی ڕۆژئاوا،دواتریش ئاژاوە و نائارامی بەردەوام بوو تا تورکە قارلوقەکانسالی٧٦٦زجێگەیانی گرتەوە،بڕوانە:بارتولد،فاسیلی فلادیمیروفتشی: تأریخ الترك فی اسیا الصغری ص٣٧.

سعد زغلول عبدالحمید:الترك والمجتمعات الترکیة،مجلة کلیة الاداب.
جامعة الاسکندریة.مجلد١،سنة١٩٥٦م.

١٠- سامانیەکان:بە بنەچە بۆ خێزانێکی دێرینی فارس دەگەڕێنەوە،باپیرەیان سامان خدا لەسەردەمی خەلیفەی ئەمەوی هشام کوڕی عبدولمەلیك،ئیسلام بووە.چووەتە ناو دەعوەی عەباسیەوە لە خوراسان،لەگەڵ (أبو مسلم الخراسانی)دا کاری کردووە، سامانیەکان لە هەرێمی ئەو دیو ڕووبارساڵی٢٦١کۆچی/٨٧٤زاینی، دەوڵەتی سامانیان دامەزراندووە.دەسەڵاتیان گەیشتۆتە ئێران و دەستیان بەسەر خوراساندا گرتووە،(تەبەرستان و ڕەی و سەجستان)یان هێناوەتە پاڵ خۆیان،مەیلیان بە لای جیابوونەوەی فارسیەوە بوو دەستیان کردە زیندوو کردنەوەی زمان و کەلتووری فارسی.خەلیفە مەئمون کوڕەکانی((ئەسەد))ی لە شارەکانی ئەو دیو ڕووبار دامەزراند کە ڕووبەڕووی هێرشەکانی تورکە بتپەرستەکان بوونەوە لە ناوچە سنوورییەکاندا،سامانیەکان ملکەچی فەرمانەکانی خەلیفەی عەباسی بوون،خەلیفەش لە سەقامگیر بوونی دەسەڵاتی خۆیدا لە ڕۆژهەڵات پشتی بەمان دەبەست،کاتێ سامانیەکان لاواز بوون،غەزنەویەکان و خانانی تورك موڵکەکانیان لە نێو خۆیاندا دابەشکرد.

١١- الراوندی،محمد بن علی:راحة الصدور وآیة السرور فی تأریخ الدولة السلجوقیة ص١٤٥

١٢- بارتولد،ص٥٧

١٣- قەرەخانیەکان.یان خانیەکان:فەرمانڕەواکانی ئەودیو ڕووبار،دوای سامانیەکان وڵاتیان کەوتە ژێر دەست،موسڵمان بوون،پەیڕەو کردنی فەرمانەکانی خەلیفەی عەباسیان بە پێویست دەزانی و خۆیان بە دەست و پێوەندی ئەوان دادەنا.

١٤- ڕووباری سەیحون:ڕووبارێکە بە ئەودیو ڕووبار بەناوبانگە نزیکی خەجندە و دوای سەمەرقەندە.لە زستاندا دەیبەستێ،لە سنووری وڵاتی تورکدایە:الحموی ج٣،ص٢٩٤

١٥- بارتولدص٧٧

١٦ـ لە مێژووی ((ابن الآثیر))دا ((تقاق))ە لە ((أخبار الدولة السلجوقیة للحسینی))((یقاق))ی پێ دەڵێن لە هەندێ سەرچاوەدا((دقاق))ە بە((تیمور یلغ))ناسراوە،یانی کەوانی ئاسنین:بڕوانە:الحسینی،صدرالدین علی:أخبار الدولە السلجوقیە. ص١٧.ابن الکثیر:الکامل فی التأریخ، ج٨، ص٢١.المستوفی القزوینی،تأریخ طزیدة، ص ٤٣٤.

خواند/أمیر:حبیب السیر ج٢ص٤٧٩. ابن العبری، أبوالفرج جمال الدین: تأریخ الزمان ص٨٧

١٧ـ دەبێ بە((بیغو)) بخوێنرێتەوە،چونکی لە زمانی مەغولیدا ناوی ((بیهو))نییە،کە دەبێتە بیغو،یان بایو. بە پێچەوانەی ئەمەوە لە زمانی تورکی((بیغو))هەیە،کە باڵندەیەکە وەکو شاهین.الحسینی: ص١.بارتولد:ترکستان من الفتح العربی الی الغزو المغولی، هامش ص ٤٠٨.

١٨ـ ترکستان:ناوی وڵاتی هەمو تورکانە.

١٩ـ خواند،أمیر:ج٢،ص٤٧٩

٢٠ـ هەمان سەرچاوە:ص٤٧٩ـ٤٨٠، الحسینی:ص١ـ٢.

٢١ـ الحسینی: هەمان سەرچاوە:ص١

٢٢ـ جەند:ناوی شارێکی گەورەیە،لە تورکستان،لەنێوان ئەم شارە و خوارزەمدا دە ڕۆژە ڕێیە،لە سەیحونەوە نزیکە:الحموی ج٢ص١٦٨

٢٣ـ سوباشی یانی فەرماندەی سوپا،بڕوانە:الحسینی ص٢.

خواند، أمیر:ج٢،ص٤٧٩

٢٤ـ هەمان سەرچاوە.

٢٥ـ بارتولد:تأریخ الترك فی أسیا الوسطی:ص١٠٨.

٢٦ـ خواند،أمیر:ج٢،ص٤٨٠.

٢٧ـ ناوی باوکەکانی سەلجوقیەکان لە کتێبی پیرۆزدا ناویان هاتووە،سەلجوق ئاینی یەهودی و نەسرانی کاری لێکردووە،واباوە هۆزە شوانکارەکان،لەوانە تورکەکان لە ناوچەی باکوری دەریای قەزوین دەگەڕان،تا دەگاتە کۆماری خەزەری یەهودی و پەیوەندی بازرگانیان لە نێواندا هەبووە..سەلجوقیەکان دوای

لە ناوبردنی ئەم کۆمارە لەسەر دەستی ڕوسەکان و لەسەدەی نۆهەمی زاییندا لەسەر شانۆی ڕووداوەکان دەرکەوتن بۆیە ئەگەری ئەوە هەیەهەندێ لە تورکەکانی غوز،لەوانە سەلجوقیەکان هەر زوو چووبوونە ناو دینی یەهودیەوە،دواجار بوون بە ئیسلام،کاتێ بۆ ناوچە ئیسلامیەکان کۆچیان کرد و پەیوەندیان بە موسڵمانەکانەوە کرد:بڕوانە خواند،أمیر،ج٢،ص٤٨٠..-pre Ottoman Turkey P20

٢٨- البیهقی،أبو الفضل:تأریخ البیهقی،ص٧٤٩

٢٩- بخارا:شارێکی گەورەی ئەودیو ڕووبارە،لەنێوان ئەم و جەیحون دا دوو ڕۆژە، بنکەی شای سامانیەکان بوو، دێیەکی بخارایة:الحموی:ج١،ص٣٥٣،ج٥،ص٣١٠.

٣٠- المستوفی القزوینی:ص٤٣٤.

٣١- الحسینی:ص٢.الراوندی:ص١٤٥ سەمەرقەند:شارێکی ناسراوە،شارۆچکەی ((صغد))ە،لە باشووری دۆڵی (صغد) دروستکراوە.الحموی:ج٣،ص٢٤٦-٢٤٧.

٣٢- بارتولد:ترکستان..ص٤٠٨-٤٠٩.

٣٣- غەزنەویەکان(٣٦٦-٥٨٢کۆچی/٩٧٦-١١٨٦زاینی) خێزانێکی تورکە،لە ڕۆژهەلات دەولەتێکی ئیسلامیان دامەزراند و (غەزنە)یان کردە پایتەختی.((سبەکتەکین)) بە دامەزرێنەری ڕاستەقینەی ئەم دەولەتە دەژمێردرێ. دەستیان بەسەر خوراسان،سەجستان،بست،هەرات داگرت،لە میرە بەناو بانگەکانی،مەحمودی غەزنەوی کە هیند و پەنجابی داگیرکرد. وڵاتی ئەودیو ڕووباری خستە ژێر دەسەڵاتەوە،هەروەها(ئەسفەهان)ی گرت و لە هیند ئاینی ئیسلامی بڵاو کردەوە،دەرکەوتنی ئەم دەولەتە بەیەکەم سەرکەوتنی تورکی دەژمێردرێ، ئەم دەولەتە غورییەکان لەناویان برد.

٣٤- الراوندی:ص١٤٨،ابن الکثیر:ج٨،ص٢٢.

٣٥- ابن الأثیر:هەمان سەرچاوە.

٣٦- تأریخ البیهقی:ص٧٩،ئەم مێژوو نووسە دەڵێ،ئەو دووکەسە لە دەروازەی سەمەرقەند یەکیان بینی..

٣٧- تأریخ البیهیقی:ص٢١١.

٣٨ـ الراوندي:ص١٤٧ـ١٤٨.

٣٩ـخوراسان: وڵاتێکی پان و بەرینە،سنوورێکی لە عێراقەوە دەست پێدەکات،لە جوین و بەیهەق و دوا سنووری دەگاتە هند و طخارستان و غەزنە و سەجستان و کرمان،ئەمانە دەوروبەری سنوورەکەین،کە گەلێ شوێنی تێدایە وەك نیسابور،هەرات،مەرو،بەلخ،تاڵەقان،باورد،سەرخس..لەو نێوانەش چەندین شار هەیە

الحموي:ج٢،ص٣٥٠.

٤٠ـ الراوندي:ص١٤٩.

٤١ـ ابن الأثير:ج٨ص٢٢.المستوفي القزويني: ص٤٣٥ خواند،أمير:ج٢ص٤٨٢.

٤٢ـ نسا: شارێکە لە خوراسان، لە نێوان ئەم و سەرخسی دا دوو ڕۆژە ڕێی،لەگەڵ((مەرو))دا پێنج ڕۆژ نێوانیانە: الحموي:ج٥،ص٢٨٢.

٤٣ـ باوەرد،ئەبی وەردە،شارێکە لە خوراسان لە نێوان(سەرخس و نسا)دایە،هەمان سەرچاوە:ج١،ص٣٣٣.

٤٤ـ الراوندي:ص١٥٣.

٤٥ـ تووس:شارێکە لە خوراسان دە فەرسەخ لە نیاپورەوە دوورە،مەشهەدی ئێستایە:الحموي:ج٤،ص٤٩.

٤٦ـ المستوفي القزويني:ص٤٣٥.

٤٧ـ الراوندي:ص١٥٤.

٤٨ـ المستوي القزويني:ص٤٣٥.

٤٩ـ الحسيني:ص٣

٥٠ـ دندانقان:شارێکە لە نێوان(سەرخس و مەرو)دا الحموي:ج٢ص٤٧٧

٥١ـ غەزنە:شارێکی گەورە و بەرینە،دەکەوێتە لای خوراسانەوە،لە نێوان هیند و خوراساندایە،هەمان سەرچاوەج٤،ص٢٠١

٥٢ـ بست:شارێکە لە نێوان سەجستان و غەزنە،ڕووباری زۆرە،باخ و دار و باری زۆرە:الحموي: ج١/ص٤١٤ـ٤١٥.

٥٣ـ ڕەبات فراوە:سەر بەشاریی ((نسا))یە، لەنێوان خوارزەم و دەهستان،هەمان سەرچاوەج٤ص٢٤٥.

٥٤ـ بلخان:شارێکە دەکەوێتە پشتی(باورد)ەوە،هەمان سەرچاوەج١،ص٤٧٩.

٥٥ـ الکردیزی:زین الاخبار،ص٧٠ـ٧١،دهستان شارێکە بەناوبانگە دەکەوێتە تەرەفی مازندەرانەوە نزیکی خوارزەم و جورجان،عبدوڵلای کوری تاهیر لەسەر دەمی خەلافەتی مەهدی دروستی کردووە،الحموی:هەمان سەرچاوەج١،٤٩٢.

٥٦ـ توغرول بەگ و جفری،دوو وشەی تورکین،یەکەمیان کورتکراوە (دوغراول)ە یانی قەساو، لە کرداری((دوغراماق))ەوە هاتووە،دووەم ماقای پرشنگدارەلە چاوگی((چاقماق))ەوە وەرگیراوە..بڕوانە: الراوندی،الهامش ص١٢٩.

٥٧ـ کاشغەر،شار و دێهات لە ناوەڕاستی وڵاتی تورك الحموی:ج٤،ص٤٣٠.

٥٨ـ فامیری:ص١٢٩.

٥٩ـ مەرو:شارێکی گەورەیە،لەشارە بەناوبانگەکانی خوراسانە،حەفتا فەرسەخ لە نیسابوورەوە دوورە:الحموی:ج٥،ص١١٢ـ١١٣.

٦٠ـ فامیری:ص١٣٣.

٦١ـ خوارزەم:جێگایەکی بەربڵاوە لە ڕۆژهەڵات،پایتەختەکەی جرجانیە،خەڵکەکەی پێی دەڵێن کرکانج،دانیشتوانەکەی لە بنەچەدا تورکن،شوێنێکی بەپیتە،ڕووباری جەیحون لەوێوە تێدەپەڕێ و دەڕژێتە دەریاچەیەکەوە بەوناوەوە، الحموی:ج٢، ص٢٩٥ـ٢٩٨.

٦٢ـ بارتولد:ترکستان،ص٤٤٢.

٦٣ـ نیساپور:شارێکی گەورەی خوراسانە چل فەرسەخ لەسەرخسەوە دوورە، الحموی: ج٥،ص٣٣١ـ٣٣٣.

٦٤ـ جرجان:شارێکی گەورەیە لە نێوان تەبەرستان و خوراساندایە هەمان سەرچاوە:ج٢،ص١١٩.

٦٥ـ بڕوانە دەقی نامەکەو وەڵامەکەی لە:تأریخ البیهقی:ص٥٠٢ـ٥٠٧.

٦٦ـ هەمان سەرچاوە:ص٥١٧ـ٥٢١،الراوەندی:١٥٥ـ١٥٦.

٦٧ـ حسنین،عبدالنعیم محمد:ایران و العراق فی العصر السلجوقی ص٣٤.

٦٨- سەرخس:شارێکی کۆنە،سەر بەخوراسانە لە ناوەڕاستی ڕێگای نیساپور و مەرو دایە الحموی:ج٢،ص٢٠٨.
٦٩- بەڵخ:شارێکی بەناوبانگە لە خوراسان،هەمان سەرچاوەج١،ص٤٧٩.
٧٠- گواستنەوەی بەڵخ بەیەکجاری بۆ سەلجوقیەکان،لەوێوە پەیوەندی لە نێوان غەزنەویەکان و هەرێمی ئەودیو ڕووبار پچڕا ساڵی ٤٥١کۆچی/١٠٥٩زاینی بە پێی ڕێکەوتنێك لە نێوان داود و سوڵتان غەزنەوی ئیبراهیم ڕوویدا:بروانە((ابن الاثیر))ج٨،ص٢٥-٢٦...بارتولدص٤٥٠.
٧١- المستوفی القزوینی:ص٤٣٦.
٧٢- تأریخ البیهقی:ص٦٦٣وە دواتریش.
٧٣- هەمان سەرچاوە:ص٦٦٢-٦٩٧، بە درێژی باسی شەڕەکە دەکات.
٧٤- هەمان سەرچاوە.
٧٥- زکار،سهیل:مدخل الی تأریخ الحروب الصلبیة ص٥٩.
٧٦- تأریخ البیهقی:ص٧٢٧-٧٢٨ لە ئەنجامی پێداگرتنی مەسعود بۆ هند کۆچ بکات،پیاوەکانی ڕێگایان پێ بڕی و لە تەخت دایانگرت، محەمەدی برایان لە جێگاکەی دانا،مەسعود لە قەڵایەکی گەورە بە بەندی مایەوە،تا برازاکەی میر ئەحمەد لە ساڵی ٤٣٣ کۆچیدا کوشتی..
٧٧- هەرات:شارێکی گەورەیە، لە شارە گەورەکانی خوراسانە، ئاو و باخ و باخچەیەکی زۆری لێیە، الحموی: ج٥،ص٣٩٦.
٧٨- سەجستان:ویلایەتێکی بەربڵاوە، دە ڕۆژ ڕێ لە هەراتەوە دوورە،خاکەکەی لماویە هەمان سەرچاوەج٣ص١٩٠.
٧٩- تەبەس:شارۆچکەیەکە،لە نێوان ئەسفەهان و نیساپوردایە، هەمان سەرچاوە ج٤، ص٢٠
٨٠- کرمان : ویلاتێکی بەناوبانگە کە شارودێهاتی زۆری لێیە دەکەوێتە نێوان مەکران و سەجستان و خوراسان هەمان سەرچاوە:ص٤٥٤.
٨١- هەمەدان:گەورەترین شارە لە چیا،زستانی زۆر ساردە،دەکەوێتە چیاکانی ڕۆژهەڵاتی عێراقی عەجەم، هەمان سەرچاوە:ج٥،ص١٠٤-٤١٧.

٨٢ـ ئەبهەر:شارێکی بەناوبانگە لە نێوان قەزوین و زنجان و هەمەدان،هەمان سەرچاوە:ج١،ص٨٢.

٨٣ـ زنجان:شارێکی گەورە و بەناوبانگە دەکەوێتە چیاکانەوە لە نێوانی ئازەربایجان و ئەو شارەدا ئەبهەر و قەزوین هەیە هەمان سەرچاوە:ج٣،ص١٥٢.

٨٤ـ ئازەربایجان:هەرێمێکی بەربڵاوە بەناوبانگە،لە باکوورەوە وڵاتی دەیلەم و جیلــو ویە،لــە ڕۆژهەڵاتەوە،بردعــە، لــە ڕۆژئــاواوە ئەرزنجانــە لەشــارە بەناوبانگەکانی:تەبریزە، قەڵای زۆری تێدایە، میوەی زۆرە، ئاوی زۆرە،هەمان سەرچاوە: ج١،ص١٢٩ـ٢١٨.

٨٥ـ دامغان:شارێکی گەورەیە لە نێوان رەی و نیساپوردایە هەمان سەرچاوە: ج٢،ص٤٣٣.

٨٦ـ حسنين:ص٣٦.

٨٧ـ Camb.History of iran.vol v:p23.

٨٨ـ بوەیهیەکان کە بنەچەیان بۆ دەیلەمی دەگەڕێنەوە ئیمارەتێکی شیعەیان لە فارس و عێراق و ئەهواز و کرمان و رەی و هەمەدان و ئەسفەهان دامەزراند،بە تەواوەتی بەسەر کارو باری خەلافەتی عەباسیدا زاڵبوون و دەستیان دەرۆیشت.دەسەڵاتیان پەرەیسەند،تا بەناوی خۆیانەوە چاخێك لە چاخەکانی خەلافەتی عەباسی بەناوی ئەوانەوە ناونرا(٣٢٤ـ٤٤٧کۆچی/٩٤٦ـ١٠٥٥زاینی).

٨٩ـ الحسيني:ص١٠.

٩٠ـ تەبەرستان:چەندین شاری گەورە بەو ناوەوە دەناسرێ شاخاویە،لە شارەکانی جرجان،ئەستراباد،دەهستان و ئامل..تەبەرستان لە مازندەرانە،نزیکی جەیلان و دیلمانە،لە نێوان رەی و قومس و دەریاو وڵاتی دەیلەم و چیا دایە،ئاوی زۆرە،دار و باری زۆرە،میوەی زۆرە الحموي:ج٤،ص١٣.

٩١ـ ئەسفەهان یان ئەسبەهان:شارێکی گەورەیە،هەمان سەرچاوە،ج١،ص٢٠٦.

٩٢ـ ابن الاثير:ج٨،ص٥٤،٣٠.

٩٣ـ ابن العبري:ص٩٠.

٩٤ـ سرور/محمد جمال الدين: سياسية الفاطميين الخارجية،ص١٧٩.

٩٥ـ ابن الاثیر:ج٨،ص٥.

٩٦ـ هەمان سەرچاوە:ص٣٧ـ٤٠.

٩٧ـ ئەهواز:لە نێوان (بەسرە و فارس)دایە،الحموی:ج١،ص٢٨٤ـ٢٨٦.

٩٨ ابن الاثیر:ج٨ص٨٣،فاتمیەکان شیعەی ئیسماعیلین،دەچنەسەر عەلی کوڕی ئەبی تالب و فاتمەی کچی پێغەمبەر (ص) ئەم جوڵانەوەیە لە کۆتایی سەردەمی خەلافەتی ئەمەوی سەریهەڵدا،کاتێ ژمارەیەکی زۆر لە زەیدیەکان چوونە پاڵ هەوادارانی جەعفەری صادق،دوای مردنی شیعەکان بوونە دوو پارچەوە بە هۆی جیاوازی بیر و بۆچوونیان سەبارەت بە چۆنیەتی دیاریکردنی مافی ویراسی بۆ هەڵبژاردنی ئیمام،ناویان لێ نرا،((دوانزە ئیمام)) کە مووسای کازمیان بە ڕەوا دەزانی کە ئیمامی حەوتەمە،ئەمانە مووسەویان پێ دەڵێن،ئیسماعیلیەکان لەو بڕوایەدا بوون ئیسماعیل کوڕی جەعفەری صادق کە کوڕە گەورەی باوکی بوو،مافی ئیمامی هەیە،هێشتا باوکی مابوو کۆچی دوایی کرد،هەوادارانی کوڕەکەیان ((محمد المستور))یان بە ئیمام ڕەوا دەبینی لەلای ئەوان ئیمامی حەوتەمە،لەو بڕوایەدا بوون ئیمامەتی لە براوە نادرێ بە برا دوای ئەوەی لە حەسەنی کوڕی عەلی یەوە درایە حسینی برای،دواجار ناو ئەو تاخمە بە (السبجبته) ناونران یان(ئیسماعیلی)یان (فاطمی)یان پێ دەگوتن،بۆ ئەوەی دوانزە ئیمامەکەیان جیابکەنەوە،فاتمیەکان دەوڵەتێکی بەربڵاویان دروست کرد،لە مەغریبەوە دەستیان پێ کرد کەساڵی ٢٩٧کۆچی٩١٠زایینی دەستیان بەسەر داگرت(عبیدالله المهدی)یان بۆ مەغرب بانگهێشت کرد.نازناوی (مهدی أمیر المؤمنین)یان پێ بەخشی فاتمیەکان بەرە و ڕۆژ هەلات کشان،ساڵی٣٥٨کۆچی/٩٦٩زایینی میسریان داگیرکرد چاویان لە شام بڕیبوو بیخەنە ژێر دەسەڵاتی خۆیانەوە تا لەوێوە بەرە و عێراق بڕۆن و خەلافەتی عەباسی لەناو بەرن کە سوننی بوون،بەڵام سوننەکان دانیان بە نەسەبی فاتمیەکاندا نەنا و بە (عبیدیین)ناویان دەبردن،٩٩الحسینی:ص١٨

٩٩—الحسینی : ص١٨

١٠٠—ابن الاثیر : ج٨، ص٧١

# بـــەشی دووەم

# پەیوەندیە بەرایی مکانی سەلجوقی و بیزەنتی

## ســەرەتا

دەمێــك بــوو دەوڵــەتی بیزەنتــی یارمــەتی تورکــەکانی دەدا، هــەر لەســەردەمی شەشــەمی زاینــەوە پرۆژەیــەکی هاوپــەیمانی لــە نێــوان تــورك و بیزەنتنیەکانــدا هەبوو،تورکەکان وەکو کرێگرتە(مرتزقة) لەناو سوپای بیزەنتیدا خزمەتیان دەکـرد ژمارەیەکی زۆریشیان لە ڕیزەکانی سـوپای ئیسلامیدا بـوون کـە لەسـەر سـنووری ڕۆژهەڵاتی ئیمپڕاتۆریەتی بیزەنتیدا مۆڵیان خواردبوو،بـەڵام ڕەگـەزی تـورکی هـیچ ئەنجام و کاریگەریەکی لە ئیمپڕاتۆریەتەکە نەکرد تـاکو سـەلجوقیەکان لەسـەدەی پێنجەمی کۆچیدا/یانزەهەمی زاینی لە سنوورەکانی ڕۆژهەڵاتدا دەرکەوتن،ئەوکاتـە هەڵوێـستی سیاسـی و سـەربازی گۆڕا،بیزەنتـە لەسـەدەی پێـشوودا دەوڵـەتێکی ئیسلامی بێهێزی لەسـەر سـنوورەکانیدا دەبینی،لـە ڕووی مەزهـەبی و سیاسـیەوە یەکپارچــە نەبوون،لــەپڕ دەســەڵاتێکی یــەکگرتووی بــە هێــزی بینی،یارمــەتی ئیسلامیەکانیدا لەسەر حیسابی ئـەو دەسـت بـە بـڵاو بوونـەوە بکەن،ئەمـەش لـەو کاتانـەدا بـوو ئیمپڕاتۆریـەتی بیزەنتـە تووشـی جـۆرە لاوازی و بـێ هێزیـەك بـوو بوون،بــە تایبــەتی دوای لــە ناوچــوونی خێزانــی مەقــدۆنی لــە ســاڵی٤٤٩ کۆچی/١٠٥٧زاینیدا، ململانێی چینی سەربازی و مەدەنیشی بە دواداهات.(١)

هۆکارەکــانی فراوانبــوون و بــڵاو بوونــەوەی ئیــسلامی ئــەمجارەیان ســێ هــۆ بوون:﴿ئاینی،ئابووری،سیاسی﴾

## مێژووی سەلجوقیەکان

هۆکارە ئاینیەکە،ئەوا سەلجوقیەکان ئامانجێکیان لە پێش چاو دانابوو هەوڵی بە دیهێنانیان دەدا،ئەویش بڵاو بوونەوەی ئاینی ئیسلام لە نێوان نەسرانیە دراوسێکانیاندا.یانی،ئەرمەنەکان و بیزەنتیەکان ئەمە وای کردشەڕەکانیان شێوەی ((جیهاد))وەربگرێت،هەروەها سۆز و پاڵپشتی هەموو موسڵمانانیش وەدەست دێنن.نزیکبوونیان لە سنووری((کورج))و(٢) وڵاتی ئەرمینیا و(٣) بیزەنتیە،ماوە و فرسەتی بۆ ڕەخساندن بەردەوام بن لە جوڵانەوەی جیهادی پیرۆز کە پێشتر لە ڕۆژهەڵات پێی هەڵسابوون.توغرول بەگ پەرۆشی ئەوە بوو تورکە دەست و پەیوەندەکانی لە ژێر فەرماندەیدا بن و لە لەشکرکێشیەکاندا بەکاریان بێنێ و لە (جیهاد)ی کافرەکاندا سودیان لێ وەربگرێت.(٤)

بۆ مەسەلەی ئابووری،هاتنی تورك لە وڵاتی ئەودیو ڕووبارەوە بە لێشاو و بە شێوزەیەکی بەردەوام دوای دامەزراندنی دەوڵەتی سەلجوقی لە ئێران و عێراق،زەویو زارەکان بەشی نەدەکرد بۆیە لە دووی لەوەڕگای نوێ و بە پیت دەگەڕان، ئەوەیان لە خاکی دەوڵەتی بیزەنتیدا دەبینی،ئەوەی ((إبن الاثير)) دەیگێڕێتەوە ئەمەمان بۆ دەسەلمێنێ لەبارەی هۆی داگیرکردنی خاکی بیزەنتە لە لایەن((ابراهيم ينال)) برای سوڵتان توغرول بەگەوە:((خەڵکێکی زۆری (غوز) لەودیو ڕووبارەوە هاتنە لای پێی وتن وڵاتەکەم جیسنگای ئێوەی تێدا نابێتەوە،من ڕام وایە بڕۆن ڕۆم داگیر بکەن و جیهاد بکەن و چیتان دەستکەوت بۆ خۆتانی بهێنن)) (٥)

لەبارەی هۆی سیاسیەوە،ئەوا وڵاتی ئەرمینیەکان گرنگیەکی سیاسی و سەربازی خۆی هەیە لەبارەی پێوەندی موسڵمانەکانەوە بە بیزەنتیەوە،دەوڵەتە ئیسلامیەکان هەر لەسەدەکانی ڕابردووە نەیدەویست لە دەستی دەرچێ،تا خێزانی مەقدۆنیەکان لە سەردەمی ئیمپراتورباسیلی یەکەم لەساڵی٢٥٣ـ٢٧٣کۆچی/٨٦٧ـ٨٨٦زاینی (٦) لە دەستیانی دەرکرد،ئەرمینیا لە سەردەمی شاکەیدا ((ئاشوت یەکەم)) کە لە خێزانی ((بغراطی))بوو،جۆرە هاوپەیمانی و پەیوەندی دۆستانەی لەگەڵ بیزەنتەدا بەست.بووە دەوڵەتێك وەك پەرژینێك دژی موسڵمانەکان لە ڕۆژهەڵاتدا.(٧)

## مێژووی سەلجوقیەکان

بەڵام ئەم لایەنگری کردنەی بیزەنتە پتە و نەبوو،چونکی ئەرمەنیەکان لەناو خۆیاندا رێك نەبوون،بەمجۆرە هەر ماوەیەك بەدەستی لایەکەوە بوو،تا لە کۆتاییدا لە سەردەمی باسیلی دووەم لە ساڵی٣٦٥-٤١٦کۆچی/٩٧٦-١٠٢٥زاینی بە یەکجاری کەوتە ژێر دەسەڵاتی بیزەنتیەکانەوە..

ئەوەبوو ((حنا سمباد))لە ساڵی ٤١٢کۆچی/١٠٢١زاینی هەرچی موڵکی هەبوو دەستی لێ هەڵگرت و پێشکەشی ئیمپراتۆری بیزەنتی کرد،بەمەرجێ تاماوە بە دەستیەوە بمێنێ.(٨)

چونکی وڵاتەکەی لەلایەن سەلجوقیەکان و ئەنجازیەکانەوە هێرشیان بۆ دەبرد(٩) سەرەڕای ئەوەش((ئاشوت))ی برای هەڕەشەی لێدەکرد و گەلێ شەڕی ناوخۆش سەری هەڵدا((سەنحاریب))شای((فاسبورەکان))یش(١٠) هەمان هەڵوێستی لەبەرنا،چونکی بۆی دەرکەوت ناتوانێ بەرەنگاری سەلجوقیەکان بکات،لە جیاتی ئەو وازلێهێنانەی داوای ((سیواس))ی (١١) کرد.

توغرول بەگ داگیرکردنی ئەرمینیای بە گرنگ زانی بۆ ئەوەی چونکی شکاندی ئەو بەربەستە لەبەردەم موسڵمانەکاندا،رێگا خۆش دەکات بۆ چوونە ناو خاکی بیزەنتەوە،تا بەردەوامی بە (جیهاد)بدات و ئارەزووی دەست و پەیوەندەکانی بەجێ بهێنێ.

بەمجۆرەدەرك بەوە دەکەین لەبەرچی دەست بە فراوانکردنەوە کرا،سەلجوقیەکان ڕوویان کردە باکوری ڕۆژئاوا هێرشیان بۆسەر کورج و ئەرمەن و بیزەنتیەکان برد، کە ڕێگا ئاساییەکەی داگیرکردنیان گرتبوو،(١٢)

ئەو لەشکرکێشانەی لەسەرەتادا سەلجوقیەکان ئەنجامیان دەدا کوتو پڕ نەبوون، چونکی دەوڵەتی بیزەنتی پێشتر ڕووبەڕووی هێرشکردن ببونەوەبەڵکو هەر لەسەدەی پێنجەمی کۆچیەوە/یانزەهەمی زاینی ناو بە ناو هێرشیان دەکرایە سەر لەلایەن هەندێ لەسەر کێشە تورکەکانەوەبەڵام ئەو هێرشانە بۆ ئیمپراتۆریەتی بیزەنتیە جێگای مەترسی نەبوون،زۆرتر مەبەست تاڵان کردن و سووسە کردنی ناوچەکە بوو،بیزەنتیە ڕووبەڕووی هێرشی مەترسیدار نەبووەوە لەلایان سەلجوقیەکانەوە تا سەردەمی ئیمپراتۆرقوستەنتینەی نۆیەم مونوماکوسی

ساڵی٤٣٣ـ٤٤٧کۆچی/١٠٤٢ـ١٠٥٥زاینی ئەم کاتە هەڕەشەی ڕاستەقینە دەستی پێکرد، بە داگیرکردنی بەشی هەرە زۆری ئاسیای بچووك لەلایان سەلجوقیەکانەوە کۆتایی پیَ هات.

## هێرشە بەراییەکان بۆ سەر ئەرمینیا

ئیمپڕاتۆڕ قوستەنتینی نۆیەم هەڵەیەکی گەورەی کرد کاتیَ لە ناوچە سنووریەکانی ڕۆژهەڵاتی ئاسیای بچووك خزمەتی سەربازی لابرد و لە جیاتی ئەوە باجی ساڵانەی وەرگرت،ژمارەی سەرباز لە سنوور کەم بووەوە ناچار بوو بۆ چارەی کێشەی سەلجوقیکان ڕێو شوێنیَ لەبەر بگریَ کە پێشتر بۆ لادانی مەترسی فاتیمیەکان پەیڕەویان کردبوو ئەویش خۆ لادان لە ڕووبەڕووبوونەوەی داگیرکەرەکان.(١٣)

سەلجوقیەکان لە سەردەمی ئەو ئیمپڕاتۆڕەدا دوو هێرشی گەورەیان کردە سەر بیزەنتیەکان،هێرشی یەکەم بە فەرماندەیی((ابراهیم ینال))بوو لە ساڵی ٤٤٠کۆچی/١٠٤٨زاینی،هێرشی دووەم توغرول بەگ خۆی فەرماندەی سوپاکە بوو،لە ساڵی٤٤٦کۆچی١٠٥٤زاینی..لە ئەنجامی ئەو دوو هێرشەدا،هەلیان بۆ ڕەخسا،هەندیَ هەنگاو بۆ پاشەڕۆژ بنێن بەمەبەستی نیشتەجیَ بوون.

((ابراهیم ینالَ))هێرشی کردە سەر ئەنجاز و ئەرمینیا گەیشتە ((مانزیکرت)) (١٤) لە ویَشەوە بەردەوام بوو بۆ ((ئەرزەن)(١٥)((قالیقلا)) (١٦) تا گەیشتە((ترابزون)) (١٧)کە دەکەوێتە سەر کەناری دەریای ڕەش،(١٨) لەو هێرشەدا گەلیَ قەڵاو گوند و مەزاری تێکدا،تالانیەکی زۆری کرد بەڵام کارەساتی گەورە لە ((ئەرزەن))ڕوویدا کە شارێکە بە دەوڵەمەندی بەناوبانگە.ئیبراهیم ویستی ئەو شارە بگرێت،بەڵام شەڕێکی سەختیان تووش بوو،ئەویش ئاگری لە شارەکە بەرداشارەکەی سوتاند،ژمارەیەکی زۆر لە دانیشتوانەکەی لەناو چوون و ئەوەیان مایەوە بە دیل گیران و لە بازاڕی کۆیلەکاندا فرۆشتنی،سوتاندنی شارەکە و وێران کردنی کارەساتێکی گەورە بوو بۆ ئەرمینیا،بە سەرەتای ڕووخانی ئەرمینیا دەژمێردریَ.(١٩)

بیزەنتیـەکان لەسـەرەتادا دوودڵ بـوون چ کـار رابیـەك بکـەن بـەلآم کـە مـیری ئەنجازیان هاتە پاڵ (لیباریتس) کە سەر بە ئیمپڕاتۆری بیزەنتی بوو کەوتنە شـەڕ کردن لەگـەڵ ((ئیـبراهیم)) دا شـەڕ بـە گـەرمی دەسـتی پێکرد،موسـڵمانەکان لـەو شەڕەدا سـەرکەوتن،((لیبـاریتس)) لەگـەڵ کۆمـەڵێك لـە ((بەتاریقـەکان)) بـە دیـل گیران و ((موسڵمانەکان مەڕو ماڵات و ئاژەڵێکی بێ ژماریان دەستکەوت و تالآنیـان کـرد(٢٠)) وا دەردەکـەوێت تـوغرول نەیدەویـست دەرگـای دوژمنایـەتی لەگـەڵ قوسـتەنتینیە دا بکاتـەوە فـەرمانی دا،فەرمانـدە بیزەنتیەکـە بەڕەڵلآبکـەن، دوای وتوویـژ لەگـەڵ ئیمپڕاتـۆری بیزەنتیـدا تـا ئاگربەسـت لـە نێوانیانـدا ببەسـتن،(٢١) ئیمپڕاتۆریش لە پاداشتی ئەمە،فەرمانیدا مزگەوتی قوستەنتینیە چاك بکەنـەوە و لەوێدا دوعا بۆ توغرول بکەن،بەلآم هێرشی سەلجوقیەکان بۆ سـەرخاکی بیزەنتیـە رانـەگیرا. سەرکێـشەکانیان بـەردەوام بـوو لـە هەڵگیرسـاندنی ئـاگری شـەڕ،لە ساڵی٤٤٠کۆچی/١٠٥٢زاینی چوونە ناو هەرێمی (قارس)ەوە.(٢٢)

توغرول بەگ بە فەرماندەی خۆی لەشکرکێشیەکی دیکەی ئەنجام دا بۆ ناو خـاکی بیزەنتە کـە بیـستی ئیمپڕاتـۆر قوسـتەنتین مردووە،خـاکی ئـەرمینیای داگیرکـردو گەیشتە ((ئەرزەن)) (٢٣) سوپاکەی ئەو ناوچانەی کەوتبوونـە نێـوان ئـەم شـارەو (کۆڵی وانە)ەوە تالآنی کرد لـەو شـارانەی تـالآنی کـرد شـاری((بـارکیری))بـوو کـە دەکەوێتە ڕێگای نێوان ((ئەرجیش و خووی)) لە ئازەربایجـان (٢٤) ئـەمجا بـەرەو ((باسین)) ڕۆیشت کە سەر بە((ئەرزەن))ە ((مانزیکرت))ی ئابلۆقەدا ((باسیلۆس)) کە کار بەدەستی شارەکە بوو بەرەنگاری کرد و توانی هێزەکانی سەلجوقی ڕاگرێ و نەهێڵێ بچنە پێشەوە ناچار توغرول بەگ گەڕایەوە ئازەربایجان، لەڕێگا هەرچـی تووشی بهاتبایە لـە دێ و مـەزرا وێرانـی دەکـرد لـە ناوچەکەشدا کۆمـەڵێ کەسـی هێشتەوە، بۆ تالآن و هێرش بردن.(٢٥)

لەراسـتیدا سـەلجوقیەکان دەیانویـست لـە ئـەرمینیا بمێننەوە،بیزەنتیـەکان بنکەیەکیان بەدەستەوە نەما، لەوێوە هێـرش بـەرن ئـەو هێرشـانەی لـەو کاتانـەدا ئەنجام دەدران سەرەتای زنجیرەیەك هێرش بوون کە تـا دەهـات پەرەیدەسـەند و زیادی دەکرد و توند و تیژ تر دەبوون.

## مێژووی سەلجوقیەکان

له سـەرەتای سـاڵی ٤٤٩کۆچـی/١٠٥٧زاینیـەوە هەڵویستی گۆڕاو لەبەرژەوەنـدی سەلجوقیەکاندا بوو،بڕیاردرا هێزەکانی بیزەنتیه له ناوچەکانی ئەرمینیا بکشێنەوە بۆ یارمەتیدانی ((اسحاق کومنین))کـه دژی ((میخـائیلی شەشـەم))شۆڕشـی بـەرپا کردبـوو(٢٦).بنکـه سـنووریەکان چـۆڵ بـوون بـەرەنگار بوونـەوەی جـدی لێـوە نەدەکرا،ئەمـە تـەماحی خـسته بـەر سـەلجوقیەکان((کبادوکیـه))یـان داگیرکـرد و هێرشـیان بـۆ ((ملطیـة)) (٢٧)کـرد چـوونە سـەر ئـەو هەرێمانـەی دەکەونـە ئـەو جێگایەیی هەردوو بەشی فورات یەکدەگرن.((قوتولمش کوڕی ئیسرائیل)) گەیشتە قوڵایی ئاسیای بچووك ((قونیـه))ی گـرت (٢٨) لەگـەڵ((ئـاق سـەرا))و(٢٩) دەورو بەرەکانیانـدا (٣٠) سـەلجوقیەکان هێرشـەکانیان بـۆ سـەر مووڵکـەکانی بیزەنتـە لەسـەر دەمـی ئیمپڕاتـۆری بیزەنتـی قوسـتەتینی دەیـەم دوکـاس ((٤٥١ـ٤٥٩کۆچـی/١٠٥٩ ـ١٠٦٧زاینـی)) دەست پێکـردەوە لـه سـاڵی یەکـەمی فەرمانڕەواییـدا چـوونە نـاو قـوڵایی خـاکی بیزەنتـەوە گەیـشتنە سـیواس،ئەوانەی بـەرەنگاریان کـردن کوشـتیانن و بـه تاڵانیـەکی زۆرەوە گەڕانـەوە،دوای ئـەوەی شارەکەیان سوتاند(٣١)  وادیـارە هێرشـەکانی سـەلجوقیەکان تـا مردنـی تـوغرول بەگ له ساڵی ٤٥٥کۆچی هەر بەردەوام بوو زۆرتر بەمەبەستی تـاڵانی نـەك هـەوڵی نیشته جێ بوون (٣٢) بـەڵکو هـەنگاوێکی سـەرەتایی بوون،بـۆ ئـەوەی هێزەکـانی سـەلجوقی لـه بـارو دۆخ و سروشـتی ناوچـەکە شـارەزابن سـەرەڕای ئـەوەش دەسـەڵاتدارانی سـەلجوقی زۆر گرنگیـان بـه بـاکوری ڕۆژئـاوای سـەڵتەنەتەکەیان دەدا،بـەڵام برازاکـەی و جێنیـشنەکەی ((ئـەلب ئەرسـەلان)) نزیکبوونـەوەی بیزەنتیەکان و فاتمیەکانی پێ ناخۆش بوو،بۆیە دەکۆشـا خـۆی بپـارێزێ تـا زووە دەست بەسـەر ئـەرمینیادا بگرێـت و بـه ئـارامی تیـادا جـێ نـشین بێ،بـەر لـەوەی مەبەستی سەرەکی بە جێ بهێنێ ئەویش هێرش بکاتە سـەر فاتمیـەکان لـه وڵاتـی شامدا،وا دەردەکەوێت ململانێی نێوان سەلجوقیەکان و بیزەنتیەکان له زیاد بووندا بوو بـه تایبـەتی بیزەنتیـەکان دەرکیـان بـه گـەورەیی ئـەو مەترسیه کـرد کـه لـه ڕۆژهەڵاتەوە هەڕە له ئیمپڕاتۆریەکەیان دەکات(٣٣) له ئەنجامی ئەمەدا سیاسەتی سـەلجوقی لـه ئاسـت ئیمپڕاتۆریـەتی بیزەنتـی چـووە دۆخێکـی نوێـوە،((ئـەلب

ئەرسەلان)) بەر لەوەی هێرشی بۆ بیزەنتیەکان بەرێت پەیوەندی پتەوی بەست لە ڕێگای ژن خواستنەوە لەگەڵ غەزنەویەکان و خانیەکاندا(٣٤) ئەمە بواری بۆ ڕەخساند زیاتر جەخت بکات و خۆی بۆ هێرش بردنە سەر بیزەنتیەکان تەرخان بکات.

((ئەلب ئەرسەلان)) هێرشی بەرپا کرد دژی هەرێمی نەسرانیەکان کە لە دەوروبەری سنووری دەوڵەتەکەیاندا بوون،بە سوپایەکی گەورەوە ڕوویکردە باشوری ئازەربایجان، دواجار بەرەو ڕۆژ ئاوا بوەوە بۆ گرتنی وڵاتی((کورج))و ئەو ناوچانەی دەڕواننە وڵاتی بیزەنتیەکان، دانیشتوانی کورج بەردەوام هێرشیان دەکردە سەر ئازەربایجان بووبوونە سەرچاوەی نا ئارامی دانیشتوانی ناوچەکە کاتێ لەشاری((مرند))بوو لە ئازەربایجان یەکێ لە میرەکانی تورکمان بە ناوی((طغتکین)) هاتە پاڵی ئەمەش بەردەوام بەسەر ناوچەکەیدا دەدا،شارەزای ڕێگاو باننەکانی بوو،سوپای سەلجوقی لە ڕووباری((ڕەس))پەڕینەوە(٣٥) ڕوویان لە وڵاتی ((کورج))کردبوو،لەم کاتەدا((ئەلب ئەرسەلان))هێزێکی سەربازی بە فەرماندەیی ((مەلەکشای))ی کوڕی و وەزیرەکەی ((نیزامولمولك)) جیا کردەوە و هێزەکە ی هێرشی کردە سەر قەڵاو شارەکانی بیزەنتیە،لەوانە قەڵای ((سورماری)) (٣٦) و شاری ((مەریەم نشین))و داگیری کردن (٣٧).ئەلب ئەرسەلان داوای لە کوڕەکەی و وەزیرەکەی کرد لەگەڵ هێزەکەیاندا بکەونە تەکی،هەموویان بەرەو ((سبید شەهر))کەوتنە ڕێ و دوای شەڕێکی قورس شارەکەیان گرت و بەرەو ژوور بوونەوە بۆ شاری((أعال لال)) دانیشتوانەکەی بەرەنگاریان کرد بەڵام بەسەریاندا سەرکەوتو چوونە ناو شارەکەوە دەستیان بە تاڵانکردنی شار کرد ((تاڵانیەکەیان بێ ژمار بوو)) (٣٨) دواجار چوونە ((قارس و ئانی)) (٣٩) ئەم شارەی دواییان ئابڵوقەدا دانیشتوانەکەیان سەغڵەت کرد خەڵکی شارەکەی زۆر بە توندی بەرپەرچیان دانەوە،ناچار ئابڵوقەی لەسەر شارەکە هەڵگرت،دانیشتوانەکەی وایزانی سوپای سەلجوقی پاشەکشێیان کردووە،تا ڕیزەکانی خۆیان ڕێك بخەنەوە بۆ ئەوەی جارێکی کە هێرش بەرن ژمارەیەکی زۆریان هەڵهات کاتێ ئەلب ئەرسەلان بەمەی زانی فەرمانی دا سوپاکەی

بۆ((ئانی))بگەڕێنەوە،جارێکی کە ئابلۆقەی شارەکەی دایەوە،دواجار بچێتە ژوورەوە و داگیری بکات(٣٩) فەرمانڕەوایەکی بۆ دانا هەروەها هەندێ لە سوپاکەشی لەوێ هێشتەوە ئەمە سەرەتای جێگیربوونی سەلجوقی بوو لەناو موڵکی ئەرمینیادا، وا دەردەکەوێت شای کورج،ئەم هاتنە ناو قوڵایی ئەرمینیای سەلجوقیەکانی پێ گران بوو،هەوڵیدا ئەلب ئەرسەلان ڕازی بکات و بە ((جزیە))پێدان ئاشتی بکاتەوە هەرواشی کرد لە ساڵی٤٥٨کۆچی/١٠٦٥زاینی.(٤٠) لەئەنجامی ئەم چوونە ناوەوەی سەلجوقیەکان ڕێگا لەپێش سەلجوقیەکاندا کرایەوە بۆئەنادۆڵ،دوای ئەوەی ناو جەرگەی ئەرمینیایان داگیرکرد،هێرشیان بۆ ناو سنوورەکەیان برد،دەستیان گرت بە ڕێگاکانی ((ئەمانۆس))دا لە ساڵی ٤٥٩کۆچی/١٠٦٦زاینیدا، هەروەها هێرشیان کردە سەر ((قەیسەریە)) (٤١) لەساڵی دواییدا (٤١) هەموو ئەمانە ڕوویاندا ئیمپراتۆری بیزەنتی هەوڵی بەرپەرچدانەوەی ئەو هێرشانەی نە دا،ئەمە زیاتر هانیدا بەرەو قوڵایی ئەنادۆڵ بڕۆن..

گەیشتنە ((نیکسار)) ( ٤٣)و((عەموریە)) (٤٤) لە ساڵی٤٦١کۆچی/ ١٠٦٨زاینیدا.. بۆ ساڵی دواتر گەیشتنە((قونیە))و ((خونیە))کە لە کەناری ئیجەوە نزیکە٤٦٣کۆچی/١٠٧١زاینی (٤٥)

## شەڕی مانزیکرت

گرتنی وڵاتی کورج و بەشێکی زۆری ئەرمینیا لەلایان سەلجوقیەکانەوە بۆ بیزەنتیە کارێکی قورس بوو،بە تایبەتی کە ئیمپڕاتۆری بیزەنتی زانی ئەلب ئەرسەلان بە ناوی جیهادەوە ئەم کارەی ئەنجامداوە ئەو شوێنانەش دەکەونە ژێر دەسەڵاتی ڕوویەکی ئیسلامی وەردەگرن ئەمە وایکرد ئەگەری شەڕی نێوان موسڵمانەکان و بیزەنتیەکاندا لە ئارادایە هیچ چارەی نیە. ئیمپڕاتۆری بیزەنتی ڕومانوسی چوارەم دیوجینیی((٤٦٠ـ٤٦٣کۆچی/١٠٦٨ـ١٠٧١زاینی)) کە جێنشینی قوستەنتینی دەیەم دوکاس بوو،هەوڵی ڕاگرتنی سەلجوقیەکانی دا نەهێڵێ لەوە زیاتر بێنە پێشەوە دوای ئەوەی بۆی دەرکەوت کەوا ئارامی و ئاشتی ئیمپڕاتۆریەتەکە بە گەڕانەوەی ئەرمینیاوە بەندە،هەوڵێکی زۆریدا سوپایەک

کۆبکاتەوەبۆ ئەم مەبەستە.سێ جار بۆ سەر وڵاتی شام و سەرووی جەزیرە لە ساڵی ٤٦١ـ٤٦٣کۆچی/١٠٦٩ـ١٠٧١زایینی لەشکرکێشی ئەنجام دا..جاری یەکەم رووبکردە ئیمارەتی حەڵەب کە لەژێر دەسەلاتی ((مرداسی دا))( ٤٦) بوو،بە گوێرەی وتنی مێژوونووسی و فەیلەسوفی بیزەنتی ((بسللوس))کە لەو سەردەمەدا ژیاوە و بەشداری ئەو رووداوانەی کردووە.هەرچەندە وتەکانی ناڕەوایی بەرامبەر ئیمپراتۆر نیشانداوە رۆمانوس بە لەشکرێکەوە لە پایتەختەوە دەرچوو بەبێ خۆ ئامادە کردن و پلان بۆ شەڕی تورکە بەربەرەکان چوو نەیدەزانی بۆ کوێ دەڕوا و چی دەکات پلانی بۆ شتێك دادەنا شتێکی دیکەی دەکرد،چووە ناو خاکی شامەوە هیچ کارێکی ئەنجام نەدا هەر ئەوەندەی فەرماندەی سوپاکەی دەکرد(٤٧) بەلام لە ڕاستیدا رۆمانۆس لەو لەشکرکێشییەیدا لەگەڵ کۆمەڵێك تورك رووبەڕوو بۆوەوە کە هێرشیان کردبوە سەر ((نیکسار))ناچاری کردبوون دەست لە تالانیەکانیان هەڵگرن،هەروەها چەند هێرشەکی بۆ سەر ئیمارەتی حەڵەب ئەنجام دابوو ((ئەرتاح))ی داگیرکردبوو،کە دەکەوێتە رۆژهەلاتی((ئەنتاکیا))وە (٤٨) لەوێ چەند دەستەیەکی سەربازی دانابوو هەروەها قەلای ((بالس))ی (٤٩) گرتبوو دواجار لە ناوچەکە کشابووەوە کە هەواڵی پێگەیشتبوو،هێزێکی تورك بە فەرماندەیی ((ئەفشینن))بەرەو ((عەموریە)) (٥٠) بە رێگاوەن ئەوەی شایانی باسە ئەلب ئەرسەلان،ئەفشینی فەرماندەی بە هێزێکی سوپاوە ناردبوو تا بچێتە ناومولکەکانی ئیمپراتۆریەتی بیزەنتیەوە.

رۆمانۆس لە جاری دووەمدا ئیمارەتی حەڵەبی داگیرکرد کە لە هەرێمی جزیرەوە (٥١) تێپەڕیبوو،رێگای سیواس قەیسەری گرتبوو بۆ گەیشتن بە((مرعش)) کە لەسەر سنووردایە لە نێوان وڵاتی شام و ناوچەی((کیلیکیە)) لەوێوە گەیشتە((مەینج))کە دەکەوێتە کەناری رۆژئاوای رووباری فورات، تالانی کرد و دانیشتوانەکەی کوشت و کردیە بەشێك لە مولکی ئیمپراتۆریەت، هێزەکەی لەگەڵ هێزەکانی((محمود کوری صالحَ المرداسی)) و ((بنی کلاب))و((ابن حسان الطائی)) و ئەو عەرەبانەی لەگەڵیاندا بوون،روو بەڕوو بوونەوە بەسەریاندا سەرکەوت (٥٢) ئاشکرایە رومانۆس لە دەور و بەری وڵاتی شام هەندێ لە ئاواتەکانی بەدی هێنا

## مێژووی سەلجوقیەکان

سـنوورێکی بـۆ جمـو جـۆڵی تورکـەکان دانا،ئاگـای لـە ئەرکـە سەربازیەکانیـشی بوو،گەیشتە ((مانزیکرت))لەم شـارە و دەور بـەری خوراسـان (٥٣) کـاری خراپـی ئەنجامدا دواجار بە هۆی کەمی ئازوقە لە ناوچەکە کشایەوە.(٥٤)

ئەم دوو لەشکرکێشییە ئەنجامی مەترسیان نەبوو،هیچ گۆڕانکارییەکیش لـە زەویـو زارەکاندا ڕوویـنەدا لەوەی زیـاتر((ئـەرتاح))و((مـەینج))و ((بـالس))داگیرکـران ئـەم سـەرکەوتنەی ئیمپراتـۆر یەکلاکـەرەوە نـەبوون بـە بەڵگـەی ئـەوەی تورکـەکان بەردەوام بوون لە فشار خستنە سەر ئیمپراتۆریەتەکە و چوونە ناو خاکەکانیانـەوە ناچـار بـۆ سـێهەم جـار چـووە سـەریان تـا سـنووریێ بـۆ دەسـت درێژیـەکانیان دابنێت،(٥٥)

ڕۆمانۆس دوای گەڕانەوەی لە شەڕەکانی شام بۆ پایتەختەکـەی زۆری پـێ نەچـوو گەڕایەوە تاکو سەلجوقیەکان لەو ناوچانە دەرکات کە تیایدا نیـشتە جـێ بووبـوون بەتایبەتی لە دەور و بەری ((قەیسەریە))و((کبادوکیە))سەرەڕای ئـەوەش دەسـتی بەسەر هەندێ جێگادا گرت کە کەوتبوونە ناو خاکی ئیسلامەکانەوە تا سەربازی بۆ بنێرێ و بیکاتە بنکەیەك تا ڕوو بـەڕووی جوڵانـەوەکانی تورکـەکان لـە پاشـەڕۆژدا بوەستێ،هەندێ لە سوپاکەی لـە نزیکـی((مەلتیـە))هێشتەوە لـە ژێـر فەرماندەی ((فیلاریتی))ئەرمەنیدا فەرمانی پێدا ڕێگا بە تورکـەکان نـەدا بێنـە پێشەوە بـەڵام توانیـــان بەســـەریاندا زاڵ بـــن و((مالتیـــە))بگرن،ڕوویـــان لـــە ئاســـیای بـــچوك کرد،((قونیە))یان تالان کرد کە ڕۆمانۆس لـەوە ئاگـادار بـووەوە چـی بەسـەر ئـەو شارەدا هاتووە بەرەو پێشەوە چوو تا نـەهێڵێ لـەوە زیـاتر بـڕۆن بـەڵام نـەیتوانی بەسەریاندا زاڵ بێ لـە سـاڵی٤٦٣کۆچی/١٠٧١زاینـی، گەڕایـەوە قوسـتەنتینیە تـا سـوپایەکی تـر ئامـادە بکـات بـە فەرماندەیی ((مانوێـل کـومنین)) ئـەنجامی ئـەم لەشـــکرە لـــەوەی پێـــشووی باشـــتر نەبوو،ســـەلجوقیەکان لـــە نزیکی((سیواس))لەشکرەکەیان شکاند و فەرماندەکەشیان بە دیلی گرت.(٥٦)

ئەلب ئەرسەلان لەم کاتانەدا خەریکی خۆ ئامادە کردن بوو لـە دژی فاتمیـەکان تـا لە شامیان دەربکەن،لەڕێگای دیاربەکرەوە بەرەو حەڵەب کەوتە ڕێ و خستیە ژێـر

دەسەڵاتی خۆی میری شارەکە((رشید الدوله محمود بن نصر المرداسی)) ڕازی بوو بچێتە پاڵیان ئەویش کردی بە فەرمانڕەوای حەڵەب.(٥٧)
لە لایەکی دیکەوە((ڕۆمانۆس))بڕیاریدا جارێکی کە هەوڵی گەڕانەوەی ئەرمینیا بدات و هێرشەکانی تورك بۆ ئاسیای بچووك ڕاگرێ کەڵکی لە بوونی ئەلب ئەرسەلان کرد لە وڵاتی شام دا بەڵام وا دیار بوو مەبەستێکی لە مە دووتری هەبوو،دەیویست لە جزیرەوە دزە بکاتە ناو خاکی موسڵمانەکانەوە بکاتەقوڵایی خاکەکەیانەوە.
بە گوێرەی وتەی یەکێ لە مێژوو نووسان ئیسلامیەکان ڕۆمانۆس دەیویست زستان لە عێراق بێ و هاوین بچێتە وڵاتی فارس و نیازی وابوو وڵاتی موسڵمانەکان وێران بکات (٥٨)،ساڵی٤٦٣کۆچی/١٠٧١زاینی، بە لەشکرێکی گەورەوە (٥٩) کە لە کرێگرتەکانی((مرتزقه))ی ڕۆم و فرەنج و نورمان و روس و بجناك و کورج و کومان پێکهاتبوو،لەگەڵ تاخمێکی کەمی سەربازی ڕاهێنراودا ئەمە وایکردبوو سوپاکە لە رووی ڕێکخستنەوە باش نەبێ و توانای شەڕکردنیشی نەبێت(٦٠).ڕۆمانۆس پلانێکی دانا بوو بۆ دەست بەسەرا گرتنی قەڵاکانی ئەرمینیا و سەربازێکی زۆری تیایاندا دابنێ بەر لەوەی سەلجوقیەکان لە باشورەوە پەیدا بن دواجار لە دواوەوە هێرش بکەنە سەر لەشکری سەلجوقی بۆ ئەوەی دەورەیان بگرن،کەوتە ڕێ و گەیشتە ((قەیسەریە) لێرەدا بە جدی کەوتە بیرکردنەوەی گەڕانەوە بۆ قوستەنتینیە بەهەر بە هانەیەك بێ، ئەو سەرچاوانەی لەبەر دەستن هۆیەکی دیاریکراومان بۆ ئەوە پێ نالین.هات((بسللوس))خۆی کە یاوەری ئیمپراتۆر بوو لەو لەشکرکێشییەدا هۆیەکی دیاری تاڵی لەبەرچی ئیمپراتۆربڕیاری گەڕانەوەی دا لەمەیدانی سەربازیشدا بە هێز بوو،بەر لەکشانەوەشی لە ناوچەکە هەوڵیدا لەگەڵ (ئەلب ئەرسەلان)دا بگەنە ڕێکەوتنێك لەو کاتەدا (ئەلب ئەرسەلان) لە بارودۆخێکی نالەباردا بوو هەندی لە سوپاکەی بە هۆی دواکەوتنی خەرجی و ئازووقەیانەوە نەیاندەویست بەشداری شەڕ بکەن،(حەڵەب)ی ئابلۆقەدا چونکی میری حەڵەب نەچووە ژێر باریەوە ئەوەی لە سوپاکەی لەگەڵیدا مایەوە،ژمارەیان چوار هەزار کەس بوون،دوای گرتنی شارەکە لە ڕێگای فوراتەوە بۆ وڵاتەکەی خۆی (٦١)

گەڕایەوە،لەو کاتەی خۆی ئامادە دەکرد شارەکە بەجێ بهێڵێ نوێنەرانی ((ڕۆمانۆس))گەیشتن.
((بسللوس)) ئەو ڕێگایانەی ئاشکرا نەکرد کە ڕۆمانۆس (٦٢) پەیڕەوی کرد لە پێناو بەستنی ڕێکەوتنی ئاشتبوونەوەدا بەڵام((سبط ابن الجوزی))کە لە ((غرس الغمة))ی دەگێڕێتەوە دەڵێ:ڕۆمانۆس پێشنیارێکی بە ئەلب ئەرسەلان گەیاند کەوا((بەرد منبیج))و ((ئەرجیش))و ((مانزیکرت))ی بۆ بگەڕێنێتەوە (٦٣) بێ ئەوەی ئەوە ئاشکرا بکات ڕۆمانۆس لە بەرامبەر ئەمەدا دەسکەوتی چی دەبێ.
ئەو دوو مێژوو نووسە هەرچەندە لەناو ڕووداوەکاندا بوون بەڵام مەرجی ئاشتبوونەوەکەیان دەرنەخستووە لەلای ((إبن العبری)) ڕوونتر باسی دەکات بەڵام پێچەوانەی وتەکانی ((غرس الغة))یە وای ڕادەگەیەنێ کەوا ئیمپڕاتۆر داوای لە ئەلب ئەرسەلان کردووە دەست لە ((منبج) هەلگرێ لە بەرامبەر دەست لێ هەڵگرتنی ((ئەرجیش و مانزیکرت))جزیەی ساڵانەشی پێبدات هەروەها دەڵێ:سوڵتان پێشنیارەکانی ئیمپڕاتۆری قبوڵکرد و دەستی لە هەموو زەویەکان تا((خلاط)) هەڵگرت (٦٤) لێکۆڵەرەوەکە لێرەدا وتەکانی ((ابن العبری)) دەسەلمێنێ چونکی((منبج)) ئەوکات لە ژێر دەسەڵاتی بیزەنتیەکان بوو، بەڵام ((ئەرجیش و مانزیکرت))لە ژێر دەسەڵاتی سەلجوقیەکان بوون.(٦٥)
ئاشکرایە ئەلب ئەرسەلان لەبەر سێ هۆ پێشنیارەکانی((ڕۆمانۆس))ی قەبوڵکرد:
یەکەم:لەوکاتەدا سیاسەتی دەست بەسەرا گرتنی جیهانی ئیسلامی پەیڕەو دەکرد هیچ تەماحێکی سیاسی لە خاکی ئیمپڕاتۆریەتی بیزەنتیدا نەبوو، تەنها زامن و پاراستنی باڵی سوپاکەی نەبێ کاتێ کە بەرەو وڵاتی شام دەڕوات لەو بڕوایەدا بوو کەوا ئەم ڕێکەوتنە ئەمەی بۆ مسۆگەر دەکات.
لەدوای ئەوەش ناردنی هێزێکی سەربازی بە فەرماندەی((ئەفشین)) بۆ قووڵایی خاکی بیزەنتیە(٦٦) تەنها بۆ سووسە ((استطلاع))کردن بوو،ڕەنگە بۆ ئەوەش بوو بێ ئیمپڕاتۆر ناچار بکات بەشێك لە سوپاکەی بکشێنێتەوە تاکو فشار کەم بکاتەوە لە مەیدانی ڕوو بەڕوو بوونەوەدا لە وڵاتی شام.

دووەم:دواکەوتنی((ئەفشین))کە ناردبووی بڕواتە ناو قوڵایی خاکی بیزەنتیەوە، ترسی ئەوەی لەبەر کەوت بیزەنتیەکان لە ناویان بردبێ.
سێهەم:بەشێکی سوپاکەی ئەو بەشەی کە لە عێراقەوە هاتبوو، کە ئەندامانی پێشتر لەناو سوپاکەی توغرول بەگی مامیدابوون،تەوزەلیان نیشان داو نەچوونە((جیهاد))و ئابلۆقەی(حەڵەب)یان نەدا کە ئامانجی دواتری بوو،چونکی ئازووقە و خەرجیان پێ نەگەیشتبوو،ناچار بوون بە ژمارەیەکی کەمەوە کە چوار هەزار سەرباز بوون،ئابلۆقەی شارەکە بدات،ناچار بوو پلانە سەربازی و سیاسیەکانی بگۆڕێ چونکی بەو ژمارە کەمەوە نەیدەتوانی لەگەڵ سوپای بیزەنتیدا ڕوو بەڕوو ببێتەوە،ملی بۆ ئاشتی خەواند لە ڕێگای فوراتەوە گەڕایەوە ڕۆژهەڵات کە جۆرە هەڵهاتنێك بوو.
جێ بەجێ کردنی ڕووداوەکان بە خێرایی ڕوویان دەدا ڕێکەوتننامەکەی دوا خست((بسللوس)) دەیگێڕێتەوە دەڵێ ((یا لە نائومێدیدا یاخود زیاد لە پێویست بڕوای بە خۆی هەبوو،بۆ شەڕکردن کەوتە ڕێ)) (٦٧) ئەم وتانەی جۆرە ئاڵۆزیەکی تێدانە،بەڵام سەرەڕای ئەمە لە لووتبەرزی ئەمەی کرد(٦٨)دڵنیابوو کەوا سەرکەوتن بەدەست دێنێ دوای ئەو خۆ ئامادەکردنە گەورەیە، ڕەنگە ئەو هەڵسوکەوتەی لە ئەنجامی ئەو زانیاریانەدا بێ کە نوێنەرانی پێ ڕاگەیاندبوون کاتێ لەلای سوڵتان گەڕانەوە، باسی سەفەری ((ئەلب ئەرسەلان))یان لە حەڵەب بۆ گێڕابووەوە و ئەو ئاژاوە و نارێکیەی لە ڕیزەکانی سوپاکەیدا پەیدا بووبوو لە ئەنجامی یاخی بوونی هەندێ لە سەربازەکانی،بەرەو ((مانزیکرت))و ((خەلات)) کەوتە ڕێ.. ((ئەلب ئەرسەلان))یش دەنگ و باسی لاوازی و بێ هێزی هێزەکانی بیزەنتیەی بیستبوو تەماحی قۆستنەوەی ئەم هەلەی کەوتە بەر،نەك وازهێنان و دەست هەڵگرتن لە هەندێ شت،بۆیە بڕیاری بەرەنگار بوونەوەی هێرشەکانی بیزەنتیەکانی دا،ژمارەی هەردوو سوپاکە وەك یەك نەبوون،جیاوازیان زۆر بوو لە ڕووی ژمارەوە پەنای بۆ پلانێکی دیکە برد لە ناوچەکە کشایەوە،لە فورات پەڕییەوە،ڕۆمانۆس لە دوویان ڕۆیشت بەڵام لە پڕ وەستان و ڕیزەکانی سوپاکەی ڕێکخستەوە و خۆی بۆ ڕوو بەڕووبوونەوەی ئیمپراتۆر ئامادە کرد بە تایبەتی

توانای شەڕکردنی بەهێزتر کرد بەو کوردانەی هاتبوونە ناو سوپاکەیەوە ژمارەی سوپاکەی گەیشتە پانزە هەزار جەنگاوەر(٦٩) کە ڕۆمانۆس گەیشتە(ئەرزەن) هەڵەیەکی سەربازی کرد، کاتێ هێزەکەی کردە دوو بەشەوە:بەشی یەکەمی بۆ قەڵای((خەلات))نارد،کە دەکەوێتە کەناری گوڵی((وان))ەوە،بەشەکەی دیکەی بەرە و ((مانزیکرت)) ڕۆیشت و داگیریان کرد(٧٠) ئەم دابەشکردنە توانای شەڕکردنی سوپای بیزەنتی لاواز کرد،هەواڵی نزیکبوونەوەی((ئەلب ئەرسەلان))ی پێگەیشت،بەرە و باشوری ڕۆژ ئاوا پێچی خواردەوە تا بگاتە بەشی یەکەمی سوپاکەی بەر لەوەی تورکەکان (٧١) بچنە سەریان،بەڵام سەلجوقیەکان پێشەنگی سوپاکەی شکاندبوو کە هێرشیان بۆ((خەلات))بردبوو(٧٢) ئیتر ڕمانۆس خۆی بەرامبەر سوپای سەلجوقی بینیەوە لە باشوری((مانزیکرت))ڕێك لە نێوان مانزیکرت و خەلاتدا،لەو شوێنەی پێی دەوترا ((زەهوە)).(٧٣)

ئەلب ئەرسەلان ویستی سوود لەو سەرکەوتنە کەمە ببینێ تاکو لەگەڵ((ڕۆمانۆس)) دا بۆ چارەسەرکردنی کارە هەڵپەسێراوەکانی نێوانیان بکەوێتە وتو وێژ،نێردراوی بۆ لای ئیمپراتۆری بیزەنتی نارد،پێشنیاری ئاگر بەستی کرد(٧٤) سەرچاوەکان مەرجی ئەو ئاگر بەستەیان دەرنەخستوە بەڵام وادیارە ئەلب ئەرسەلان داوای کشانەوەی هەردوو سوپای سەلجوقی و بیزەنتی لە ناوچەکە لێکردبوو و هیچ لایەنێکیش هێرش نەباتە سەر لایەنەکەی تر،ئەو زەویو زارانەش ئێستا چۆنن هەروا بمێننەوە بەڵام ڕۆمانۆس بەمە ڕازی نەبوو داواکانیان بە هەند وەرنەگرت هەوڵی نەدا گوێ لە نامەکەی ئەلب ئەرسەلان بگرێت،پێی لەوە زیاتریش درێژکرد کاتێ پێی ڕاگەیاند کەوا:

((ئاگر بەستن نیە بێ ڕەی)) (٧٥) ئەمە تەحەددایەکی ئاشکرا بوو((ئومان))دەڵێ: ئیمپراتۆری بیزەنتی سوڵتانی سەلجوقی ئاگادارکردەوە دەبێت بکشێتەوە لەناوچەکە بەبێ هیچ مەرجێ بۆ ئەوەی سوپای بیزەنتی بچێتە شوێنەکەیان.(٧٦) ئەلب ئەرسەلان هەڵوێستی ڕاستەقینەی بیزەنتیەکانی زانی کە دەیانەوێ دەوڵەتی سەلجوقی لەناوبەرن دواجار خەلافەتی ئیسلامیش نەهێڵن،تەنها ڕێگاش بۆ ڕێگە لەدان بە بیزەنتیەکان دەبێ شکست بە سوپاکەیان بهێنرێ.سەربازەکانی هاندا تا

لە ڕێگای ئاین و پاراستنی دەوڵەتی ئیسلامی درێغی نەکەن (٧٧).لەو شەڕە یەکلاکەرەوەدا کە لە نێوان هەردوو سوپاکەدا ڕوویدا، سوپای بیزەنتی شکستی هێنا و ئیمپراتۆر بە زامداری دەستگیرکرا((کوژراوی ڕۆمەکان لە ژمارە نەدەهات تا ئەو ناوانە لەش داپۆشی)) (٧٨) موسڵمانەکان زێڕ و زیوێکی زۆریان بە تالانی دەسکەوت دوای شەڕەکە موسڵمانەکان بۆ ئازەربایجان گەڕانەوە.(٧٩)

## ئەنجامەکانی شەڕی مانزیکرت

ـ بیزەنتیەکان لەم شەڕەدا ئەو پەڕی هەوڵیان دا تاکو هێرشەکانی سەلجوقیەکان ڕاگرن،ئیمپراتۆر((ڕۆمانۆس)) شەڕێکی ئازایانەی کرد بەڵام خیانەت ڕۆڵێکی گرنگی بینی لە لاواز کردنی هێزەکەیدا، سوپاکەی لە کرێگرتەی (مرتزقە) هەمە لایەن پێکهاتبوو، دوژمنایەتی و ناکۆکی کەوتە نێوانیانەوە، وەکو ئەوەی لە نێوان یۆنانیەکان و ئەرمەنەکاندا ڕوویدا،((کومان))ەکان کە هەواداری سەلجوقیەکان بوون چونکی بەڕەچەڵەک تورك بوون هەندێ فەرماندەکانی بیزەنتیەکان لەو ساتە ناسکانەدا وازیان لە ئیمپراتۆر هێنا((روسل))و ئەوانەی لە گەڵیدا بوون لە فرەنجە ڕۆژئاواییەکان بڕیاریاندا بەشداری شەڕ نەکەن هەروەها ((ئەندرو نیقوس دوکاس))لە شەڕەکە کشایەوە کە زانی زیان دەکەن ئیمپراتۆر بە تەنها ڕوو بە ڕووی چارەنووسی خۆی بووەوە هەندێ لە فەرماندەکان هەواڵی شکست خواردنیان بڵاو کردەوە لە کاتی شەڕەکەدا بووە هۆی هەڵهاتنی سەربازەکان و ئیمپراتۆریان لەبەر دەستی دوژمن بە جێهێڵا(٨٠).بێگومان ململانێی ناوخۆی نێوان بیزەنتیەکان دواجار لە نێوان خۆیان و ڕۆژئاواییەکاندا لە ئیمپراتۆریەکەدا بە تایبەتی ((نورمان))کاردانەوەیەکی خراپی هەبوو لەسەر ئەنجامی شەڕەکە بۆیە شکستیان هێنا.

ـ ئەلب ئەرسەلان هەرچەندە ڕۆمانۆس دیل بوو، بەڵام بەباشی لەگەڵیا ڕەفتاری کرد بەر لەوەی بە پارەیەکی زۆر بەرەڵا کرا،دەبوایە ساڵانەش ((جزیە))ی بدایە و بەمەرجی ئەوەش کە دەبێ ڕێکەوتنێك مۆر بکات بۆ ڕێکخستنی پەیوەندیەکانی نێوان موسڵمانان و بیزەنتیەکان ڕێکەوتنە کرا بریتی بوو لە:

١ـ بەرەڵاکردنی ئیمپراتۆر ڕۆمانۆس.(٨١)

٢ـ سالانەحكومەتی بیزەنتی ((جزیە))بە حكومەتی سەلجوقی بدات.(٨٢)
٣ـ بەرەلاكردنی هەموو دیلە موسڵمانەكانی لە ولاتی رۆم.(٨٣)
٤- ئیمپراتۆریەتی بیزەنتی لە كاتی پێویستدا ئەگەر دەسەلاتی سەلجوقی پێویستی بە سەرباز هەبوو بیداتێ.(٨٤)

دوای مۆركردنی ڕێكەوتنامەكە ڕۆمانۆس لە لایان ئەلب ئەرسەلانەوە بەسەد كەسەوە بەرێی خست و چەند فەرسەخێك كەوتە تەكی بۆ بەرێخستنی (٨٥) هەردووكیان لەسەر ئەوە ڕێكەوتن زەویو زار و موڵكەكان وەكو خۆیان بمێننەوە ((ئانی))و((قارس))و((فاسبوركان))و((مانزیكرت))بەدەست سەلجوقیەكانەوە بمێننەوە، ئیمپراتۆریەتی بیزەنتی هەرێمەكانی دەورو بەر بە تایبەتی ((لاسیما ئەرزن))بەدەستەوە بمێنێ لە ئەنجامی ئەمەدا ئەلب ئەرسەلان بەر لەوەی ناوچەكە بە جێ بهێڵێ والیەكی بۆ ((خەلات و مانزیكرت))دان.(٨٦)

- شەڕی مانزیكرت كاریگەریەكی زۆری كردە سەر بارودۆخی سوپای بیزەنتی ئەو گورزە كوشندەیەی تووشی هات،توانای بەرگریكردنی لە سنوورەكانی ئاسیای بچوك لەدەست دا بۆیە ئیمپراتۆریەت نەیتوانی هێرشی توركە سەلجوقیەكان ڕاگرێ لەناوچەكەدا.بۆیە هەلیا بۆ ڕەخسا بكشێنەوە ناو ئاسیای بچووكەوە و تیایدا جێگیربن. (٨٧)

- ڕاستیەكی دیكەی كە گرنگیەكی ترسناكی لە مێژوودا بەشەڕی مانزیكرت بەخشی ئەوەبوو بیزەنتیەكان لەسەرەتادا دەركیان بە مەترسی ئەو كارە نەكرد وایان زانی سەركەوتنی سەلجوقیەكان لە داگیركردنی ئەرمینیا دواجار ئەنتاكیا و ڕەها (٨٨) بەولاوە هیچی دیكە نیە،بەلام ئەم دەڤەرانە كە جێگای پیاوانی ناودار و جەنگاوەران بوون،لەسەردەمانێكدا كۆڵەكەی دەوڵەتەكە بوون هەتا هەتایە لەدەستیان دەرچوو، توركەكان لەسەر سەرووەری ڕۆمانیە كۆنەكان (٨٩) خۆیان چەسپاند.

- شەڕی مانزیكرت كارەساتێكی گەورەبوو لە مێژووی بیزەنتیدا ڕوویدا بەڵكو گەورەترین كارەسات بوو بەسەر ئیمپراتۆریەتی بیزەنتیدا هات تا سەدەی پێنجەمی كۆچی/یانزەهەمی زاینی...كۆتایی هاتنی ڕۆڵی دەوڵەتی بیزەنتی بوو لە

پارێزگاری کردنی نەسرانیەتدا لە فشاری ئیسلام و لە پاراستنی دەروازەی ڕۆژهەلاتی ئەورووپا لە هێرشی ئاسیاییەکان(٩٠) ئەم شەڕە لە لایەکی ترەوە پاساوی بە ئەورووپای ڕۆژئاوا بەخشی بۆ دەستێوەردان چونکی بیزەنتیەکان لە توانایاندا نەما پارێزگاری لە جیهانی نەسرانی لە ڕۆژهەلاتدا بکەن بۆ چەند سالێش توانای ئەوەی نەبوو بەشداری لە شەڕەکاندا بکات.(٩١)

- شەڕی مانزیکرت،خالێکی وەرچەرخانی گرنگ بوو لە مێژووی ڕۆژئاوای ئاسیا بە تایبەتی و لە مێژووی ئیسلامیدا بە گشتی چونکی ڕێگای خۆشکرد و ئاسانکاری کرد بۆ نەهێشتن و لابردنی دەسەلاتی بیزەنتی لە زۆربەی ناوچەکانی ئاسیای بچووکدا لە دوایشدا بووە هۆی لەناوچوونی دەولەتی بیزەنتی لەسەر دەستی عوسمانیەکان.(٩٢)

- پێشتریش بیزەنتیەکان بەدەستی موسلمانەکان توشی شکستی هاتبوون شەڕی مانزیکرت شەڕێکی سەربازی بووجیهانی بیزەنتە دەیتوانی بەسەریا تێپەڕێ بە تایبەتی سەلجوقیەکان کەلکیان لەسەرکەوتنەکانیان وەرنەگرتبوو چونکی نیازی لایەکی دیکەیان هەبوو ئەویش دەست بەسەراگرتنی جیهانی ئیسلامی بوو هەروەها لە سالی دواتردا ئەلب ئەرسەلان کۆچی دوای کرد.بەلام کۆمەلگای بیزەنتی لەوکاتەدا لە بارێکی ئاساییدا نەبوو بتوانێ بەسەر ئەم کارەساتەدا زالێ بێ ململانێ لە نێوان خۆیاندا بەردەوام بوو لەسەر دەسەلات سوپا ببووە یارییەك بەدەستی ئەوانەی چاویان لە دەسەلات بەدەستەوە گرتن بڕیبوو.

- سەلجوقیەکان کەلە شەڕی مانزیکرت سەرکەوتنیان بە دەست هێنا هەرچی ئاسەوارێکی بیزەنتی هەبوو لە ڕێگا سەرەکیەکانی ئەرمینیا و کبادوکیە بەڕێوەبەرایەتی مەدەنی شارەکاندا لایان برد و نەیان هێشتەوە.زۆربەی دانیشتوانیش پشتیان لە بیزەنتیەکان کرد هاتنە ژێر دەسەلاتی فەرمانڕەوا تازەکانەوە،لە ترسی گرانی و قات و قوڕیدا لەگەل ئەوەشدا سەلجوقیەکان ڕێگایاندا شارەکان خۆیان خۆیان بەڕێوەبەرن و دەستیان نەکێشایە کار و باری ناوخۆیانەوە بەلام شێوەی ژیان گۆڕا چونکی خەسلەتێکی ئیسلامی وەرگرت نەمانی دەسەلاتی بیزەنتی لە ناوچەکەدا دانیشتوانەکانی هاندا بچنە ناو دینی

ئیسلامەوە بەڵام هەر بە ڕواڵەت موسڵمان ببوون زۆربەیان هەر مەی دەنۆشی و بە زۆر بۆ نوێژیان دەبردن.(٩٣)

- تورکەکان لەم بارو دۆخە نا ئارامە لە لایەنی دیکە زیاتر سودمەند بوون دوای سەری مانزیکرت لایەنە جیاجیاکانی بیزەنتە لە ململانێیەکانیاندا،هەوڵیان دەدا پەنا بۆ هێزەکانی تورک ببەن و لە دژی یەکتر لەناوخۆیاندا بەکاریان بهێنن ئەمە ڕێگای بۆ سەلجوقیەکان خۆش کرد،بچنە ناو ژیانی بیزەنتیەکانەوە.

- دەسەڵاتدارانی بیزەنتیە لە قوستەنتینیە ئیمپراتۆر ڕۆمانۆسی چوارەمی لەسەر تەخت لابرد و لە جێگای ئەو ((میخائیلی حەوتەمی کوڕی قوستەنتینی دەیەم دوقاس))یان دانا لە ساڵی ٤٥٢_٤٥٩کۆچی/١٠٦٠_١٠٦٧زاینی.. لەگەرمەی ئەم ناکۆکی و ململانێیەدا هەوڵی دا پەنا بۆ هێزەکانی تورک بەرێ و داوای یارمەتیان لێ بکات بەڵام توشی شکستی هات و و دەستگیریان کرد و چاویان هەڵکۆڵی.

- زۆربەی((ئەباترە))کانی بیزەنتیەکان دوای ڕۆمانۆسی چوارەم لەسەر هەمان ڕێباز ڕۆیشتن و دەیانویست تورکەکان یارمەتیان بدەن کاتێ ((ڕۆسیل بابایل))ی فەرماندەی هێزەکانی فەرەنج لە دەوڵەتی بیزەنتی یاخی بوو((میخائیلی حەوتەم پەنای بۆ هێزەکانی تورک برد بۆ دامرکاندنەوەی بزوتنەوەکەی پەناشی بۆ((مەنسور و سلیمان))برد کە ئەو دووبرایە لە خزمانی ئەلب ئەرسەلان بوون تاکو شۆڕشی((نقفوربوتانیاتس))لەناو بەرن بەڵام ئەو دووبرایە دەستیان لە ئیمپراتۆر هەڵگرت و چوونە پاڵ ((بوتانیاتس))لەشاری((نیقیە)) (٩٤) دانیان بەمجۆرە جۆرە تورکەکان دەستیان گرت بەسەر هەردوو هەرێمی((گالاتیا)) لەناوەڕاستی ئەنادۆل و((فریجیا))ی نزیکی..

- بەکار بردنی هێزەکانی تورک،ڕێگای بۆ سەلجوقیەکان خۆشکرد لە ڕۆژئاوای ئاسیای بچووک و سنوورەکانی ڕۆژهەڵاتی ئیمپراتۆریەتی بیزەنتە نیشتەجێ بن کە دانیشتوانەکەی((کەبادوکیا))و ئەرمەنیەکان پەیوەندی پتەویان لە نێواندا هەبوو،چونکی هەردوو لایان بیزەنتیەکانیان دەبێزاناسەرەڕای ئەمەش هەندێ لە سەربازگاکانی سنور لەگەڵ سەلجوقیەکاندا پەیوەندی پتەویان بەست ئەمە بووە هۆی لێکترازانی سیستەمی بەرگریکردن بیزەنتیەکان.

ـ ئەلب ئەرسەلان ئامانجەکانی خۆی بەدی هێنا پارێزگاری باڵی سوپاکەی دابین کرد مەترسی نزیك بوونەوەی بیزەنتە فاتیمیەکانی نەما دوای ئەوە بۆ بەردەوام بوونی شەڕی لە هەرێمەکان خۆی تەرخان کردلەساڵی٤٦٥کۆچی/١٠٧٢زاینی (٩٥)کۆچی دوایی کرد دوای خۆی کوڕەکەی و جێنشینەکەی((مەلەك شا))نەچوونە ئاسیای بچووك بەڵام ئەو تورکانەی لەگەڵیدابوون هەمیشە ئامادە بوون، دەشتاییەکانی ناوەڕاستی ئاسیای بچووك کە بیزەنتیەکان چۆڵیان کردبوو بە شوێنێکی گونجاویان بۆ خۆیان دەزانی دەیانتوانی بیکەنە لەوەڕگای ماڵاتەکانیان((سلێمان کوڕی قوتولمش))یان ڕاسپارد ئەو ناوچانە داگیربکات بۆ بەرژەوەندی گەلانی تورك.(٩٦)

## پەراوێزەکانی بەشی دووەم

١.ـ Vasiliev:History of the Byzantine Empire

ـ vol1;p429.setton:History of the crusades vol1;p136

٢ـ کورج:کەسانێکی نەسرانین لە چیای((قبق))و شاری((سرین))دەژیان بەهێزبوون و توانیان ئەفلیس بگرن،ویلایەتێکیان بە ناوی خۆیانەوە هەیە الحموی:ج٤ص٤٤٦

٣ـ ئەرمینیا:دەکەوێتە ناوەڕاستی گەلێ وڵاتەوە لەناوچە چیاییەکان ڕۆژئاوای ئاسیا بەرزترە،لە ڕۆژئاواوە ئاسیای بچووکە لە ڕۆژهەڵاتیەوە بەرزاییەکانی ئازەربایجان و و کەناری باشووری دەریای قەزوینە لە باکورەوە و باکوری ڕۆژئاوە ئەو وڵاتانەیە کە دەکەونە سەر دەریای ڕەش و وڵاتی قەوقاز..ئەگەر لە ڕووی جوگرافیاوە تەماشای بکەین ئەوا چیا سەختەکان کە لەنێوان گۆلی ئەرجیش لە باکورەوە و دەشتاییەکانی ئاشور لە باشوورەوە دەبێ بە بەشێك لە ئەرمینیای دابنێین ئەم ناوچەیە ناوچەیەکی جیاکەرەوەیە لە نێوان سامیەکان لە باشوروئەرمەنیەکان کە دەگەڕێنەوە سەر رەگەزی ئاری لەباکور ئەرمینیا وڵاتی ڕووبارە لەوانە دیجلە و فورات لە گۆلەکانی ـ گۆلی ئەرجیش وڵاتی ئەرمینیا دەکرێتەوە دوو بەشەوە:ئەرمینیای گەورە کە لە ڕووباری فوراتەوە لە ڕۆژئاواوە تاکو هەرێمی نزیکی ڕووباری((کر))لە ڕۆژهەڵاتەوە خەلات شارێکە دەکەوێتە

ناوەڕاستی ئەرمینیاوە..ئەرمینیای بچووک بریتیە لە هەرێمی تەفلیس و دەور و بەرەکەی..بڕوانە:هەمان سەرچاوەی پێشوو:ج۱ص۱۵۹ـ۱٦۱.

٤- setton:1;pp144-147.

٥- الکامل فی التاریخ:ج۸،ص٤۸.

٦- العرینی،السید الباز:الدولة البیزنطیة ص۲۳۸ـ۲۳۹.

۷- camb-med.History;17;p140.

۸ـــ سمباد لە ساڵی۱۰٤۰زاینیدا کۆچی کرد کورەکەی ((کاجیکی دووەم))فەرمانڕەوای کرد کە دواجار بۆ بیزەنتیەکان دەستی لە هەموو شتێك هەڵگرت.

۹- ئەنجاز:ناوی شارێکە لە چیای ((قبق)) شوێنێکی سەخت و عاسییە نزیکی وڵاتی((لان))ە دانیشتوانەکەی نەسرانین.پێیاندەوترێ((کرج))لە دەورو بەری تەفلیس کۆبوونەتەوە الحموی:ج۱ص٦٤.

۱۰ـ فاسبورکان:ناوچەیەکە لە ئەرمینیا.

۱۱ـ camb.Med.Hist:17;p163.سیواس((سبستیە))یە لە تورکیادایە لە باکوری وڵاتی ڕومەوە باکوری((قەستەمون و ترابزون))ە لە ڕۆژهەڵاتەوە ئەرزەنی ڕۆمە باشوری حەڵەب و ئەدرنەیە ڕۆژئاوای ئەنقەرە و قەستەمونە.

۱۲–cahan:p23..setton:1;p147.

۱۳ـ رستم،اسد:الروم..ج۲،ص٦۹ـ۷۰

۱٤ـ مانزیکرت یان منازگورد یان ملازکرت:شارێکی بەناوبانگە لە نێوان خەڵات و وڵاتی ڕۆمدایە،دانیشتوانەکەی ئەرمەنین.الحموی:ج٥،ص۲۰۲.

۱٥ـ ئەرزەن یان ئەرزەنی ڕۆم:شارێکی بەناوبانگە نزیکی خەلاتە قەلایەکی سەختی لێیە شارێکی ئاوەدانی ئەرمینیا بوو:هەمان سەرچاوەی پێشووج۱،ص۱٥۰.

۱٦ـ قالیقلا:لە ئەرمینیای گەورە دایە سەر بە((خەلاتەــخلاط))ە هەمان سەرچاوەی پێشوو:ج٤،ص۲۹۹.

۱۷ـ ترابزون:بەندەرێکە لە ئاسیای بچووك دەکەوێتە سەر دەریای ڕەش ابن الاثیر:ج۸،ص٤۸.

١٨- ابن الآثير:ج٨،ص٤٨.

١٩- chamichiam:History of Armenia;vol 11;p138

Finlay:13yzant ine Empire;p522

٢٠- ابن الآثير: ج٨ص٤٨.

٢١- Grouset;R;History de l;Armenie:pp588-590.

٢٢ــــ ٥٩٧ــــ٥٩٦ 1bid:pp. قـارس:شـارێکه لـه ئـەرمینیا سـەر بـە تەفلیسە:الحموی :ج٤،ص٣٢٣.

٢٣- ابن الآثير: ج٨،ص٦٣.

٢٤- chamic hian:11 p 142.

٢٥- ابن الآثير: ج٨،ص٦٧/ chamichian:11pp;142-146.

٢٦- Grousset:pp596-597.

٢٧- مەلتیە:شارێکە لە ولآتی ڕۆم لەسەر سنووری شامە:الحموی:ج٥،ص١٩٢.

٢٨- قونیە:گەورەترین شاری ئیسلامە لە ڕۆم((ئاسیای بچووك))بەها و ئاق سەرا جێگای شاکانیان بوون،هەمان سەرچاوەی پێشوو:ج٤،ص٤١٥.

٢٩- ئاق سەرا شارێکی بەناوبانگە.

٣٠- ابن خلدون،عبدالرحمن:...تأريخ ابن خلدون ج٥،ص١٦.

٣١- Psellus:chronographia:pp277-302;Grousset p 608.

٣٢- Grousset:History des croisades.voLl;p30.

٣٣- عنان محمد عبدالله:موقعة ملازكرد.مجلة الثقافة عدد ٥٠٠سنة١٩٤٨،ص٧.

٣٤- setton:vol 1;p148.

٣٥- شووی کردە یەکێ لە کوڕەکانی ئەلب ئەرسەلان کچی سوڵتان ئیبراهیم غەزنەوییە هەروەها کوڕەگەورەکەی مەلەك شا کچی((طمغاج))خان شای خانییەکانە.حسنین:ص٦٠.

٣٦- ڕەس:ڕووبارێکە لە((قالیقلا))وە دەردەچێ و بە((ئەران))دا تێدەپەڕێ دواجار بە ((بورتان))دا تێدەپەڕێ لەگەڵ((کر))دا یەك دەگرن شاری((بیلقان))دەکەوێتە نێوانیانەوە ((کر))و((ڕەس))دەڕژێنە دەریای جرجانەوە الحموی: ج٣،ص٤٤.

٣٧ــ سورماری:قەلایەکی گەورەیە و ویلایەتیشە لە نێوان ((تەفلیس و خەلات))دایە:الحموی: ج٣،ص٢١٥.

٣٨- ابن الآثیر: ج٨ص٩٨-٩٩.

Grousset:Hist.de l;Armenie p612.

٣٩- هەمان سەرچاوەی پێشوو.

٤٠ــ ئانی:قەلایەکی سەختە و شارێکە لە ئەرمینیا لە نێوان ((خەلات و کەنجە))دا:الحموی: ج١،ص٥٩.

٤١ــ ابن العبری:ص١٠٦.ابن الآثیر: ج٨،ص١٠٠/ chamichian: .11pp149

٤٢- Grousset:pp/613-615.

٤٣- قەیسەرییە:شارێکی گەورەیە لە ولاتی رۆم/ الحموی: ج٤ص٤٢١.

٤٤- رنسیمان،ستیفن:تأریخ الحروب الصلیبیە ج١ص١٠٥..Cahen:p70

٤٥- عەموریە:شارێکە لە ولاتی رۆم cahen:p71.laurent:Byzance et les tures seldjoucides pp4-6

٤٦ــ مرادسیەکان:هۆزێکی عەرەبە ئیماراتێکیان دامەزراند لە حەلەب لەسەردەمی(صالح کوری مرادس)لەسالی ٤٥١کۆچی تا٤٧٢کۆچی بەردەوام بوو.

٤٧- chronographia:p532.

٤٨- ئەرتاح:ناوی قەلایەکی سەختە سەر بە حەلەبە..ئەنتاکیە:شارێکی بەناوبانگە لە باکوری ولاتی شام،شەو و رۆژە رێیەك لە حەلەبەوە دوورە/.الحموی:ج١،ص١٤٠.ص٢٦٦-٢٧٠.

٤٩ــ بالس:شارێکە لە شام لە نێوان((حەلەب و رقە))دایە هەمان سەرچاوە:ص٣٢٨.

٥٠- العظیمی:تأریخ حلب ٣٤٧.

٥١- جوگرافیە ناسەکانی عەرەب ولاتی دوو زێکەیان - فورات و دیجلە- دابەش کردۆتە سەر دوو هەرێم:خوارو و سەروو هەرێمی سەروویان ناو ناوە جزیرە،چونکی

سەرووی دجلە و فورات دەشتاییەکی زۆرە ئەم بەشەیانیش کردۆتە سێ((دیار))ەوە:دیاری رەبیعە و دیاری( مضر) دیاری (بەکر) بڕوانە:المقدس:احسن التقاسیم فی معرفة الأقالیم ص١٢٢ـ١٢٣..ابن حوقل النصیبی صورة الارض ص١٨٩ـ٢٠٧..الهمذانی المعروف بابن الفقیة:کتاب البلدان ص١٧٦ـ١٨٢.

٥٢ـ سبط ابن الجوزی:مرأة الزمان ص٢٥٤.

٥٣ـ ابن القلانسی:ذیل تأریخ دمشق /ص١٦٦.

٥٤ـ سبط ابن الجوزی:ص٢٥٤.

٥٥ـ Grousset:p624;cahen:p71.

٥٦ـ سبط ابن الجوزی:ص٢٨٠ ابن العدقیم، الصاحب کمال الدین عمر:زبدة الحلب من تأریخ حلب ج١ص٢٦١ـ٢٦٢.

٥٧ـ سبط ابن الجوزی:ص٢٨٠.

٥٨ـ سەرچاوەکان لەسەر ژمارەی سوپای ئیمپراتۆر ڕێك نەکەوتوون ((ابن القلانسی))بە شەش سەد هەزار سەرباز مەزەندەی دەکات،لە کاتێکدا((سبط ابن الجوزی))دەیگێڕێتەوە کەوا ئیمپراتۆری بیزەنتی (سەد هەزار جەنگاوەر و سەد هەزار تیرەوان و سەد هەزار پیادە و چوار سەد گالیسکە هەر گالیسکەیەك هەشت گا ڕایدەکێشا و هەزار بار چەك و جبەخانە و زێڕو جلو بەرگی نایاب)ی پێ بووە ((ابن الأثیر)) ژمارەی سوپاکەی بە دوو سەد هەزار سەرباز داناوە ((ئومان))دەڵێ شەست هەزار سەرباز بووە ئەمانە بەراورد بکە:ابن القلانسی ص١٦٧.

سبط ابن الجوزی ص٢٨٢.ابن الأثیرج٨،ص١٠٩

Oman:History of the Art of War in the Middle Ages.voL 1;p219.

٥٩ـ ابن الأثیر:سەرچاوەی پێشوو:Psellus:p352 Note1.

٦٠ـ سبط ابن الجوزی:ص٢٨١.

٦١ـ Psellus:p354.

٦٢ـ سبط ابن الجوزی:ص٢٨٠.

٦٣- تأريخ الزمان:ص١٠٩خەلات:شارێکی ئاوەدانە لە ناوەڕاستی ئەرمینیا دایە میوە و ئاوی زۆرە لە زستاندا ساردە گولێکی لێیە.الحموی:ج٢،ص٢٨٠-٢٨١.

٦٤- ابن القلانسی:ص١٦٦. سبط ابن الجوزی:ص٢٧٨.

٦٥- ابن العبری:ص١٠٩-١١٠.

٦٦- العراق العربی والعراق العجمی.

٦٧- Psellus:P355.

٦٨- ابن العبری:ص١١٠.

٦٩- ابن العدیم:ج١ص٢٦٦. سبط ابن الجوزی:ص٢٨٥.

سەرچاوەکانیش جیاوازیان هەبوو لە مەزەندە کردنی ژمارەی سەربازی سوپای سەلجوقی.ابن القلانسی،دەڵێ چوار سەد هەزار جەنگاوەر بوون بەڵام ابن کپیر بە بیست هەزار داینا‌وە((ئومان))بەسەد هەزار..ابن القلانسی:ص١٦٧.

الحافظ:البدایە والنهایە،ج١٢،ص١٠١.Oman:p219.

٧٠- ابن الأثیر:ج٨،ص١٠٩.

٧١- Oman:p219

٧٢- ابن الآثیر: ج٨،ص١٠٩.

٧٣- ابن کثیر: ج١٢ص١٠١.

٧٤- ابن الآثیر: ج٨ص١٠٩.

٧٥- هەمان سەرچاوە.

٧٦- Artofwar..p226.

٧٧- ابن الآثیر:ج٨ص١٠٩.

٧٨- هەمان سەرچاوە:ص١١٠.

٧٩- الفارقی:،ابن الأزرق:تأریخ میا فارقین:١٨٩

٨٠- GMAN:P221/.Grousset:pp628-629.Vasiliev.p431

٨١ـ سەرچاوە عەرەبیەکان بەهەزار هەزار دینار دیاریان کردووە/ سبط ابن الجوزی:ص٢٨٣.دة هةزار دینار ابن العبری:تأریخ الزمانص١١١.

٨٢ـ سەرچاوە عەرەبیەکان بە سێ سەد هەزاردینار دەست نیشانیان کردووە/ سبط ابن الجوزی:هەمان سەرچاوە.

٨٣ـ ابن الأثیر:ج٨ص١١٠.

٨٤ـ هەمان سەرچاوە.

٨٥ـ سبط ابن الجوزی:ص٢٨٤ـ٢٨٥.

٨٦ـ الفارقی:ص٨٩١.....Grousset:p629.

٨٧ـ Vaisiliev:p431

٨٨- ڕەها:شارێکە لە جزیرە لە نێوان موصڵ و شام شەست فەرسەخ نێوانیان هەیە.الحموی:ج٣ص١٠٦.

٨٩ـ Vaisiliev.p432.

٩٠ـ عاشور سعید عبدالفتاح:الحرکة الصلیبیةج١ص٨٨.

٩١ـ رنسیمان:ج١ص١١٠.

٩٢حسنین:ص٦٣.

٩٣ـــ Vaisiliev.p432.OSmanturan:l;lslamisation dans la turguie du Moyen Age.studia.Vol l1959;p148.

٩٤ـ نیقیە:سەر بە قوستەنتینیە لە ڕۆژهەڵاتەوەیە ئەو شارەیە باوکانی نەسرانی تیایدا کۆبوونەوە ژمارەیان ٣١٨باوك بوون/الحموی ج٥ص٣٣٣.

٩٥ـ الحسینی:ص٥٣ـ٥٤.

٩٦ـ Laurent:pp9-11.

## ـ بەشی سێیەم ـ
## ﴿سلێمانی کوڕی قوتولمش﴾

### داگیرکـــەری ئـــەنادۆڵ و دامەزرێنـــەری ســـەڵتەنەتی ســـەلجوقیەکانی ڕۆم ٤٧٠ـ٤٧٩کۆچی/١٠٧٧ـ١٠٨٦زاینی

### دامەزراندنی سەڵتەنەت:

شەڕی مانزیکرت ڕێگای بۆ سەلجوقیەکان خۆش کرد بچنە ناو قوڵایی ئاسیای بچووکەوە ناکۆکی و شەڕە ناوخۆییەکان کە لە نێوان بیزەنتیەکاندا ڕوویان دا سەلجوقیەکانی هاندا لەو وڵاتەدا نیشتە جێ ببن و سەلتەنەتێك دامەزرێنن لە مێژوودا بە ناوی ((سەلتەنەتی سەلجوقی ڕۆم)) (١) ناسراوە.کە سلێمان کوڕی قوتولمش دایمەزراند (٢) کە بە باپیرەی سوڵتانەکانی ئاسیای بچووك دەژمێردرێ. دوای ڕۆیشتنی ئەلب ئەرسەلان سلێمان بەڕێوەبردنی کارو باری ناوچەی باکوری ڕۆژئاوای خستە ئەستۆی خۆی.کەوتە نیازی ئەوەی سەڵتەنەتێك لە قونیە و ئاق سەرا و شارەکانی دیکە دامەزرێنێ کە لە ژێر فەرمانڕەوایی قوتولمشی باوکیدا بوو.فەرمانڕەوایەتی بکات و دانیش بغا بە دەسەڵاتی مەلەك شا دا جێنیشینی ئەلب ئەرسەلان باوکی بوو. ئەوەی یەکەم راسپارد بوو بۆ بەرژەوەندی تورکەکان (٣) ناوچەکە بەڕێوەبەرێت.

ئەگەر لەو بڕوایەدا بین دەست درێژی کردنی سەلجوقیەکان بەرەو ڕۆژئاوا لەسەردەمی مەلەك شادا بەری هەوڵی خودی خۆی بوو بەهەڵە دادەچین.چونکە

## مێژووی سەلجوقیەکان

لەو ڕاستیانەی کە سەرنج ڕادەکێشن ئەوەیە،ئەم سوڵتانە پێی نە ناوەتە خاکی ئەنادۆڵ..

دوو هۆکار یارمەتیدەری سلێمان بوون بۆ بەدیهێنانی مەبەستەکەی یەکەم:گۆڕانی دیموگرانی لە ئەنجامی داگیرکردنەکاندا،ناوچەکانی باکوری ڕۆژهەڵات دوای کۆچ کردنی دانیشتوانەکانی چۆڵ بوون.چونکی هۆزە تورکەکان ئەوانەی یارمەتی سلێمانیان دا لە داگیرکردنەکانی،بە ئەنادۆڵدا بۆ ئاوو لەوەڕگا دەگەڕان،دانیشتوانەکان ناچار بوون دێهات و کێڵگەکانیان بە جێ بهێڵن و بڕۆنە ناوچەیەکی ئارامتر،لەو کاتەدا سەلجوقیەکان هاتن و لەو ناوچانە جێ نشین بوون و ڕووی ڕاستەقینەی ناوچەکانیان گۆڕی.

دووەم:بارودۆخە شڵەژاوەکەی بیزەنتینیەکان.لە ساڵانی دوای شەڕی مانزیکرت،سەلجوقیەکان کەڵکەیان لەو بارودۆخە ئاڵۆزاویە وەرگرت،دەستیان وەردایە کارو باری ناوخۆی بیزەنتینیەکان،بوونە لایەنگری هەندێکیان ئەمە یارمەتی دان زۆرتر بچنە ژوورەوە تا گەیشتنە هەرێمەکانی ڕۆژئاوا لە ئاسیای بچووکدا (٤) لەواقیعدا مێژووی بیزەنتی ئەو دەمانە بزووتنەوەی پیلان و یاخی بوونی زۆری بەخۆوە بینی کە هەواڵی کارەساتی مانزیکرت گەیشتە قوستەنتینیە و زانرا ئیمپراتۆر ڕۆمانۆس بەدیل گیراوە((میخائیل دوقاس))کوڕی ژنەکەی ڕۆمانۆس جاڕی بالغبوونی خۆیدا و بەناوی میخائیلی حەوتەمەوە ٤٦٠ـ٤٧١کۆچی/١٠٦٨ـ١٠٧٨زاینی دەسەڵاتی بەدەستەوە گرت،کە هەستی بە فشاری تورکەکان کرد سەر لەنوێ جارێکی کە لەگەڵ مەلەك شادا کەوتە ووتو وێژکردن لەبارەی ڕێکخستنی بارو دۆخی ناوچەکە، مەبەستی ئەوە بوو هاتنە پێشەوەی سەلجوقیەکان ڕاگرێ و مەترسی سەلجوقیەکان لە پایتەخت دوور بخاتەوە.

ووتو وێژەکان ئاکامێکی دڵخۆش کەر نەبوون.مەلەك شا ئازادی تەواوی بەو دەستو پەیوەندانەی خۆی نەدا کە لەناوچە بیابانەکان بوون تا لەژێر دەسەڵاتیدا دەربچن بەڵام هیچ کارێکی جددی لەبەرامبەریاندا ئەنجام نەدا (٥) کە پیلانەکەی ئیمپرتۆر سەرنەکەوت پەنای وەبەر هێزی سەربازی برد هێزێکی بە فەرماندەی ئیسحاق

## مێژووی سەلجوقیەکان

کۆمیتن ئامادەکرد و بۆ یارمەتی ((رۆسل بایلیل)) ی هەنارد کە ناردبووی شەڕی سەلجوقیەکان بکا، بەڵام (رۆسل) لەفەرمانی ئیمپراتۆر دەرچوو بەرلەوەی ڕووبەڕووی سەلجوقیەکان بێتەوە ئسهاق کۆمینن کەوتە هەڵوێستێکی خراپەوە، بەتەنها ڕووبەڕووی سەلجوقیەکان بووەوە بەڵام بەدیل گیرا (٦) بەمجۆرە پلانەکەی میخائیلی حەوتەم سەری نەگرت و بۆی نەگرا سەلجوقیەکان لەشوێنی خۆیان ڕابگرێ و نەهێڵێ بێنە پێشەوە، رۆسل بایلیل کەڵکی لە ململانێی نێوان سەلجوقیەکان و بیزەنتیەکان لە ئاسیای بچووکدا وەرگرت بۆ بە وەدیهێنانی دەستکەوتی تایبەتی لەسەر شانی هەردوو هێزەکە ساڵی ٤٦٦کۆچی/١٠٧٣زاینی جاری یاخی بوونی دا بەتەمای سەربەخۆیی بوو لەناوچەکانی قونیە و ئەنقەرە (٧) و دامەزراندنی دەوڵەتی نورمانی لەبەشی ڕۆژهەڵاتی ئیمپراتۆریەتی بیزەنتیدا چاوی لە هاو نیشتیمانەکانی کرد کاتێ ئیماراتێکیان لە باشووری ئیتاڵیا دامەزراند دواجار ویستی قوستەنتینیە داگیر بکات میخائیلی حەوتەم لەوە ترسا کەوا لە ناو جەرگەی ئیمپراتۆریەکەدا خۆی بچەسپێنێ بۆیە پەنای بردە بەر سەلجوقیەکان بۆ دامرکاندنەوەی جوڵانەوەکەی (٨) لەبەر ئەمە لەگەڵ سلێماندا ڕێکەوتنێکی بەست سلێمان پەیمانی ئەوەی دا یارمەتی پێویست پێشکەسیان بکات لەبەرامبەر ئەوەدا ئیمپراتۆر دان بە دەسەڵاتەکەیدا بنێ لەسەر ئەو هەرێمانەی لە ڕۆژهەڵاتی ئەنادۆڵ کەوتبوونە ژێر دەستی ((رۆسل بایلیل)) نەیتوانی لەبەرامبەر سەلجوقیەکاندا خۆی بگرێت شکستی هێنا بۆ ئەماسیە هەڵات کە دەکەوێتە باکووری ڕۆژهەڵاتەوە جێگایەکی کەمی بەدەستەوە مایەوە لەوێوە سەر لەنوێ ویستی شەڕی بیزەنتیەکان بکات و هەڕەشە لەبەندەرەکانی دەریای ڕەش بکات ئەوکاتە میخائیلی حەوتەم ئەلکسیوس کۆمینن نوێنەری نارد تا وتووێژ دەست پێ بکەن بەڵام((کۆمینن))بەیارمەتی تورکەکان توانی دەستگیری بکات((نورمان)) دەست و پێوەندەکانیشی خۆیان بەدەستەوە دا بەمجۆرە ئەو هەوڵدانەی نورمانیەکان بۆ دامەزراندنی دەوڵەتێك لە ئەنادۆڵ شکستی هێنا(٩)

لەساڵی٤٧١کۆچی/١٠٧٨زاینی دا ((نقفور بوتانیاتس))فەرمانڕەوایی عەموریە لە هەرێمی فریجیا (١٠) لە دژی ئیمپراتۆر شۆڕشی بەرپاکرد، خۆی وەکو ئیمپراتۆر

بــەناوی((نقفــوری ســێهەم))ەوە ناســاند،میخائیلی حەوتــەم دامرکاندنــەوەی یاخیبوونەکەی دا و تورکەکانی سەر بە سلێمان لەمەدا یارمەتیدەری بوون،بەڵام سلێمان زۆری نەبرد دەستی لە ئیمپراتۆر هەڵگرت و چووە پاڵ((بوتانیاتس))کە بەڵێنی پێدابوو کاری باشتری بۆ بکات بوتانیاتس تورکەکانی بۆ پاسەوانی ئەو شارانە بەکار هێنا کە لە چوونی بەرەو قوستەنتیەدا دەستی بەسەرا گرتبوون.

وەکو شارەکانی ((سیزیکوس)) و((نیقیە))و ((نیوقومیدیە))و ((خلقدونیە))و ((سکودری)) کە دەکەونە سەرکەناری دەریای مەرمەڕەی لای ئاسیاوە بۆ یەکەمجار تورکەکان خۆیانیان لەناو شارە گەورەکاندا لە ڕۆژئاوای ئەنادۆڵ بینیەوە.ئەمە ماوەی بڵاو بوونەوەیانی دا ئەگەر ئەو شارانە هەر بەڕەوڵەت سەر بیزەنتیەکان مانەوە بەڵام هێزە تازەکانی ئیمپراتۆریەت جۆرێکی نوێ بوون کە لە ڕەگەزێك پێك هاتبوون بروایان بە ئیسلام بوو ئەمانە کەیفیان بەوە دەهات هێرش بکەنە سەر دێهات و شارە نزیکەکانی ئەو دەورو بەرە هەروەها پەیوەندیکردنی نێوان پایتەختی بیزەنتی و ناوەوەی ئەنادوڵیان پچڕاند بۆیە بۆ هیچ کام لە ئیمپراتۆرەکان دەرکردنیان ئاسان نەبوو.

بەمجۆرە لە وڵاتی ئەنادۆڵ ئاژاوە زۆر بوو بە بەردەوامیش دانیشتوانەکەی دژی حکومەتی ناوەند ڕادەپەڕین و سەلجوقیەکانیش ڕۆژ بە ڕۆژ پەرەیاندەسەند نەدەتوانرا دەست بەسەر ناوچەکەدا بگیرێ و ئارام بکرێتەوە بەهۆی ئەوەی ڕێگاکان لەلایەن کۆچەرییەکانەوە تێکدەدران هاتو چۆو کەم بووەوە، سیاسەتێکی دیار و داڕێژراوی بیزەنتیش لە ئارادا نەبوو. بەکارهێنانی هێزەکانی تورك بواری بۆ سەلجوقیەکان ڕەخساند لە ڕۆژئاوای ئاسیای بچووك ئارام بگرن و جێ نشین بن تورکەکان دانیان بە سلێمان دا نا وەکو سەرکردەیەك تەماشایان دەکرد (١١) ساڵی٤٧١کۆچی١٠٧٨زاینی تەواو نەبووبوو هێزەکانی ((نیقیە))سەلجوقی لە((نقفور))ی سێهەم یاخی بوون (١٢) بەمجۆرە ئیمپراتۆریەتی بیزەنتی یەکێ لە شارە گرنگەکانی لەدەست دەرچوو کەوتە ژێر دەسەڵاتی سەلجوقیەکانەوە.

سوڵتان مەلەك شا لە دوورەوە چاودێری جمو جۆڵەکانی سلێمانی دەکرد لە ئاسیای بچووکدا وای بەباش زانی بە فەرمانڕەوایی سەلجوقی ڕۆم دایمەزرێنێ

## مێژووی سەلجوقیەکان

دوای ئـەوەی قونیـە و ئـاق سـەرا و قەیسەرییە و دەورو بەرەکـەی داگیرکـرد(١٣) لەسـاڵی٤٧٢کۆچـی/١٠٧٩ زاینیـدا ((نقفـور میلیـسیونس))لـەدژی دەسـەڵاتداری ئیمپراتـۆر نقفـوری سـێهەم ڕاپـەڕی لەگـەڵ سـلێماندا بوونـە هاوپـەیمان سـلێمان بـەڵێنی دا یارمـەتی یـاخیبوان بکـات بـۆ ئـەوەی دەسـت بەسـەر قوسـتەنتینیە بگرن،لەبەرامبەر ئەمەدا نیوەی ئەو شار و هەرێمانە لەدەستی نقفور لەکاتی شەڕدا دەردەکـرێن بـدرێ بـە سـەلجوقیەکان (١٤) بـەهۆی ئـەم ڕێکەوتنـەوە سـەلجوقیەکان((جالاتیـا و فریجیـا))یـان دەسـتکەوت ڕێگاشـیان لەبەردەمـدا والابـووەوە بۆبیسـسینیا تـا دەگاتـە دەریـای مەرمـەرە هـەروەها((لیـدیا و ئەیونیا))تـاکو دەریـای ئیجـەی داگیرکـرد (١٥)کـاتێ ((میلیـسیونس)) بـۆی نـەکرا دەست بەسەر قوستەنتینیەدا بگرێت لەبەرامبەر((ئەلکسیوس کومینن))لەسـەر تەخت لادرا سلێمان ئامادە نەبوو دان بەهیچ مافێکی ئیمپراتۆریەتی بیزەنتیدا بنێ لـەو شـار و خاکانـەی داگیرکرابـوون (١٦)،بـەڵکو لـە نیقیـە جـێ نـشین بـوو و بـە پایتـەختی خـۆی کـرد ئـەم شـارە کـە بـەجوانترین شـارەکانی جیهـانی نەسـرانی دەژمێردرێ و تەنها سەد میـل لـە قوسـتەنتینیەوە دوورە بـووە یەکـەم پایتـەختی سـەڵتەنەتی سـەلجوقی ڕۆم (١٧) ئەمـەش لەسـاڵی٤٧٤کۆچـی/١٠٨١زاینیـدا بوو..هەروەها سلێمان شاری نیقومیدیەی دایە پاڵ موڵکەکانی خۆیەوە لەو کاتەوە سەلجوقیەکان بە تەواوی لەزۆربەی ناوچەکانی ئاسیای بچووکدا دەستە بالابوون و فەرمانڕەواییان دەکرد هەر لە فوراتەوە تاکو دەریای مەرمەرە بێجگـە لەمـەش لـە باکورەوە لە دەریای ڕەشەوە تاکو دەریای سپی ناوەڕاست لە باشووری دەستیان دەڕۆیی و دەسەلاتیان هەبوو بە شێوەیەکی مەترسیدار بوون مایـەی هەڕەشـە بـۆ ئیمپراتۆریـەتی بیزەنتـی (١٨) هەرچـی چـۆنێ بـێ وا دەردەکـەوێت بیزەنتیـەکان خۆیان هاندەری تورکەکان بـوون بـۆ ئـەوەی ڕووە و ناوچەرگـەی خـاکی بیزەنتـی بجوڵێن کە شارەکانیان دەگیرا هێزی سەرەکی پێویستیان پێدەدان...

## ئیمارەتە بچووکەکانی تورك لە ئەنادۆڵ:

لەو کاتەی سلێمان خەریکی دامەزراندنی دەوڵەتەکەی بوو، هەندێ لەمیرەکانی تورك کە لەدوای شەڕی مانزیکرتەوە لەناوچەکە نیشتەجێ بوو بوون، بۆ نموونە دانشمەند و زاخاس و منکوکوچك، هەوڵیان دا لە باکووری ڕۆژهەلاتی ئاسیای بچووك لە دەوروبەری قەیسەری و سیواس و ئەماسیە، ئیمارات بۆ خۆیان دامەزرێنن، هانی دەست و پێوەندەکانیان لە تورکمان دەدا هێرش بۆ ناوچە نزیکەکان بەرن. فەرمانڕەوای هەرێمەکانیان ناچارکرد تەریك و دوورەپەرێ بمێننەوە، ڕێگاکانیان خراپ و وێران دەکرد، هانی سەرکردە تورکەکانیانیشی دەدا بۆخۆیان ئیمارەت دامەزرێنن، بوونە مایەی پوچەڵکردنەوەی ئەو هەوڵانەی بیزەنتیەکان بۆ گەڕانەوەی وڵات دەکۆشان.

(گومش تەکین (١٩) ئەحمەد دانشمەند(٢٠) سەرکردەیەکی ئەلب ئەرسەلان بوو، لەشەڕی مانزیکرت لەگەڵیا بەشداربوو، لەبەر ئازایەتی شاری(توقات) (٢١)ی پێشکەش کرد، دواجا(سیواس و بوستان)ی پێدا لەگەل (مەلطیة و نیکسار)دا، کە لە ژێر چاودێری سەلجوقیەکان فەرمانڕەوایی دەکرد (٢٢) لەوکاتەی سەلجوقیەکان لەسەر شانۆی سیاسی دوورکەوتنەوە لەئاسیای بچووك ئەحمەد دانیشمەند ئەو ناوچانەی خستە ژێردەسەلاتی خۆیەوە و سالی ٤٧٧ـ٥٧٣کۆچی/١٠٨٤ـ١١٧٧زاینی ئیمارەتی دانیشمەندی دامەزراند و سیواسی کردە پایتەخت..

بیزەنتیەکان هەمیشە لە هەوڵدانی ئەو ناوچانەدا بوون کە لەبەرامبەر تورکەکان لە دەستیان دەرچوون لە ئەنجامی ئەو ئاژاوەیەی کە بە هۆی کوشتنی (سلێمان کوڕی قوتولمش)ەوە بەرپابوو هەندێ شاریان لە دەستی دانیشمەندیەکان دەرهێنا بەڵام میر ئەحمەد دانیشمەند هەندێ لەو شارانەی گەڕاندەوە.نیکسار دوا شەڕبوو پێش مردنی لە سالی ٤٩٩کۆچی/١١٠٦زاینی دا گەڕاندیەوە.

هەندێ لە موڵکەکانی بیزەنتیەکان لە ئەنادۆڵ لە ژێر دەسەلاتی ئەحمەد دانیشمەندا بوون هەر لەسەرەتای دامەزراندنی ئیمارەتەکەیەوە لە سیواس تاکو ئەو کاتەی سەلیبیەکان هاتنە ناو ئەو ناوچانەی لە ژێر دەسەلاتی دانیشمەندیەکان

## مێژووی سەلجوقیەکان

بوون لە ئەنادۆڵ لە ساڵی ٤٩٠کۆچی/١٠٩٧زاینیدا.((زاخاس))میرێکی تورکە ئیمارەتێکی لەبەشی ڕۆژئاوای ئەنادۆڵدا هەبوو و دەستی بەسەر شاری ئیزمیردا گرت کە دەکەوێتە سەر دەریای ئیجە هێزێکی دەریایی دامەزراند توانی چەند دورگەیەکی نزیك بگرێت هەڕەشەی لە قوستەنتینیەش دەکرد (٢٣) ئەم میرە توانی سەر بەخۆبێ بەهۆی ئەو شارانەی دەستی بەسەرا گرتن و لاوازی و بێ هێزی ئیمپراتۆریەتی بیزەنتیەی بەهەل زانی لەلایەکەوە لەلایەکی دیکەوە سلێمان ڕێگای لێ نەدەگرت (٢٤) چونکی ئەویش خەریکی خۆ قایمکردن بوو لەو شارانەی گرتبوونی.

((بنومنکوکچك)) ساڵی ٤٦٤-٦٥٠ کۆچی / ١٠٧١-١٢٥٢ زاینی کە بنەماڵەیەکی تورکن، ئیمارەتێکیان لەو ناوچەیەی دەکەوێتە ڕۆژئاوای فوراتەوە دامەزراند، کە ئەم شارانە دەگرێتەوە ((ئەرزەنجان،کماخ،دیورکی))، باپیرەگەورەی ئەم خێزانە ((منکوکچك غازی)) یەکێك بوو لەو فەرماندە تورکانەی کە لە شەڕی مانزیکرت بەشداربوو لەتەك ((ئەلب ئەرسەلان))دا و شاری ئەرزەنجانی بە پایتەختی خۆی کرد.

ئەوەی شایانی وتنە، ئەو میرانە، ئیمارەتەکانیان سەربەخۆ بوو، سەر بە دەوڵەتی سەلجوقی نەبوون. ((زاخاس)) میری ئەزمیر و دانیشمەند لە کبادوکیە، نەچوونە ژێر دەسەڵاتی سلێمانەوە، بەمجۆرە ئاسیای بچووك دەسەڵاتێکی یەکگرتووی نەبوو تاکو دامەزراندنی سەڵتەنەتی قونیە لەساڵی ٤٨٥ کۆچی /١٠٩٢ زاینی، لەسەر دەستیی ((قلج ئەرسەلان کوڕی سلێمان))(٢٥) بێگومان ئەم ئیماراتانە کە لەسایەی جوڵانەوەی فراوانبوونی سەلجوقی لەئاسیای بچووکدا دامەزران و لەژێر پەردەی سەلجوقیدا بۆ خۆیان کاریان دەکرد ئەرکی گەڕاندنەوەی ئاسیای بچووك کارێکی گران و ئاستەنگ بوو لەبەردەم بیزەنتیەکاندا.

کەنارەکانی باکووری ئاسیای بچووك لەسەر دەریای ڕەش بە ((ترابزون)) و کەنارەکانی باشوورەوە لەسەر دەریای سپی ناوەڕاست تاکو ((قیلیقیە)) لە ژێر دەسەڵاتیی بیزەنتیەکان مانەوە، هەروەها هەندێ لەشارەکانی ناوەڕەش لە

ڕۆژهەلات و ولاتی شام وەکو((ئەنتاکیە)) و ڕۆژهەلاتی فورات وەکو ((ڕەها)) هەر سەر بە ئیمپراتۆرییەتی بیزەنتیی مانەوە. لەشکری بیزەنتیان تیادا هەبوو، سەرکردەکانی ئەرمەنیان لێ بوو کە خۆیانیان سەر بە قوستەنتینیە دادەنا.

## ئیمارەتە ئەرمەنیەکان لە قیلیقیە:

کاتێ سلێمان شاری ((نیقیە))ی بە پایتەختی سەڵتەنەتەکەی کرد. نەسرانیەکانی ئاسیای بچوك ترسیان لێ نیشت، بەتایبەتی ئەرمەنیەکان، ڕازی نەبوون لە ژێر دەسەلاتی سەلجوقیدا بمێننەوە. زۆربەیان بۆ ناوچە ئەرمەنیەکان لە ((تۆرۆس))کۆچیان کرد، کە دەکەوێتە قوژبنی باشووری ڕۆژهەلات لە ئاسیای بچووك. دوای ئەوەی بۆیان دەرکەوت ئەم ناوچانە تارادەیەك لە سەرە ڕێگایی سەلجوقیەکانەوە دوورە لە ((قیلیقیە))دا ئەرمەنیەکان بوونە هێزێکی گەورە، بەرادەیەك مێژوونووسی(( غروسیە)) لەو چەرخەدا پێی دەگوت(( ئەرمینیای نوێ)) (٢٦) لەراستیدا کۆچکردنی ئەرمەنیەکان لە دەوروبەری گۆلی وانەوە بۆ((قیلیقیە)) دوای شەڕی مانزیکرت، گۆڕانی ڕووی ناوچەکەی لێ پەیدابوو، سەرەڕای ئەوەش دەوڵەتی بیزەنتی ئەرمەنیەکانی بەسەربازی خۆی دادەنا و لەڕووبەڕووبوونەوەی مەترسی سەلجوقیەکاندا پشتی بەوان دەبەست، ((فیلاریت))ی ئەرمەنی، توانی لەو ناوچەیەدا دەوڵەتێکی ئەرمەنی دامەزرێنی (٢٧) لەبەر ئەوەی دەوڵەتی ئەرمینیا لە ((قیلیقیە)) ڕۆڵێکی بەرچاو لە ژیانی دەوڵەتی سەلجوقیدا دەبینێ، دەبێ بەکورتی باس لە مێژووی کۆچکردنی ئەرمەنی بکەین بۆ ئەرمینیای بچووك، وردەکاری پەیوەندیەکانیان بە سەلجوقیەکانەوە بۆ کاتی خۆی لەم باسەدا بەجێ دەهێلین.. دوای ئەوەی سەلجوقیەکان دەستیان بەسەر جێگاکانی ئەرمەنیەکاندا گرت، ئەرمینیا دەستیان بە کۆچکردن کرد لە سەرچاوەی فورات دەژیان، لە دەوروبەری ((مەلطیة)) جێگیربوون، ئیمپراتۆرییەتی بیزەنتی ئەمەی پێ باش بو، جێگایەکی پان و بەرینیان لە (( کە بادۆکیە)) بۆ سازاندن، ئەمە وای کرد بە لێشاو بۆ ئەو شوێنە کۆچ بکەن. لە ئەنجامی پەل وپۆ هاوێشتنی سەلجوقیەکان و زیاتر بلاوبوونەوەیان لە ئاسیای بچووك، ئەرمەنیەکان بەدوای جێگایەکی دیکەدا گەڕان. ڕوویان لە ((قیلیقیە))ی شاخاویی کرد لە

## مێژووی سەلجوقیەکان

باشووری ڕۆژهەلاتی ئاسیای بچووك، ئەو شوێنەیان بەجێ هێلا کە تیایدا نیشتەجێ بووبوون، (٢٨) بەرە بەرە ئەو کۆچبەرە لادێیانە هاتنە دەشتاییە بەرینەکەی((قیلیقیە))، دوای ئەوەی لەناوچە شاخاوییەکاندا قەلای سەختیان لێدا، توانیان دەست بەسەر ئەو ناوچە شاخاوییەدا بگرن، شایانی وتنە ئەم ناوچەیە ژمارەیەك قەلاو جێگای سەختی لێیە کە ئەو ڕێگایە لە ئاسیای بچووکەوە بۆ ولاتی شام دەڕوات بەسەریا زالبوون، لەوانە(( ئەزنە)) (٢٩) و ((تەرسوس)) (٣٠) و ((مەسیسە)) (٣١) و ((عین زربی)) (٣٢)، کە بە دەروازە ئیسلامیەکان (٣٣) ناسرابوون. بووە هێلی بەرگری پێشەوە لە ئیمپراتۆرییەتی بیزەنتی.دەست بەسەراگرتنی ئەوجێگایانە لەلایەن ئەرمەنیەکانەوە کاریگەرییەکی ئەو جێگایانە لەلایەن گەورەی دەبێ لەسەر ئاسایشی ئیمپراتۆریەت و بارودۆخی دەولەتی سەلجوقی ڕۆم.

ژمارەیەك فەرماندەی ئەرمەنی دەرکەوتن، ئەوانە ڕۆلێکی بەرچاویان گێڕا لە مێژووی ئەم ناوچەیەدا، لەمیانەی سوود وەرگرتن لە ململانێی نێوان سەلجوقی– بیزەنتی، جۆرە سەربەخۆییەکیان لەسەر حیسابی ئەو دووهێزە بە دەست هێنا. لەوانە((فیلاریت)) کە ((مەرعش)) و ((ڕەعبان))ی خستە ژێر دەسەلاتیی ئەرمەنیەکانەوە. هەروەها ((بوستان و مەلطیة)) کە لەدەستی تورکیان دەرهێنا، خۆی بەهێزکرد و میرە ئەرمەنیەکانی دەوروبەریش، کە ((تەرسوس)) و((مەسیسە)) و ((عین زرب)) یان لە ژێر دەستیا بوون، چوونە پالی ئەو، کە دەسەلاتیان فراوانتر بوو(( ڕەها)) یان داگیرکرد کە سەر بەئیمپراتۆریەتی بیزەنتی بوو لەسالی ٤٧٠ کۆچی /١٠٧٧ زاینی دا. بۆ سالی دواتر (( ئەنتاکیە)) یان وەگرتەوە، ئەم شارە دانیشتوانەکەی لە ترسی سەلجوقیەکان چوونە ژێر دەسەلاتی ئەرمەنیەوە. ئیتر ((فیلاریت)) دەستی بەسەرئەو شوێنانەدا گرت لە ڕۆژئاواوە لە ((تۆرۆس))ەوە دەست پێدەکات، تا ئەو دیوی ڕووباری فوڕات لە ڕۆژهەلات، لە ڕۆژهەلات و باکوورەوە لە تورکە سەلجوقیەکانەوە نزیك بوونەوە، لە ڕۆژئاواشەوە بوونە هاوسێی ئیمپراتوریەتی بیزەنتی. (٣٤) هەروەها ((ئۆشین کوڕی هیسوم)) مالی هیسومی بەناوبانگی دامەزران کە فەرمانڕەوایی ئەو ناوچە

شـاخاویانەی کـرد کـە دەکەوێتـە رۆژئـاوای دەروازەکـانی قیلیقیـەوە. قـەڵای سـەختی((لامـبرون)) کـە بەسـەر تـۆرۆس و دەشـتایی قیلیقیـەدا دەڕوانـێ، کـردە بارەگای خۆی، ئەمە وایکرد ئەم خێزانە زیاتر بە بیزەنتیەکانەوە پەیوەندی هەبێ، وادیارە، ((ئۆشین)) لەگـەل ئیمپراتـۆری بیـزەنتی (( ئەلکسیوس کۆمنین (٤٧٤- ٥١٢ کۆچـی) دا یارمـەتی یـەکتریان دا کـە نازنـاوی(( جێگـری قیلیقیـەی))ی پـێ بەخـشی، دواجـار هـەلی خـەریکبوونی سـەلجوقیەکانی قۆسـتەوە کـاتێ خـەریکی بەرەنگاربوونەوەی سەلیبیەکان بوو، دەستی بەسەر شاری (( ئەدەنـە)) و هەنـدێ لەو ناوچانەی دەکەونە رۆژهەڵاتی دەروازەکانی قیلیقیـەدا، گـرت، کـە ئەوکاتـە لـە ژێر دەسەڵاتی قوستەنتین کوڕی رۆبین بوو (٣٥) ((رۆبـین)) کـە سـەر بـە خێزایـی ((بقراط)) بوو، لەو ناوچەیەی دەکەوێتـە بـاکووری رۆژهـەڵاتی سیـسەوە (٣٦) لـە ٤٧٣ کۆچی جێگیربوو، ئەمە وایکـرد، ئـەم بەشـەی ئەرمـەن زیـاتر پەیوەنـدی بـە چەند هێزێکی جیاوازەوە هـەبێ کـە دواتـر لـە وڵاتـی شـام دەرکـەوتن. کوڕەکـەی ((قوسـتەنتینی یەکـەم)) بـووە جێنـشینی و قـەڵای ((بـارتزربرت)) کـە دەکەوێتـە باکووری رۆژئاوای سیسەوە، کردە بارەگای خۆی. دواجار بەرەو رۆژهەڵات رۆیشت و قـەڵای ((ڤاهکـا)) کـە دەکەوێتـە سـەر رووبـاری ((جاکـسو)) لەچـیای تـۆرۆس داگیرکرد، ئەوەی شایانی باسە، ئەم خێزانە، لـە هـەوادارانی کەنیـسەی ئەرمـەنی جیـاوازی خوازبـوو، دوژمـنی بیزەنیتـەکانیش بـوو، ((رۆبـین)) لـە هـەل دەگـەڕا دەسەڵاتی خۆی فراوان بکا لەسەر شانی سـەلجوقی و بیزەنتیـەکان.(٣٧) هەنـدێ لە ئەرمەنیـەکان لـە بـاکووری چیای تـۆرۆس لـە دەرەوەی قیلیقیـە بڵاوبوونـەوە، ئەمەش بـەگوێرەی هەنـدێ لـە سەرچاوە لاتینیـەکان کـەوا پیـاوانی لەشکرکێـشی سـەلیبیەی یەکـەم، هـەر کـە لەشـاری قەیسەری نزیـك بوونـەوە لـە هـەرێمی (کـە بادوکی)، یەکسەر چوونە ناو وڵاتی ئەرمەنـەوە، ئەرمنیـەکانیش لـەو دەوروبـەرەدا پێشوازی لێکردن.(٣٨)

## پەیوەندی سەلجوقیەکان بە بیزەنتیەکانەوە دوای دامەزراندنی سەڵتەنەت

((ئەلکسیوس کومینن)) لەساڵی ٤٧٤کۆچی/١٠٨١زاینی چووە سەر تەختی ئیمپراتۆریەتی بیزەنتی خێزانێکی نوێ ی لە مێژووی بیزەنتیەکان دامەزراند ئەم ئیمپراتۆرە بە دووربینی سیاسی و کاری سەربازیدا بەناو بانگ بوو ئەم خەسڵەتانەی بەکار هێنا بۆ ڕزگار بوون لەو کێشانەی ڕووبەڕووی دەسەڵاتەکەی بوونەوە گرنگترین کێشە، کێشەی سەلجوقیەکان بوو سلێمان لە پایتەختەکەیەوە((نیقیە))هێرشی دەبرد لە هەرێمی ((بیسینیا))بڵاو دەبووەوە هەوڵی ئەوەشیان دا لە دەریای ئیجە بپەڕنەوە بۆ کەناری ئەورووپی (٣٩) بەڵام((ئەلکسیوس))توانی هەندێ لەو شوێنانەی داگیریان کردبوو لە کەناری ڕۆژهەڵاتی دەریای ناوبراو دەریان بکات.لەمەدا شەڕی چەتەگەری پەیڕەو کرد و هەندێ سەکەوتنی بەدەست هێنا ناچار سەلجوقیەکان دەستیان لە هەندێ شوێن هەڵگرت بەڵام ئەم هەوڵانە دژی سەلجوقیەکان لەگەڵ لەشکرکێشی نورماندیەکاندا بۆ بەلقان ڕاگیرا وای دانا دەرکردنی تورکەکان لە ئاسیای بچووك پێویستی بە هەوڵێکی زۆر و درێژخایەن هەیە جارێ ئەمەی بۆ نەلواوە.وای بە پێویست زانی بۆ ڕۆژئاوا بڕوات بۆ بەربەرچدانەوەی هێرشی نۆرمانیەکان بۆ ئەوەی پشتەوەی دڵنیا بکات لەگەڵ سلێماندا ڕێکەوتنێکی بەست کە:

- سەلجوقیەکان ئەو جێگایانە تا دەگاتە ڕووباری((سنغاریوس))لەسەر دەریای ڕەش و (نیقومیدیە) کە دەکەوێتە سەر کەنداوی باکووری (دەریای مەرمەرە) و ڕووباری دراکۆن ببێتە سنووری نێوانیان و بدرێتە سەلجوقیەکان.
- سلێمان دەبێت حەوت هەزار جەنگاوەر بۆ یارمەتی ئیمپراتۆربنێرێ کە شەڕی نورمانیەکانی دەست پێ کرد و هێرش نەکاتە سەر ناوچەی بیسینیا و ئەو ناوچانەی دیکەی ژێر دەسەڵاتی بیزەنتیەکان...

بە پێی ئەم ڕێکەوتنە ئیمپراتۆر ناچار بوو هەندێ ناوچە بۆ سەلجوقیەکان چۆڵ بکات (٤٠)

## مێژووی سەلجوقیەکان

ئارامی و ئاشتی کەوتە نێوان سلێمان و ئەلکسیوسەوە دوای ئەم ڕێکەوتنە لەساڵی ٤٧٦کۆچی/١٠٨٣زاینی ئەلکسیوس هانای بۆ سلێمان برد کاتێ لە ئەوروپا لەسەر دەستی ((بۆهیموند کوڕی جوبسکارد))توشی شکست هات،سلێمان حەوت هەزار جەنگاوەری بۆ نارد بەهۆی ئەو یارمەتیدانەوە ئیمپراتۆر توانی نورمانیەکان لە جێگای خۆیاندا ڕابگرێ و لە شالیا بەسەریاندا زاڵ بوو، (٤١)

هەرکە ئەلکسیوس لە بولقان کێشەکانی چارەسەر کرد خۆی بۆ کێشەی سەلجوقیەکان تەرخان کرد و نەیتوانی جڵەوی سەرکێشی دەستو پێوەندەکانی سلێمان ڕابگرێ و سەرەڕای ئەو ڕێکەوتنەی نێوانیان بڕیاریدا بەرەو قونیە بڕوات بۆ لەناو بردنی هێزەکانی سەلجوقی.سەلجوقیەکان لەبەرامبەر بیزەنتیەکان پاشەکشەیان کرد لەکاتی کشانەوەیاندا کێڵگەی گەنمە شامیەکانیان دەسوتاند (٤٢) لەپڕ ئەلکسیوس چوونە پێشەوەی ڕاگرت ڕەنگە لەترسی قاتو قڕی و برسێتیدا بووبێ جۆرە گومانێکی لەلا پەیدا بوو لەو تورکانەی هاوپەیمانی بوون (٤٣)،ناچار بوو جارێکی کە لەگەڵ سلێماندا ڕێك بکەوێتەوە.

ڕێگای دایە سلێمان،لەجیاتی بیزەنتە کارو باری قیلیقیە و ئەنتاکیە و مەلتیە بەڕێوەبەرێت بەمەرجێ جڵەوی دەست و پێوەندەکانی بگرێت بەمجۆرە سلێمان دوو ڕێگای گرنگی کە ئاسیای بچووکدا تێدەپەڕێ لە ڕۆژهەڵاتەوە بۆ ڕۆژئاوا کەوتە ژێر دەسەڵاتیەوە.موڵکەکانی کەوتە هاوشانی موڵکەکانی سوڵتان مەلەك شا لە وڵاتی شام و جەزیرەدا.(٤٤)

بۆئەوەی متمانەی دانیشتوانی وڵاتە داگیرکراوەکان بەدەست بهێنێ ئەوانەی دێهات و جێگاکانی خۆیان چۆڵ نەکردبوو،سیاسەتێکی ئازادانە و کراوەی بەرامبەر جوتیارەکان پەیڕەو کرد.شەڕەکان زەویە کشتوکاڵیەکانی وێران کردبوو،خاوەنەکانیان دەستیان لێ هەڵگرتبوو بەسەر جوتیارەکانیدا دابەش کرد لەبەرامبەر ئەوەدا ((جزیە))یان دەدا.

بەمە ئەو چینەی بەلای خۆیدا ڕاکێشا کە جەورێکی زۆریان پێشتر بینیبوو لەبەر گرتنی ئەم سیاسەتە بووە کۆسپ لەپێش ((ئالی کومینن))و پیاوانی لەشکرکێشی سەلیبی یەکەم کە لەکۆتایی سەدەی پێنجەمی کۆچیدا/یانزەهەمی زاینی لە

ڕۆژئـاواوە دەهـاتن بـۆ گەڕاندنـەوەی خـاکی ئـەنادۆڵ لـە تورکـەکان دوای ئـەوەی هۆزەکانی سەلجوقی و تورکمانی تێدا بڵاو ببوونەوە و چادریان تێدا هەڵدابوو کـە لەوەڕگاکانی فەرغیزیەکان دەچوو، (٤٥)

## پەلو پۆ هاوێشتنی سەلجوقیەکان بەرە و باشوور

گرتنی ئەنتاکیە دوای ئەوەی سلێمان کێشەکانی سەڵتەنەتی لەگەڵ ئیمپراتۆریەتی بیزەنتیدا چارەسەر کرد کەوتە هەوڵی پەلو پۆ هاوێشتن بەرە و باشوور لەوە زیاتر نەیتوانی بێدەنگ بێ لەئاست پەرەسەندی دەسەلاتی ئەرمـەنی کـە((فیلاریـت))لـە قیلیقیە و ولاتی شام دایمەزراندبوو بە تایبەتی ببووە ئاستەنگ لە ڕێگای پـەلو پـۆ هاوێشتنی بەرە و ولاتی شام کە بە ئامانجی خۆی کردبوو و هەوڵی بۆ دەدا.دەڵێن دان پێدانانی ((فیلاریت))بە دەسەلاتی ئەلکسیوس گومانی بۆ پەیدا کردبـوو بۆیـە هەوڵی دەدا خۆی لەگەڵ میرە عەرەبەکانی حەڵەب و سوڵتان مەلەك شا بگونجێنێ تـاکو مەملەکەتەکـەی بپـارێزێ ((ابـن الکـثیر)) لـەم بارەیـەوە دەڵـێ:سـەرکردەی ئەرمەنیەکان لەگەڵ سوڵتان مەلەك شادا کۆبـووەوە و لەسەردەسـتی ئـەو بـوو بـە ئیسلام مەلەك شا فەرمانی دا لە((ڕەها)) بمێنێتەوە ئیتر تا مرد هەر لەوێ مایـەوە (٤٦)((میخائیلی سریانی))دەڵێ: فیلاریـت ئامـادە بـوو ببـێ بـە ئیسلام لـە پێنـاو بەرژەوەندی تایبەتی خۆیدا.(٤٧)٠

لە ئەنجامی سیاسـەتی نزیکبوونـەوە لەگـەڵ هێـزە ئیـسلامیەکاندا و خـەریکبوونی فیلاریت بە ناکۆکی لە نێوان تورکەکان و بیزەنتیـەکان هـەروەها ئـەو ناکۆکیانـەی نێوان کەنیەکانی ئەرسەدوکس و یەعقوبی و ئەرمەنی، دەسـەڵاتەکەی لـە ئـەنتاکیا خستە مەترسیەوە دانیشتوانی شـارەکە لـە دژی دەسـەڵاتەکەیدا ڕاپـەڕین ئـەویش زۆر بە توندی ئەو جوڵانەوەیەی دامرکانـدەوە و سـەرکردەکانی شـارەکەی گـرت و دەسـتی خـستە سـەر زەویـو زار و موڵکەکانیانـەوە..لـەلای دانیـشتوانەکە بـووە قێزەوەن ئەم بـارو دۆخـە ئـاڵۆزە بـووە هـۆی نائـارامی لـە بـاکوری ولاتـی شـام و لەدەست چوونی هەرێمەکانی ڕۆژهەلات کە تورکـەکان داگیریـان کـرد و دەسـەلاتی بیزەنتی کەوتە باری ڕووخانەوە.هەرچـی چـۆنێك بـێ نزیـك بوونـەوەی فیلاریـت و

مەلەك شا و سلێمان بە پیلانێکی دژی خۆی داینا بۆیە بڕیاریدا دەوڵەتی فیلاریت لەناو بەرێت..

ساڵی ٤٧٧کۆچی/١٠٨٤زاینی فیلاریت ئەنتاکیای بەجێ هێشت لە ئەنجامی ئەو ڕاپەڕینەی دژی دەسەڵاتەکەی بەرپا بووبوو هێزێکی سەربازی لەوێدا هێشتەوە دانیشتوانی شارەکە خۆیان ((والی))یەکی بەڕەگەز فارسییان بەناوی((ئیسماعیل))دامەزراند دوژمنایەتی فیلاریت بە تایبەتی کوڕەکەی کە ئەودەمە لە شارەکەدا زیندانی بوو ڕۆیشتنی ((فیلاریت))یان بە هەل زانی و لەگەڵ ((والی))دا ڕێکەوتن شارەکە بەدەستی سلێمانەوە بدەن هەر بۆ ئەم مەبەستە هێنایان.(٤٨)

سلێمان بە پەلە خۆی گەیاندە ئەنتاکیە ئەو ئاژاوەیەی لە دەوڵەتی((قیلاریت))دا هەبوو بەهەل زانی ((اباالقاسم))ی یاریدەدەری کردە فەرماندەی شاری((نیقیە))و بە هێزێکی سوپاوە کە سێ سەد سوارەو ژمارەیەکی زۆری پیادە بوو لە پایتەختەکەی دەرکەوت ڕێگای قلیقیەی لەبەر گرت، هەندێ شاری سەر بە قیلیقیەی داگیرکرد وەك((تەرسوس))و((تۆرۆس))و((مەسیسە))و((عیق زربی)(٤٩) گەیشتە ئەنتاکیە و لەوێ لە پێش پەرژینەکانیدا لەشکرەکەی ڕاگرت دواجار بە پەیژە چوونە سەر پەرژینەکان و لەگەڵ ((والی))دا لەبارەی چوونە ناو شارەکەوە وتووێژیان کرد لەمانگی شەعبانی ساڵی٤٧٧کۆچی کانونی یەکەمی١٠٨٤زاینی دەرگا واڵابوو و سوارەکانی سەلجوقی چوونە ناو شارەکەوە بەڵام هەندێ لە دانیشتوانی شارەکە کەوتنە بەرگریکردن لە شەقام و کۆڵانەکانی شاردا پێکدادان لە نێوانیاندا ڕوویدا تا بەسەریاندا سەرکەوت دواجار سوپای سەلجوقی ئابلۆقەی قەڵای((قسیان))ی دا بۆماوەی مانگێك ئابلۆقەکە بەردەوام بوو تا توانیان بیگرن.سلێمان بانگەوازی کرد کەژیانیان پارێزراوە بەکارهێنانی هێزی لەلایەن سوپاکەوە قەدەغەکرد،هەروەها نەیهێشت بچنە هیچ ماڵێکەوە یان ژنیان لێ بخوازن...بەمجۆرە دانیشتوانی ئەنتاکیە دڵنیابوون لەژێر دەسەڵاتی سەلجوقیدا (٥٠) هەستیان بە ئەمن و ئاسایش کرد((ابن االعدیم))بە دوورو درێژی لەبارەی داگیرکردنی ئەنتاکیەوە بۆمان دەگێڕێتەوە دەگاتە ئەو ئەنجامەی کەوا لەنێوان

فیلاریت و دانیشتوانەکەدا ناحەزی هەبوو،ئەو شەڕەش کە ڕوویدا هۆکەی ئەوەبوو وایـان زانـی ئەوانـەی هێرشـیان هێنـاوە سـەربازی((فیلاریـت))ن ئـەوەش ڕوون دەکاتــەوە هــیچ ڕێکــەوتنێکی لــەوەوپێش لــەنێوان ســلێمان و کەسـایەتیەکانی شـارەکەدا نـەبوو(٥١) سـلێمان دوای ئـەوەی ئەنتاکیـەی خـستە ژێـر دەسـەڵاتی خۆیـەوە نامەیـەکی بـۆ مەلـەك شـا نـارد هـەواڵی سـەرکەوتنەکەی پـێ ڕاگەیانـد و ئاشکرای دەکات ئامادەیە لە ژێر فەرمانی ئەودا بێت.(٥٢)
بۆ ئەوەی نەك پرۆژەکانی لە وڵاتی شام ڕابگرێـت هەرچـەند داگیرکردنـی ئەنتاکیـە ئەو توانایەی پێدەدا بتوانێ سەربەخۆیی خۆی لە سەلجوقیەکان ئاشکرابکات.ئـەم هەنگاوە ئەگەر بنرێت ئـەوا مەترسـی دەکەوێتـە نێـوان مـیرە موسـڵمانەکانەوە لـە وڵاتی شام ئەوانەی لە پرێکا لەگەڵیدا بوونە دراوسێ.(٥٣)

## بەرەو حەڵەب چوون ـ کۆتایی سلێمان کوڕی قوتولمش

دوای ئەوەی لە ئەنتاکیا دەسەڵاتی چەسپا، سلێمان کەوتە کەڵکەڵەی پەلهاوێشتن بەرە و ئەو ناوچـانەی سـەر بـەئیمارەتی حەڵـەبن تـا لـە دواییـدا دەسـت بـە سـەر ((حەڵەب))یشدا بگرێت.ئـەو کاتـەی لـە ئەنتاکیـەدا بـوو ژمارەیـەك لـە میرەکـانی مرداسیەکان هاتنە پاڵی لەگەڵ هەنـدێ لەسـەربازەکانی ((شـرف الدولـة مـسلم بـن قـریش العقیلـی)) کـە حـاکمی حەڵـەب بـوو هانیـان دا دەسـت بەسـەر حەڵەبـدا بگرێ.ئەمە ئەوە دەگەیەنێ حەڵەبیەکان لەنێوان خۆیاندا ڕێك نـەبوون.داگیرکردنـی ئەنتاکیە،بووە هـۆی هەڕەشەکردن لـە((شـرف الدولـة)) هـەر کـە هـەواڵی دەسـت بەسەرا گرتنی ئەنتاکیا بەدەستی سلێمان بیست. دەستی بە خۆ ئامادە کردن کرد تا بەرەنگاری بکـات بەپەلـە هاوپەیمانیـەکی دروسـت کـرد لەگـەڵ مـیری تورکمـان ((جبق))و هەندێ لە عەرەبەکان (٥٤) بـۆ ڕووبـە ڕوو بوونـەوە و بەرپـەرچدانەوەی کە سلێمان شاری ئەنتاکیەی کردە بنکەی هێرشەکانی بۆ گرتنی قـەڵاکانی دەور و بەر ئەم پەلەی کرد لە بەسـتنی ئـەو هاوپەیمانیـە.بـە تـەواوی دەرکـەوت دەیـەوێ حەڵەب داگیر بکات بە بەڵگەی ئەوەی کۆمەڵێك لە((بنی کلاب))ی کـردە سـەرباز و لەگەڵ سەربازەکانی خۆیـدا نـاردنی بـۆ هێرشـکردنە سـەر حەڵـەب و ((سـەرمین))

(٥٥) و((براعـە)) (٥٦) ((شـرف الدولـة)) نامەیـەکی بـۆ نـارد داوای ئـەو مـالّ و سامانەی لیّ دەکرد کە فیلاریت بۆی دەنارد چونکی سەر بەوە و هەڕەشـەی یـاخی بوونیشی لیّ دەدا.

ئەم داوایـەی ((شـرف الدولـة)) بەهانـە بـوو بـۆ شـەڕ دەسـت پـیّ کـردن و گوشـار خستنە سەر سلێمان تا لەناوچەکە دەرچێت. بـەلاّم ئەمـەی وای وەلاّمـی دایـەوە کەوا دروشمی ئەو ملکەچکردنە بۆ سـولّتان و بـەناوی ئـەوە خوتبـەدەدا و بـەناوی ئەویـشەوە سـکە لێـدەدات ئـەو پارەیـەش کـە فیلاریـت دەیـدا((جزیـە))ی لەسەرنییە.(٥٧)

ئاشـکرایە بەسـتنەوەی ئەنتاکیـە بـە سـەلّتەنەتی سـەلجوقیەکانی ڕۆمـەوە لـەناو ڕیزەکانی موسـلّمانەکاندا نـاکۆکی پەیـدا کـرد.سـلێمان و ((شـرف الدولـة))کەوتنـە ململانێیەکی ئاشکرا،دوای ئەوەی یەکەم داوای دووەمی ڕەفز کرد ((شرف الدولـة)) هێرشی کردە سەر دەور و بەری ئەنتاکیە و تالاّنی کرد سلێمان لـە تۆڵـەی ئەمـەدا دەور و بەری حەڵەبی تالاّن کرد کاتیّ دانیشتوان شکایەتی حـالّی خۆیـان لای کـرد پاساوی ئەوەی هێنایەوە کەوا((شرف الدولة)) لەپێشدا دەستدرێژی کردۆتە سەر. بەلاّم هەرچی بردبوو بۆیانی گەڕاندەوە و پێـی گـووتن:((مـن خـووم نـەگرتووە بـە تالاّنکردنی مالّی موسلّمانەوە و ئـەوەی شـەرع ڕێگـا نـادا دەسـتی بـۆ درێـژ ناکـەم (٥٨) دواجـار هـەردوولا کەوتنـە شـەڕێکی خوێنـاوی لـە ڕۆژی شـەممەی مـانگی سەفەری ساڵی٤٧٨کۆچـی/٢٠حـوزەیرانی ١٠٨٥زایینـی لـە نزیکـی ئەنتاکیـە نزیکـی ڕووبـاری عفـرین (٥٩) شـەر ڕویـدا تیایـدا سـلێمان سـەرکەوت کەسـی وا لەگـەلّ ((شرف الدولة))دا نەمایـەوە کـە شـەڕەکە سـەختر بـوو هەولّیـدا بکشێتەوە بـەلاّم نەیتوانی دەرچیّ و لەوشەڕەدا کوژرا.(٦٠)

## چەند هۆکارێك ڕۆڵی دیاریان گێڕا لەسەرکەوتنی سلێماندا لەمانە :

- شەڕەکە لە نیوەڕۆدا دەستی پێکرد کە خۆر بەرە و ئاوابوون ڕۆیـشت هێزەکـانی ((شرف الدولة)) ڕووبـەڕووی خۆرەکـە بـوون چـاویان ڕێـشکە و پێـشکەیان دەکـرد ئەمە کاری کردە سەر توانای شەڕکردنەکەیان.(٦١)

- هەر لە دەست پێکردنی شەڕەکەدا تورکمان ((جبق))کشایەوە هێزەکانی چوونە پاڵ سلێمان بەوەی لەیەك ڕەگەزن ئەمە تای تەرازووی شەڕەکەی لاسەنگ کرد.(٦٢)

- هەندێ لە هاوپەیمانانی ((شرف الدولة))بە جێیان هێشت لەکاتی شەڕەکەدا و بە تەنها مایەوە لەوانە ((بنوعقیل)).

سلێمان دوای ئەوەی سەرکەوت بەرە و حەڵەب ڕۆیشت، تەرمی ((شرف الدولة)) شی هەڵگرتبوو لە بەرامبەر پەرژینی شارەکەدا تەرمەکەی دانا بە هیوای ئەوە بوو خۆیان بەدەستەوە بدەن بەڵام وا دەرنەچوو ئەوجار ئابڵوقەی شارەکەی دا.(٦٣)

**بارودۆخی ناوخۆی حەلەب ئاڵۆز بوو دوای کوشتنی شرف الدولە.**

ئامۆزاکەی((سالم کوڕی مالك ))چووە ناو قەڵاکەوە و خۆی تیادا حەشاردا((شریف حسن بن هبة الله الحتیتی))کارو باری شاری بەدەستەوە گرت.سلێمان داوای لێکرد کە چارەنووسی حەڵەب کەوتبووە ژێر دەستی داوای کرد شارەکە بەدەستەوە بدات ڕازی نەبوو و مکوڕ بوو لەسەر شەڕکردن ئەوجار ئابڵوقەکەی توندتر کردەوە (٦٤) ((حتیتی))لە بارێکی شلۆقدا بوو،ئەو پێویستیانەی لەبەر دەستدا نەبوو بتوانێ بەرەنگاری سەلجوقیان بکات و ئابڵوقەکەش لەوانە بوو درێژە بکێشێ بە تایبەتی سلێمان لە شاری((قنسرین))ی نزیکی حەڵەب بنکەیەکی سەربازی هەبوو کە لەوێوە هێرشی دەکردە سەر شارەکانی باشووری ئیمارەتەکە ئەوە بوو شاری((نغمان)) (٦٥) و((کفرطاب)) (٦٦) و((لطمین))(٦٧)ی داگیرکرد بۆیە نامەیەکی بۆ سوڵتان مەلەك شا نارد لە کوشتنی ((شرف الدولة))ی ئاگادار کردەوە و داوای لێکرد بێت بۆ حەڵەب و لاشەکەی وەرگرێ(٦٨)

مەلەك شا داواکەی((حتیتی))قەبوڵکرد لەگەڵ هێزێکدا بەرەو شارەکە کەوتە ڕێ بەڵام بە سستی دەجوڵا سلێمان هەلی بۆ ڕەخسا ئابڵوقەکە توندتر بکات.

((حتیتی))ناچار بوو نامە بۆ((تاج الدولة توتوش))ی برای مەلەك شا و دەسەڵاتداری دیمەشق بنێرێ بەڵێنی پێ دەدا شارەکەی بەدەستەوە بدات.(٦٩)

((توتوش))تەماحی کرد ئەم بانگهێشتەی پێ خۆش بوو بە تەمای ئەوە بوو دەست بەسەر ئەنتاکیەدا بگرێت دوای حەڵەب و بەرە و باکووریش دەست درێژ

بکات.بۆیە بە سوپایەکەوە کەوتەڕێ بۆ یارمەتی دانی شارە ئابلوقەدراوەکە((میر ئەرتەق))کە یەکێکە لە میرەکانی تورکمان دەستی یارمەتی درێژکرد کە سلێمان بەمەی زانی ئابلوقەکەی هەلگرت و بەرە و ڕووی دیمەشقیەکانەوە ڕۆیشت خۆشی باش ئامادە نەکردبوو هەردوو سوپاکەی سەلجوقی لە مانگی موحەڕەمی ساڵی٤٧٩کۆچی/ئایاری١٠٨٦زاینی لە جێگایەکدا پێی دەڵێن((عین سلیم))لە نێوان ئەنتاکیە و حەڵەب ڕووبەڕووی یەك بوونەوە شەڕێکی قورس بەرپابوو سلێمان زیانێکی زۆری لێکەوت و سەربازەکانی هەڵاتن ئازایەتیەکی بێ وێنەی نواند لەناو شەڕەکە مایەوە لەگەڵ چەند کەسێکدا،

دواجار لە مەیدانی شەڕەکە دەرچوو، لە جێگایەکی ئەمین زرێ پۆشەکەی داکەند و لەسەر زەوییەکە پاڵ کەوت.(٧٠)

توتوشی مامی ناردی بە شوێندا، بەڵام نەڕۆیشت، زانی ژیانی لەمەترسیدایە، کە فەرماندەکانی داوایان لێکرد بڕوات، خەنجەری هەڵکیشا و خۆی کوشت((توتوش)) دەستی بەسەر سەربازگەکەیدا گرت و حەڵەبی داگیر کرد.

بەڵام زۆری تیا نەمایەوە. چونکی مەلەك شا بۆ ئەوێ دەهات، نەیویست ڕووبەڕوو ببنەوە، حەزیشی نەکرد بیبینێ،(٧١) بەمجۆرە ژیانی سلێمانی کوڕی قوتولمش، داگیرکەری ئەنادۆڵ و دامەزرێنەری دەوڵەتی سەلجوقی ڕۆم کۆتایی پێهات.

## پەراوێزەکانی بەشی سێهەم:

١- ناوی سەڵتەنەتی سەلجوقی لێنرا لە ئاسیای بچووك چونکی بیزەنتیەکان لە چاخەکانی ناوەڕاستدا، عەرەب بەناوی ڕۆم ناویانی دەبرد، ئەم ناوچانەیان داگیرکردبوو، بۆیە بەدرێژی چەندین سەدە بەناویانەوە ناونراو پێیان دەگوت وڵاتی ڕۆم. کە سەلجوقیەکان تیایدا نیشتەجێ بوون، مێژوونوسە موسلمانەکان ناویان لێ نان سەلجوقی-ڕۆم. هەروەکو ناوی بەشەکانی دیکەی سەلجوقیەکان بەناوی ئەو دەوڵەتەوە ناودەبران کە تیایدا بوون، وەکو سەلجوقی شام و سەلجوقیەکانی عێراق.

٢- ((شهاب الدین قوتولمش کوڕی ئیسرائیل کوڕی سەلجوق. لە دەسەڵاتی سوڵتان توغرول بەگ جیابووەوە لە کۆتاییەکانی سەردەمەکەیدا. لەگەل دەست و

پێوەندەکانی خۆیدا روویان لە ناوچە شاخاویەکان کرد، کە دەکەوێتە باشووری دەریای قەزوین، زۆری نەبرد((قوتولمش)) جاڕی شۆڕشی دژی ئەلب ئەرسەلان دا، دوای ئەوەی بووە جێنشینی توغرول بەگ، چووە ناو قەڵاکانی ناوچەکەوە، بەڵام ئەلب ئەرسەلان وازی لێ نەهێنا، کەوتە شەڕ لەگەڵیا و ساڵی ٤٥٦ کۆچی/١٠٦٣ زاینی کوشتی: بڕواتە : الحسینی: ص ٣٠-٣٣

٣- ابن الاثیر: ج ٨،ص ٩٨.

٤- Vasiliev:p432

٥- cahen:p73

٦- رنسیمان: ج١، ص ١١٣

٧- ئەنقەرە : پایتەختی تورکیا.

٨- Schlomberger. Racits de Byzance et des croisades. voL 11,p82.

٩- Nicephorus Bryennius : Historia, in c.s.h. Bonn 1836, pp73-96.

١٠- فەریجیا دەکەوێتە ناوەڕاستی ئەنادۆڵ، ناکەوێتە سەر دەریا

١١- cahen.p76

١٢- Laurent : Byzance les tarcs saljucides P98

١٣- الحسینی : ص ٧٢ خواند، امیر : ج٢، ص ٥٣٨

١٤- Laurent.p98.

١٥- رستم : ج٢، ص ١١٤

١٦- Grousset : histoire de l Armenie p.629

١٧- Grousset.p629. vasiliev. 1 p432

١٨- vasiliev : 1 bid p433.cahen : p76 setton: 1 p213

١٩- تورکەکان دوو ناویان لە کەسێك دەنا، بەجۆریك یەکێ لە ناوەکان تورکی بوایە ئەوی دیکەیان ئیسلامی. بۆیە گومش تەکین. ناوێکی تورکیە بۆ دانشمند، ئەحمەد ناوە ئیسلامیەکەیەتی.

٢٠- دانشمند: وشەیەکی فارسیە، مای زانا، لە دوو برگە پێکهاتووە ((دانش)) یانی زانست ((مەند)) بەمانای خاوەن...
٢١- توقات: شارێکە لە خاکی روم، لەنێوان( قونیە و سیواس) دایە قەلایەکی سەختی هەیە: الحموی: ج٢،ص ٥٩.
٢٢- بستان یان ئەبلەستین بە شارێکی بەناوبانگە لە ولاتی روم نزیکی ئەفسوسە: هەمان سەرچاوە: ج١، ص ٧٥.
٢٣- نجم باشي: صحائف الاخبار،ج٢، ص ٥٧٥.
٢٤- ostrogorsky: A Histrory of the Buyzantine states p39
٢٥- Rice T: the Seljuk in asia minot p47
26- camb-med history : 1v pp331-332
٢٧- History de L armenie : p522
٢٨- Grousset: Histoire des croisades: vol 1 p43
٢٩- عاشور: ج١، ص ٩٧-٩٨
٣٠- ئەدەنە : شارێکە لە نزیکی مەسیسە بەناوبانگە : الحموی: ج١، ص ١٣٢-١٣٣.
٣١- تەرسوس : لەنێوان ئەنتاکیە و حەلەب و ولاتی رومدایە، شەش فەرسەخ لە ئەدەنەوە دوورە. هەمان سەرچاوە: ج١، ص٢٨.
٣٢- مەسیسە ((المصیصە)) : شارێکە لەسەر کەناری جەیحان دایە، لە دەروازەی شامدایە، لەنێوان ئەنتاکیە و ولاتی روم، نزیکی تەرسوسە. هەمان سەرچاوە: ج٥، ص ١٤٤-١٤٥
٣٣ عین زربی: لە دەوروبەری مەسیسە هەمان سەرچاوە: ج٤، ص١٧٧
٣٤- کەلەبەرەکان:هەر جێگایەك نزیکی خاکی دووژمن بێ لەگەلێ جێگادا هەیە.کەلەبەری شام دەکەوێتە باشووری رۆژهەلات لەوانە بغراس،بەیاس،مەسیسە،عین زبری،ئەدەنە،تەرسوس،لەوانە کەلەبەری جزیرە کە لە باکووری رۆژهەلاتەوەن لەوانە(زبگرە،کیسوم،سمیساگ،ملگیە،مرعش،حدپ، لەو کەلەبەرانە، قەلای قایم هەبوو، سەربازی لێ بوو، بۆ بەرگری کردن لە ناوەوەی

ئیسلامی. کەلەبەری شام بۆ بەرگریکردن لە شام دانرابوو، کەلەبەری جزیرە، بۆ بەرگری کردن لە باکووری عێراق...

٣٥- رەعبان : شارێکە لە کەلەبەری نێوان حەلەب و سیمیساگ لەنزیکی فورات. الحموی : ج٣، ص ٥١.

٣٦- رەنسیمان: ج١، ص ١٢٣-١٢٤. عاشور: ج١، ص ٩٧-٩٨

٣٧- رنسیمان: ج١، ص ١٢٣.

٣٨- سیس: گەورەترین شاری کەلەبەری شامە، لەنێوان ئەنتاکیا و تەرسوس دایە. الحموی: ج٣، ص ٢٩٧.

٣٩- Mathew of edessa : chronique – in r-h-c arm doc: vol, 1,p216

٤٠- المورخ المجهول : اعمال الفرنجه و حجاج بیت المقدس : ص ٥٥

٤١ - comnena , anna : the alexiad, p93

٤٢- Comnena , Anna : the Alexiad , p95 Rice : p 49

43- Camb,Med.Hist : Byzantine Empire: FOL 17, P213 :

٤٤- Alexad : 399

٤٥- Lbid

46- Setton:I pp 150-151

٤٧- Grousset:L Empire du LeFant- p73

٤٨- الكامل فی التاریخ: ج٨، ص ٢٤٠

٤٩- La chronique de Michel le syrien.111 p 173

50- سبط ابن الجوزی : ص ٤٢٢. ابن الاثیر : ج٨، ص ١٣٦

٥١- ابن الاثیر : هەمان سەرچاوە. العظیمی : ص ٣٥٢، Alexiadp152

٥٢- سبط ابن الجوزی : ص ٤٢٢

٥٣- زبدة الحلب : ج١، ص ٣١٣

٥٤- ابن الاثیر : ج٨، ص ١٣٦

٥٥- cabon:p77.Rice:p49

٥٦- ابن الاثیر: ج٨، ص ١٣٧

٥٧- سەرمین: شارێکی بەناوبانگە سەر بەحەڵەبە. الحموی : ج٣، ص ٢٥١

٥٨- بزاغە:سەر بەحەڵەبە، لەدۆڵی ((بطنان))ە. هەمان سەرچاوەی پێشوو ج١، ص ٤٠٩

٥٩- ابن العديم: ج١، ص ٣١٦

٦٠- ابن الاثير : ج١، ص ١٣٧

٦١- عفرين: ناوی ڕووبارێکە لە دەوروبەری مەسیسە. الحموی : ج٤، ص١٣٢

٦٢- العظیمی : ص ٣٥٣. ابن العديم :ج١، ص ٣١٧

٦٣- ابن العديم : هەمان سەرچاوە

٦٤- ابن الاثير : ج٨، ص ١٢٧

٦٥- ابن القلانسی : ص ١٩٢. ابن العديم : ج١، ص ٣١٧-٣١٨

٦٦- هەمان سەرچاوە

٦٧- (معرالنعمان) :شارێکی گەورەیە، سەربە (حمص)ە الحموی: ج ٥، ص ١٥٦

٦٨- كفرطاب : شارێکە لەنێوان مەعەرە و حەڵەب، هەمان سەرچاوە ج ٤، ص ٤٧٠

٦٩- لەتمين : هەمان سەرچاوەی پێشوو : ج٥، ص ٤٧

٧٠- ابن الاثير : ج٨، ص ١٤٠. ابن العديم : ج١، ص ٣١٩

٧١- ابن القلانسی : ص ١٩٤. ابن الاثير : ج٨، ١٤٠ منجم باشی : صعائف الاخبار ج٢، ص ٥٦٠

## (( بەشی چوارەم ))

## قلیج ئەرسەلان داود کوڕی سلیمان/ ٤٨٥-٥٠٠ کۆچی/ ١٠٩٢-١١٠٧ زاینی

## بارودۆخی سیاسی لە ئاسیای بچووك لە دوای مردنی سلێمان

بەکوشتنی سلێمان، ئاسیای بچووك پیاوێکی ئازای لە دەستدا کە سەرۆکایەتی سەلجوقیەکانی دەکرد. وڵاتی خستە بارێکی ئاژاوە و دابەشبوونەوە. کە هەواڵی مردنەکەی بڵاوبووەوە، کاربەدەستانی شارەکان و دەوروبەر ئەمەیان بە هەل زانی، لە دەڤەرەکانی خۆیاندا سەربەخۆ بوون، ناکۆکی کەوتە نێوان میرەکانی سەلجوقەوە بەهۆی کێبڕکێ لەسەرئەوەی کێ بچێتە سەر تەختی چۆڵ.(١)

لەم بارودۆخە نالەبارەدا، مەلەکشا دەرکەوت، خۆی وانیشاندا دەیەوێ سەلجوقیەکان یەك بخات. چونکی خۆی بە سولتانی هەموو سەلجوقیەکان دادەنا، بەهەموو بەشەکانیەوە لە رۆژهەڵات و لە رۆژئاوا، هەر چەندە بیری لەوە نەدەکردەوە وڵاتی رۆم بهێنێتەوە ژێر دەسەڵاتی خۆی، بەڵام هەر جارێ لقێك لە لقەکانی سەلجوقی خۆی وانیشان بدایە سەربەخۆیە(٢) خۆی دەهێنایە ناوەوە ودەستی دەخستە کاروبارەکانەوە، کاروباری حەڵەب و ئەنتاکیە و رەها و ئاسیای بچووکی رێکخست، حەڵەبی دایە (( قسيم الدولە ئاق سنقر)) دامەزرێنەری ماڵی زەنگی (٣) یەکێ لە ئەفسەرەکانی(( یاغی سیان الترکی)) بە فەرمانڕەوای ئەنتاکیە دامەزراند، دوای ئەوەی لە (( حەسەنی کوری تاهیر)) وەزیری سلێمان، سەندەوە هەروەها (( رەها))ی، بە فەرماندەیەکی تورکی دا ناوی (( بوزان)) بوو، میر ((برسق))ی کردە فەرمانڕەوای موڵکەکانی سەلجوقیەکان لە ئاسیای بچووکدا

(٤)، دواجار کەوتە وتوێژ لەگەڵ ئیمپراتۆری بیزەنتی (( ئەلکسیوس کۆمینن))دا، بۆ رێکخستنی باروۆخی گشتی لە ئاسیای بچووکدا، داوای لێکرد:

- تورکەکان لە کەنارەکانی رۆژئاوای ئاسیای بچووك بکشێنێتەوە.
- هەموو ئەو قەلآیانەی روخێنراون نۆژەنیان بکاتەوە
- لەکاتی پێویستدا یارمەتی ئیمپراتۆر بدات
- ئەمیرەیەکی بیزەنتی بخوازێت.(٥)

وتووێژەکان بەهۆی بەجێ هێشتنی ناوچەکە چوونی مەلەك شا بۆ رۆژهەلآت تەواو نەکرا. لەگەڵ خۆیدا(( قلیج ئەرسەلان داود کوری سلێمان کوری قوتولمشی)) وەکو بارمتەیەك لەگەڵ خۆیدا برد، ئەو کاتە لە تەمەنی یانزە ساڵیدا بوو، بەدیلی لە ولآتی فارس تا ساڵی ٤٨٥ کۆچی مایەوە، لە ژێر چاودێری راستەوخۆی سوڵتاندا بوو.(٦)

لە ئاسیای بچووك چەند هێزێك لەگەڵ یەکتردا ناکۆك بوون، لەوانە: هێزی ئیمپراتۆریەتی بیزەنتی، خاوەنی ولآت و تەماحگیری گەڕانەوەی موڵکەکانی و دەرکردنی تورکەکان بوون.

هێزی میرە دانیشمەندییەکان، کە بەتەمای ئەوەبوون جێ پێی خۆیان لە شوێن و جێگای خۆیاندا بچەسپێنن و لەسەر شانی هاوسێکانیان دەسەلآتیان فراوانتر بکەنەوە.

هێزی میری تورك زاخاس، میری ئەزمیر.. تەماحی ئەوەی دەکرد بەرەو رۆژئاوا بڕوا و تەختی ئیمپراتۆریەتی بیزەنتی بۆ خۆی داگیر بکات. لەگەڵ هێزی میرەکانی سەلجوقیەکان لە نیقیە.

لەم کەش و هەوایەدا، ئیمپراتۆری بیزەنتی ئەلکسیوس کۆمینن هەلێکی زێڕینی دەستکەوت بۆ گەڕانەوەی موڵکەکانی لە ئاسیای بچووکدا و دەرکردنی تورکەکان لەوێدا، دەستی خستە ناو کاروباری ناوخۆیانەوە، ئاگری ناکۆکیەکانی لەنێوانیاندا خۆشکرد، بەرتیلی بەهەندێکیاندا، یەکەیەکە بەڵێنی پێدەدان ژنیان بداتێ، توانی دەسەلآتی خۆی لەو ناوچانەی لە ژێر دەسەلآتیدا بوون بچەسپێنێ، بەلآم هیچ شارێکی بۆ نەگیرا، بیجگە لە ((سیزیکوس)) هەروەها لەگەڕانەوەی

((قەستەمونی)) لە هەرێمی بافلاجۆنیا))دا سەرنەکەوت. دەتوانین بڵێین سنوری بیزەنتیەکان لە (( خەلقدۆنیە و نیقومیدیە و ناوچەی کەناری رۆژئاوای ئاسیای بچووك )) تێنەپەڕی، لەگەڵ چەند شارێکی لا چەپ لە کەناری دەریای رەشدا وەکو سینوب و ترابزون.(٧)

دانیشمەندیەکان بەرەو رۆژئاوا بڵاوبوونەوە، لە سیواس و قەیسەری و هەندێ لەشارەکانی دەریای رەش نیشتەجێ بوون. ((غازی کوری دانیشمەند)) ئەم بۆشاییە سیاسیەی سەلجوقیەکانی بەهەل زانی، دەستی بەسەر قەستەمونی بیزەنیتیەکاندا گرت.(٨)

لەو میرە تورکانەی کە جێگای مەترسی بوون، ((زاخاس))ی میری ئەزمیر بوو، کە گەلێ ئاواتی سایسی لە دڵدا بوو، لەجیاتی تورکەکان، بیزەنتیەکانی هێنایە ناو سوپاکەیەوە. لە شارەزایی دەریاییدا سوودی لێ وەگرتن، هێرشی کردە سەر ئەو دورگانەی دەریای ئیجە و داگیری کردن، لەوانە، لسیوس، خیوس، ساموس، رۆدۆس، ئەلکسیوس بەمە تەنگەتاو بوو، ناچار گورزێکی کوشندەی پێگەیاند بەتایبەتی نیازی بەگژاچوونی(بەلقان)ی هەبوو. دوو سوپای نارد، یەکەم : هێزێکی دەریایی بەفەرماندەیی ((یوحەنا دوقاس)). دووەم سوپایەکی پیادە بەفەرماندەیی ((دلاسینۆس)) هەماهەنگی لەنێوان هەردوو هێزەکەدا هەبوو، توانیان هێزەکانی ((زاخاس)) لەدەریای مەرمەرەدا تەفروتونا بکەن و دورگەکانیان لەدەست سەندەوە.

بەڵام هەر جێگای مەترسی بوو، تاکو ((زاخاس)) بە دەستی (قلیج ئەرسەلان)(٩) کوژرا، وەکو لەمەودوا دەبینین : ((ابو القاسم)) لە نیقیە سەربەخۆ بوو، ((بولکاس))ی برای بە فەرمانڕەوای ((کبادوکیە)) دامەزراند، نیازی ئەوەی کەوتە سەر بەرەو رۆژئاوا بڕوات. هێزێکی ناردو ((بیسینیا))ی داگیر کرد، جێ پێی خۆی لەسەر کەناری دەریای ئیجە کردەوە، هێزێکی دەریایی دروستکرد تا هێرش بکاتە سەر قوستەنتینیە و داگیری بکات، ئیمپراتۆری بیزەنتی ناچار بوو هێزێك بە فەرماندەیی ((تاتیکۆس)) بنێرێ و لە ((نیقیە)) هێرشیان کردە سەر ((ئەبو القاسم بەڵام سەرنەکەوتن ((تاتیکۆس)) کشایەوە و گەڕایەوە و قوستەنتینە(١٠)

((ئەلکسیوس کۆمنین)) بە شکست هێنانی فەرماندەکەی توشی نائومیدی نەبوو، دوو لەشکرکێشی دیکەی نارد هێرش بکەنە سەر ((نیقیە)) یەکەمیان بەفەرماندەی ((تاتیکۆس))و دووەمیان هێزێکی دەریایی بوو بە فەرماندەی ((مانۆیل بۆتۆمیتسی))، ئەمجارەیان هێزەکەی ((ئەبو القاسم)) شکستی هێنا دواجار پەیمانی رێکەوتنیان لەنێوان خۆیاندا مۆرکرد، (ابو القاسم) لەسەر داوای ئیمپراتۆر سەردانی پایتەختی بیزەنتیەی کرد.(١١)

نیازەکانی ((ابو القاسم )) سەرنجی مەلەك شای راکێشا، هێزێکی بەفەرماندەی ((برسق)) بەو پێیەی فەرمانڕەوای فەرمی ولاتی رۆمە، بۆ تەمێکردنی نارد، کە هێزەکە گەیشتە ((نیقیە)) لەسالی ٤٧٩ کۆچی /١٠٨٦ زانینی، ((ابو القاسم)) دەروازەکانی شاری کلۆم کرد، ((برسق)) ئابلۆقەی خستە سەر شارەکە،((ابو القاسم)) هانای بۆ ئیمپراتۆری بیزەنتە برد، ئەویش بە چاکترین تیپی سەربازی یارمەتی دا، ناچار((برسق)) ئابلۆقەی لەسەر شارەکە هەلگرت،(١٢) لە ئەنجامی سەرنەکەوتنی ((برسق))، مەلەك شا، هێزێکی دیکەی بۆ ولاتی رۆم نارد، بە فەرماندەی ((بوزان)) میری ((رەها )) تا بەسەر (( ابو القاسم)) دا سەرکەوێت و (نیقیە)ی لەدەست دەرکات.(١٣) سولتان لەگەل فەرماندەکەیدا نامەیەکی بو(ئەلکسیوس کومنین)) نارد، بریتی بوو لە:

- بەرپابوونی ئاشتی لە ئاسیای بچووك
- ئەلکسیۆس کۆمنین لەمەودوا یارمەتیەکانی ((ئەبو القاسم)) رابگرێت
- مەلەك شا، ئەنتاکیە و هەندێ جێگای ئاسیای بچووك بۆ ئیمپراتۆر بگەڕێنێتەوە.
- هەردوو خێزانەکە لەیەك نزیك ببنەوە، کوڕە گەورەکەی مەلەك شا، کچی ئەلکسیۆس بخوازێت.
- مەلەك شا، هێزێکی سەربازی بخاتە ژێر دەستی (ئەلکسیۆس)ەوە بۆ راگرتنی دەستدرێژیەکانی تورکمانەکان..

ئەلکسیۆس، لەسەر داواکانی مەلەك شا رازی بوو، چەند نوێنەرێکی نارد تا رازی بوونی خۆی پێ راگەیەنێ، بەلام لە یارمەتیدانی((ابو القاسم)) هەر بەردەوام بوو،

## مێژووی سەلجوقیەکان

رەنگە نزیکبوونەوە لە میرێکی بێ هێزی لەوە پێ باشتر بوو، نزیکی سولتانێکی بەهێز بێ. بەهۆی ئەو پشتیگیری کردنە ((ئەبو القاسم)) توانی لە ((نیقیە)) بەرگری بکات و بیپارێزێ. ((بوزان)) ناچار بوو ئابلۆقەکەی هەڵگرێ و گەڕایەوە ((رەها)) بەڵام بەردەوام فشاری دەخستە سەر ((ابو القاسم )) تا ناچار بوو داوای لێبوردن بکات.(١٤)

((ابو القاسم)) بریاریدا، بچێتە ژێر دەسەڵاتی سولتانەوە خۆی چووە لای و داوای لێخۆشبوونی لێکرد. بەڵام سولتان لەسەر خواستی ((بوزان)) لایدا، بەڵام ((ئەبو القاسم )) لەجیاتی خۆی ((بولکاس))برای کردبووە فەرمانرەوای نیقیە.(١٥)

سەبارەت بە وتوێژی نێوان سولتان و ئیمپراتۆر رێکنەکەوتن، چونکی نوێنەرانی بیزەنتی. هەوالی مردنی سولتانیان زانی کاتێ بەرەو بارەگاکەی دەرۆیشتن، بۆیە گەرانەوە قوستەنتینیە

قلیج ئەرسەلان دەسەڵاتی بەدەستەوە دەگرێت

سولتان ((برکیاروق)) کە بووە جێنشینی مەلەك شا، ((قلیج) ئەرسەلان)ی ئازاد کرد. یەکسەر چووە

نیقیە، ((بولکاس)) دەسەڵاتی دایەوە دەست، بەو پێیەی وارسی شەرعی سلێمانە. بەمجۆرە قلیج ئەرسلان لە ((نیقیە)) بووە فەرمانرەوا دوای شەش ساڵ (١٦) کە ئەو پایەیە بە بەتاڵی مابووەوە یەکەم کاری قلیج ئەرسەلان، لابردنی((بولکاس )) بوو، لە جێگاکەی کابرایەکی زانا و لێهاتووی دانا ناوی ((محەمەد)) بوو، کردیە یاریدەدەری خۆی لە نیقیە.(١٧)

لەم کاتەدا((زاخاس)) هەستی بە گرنگی بەستنی هاوپەیمانی کرد لە نێوان میرەکانی تورکدا لەئاسیای بچووك بۆ بەرپەرچدانەوەی پیلانەکانی ئیمپراتۆر، دوای ئەوەی ئەمەی دوای سیاسەتێکی فێڵبازانەی بەکار دەهێنا بۆ نانەوەی دووبەرەکی لەنێوانیاندا، بۆ ئەم مەبەستە پەیوەندی بە قلیج ئەرسەلانەوە کرد و کچەکەی خۆشی لی مارەکرد تا لیك نزیك ببنەوە. بەڵام ((ئەلکسیۆس کۆمینن)) توانی دووبەرەکی بخاتە نێوان قلیج ئەرسەلان و خەزوریدا، مەترسی ئەوەی لەبەر خست کەوا ((زاخاس)) لە ئایندەدا رکەبەری دەکات. ئامۆژگارییەکانی قەبوڵکرد و

## مێژووی سەلجوقیەکان

ترسی ئەوەی بوو میرێکی تورکی دیکە لەو بەناوبانگتر بێ لەوکاتەی ((زاخاس)) ئابلۆقەی ((ئەبیدۆس))ی دەدا، کە کلیلی دەردەنیلە، ئەلکسیۆس کۆمینن لەگەڵ قلیج ئەرسەلاندا رێکەوت بۆ جێبەجێ کردنی پلانی لەناوبردنی. سەرکردە سەلجوقیەکە، بۆ میوانداری بانگهێشتی کرد کە لە نیقیە سازاندبووی، هات لەوێدا بەدەستی خۆی کوشتی.(١٨) بەمردنی لەوەو پێشی سلیمان و کوشتنی زاخاوس، ئەلکسیوس کومنین توانی بیر لە رێگایەکی دیکە بکاتەوە بۆ دەستدرێژی کردن، بەتایبەتی قوستەنتینیە مەترسی ئەورووپای لەسەر نەمابوو، کەوتە وتوژێەوە لەگەڵ قلیج ئەرسەلان سەبارە بەرێخستنی بارودۆخی ناوچەکە و بەرقەرارکردنی ئاشتی لە هەموو لایەکیدا. بەڵام ئەم وتوێژە لە بەرژەوەندی سەلجوقیەکاندا نەبووئەوەندەی لەقازانجی بیزەنتیەکاندا بوو، کە هەندێ لەشارەکانی کەنار دەریایان گێرابووەوە ژێر دەسەڵاتی خۆیان. بەهاتنی ساڵی ٤٨٩ کۆچی /١٠٩٦ زاینی، دەبینین بەشی هەرە زۆری ئاسیای بچووك کەوتبووە دەستی سەلجوقیەکانەوە، ئەوەی لە ژێر دەسەڵاتی بیزەنتیەکان بوو بریتی بوون لە ((خەلقدونیە)) و ((نیقومیدیە)) و هەندێ لە شارەکانی کەناری دەریای رەش و کەناری ناوچەی ((میسیا))(١٩) سیاسەتی ئەلکسیۆس کۆمیێن دەرکردنی موسڵمانەکانی بوو لە ئاسیای بچووکدا، بەهەموو رێگایەك هەوڵی جێبەجێ کردنی ئەمەی دەدا. ئەو رێکەوتنانەی کە لەگەڵ قلیج ئەرسەلان و میرەتورکەکاندا، بگرە تا لەگەڵ سەلیبیەکاندا بەستبوونی بەمەبەستی لێدانی میرە موسڵمانەکان ئەنجامی دابوون تا بەگژیەکتریاندا بکا و دوو بەرەکی لەنێوانیاندا بچێنێ، بۆ ئەوەی لاواز بن و دواجار بیانخانە ژێر دەسەڵاتی خۆیەوە، کە ئەورووپیەکان بەپیری بانگەوازەکەیەوە چوون بۆ شەڕی موسڵمانەکان، شاگەشکە ببوو، بەمجۆرە هێشتا ساڵی ٤٨٩ کۆچی /١٠٩٦ زاینی نەهاتبوو پیشەنگی لەشکرکێشی سەلیبی گەیشتە قوستەنتینیە.

## ململانێی قلیچ ئەرسەلان لەگەڵ سەلیبیەکاندا

### بزووتنەوەی سەلیبی:

دەبێ ئێمە پێش وێنەکێشانی ململانێی سەلجوقی–سەلیبی بیرۆکەیەك لەبارەی سروشتی بزووتنەوەی سەلیبیەوە بخەینەروو، کە هێرشیان بۆ رۆژهەڵاتی ئیسلامی هێنا. بەمەبەستی دەست بەسەراگرتنی ((خاکی پیرۆز)) و دامەزراندنی چەند ئیماراتێکی نەسرانی لەو دەوروبەرەدا. لەراستیدا رووداوەکانی بزووتنەوەی سەلیبی کە مێژووی سەدەکانی ناوەڕاستی گرتەوە، لەم لێکۆڵینەوەیەدا ئەوەندە مەبەستمانە کە پەیوەندی بە سەڵتەنەتی سەلجوقیەوە هەیە و تا چەند کاریگەری هەبوو لەسەر بارودۆخەکەی.

ئەگەر بۆمان هەبێ بەکورتی لەبارەی سروشت و مەبەستەکانی ئەم بزوتنەوەیەوە بدوێین. دەتوانین بڵێین، لەڕاستیدا بەردەوامبوونی ئەو ململانێیەدرێژخایەنەیە کە هەر لە چاخەکانی کۆنەوە لەنێوان رۆژهەڵات و رۆژئاوادا بووە. لەسەر سەردەمێکدا شێوەی خۆی وەرگرتووە بەپێی پێویستی بارودۆخەکە، هەر چەندە، ئامانج و مەبەستەکە هەر یەکێکە..

لە چاخە کۆنەکاندا ململانێی سیاسی و سەربازی بووە لە جیهانێکدا بڕوای بت پەرستی هەبوو، کە فارسەکان و یۆنانیەکان ئاڵاکەیان هەڵگرتبوو، کەچی رۆژئاوا لە سەدەکانی ناوەڕاستدا، ((ئاین)) یان کردبووە پەردە بۆ بەدیهێنانی هەمان ئەو مەبەستانە. ململانێیەکە شێوەیەکی ئاینی وەرگرت. دوای ئەوەی ئیمپراتۆری رۆمانی قوستەنتینی گەورە، دانی بە ئاینی نەسرانی دا نا، بە پێی بەیانی میلانو لەساڵی ٣١٣ زاینی و بەر لەمردنی چووە سەر ئەو دینە.(٢٠)

بە پەیدابوونی ئیسلام لەسەدەی حەوتەمی زاینی و بڵاوبوونەوەی لەدورگەی عەرەبی. بەمەبەستی بڵاوکردنەوەی ئاینە تازەکە موسڵمانەکان لە دەرەوەی دورگەکەیاندا بڵاوبوونەوە. عێراقیان داگیرکرد لەگەڵ وڵاتی شامدا و لەگەڵ فارس

و بیزەنتیەکاندا ڕووبەڕوو بوونەوە، لە چەند ساڵێکی کەمدا سەرکەوتنی گەورەیان بەدەست هێنا، ئیمپراتۆریەتی فارسیان لەناوبردو دەستیان بەسەر ویلایەتەکانی رۆژهەلاتدا گرت کە سەر بە ئیمپراتۆریەتی بیزەنتی بوون.

**هۆیەکانی شەڕەکانی سەلیبی:**

بزووتنەوەی سەلیبی لەسەدەی ناوەڕاستدا ڕەنگدانەوەی رۆحی کۆمەڵگای رۆژئاوا و ئەو بیرۆکە باوانە بوون تیایدا لە دوو رووەوە: دین و شەڕ. لەدینەوە دیاردەی ((حەج)) پەیدابوو، لە شەڕیشەوە دیاردەی شەڕی پیرۆز هاتەکایەوە.

حەج دیاردەی تۆبە و پەشیمان بوونەوەیە، کە ((حاجیان)) ڕوویان دەکردە، خاکە پیرۆزەکان، تا دەهات بلاوتر دەبووەوە و گرنگتر دەبوو بەهۆی کاریگەری بزووتنەوەی ((کلونی)) کە لە سەدەی دەیەمدا بانگەشەی پیرۆزی کەنیسەی رۆمای دەکرد و لە کەنیسە رۆژهەلاتیەکان زیاتر جێگای گرنگی پێدان بوو. هەروەها تازەکردنەوەی داوای (بوتروسی)) بۆ دەسەلاتی جیهانی پاپایەتی. قەدر و پایەی پاپا بەهۆی چەند پاپایەکی بەهێز بەرزبووەوە، وەکو ((گریگۆری حەوتەم و ئوربانی دووەم)) (٢١) کە داوای دەکرد دەست لەشەڕی ناوخۆ هەلگرن لەنێوان میرەکانی فیودیالدا و ڕووبەڕووی موسلمانەکان ببنەوە. بۆ وەرگرتنەوە و لەدەست دەرکردنی خاکی پیرۆز لە دەستی موسلمانەکان.

گەلێ هۆی جیاجیای دیکەشی هەبوو، کە پەیوەندی بە ئاینەوە نەبوو، کۆمەلگای رۆژئاوا تەنگژەکانی خۆیان تێدا دەبینییەوە. ئەوەی لە مێژووی بزوتنەوەی سەلیبی بکۆلێتەوە، بە ئاشکرا کاریگەری هۆکارە ئابوری و کۆمەلایەتی و سیاسیەکان دەبینێ لە ئاراستەکردن و دەستنیشانکردنی چارەنووسیدا، دین بۆ پروپاگەندە بەکارهێنرا بۆ وە دیهێنانی مەبەست گەلێك دووربوون لە ئاین.

هۆکاری ئابووری رۆلێکی گرنگی لە بزوتنەوەی سەلبیدا هەبوو، چارەسەرکردنی گەلێ کێشەبووکە کۆمەلگای رۆژئاوا ڕووبەڕووی ببووەوە. لە کۆتایی سەدەی یانزەهەمی زاینی تووشی تەنگژەیەکی ئابووری تیژببوو. بەتایبەتی لە فەرەنسا و ببووە هۆی شەڕی ناوخۆ لەنێوان میرەفیودالەکاندا، ئەمەش خراپی باری ئابووری لێکەوتەوە. ڕێگاکانی بازرگانی پەکیان کەوت، ئەمن و ئاسایش نەما، داواکانی

دەرەبەگ و خاوەن زەویو زارەکان لەسەر کۆیلەکانی زەوی، گرانتر بوو، ئەمەش هەموو چین و توێژەکانی گەلی گرتەوە. لێرەوە بزوتنەوەی سەلیبی رێگای کردەوە بۆ کۆچکردنی ئەو برسی و هەژارانە و رێگایەك بوو بۆ دەرچوون لەو بارودۆخە سەختە. بۆیە هیچ جێگای سەرسوڕمان نییە، کۆمەڵانی سەلیبی یەکەم زۆربەی زۆریی ئەو کۆیلانەی زەوی و جووتیارانەی وەکو دیل کاریان دەکرد دەستیان بەکۆچکردن کرد، لەگەڵ هەژاران و دەست نەڕۆیەکاندا. بەمەبەستی خۆ رزگارکردن مەرج و پێوەندەکانی دەرەبەگەکان. لەو شەڕانەدا دوو دەسکەوتیان هەبوو:

یەکەم: لە کۆیلایەتی رزگاری کردن

دووەم: وەکو کەنیسە بەێنی پێدابوون، خۆیانیان لە گوناهەکان پاك دەکردەوە

چونکی باس لە هۆکاری ئابووری دەکەین، دەبێ ئاماژە بۆ دوو تایفە بکەین لەو بزووتنەوەیەدا، ئەویش: شارە بازرگانیەکان و کۆمەڵانی رەهبانی چەکدار.

ئامانجی شارە بازرگانیەکاینی ئیتالیا و فەرەنسە کە لەشەڕی سەلیبیدا بەشداریان کرد، دەسکەوت بوو، کە بەهۆی دەست بەسەرا گرتنی جوڵانەوەی بازرگانی رۆژهەڵات دەستیان دەکەوت، لەسەر حیسابی پاپایەتی وکەنیسە و سەلیبیەکان. بۆیە هێزە دەریاییەکانی ئەو شارانە رۆڵێکی گرنگیان هەبوو لە دەست بەسەراگرتنی بنکەسەرەکیەکان لە وڵاتی شامدا، هەروەها یارمەتی دامەزراندنی دەوڵەتی بچووك بچووك لەخاکی پیرۆزدا دا، لەبەرامبەر ئەو ریکەوتنانەی دەیان بەست، بەپێی ئەو رێکەوتنانە شارەکان دەسکەوتی ئابووری گرنگیان وەدەست دەهێنا. هەرچی کۆمەڵانی ئاینی چەکدار بوون، وەکو ((داویە)) (٢٢) و ((ئەسبتاریە)) (٢٣) کە لە بیروباوەڕیاندا هەژاری و مل کەچبوون و قنیاتکردن و دوورکەوتنەوە لە خۆشیەکانی ژیان بوو، ئەمانیش گۆڕان بوون بەکۆمەڵی پەیداکردنی پێویستیەکان. سوپا و کۆگای بازرگانیان هەبوو، دەسکەوتی دراو و سیاسەتی تایبەتی دەرەوەیان هەبوو، لە بیروباوەرە سەرەکیەکانی خۆیان لایاندا، کە پارێزگاریکردنی حاجیەکان و بەهاناوە چوونی زامدار و نەخۆشی سەلیبیەکان بوون.

هـۆی کۆمەلایـەتیش رۆڵـی لـە بزووتنـەوەی سـەلیبی گێـڕا، ئاشـکرایە کۆمـەڵگای ئەوروپی لەسەدەکانی ناوەڕاستدا بەسەر سێ چیندا دابەشکرابوون: چینی پیاوانی ئـاین، چـینی جـەنگاوەران لـە نوبـەلا وسـوارەکان پێکهـاتبوو، لەگـەڵ چـینی جووتیارانـدا. چـینی یەکـەم ودووەم، دەسـتەی فـەرمانڕەوا و خـاوەن سـامان بوون،چینی جووتیارەکان هەموو ئەو کەسانە بوون کە نـە دەسـەلاتیان هـەبوو نـە سامان.کەدەبوایە لـەباروودۆخێکی سـەختدا کـار بکـەن. تـاکو پێویـستیەکانی دوو چینەکەی تر دابین بکەن.هەر لە باوباپیریانەوە بەزەویو زارەوە بەسترابوونەوە کە کاریان تیادا دەکرد، ژیانێکی سەخت و پڕ کولەمەرگی و ئەرکی گران دەژیـان، کـە دەبوایە بۆ دەرەبەگەکان خۆیان تەرخان بکردایە.

ئەم چینە دەست نەڕۆیە، شەڕی سەلیبی بە هـەل زانـی تـاخۆی لـەو هـەموو بـارە قورسە رزگار بکات، گوێی بە مەترسیەکان نـەدەدا، کـە لەگـەڵ سـەختی ژیانیانـدا بەراورد ناکرێ، کە لەو سەر شۆڕییەدا دەژیان و ئومێدی لـێ رزگاربوونیـان نـەبوو، بۆیە بە دوای ژیانێکی باشتردا دەگەڕان. سەبارەت بە هۆکاری سیاسـی، چـاوەڕێی هیـوای گـەورەبوون بەتایبـەتی دەسـەلاتداران و دەرەبەگـەکان، بەتـەمای فـراوان کـردن و زۆرکردنـی موڵکـەکانیان بـوون و لـە رۆژهـەلات((موسـتەعمەرەی)) نـوێ دابمـەزرێنن، بـەدەر لـە شـاکانی ئـەباتیرە، کـە هانـدان و زۆرلێکردنـی پاپـاوە بەشداربوون و سۆزی ئاین پاڵنەریان بوو، جێگەی سەرسوڕمان نییە.

پاپا لە سەرووی هەموو ئەو کۆمـەڵ و تایفانـەوە بـوو، ئـەو بـەناوی دینـەوە هـانی خەڵکی دەدا، بۆ جێبەجێکردنی ئامانجە سیاسیەکانی تا لە فشارەکانی میرەکان و دەرەبەگەکان رزگـاری بـێ. هـەروەها لەشـەڕی سـەلیبیدا بـەدیهێنانی خەونـەکانی تیادا دەبینی کەوا دەسەلاتی ئاینی و دنیایی بەسەر جیهانی نەسرانیدا لە رۆژئاوا و رۆژهەلات بچەسپێنێ و کار بۆ یەکگرتنی کەنیسەی لاتینی و یۆنـانی بکـات لەسـەر مەزهـەبی کاسـولیك کـە خـۆی بـڕوای پـێ بـوو، لـە ئـەنجامی ئـەو جیابوونـەوە و لێکترازانــە دینییــەی ســاڵی ٤٤٦ کۆچــی /١٠٥٤ زاینیــدا (٢٤) مــیرە دەرەبەگــە رۆژئاواییـەکان، ئەوانـەی لـە شـەڕی سـلیبیدا بەشـداربوون، نـاکۆکی کـەوتبووە نێوانیـان. بـۆ نموونـە لـە شـەڕی سـەلیبی یەکەمـدا، نـاوی سـەرکردەی نورمـانی

## مێژووی سەلجوقیەکان

بوهیموند دەرکەوت، دەیویست ئیمارەتێکی نورمانی لە رۆژهەلاتدا دامەزرێنێ، شایانی باسە چەند سوپای سەلیبی بۆ قولایی رۆژهەلاتی ئیسلامی بچووبایە، ئەوەندە مەبەستی دنیایی میرەکان ئاشکراتر دەبوو، ئەمە لەو ناکۆکیە بەردەوامەدا دەردەکەوێ کە لەنێوانی فەرماندە و پیاوە ناودارەکاندا هەبوو لە لەشکرکێشی یەکەمدا، بەهۆی دەست بەسەراگرتنی شارەکانەوە، بەتایبەتی شاری ئەنتاکیە، سەرەرای ئەوەش، دوو ئیمارەتیان دامەزراند بەر لەوەی دەست بەسەر (قودس)دا بگرن، ئەمەش مەبەستی سەرەکیان بوو، کە ئارەزووی دەست بەسەراگرتن داگیرکردن و چاوچنۆکیانی دەردەبڕی.
شەڕەکانی سەلیبی، هۆیەکی راستەوخۆ بوون بۆ نزیکبوونەوەی نەسرانیەکانی رۆژهەلاتی ئەرسەدوکی لەگەڵ نەسرانی رۆژئاوای کاسۆلیك، ئەمە کاریگەری هەبوو لە مێژووی بەرەو پێشەوەچوونی پەیوەندیەکانی نەسرانیەکانی رۆژهەلات و رۆژئاوا، ئاشکرایە لەوکاتەدا پەیوەندییەکانی نێوانیان باش نەبوو، گومان و بروانەکردنی بەسەردا زاڵ بوو، لە هەموو بوارێکیشەوە جیاوازییەکانی نێوانیان زۆر بوون چ دینی، یا سیاسی، یا کۆمەلایەتی و ئابووری، کە ئەمەش هۆیەکی تر بوو بۆ قورسکردنەوەی دوژمنایەتی لە نێوانیاندا، ئەمەش کاردانەوەیەکی خراپی لەسەر بزووتنەوەی سەلبیی هەبوو، هەر نەبێ لەسەرەتایدا کاتێ سەلجوقیەکانی رۆم لە ((نیقیە)) دەسەلاتی خۆیان دامەزراند. لەدوای شەڕی مانزیکرت، بەردەوام بوون دەسەلاتی خۆیان لە ئاسیای بچووك فراوان بکەنەوە، گەلێ جێگایان خستە ژێر دەسەلاتی خۆیانەوە. تورکەکان هەندێ لە دورگە نزیکەکانیان داگیر کرد. ئیمپراتۆر ئەلکسیۆس کۆمنین هەولەکانی بێ سوود بوو لە راگرتنی هاتنە پێشەوەی تورك، کە ببونە جێگای هەڕەشە لە پایتەختەکەیان قوستەنتینیە. بۆیە رووی لە رۆژئاوا و پاپاکرد بۆ داوای یارمەتی. ئەو شەڕانەی لە ئیسپانیا روویاندا لەنێوان موسڵمانەکان و نەسرانیەکاندا، جۆرێك بوو لە شەڕی پیرۆز، پاپاکان بەئاراستەیەکی ئاینیدا بردیان، دەست بەسەراگرتنی ((تولەیتەلە)) لەسالی ٤٧٨ کۆچی/ ١٠٨٥ زاینی لەلایەن ئیسپانیەکانەوە، هەنگاوێك بوو بۆ دەرکردنی موسڵمانەکان لەو ولاتەدا، دوای شەڕی ((زەلاقە)) کە لەسالی دوایندا روویدا،

بزووتنـــەوەی وشـــیاربوونەوەی ئیـــسلامی پەیـــدابوو کـــە ((مورابتـــەکان- المرابطون))(٢٥) زیندوویان کردەوە، دوای ئەوە بانگەشەی سوارەکانی نەسرانی پەرەیسەند تا روو لە ئیسپانیا بکرێت بۆ شەری موسڵمانان چونکی ئیسپانیەکان هەستیان بـە لاوازی موسـڵمانەکان کردبـوو، ئـەوە هەسـتێکی لـەناو کۆمـەڵگای ئەورووپیدا پەیداکرد بـە هانـدانی پاپـا(( ئوربـانی دووەم)) بـۆ ئاراسـتەکردنی ئـەم هەوڵانە بەرەو رۆژهەڵات بکرێتەوە بـۆ شـەڕی موسـڵمانان و وەرگرتنـەوەی خـاکی پـیرۆز و دامەزرانـدنی ئیمـاراتی نەسـرانی. سـەدەی یانزەهـەمی زایـنی کۆتـایی نەهاتبوو، بەراستی شەڕی پیرۆز بووە راستیەك، سوارەکانی کۆمـەڵگای ئـەورووپی ئامادەگی خۆیان پیشان دا و بەدەنگی کەنیسەوە چوون تا شوێنە پیرۆزەکـان لـە رۆژهەڵات بۆخۆیان بگەڕێننەوە کەچی، میرەکان لە پێشدا لەم کەشو هەوایـە دوور راوەستان، بەڵام بیرۆکـەی داگیرکردنـی زەوو زار پـاڵی پێوەدەنـان تـا لـەو شـەڕە پیرۆزانە بەشداری بکەن. سەرەڕای ئەوەی رۆژئـاوا بـەدەم بانگـەوازی بیزەنتیـەوە چوون تا شەڕی موسڵمانان بکەن، بەڵام لە بیزەنتیە بیرۆکـەی شـەری سـەلیبی لـە ئارادا نەبوو، گەڕانەوەی خاکی پیرۆز تارادەیەکی زۆر بە کارێکی خـەیاڵی دادەنـرا، لە سیاسەتی بیزەنتیدا بۆ ئەمـە نەدکۆشـان، کـاتێ خـۆی لـەناو شـەڕی سـەلیبیدا بینیەوە. لە راستیدا بیزەنتیە بۆ ئەوە هەوڵی دەدا هەنـدێ یارمـەتی سـەربازی لـە کرێگرتـەکان(المرتزقـە) دەسـت بکـەوێ بـۆ شـەڕی سـەلجوقیەکان، ئـەم کـارە پەیوەندی بە لەشکرکێشی دژ بـە فەلەسـتینەوە نـەبوو، گـەورەکانی بیزەنتـەش. نەیاندەزانی و بە خـەیاڵیاندا نەدەهات چی مەترسیەکیان تووش دەبێ لە ئـەنجامی هـــاتنی هێزەکـــانی ســـەلیبیەوەیە. کـــە بـــووە جێگـــای هەرەشـــەکردن لـــە ئیمپراتۆرییەتەکـــە. ئاشـــکرایە سیاســـەتی دەرەوەی بیزەنتـــە، بـــەر لـــەهاتنی سەلیبیەکان، لەسـەر جـۆرە سـەنگیەك لەگـەڵ موسـڵمان و غـەیرە موسـڵمانەکاندا راگرتبـوو، کـە پارێزگـاری دەسـەڵاتەکەیانی راگرتبـوو، بیزەنتیـەکان دوای هـاتنی سـەلیبیەکان هـەر ئـەو سیاسـەتەیان پـەیرە و دەکـرد. مێژوونوسـان گرنگیـان بـە هەشت لەشکرکێشی سـەلبیی داوە. چـواری روویکـردە خـاکی پـیرۆ، کـە یەکـەم و دووەم و سـێهەم و شەشـەم بـوون، دوانیـشیان بـەرەو میـسر چـوون، پێنجـەم و

حەوتەم، یەکێکیش بەرەو قوستەنتینیە رۆیشت ئەویش لەشکرکێشی چوارەم بوو، هەشتەم لە باکووری ئەفریقیا دابەزین، لەنێوان ئەم لەشکرکێشیە نیزامیانەوە، لەشکرکێشی دیکە هەبوو، کە خەڵکە سادەکە ئەنجامیانددەدا، هەندێ لەم لەشکرکێشیانە، لە رووی ژمارە و خۆئامادەکردنەوە، لە نیزامیەکان رێکتر و بەتواناتربوون.

## لەشکرکێشی سەلیبی یەکەم:

### بەرەو رۆژهەلات:

لەسەر دەستی پاپا((ئوربانی دووەم)) لە کلێرمۆنت، لەساڵی ٤٨٨کۆچی/١٠٩٥زاینی(٢٦) جاڕی لە دایکبوونی بزووتنەوەی سەلیبی درا،خۆ ئامادەکردن بۆ جێبە جێکردن،پاپا لە ولاتەکانی رۆژئاوای ئەورووپی بۆ هاندان دەستی بە جەولە کردن کرد لەو بڕوایەدا بوو کەوا سوپایەکی رێك و پێك لەژێر چاودێری رۆحیەکدا و فەرماندەیەکی یەکگرتوودا دەبێتە مایەی پێشکەوتن و سەرکەوتن بەڵام نوێنەرانی کە بە ئەورووپا بڵاو بوونەوە رێگایان بە هەموو کەسێك دا کە سەلیبی هەلگرد و رووی لە خاکی پیرۆز کرد لە ئەنجامی ئەمەدا کۆمەڵگاکانی ئەورووپا دڵگەرمی ئاینی تیایدا بڵاو بووەوە میللەت هەمووی ئامادە بوو روو لە رۆژهەلات بکەن لە چین و توێژە جیاجیاکان کۆمەڵان کۆبوونەوە لە فەرەنسا و ئیتالیاو ئەلمانیاو هەمان کەشو هەوا پەیدا بوو بە هەزاران ژن و و پیاو رێگر و دزو ئاژاوە چیەکان کە هیچ هۆیەکی دینی پاڵی پێوە نەدەنان و هونەری شەڕو جەنگیان نەدەزانی خۆیان ئامادە کرد هەندێ لە میرە بچووکەکانیش کە تەماحی پارە و موڵك پاڵی پێوەدەنان لەگەڵیاندا خۆیان ئامادە کرد...

کۆمەڵ کۆمەڵ کەوتنە رێ لە ژێر فەرماندەی چەند کەسێکدا لەوانە((جوتیە))و((بوتریسی قەشە))و((والتەر))کەسانی دی لە رێگایاندا لەگەڵ گەلانی ئەو ولاتانەی پێیدا تێدەپەڕین شەڕ و پێکدادان روویدا وەك لە ((باڤاریا)) و ((مەجەر)) و ((بولگاریا))دا روویاندا. بەتایبەتی لەگەڵ نەسرانیە ئەرسەدوکسەکان

کە لە مەزهەبدا جیاوازبوون لەگەڵیاندا و یەهودیەکان کە بە ئاڵوگۆڕی نارەوای دراو و سامان ناسرابوون. هەروەها بەدەم ڕێگاوە تاڵانیان دەکرد و خەڵکیان دەکوشت و شارەکانیان دەسووتاند، تادەورووبەری قوستەنتینیەش لەو دەستدرێژیانە بێ بەش نەبوو، ناچار ئیمپراتۆری بیزەنتە بەپەلە بۆ ئاسیای بچووکیانی گواستنەوە، هەرچەندە ئەم کۆمەڵانە جێگای مەترسی نەبوون بۆ ئەو، ئەگەر بۆ ئاسیای بچووك بپەڕنەوە، ئەوا تورکەکان لەناویان دەبەن (٢٧) چونکی لەشکرکێشیەکە هەر لەسەرەتاوە ڕێك نەبوو، فەرماندەیەکی یەکگرتووی نەبوو، ئەوا دەتوانرێ بزانرێ کە چوونە ئاسیای بچووکەوە چیان بەسەر دێ. کۆمەلانی ئەڵمانی و ئیتالیەکان و فەرەنسیەکان، لەناو خۆیاندا کەوتبوونە پێشبڕکێ لە هێرشکردنە سەر ناوچە کشتوکاڵیەکان، دێهاتەکانیان تاڵان کرد، بێ جیاوازی لەنێوان موسڵمانەکان و نەسرانیەکاندا، لەشاری ((نیقیە)) نزیکبوونەوە، کە پایتەختی قلیج سلێمان بوو، بەگوێی ئامۆژگاریەکانی ئیمپراتۆری بیزەنتەیان نەکرد کە لە قەڵای ( کیفیتوت) بمێننەوە کە ببووە سەربازگەیەکی سەلبیی و بە هیچ لایەکدا نەجووڵێن تا لەشکرە نیزامیەکە دەگات. لەم کاتەدا ((واڵتر)) گەیشتە قوستەنتینیە، لەگەڵ ئەوانەی لەگەڵیدا بوون چوونە ناو کۆمەڵەکەی((بوترسی قەشەوە)) (٢٨)

**پێکدادانی یەکەم:**

یەکەم ڕووبەڕووبوونەوە لەنێوان کۆمەلانی سەلبیی و سەلجوقیەکان دەستی پێکرد، کاتێ سەلیبیەکان بەرەو ((نیقیە)) کەوتنە ڕێ.(( ریناڵدی نورماندی)) ئەو شارەی تێپەڕاند و گەیشتە قەڵای(( ئەکسیریجوردن)) و داگیری کرد. کردیە بنکەی خۆی و لەوێوە هێرشی دەبردە سەر زەوییە کشتوکاڵیەکان و دێهاتەکانی ئەو دەورووبەرە (٢٩) ئەم دەستدرێژیانە قلیج ئەرسەلانی سەغڵەت کرد((ئیلخانۆس))ی بە لەشکرێکی گەورەوە نارد تا قەڵاکە بگەڕێنێتەوە. ئابڵۆقەی قەڵاکەیدا، ئاوی لێ بڕین، ئەوانەی ناو قەڵاکە تووشی نائومێدی بوون.(٣٠)

((ریناڵد)) بڕیاری دا خۆی بەدەستەوە بدات، دەرگاکانی قەڵاکەی بۆ سوپای سەلجوقی کردەوە، دوای ئەوەی بەڵێنی لە فەرماندەی سوپاکە وەرگرت کە ژیانی بپارێزێ ئەگەر ببێتە ئیسلام((ریناڵد)) و ئەوانەی لەگەڵیدابوون بوون بە ئیسلام و

بەرەو(ئەنتاکیە و حەڵەب و خوراسان) یان بردن، ئەوەی نەبووە ئیسلام کوشتیان.(٣١)

هەواڵی دەست بەسەراگرتنی قەڵاکە لەلایەن ((نورمان))ەوە گەیشتە سەلیبیەکان لە ((کیفیتوت)) سەلجوقیەکان پلانێکی ژیرانەیان دارێژا تا بیانخەنە ناو بۆسەوە کە پێشتر ئامادەباشی بۆکرابوو، وایان بڵاوکردەوە گوایە هێزەکانی نورمانی دەستیان بەسەر ((نیقیە)) داگرتووە و وا خەریکی دابەشکردنی تاڵانی و دەسکەوتەکانیانن (٣٢)، سەربازگەکە شڵەژا، سەربازەکان داوایان کرد رێگایان بدرێ بۆ نیقیە برۆن تا بەشی خۆیان تاڵانیان دەست بکەوێ.

بەمجۆرە کۆمەڵانی سەلیبیەکان لەو رێگایەوە بۆ ((نیقیە)) دەچوو روویان لە ئاسیای بچووك کرد بێ ئەوەی خۆیان باش ئامادەکردبێ و بێ ئەوەی توانای شەرکردنی خۆیان بزانن، تا راستی بەسەرهاتەکەی ((بریناڵد)) زانرا، ترسیان لێ نیشت.(٣٣) کە نزیك بوونەوە(( ژمارەیان بیست هەزار کەس بوو)) لە رووباری ((دراکۆن)) هێزەکانی سەلجوقی هێرشیان برد تەفروتونابوون. تەنها سێ هەزارکەسیان رزگاری بوو،(٣٤) کە ئیمپراتۆری بیزەنتە هەواڵی کارەساتەکەی بیست، کەشتی نارد بۆ گواستنەوەی ئەوانەی رزگاریان ببوو، بۆ قوستەنتینیە.(٣٥) قلیج ئەرسەلان، پایتەختەکەی((نیقیە)) بەجێ هێشت دوای سەرکەوتنی بەسەر سەلیبیەکاندا، بەرەو((مەلتیە)) کەوتەرێ تاهێرش بکاتە سەر دانیشمەندیەکان، بێ ئەوەی بە سەلیبیەکان بدات، هەر چەندە بیستبووی وا کۆمەلانی نوێی سەلیبی بەرێگاوەن بەهەندی وەرنەگرت. وای بۆچوو کەوا کۆمەڵانێکی دیکەی بێ مەشق و راهاتنن کە بەئاسانی توانی بەسەریاندا سەرکەوێت.(٣٦)

نەیزانی چ مەترسیەك لە رۆژئاواوە هەرەشەی لێدەکات، ئەوەی زیاتر دڵنیای کردبوو، ئەو شێوازە نموونەییە بوو کە ئەلکسیۆس کۆمینن پەیرەوی کرد، کاتێ سیخورەکانی هاویشتە ناو ریزەکانی سەلجوقیەکانەوە و هەواڵی درۆیان بڵاوکردەوە لەبارەی ناکۆکی نێوان خۆی ومیرەکانی سەلیبیەوە، سوڵتانی

سەلجوقیش کەوتە ئەو بڕوایەوە کەوا ئەوانە بەرەو((نیقیە))نایەن، بە بەڵگەی ئەوەی ژنەکەی ومنداڵەکانی و سامانی لەشارەکە بەجێهێشتووە.(٣٧)

## گرتنی نیقیە:

دوای دەسپێکردنی لەشکرکێشی میللی، خۆ ئامادەکردن لە ڕۆژئاوای ئەورووپی دەستی پێکرد بۆ بەرێخستنی سوپای نیزامی بەرەو ڕۆژهەڵات. کە لە میرە دەرەبەگەکانی فەرەنسا و ئیتالیا و نورماندیا پێکهاتبوو، بێگومان کەسانی ئەم لەشکرکێشییە پلانی ڕێگا و ئامادەکارییەکانی چەك و سامان و پێویستی دیکەیان بە باشی لێکدابۆوە و هەڵسەنگاندبوو، هەروەها بەر لە بەرێکەوتنیان پەیوەندیان بە ئەو فەرمانڕەوایانە وە کردبوو کە بەسەر خاکەکانیاندا تێدەپەڕن، تاکو یارمەتیان بدەن. ئەم لەشکرکێشیە نیزامییە چەندین فەرماندەیی هەبوو، هەر میرێك پیاوو سەربازی خۆی هەبوو، لەگەڵ جیاوازیان لە تێگەیشتنیان و ڕوانینیان بۆ مانای جوڵانەوەی سەلیبی، لەچوار لەشکر پێکهاتبوون سوپای یەکەم بریتی بوو لەهێزەکانی نورماندی بەفەرماندەی(( بوهیموند)) و برازاکەی ((تانکرد)). سوپای دووەم، هێزەکانی ((پروڤنسالی)) بوون، بە فەرماندەی ((ڕیموندی چوارەم کونت تولوز)) سوپای سێهەم لەهێزەکانی فەرەنسی پێکهاتبوو بە فەرماندەی ((کونت بلوا وهیوکنت فرماندوا))ی کوری بچووکی ((هنری یەکەم شای فەرەنسا)).. ((جودفری دی برایۆن)) و ((بلدوین)) فەرماندەی هێزی لورینی خوارویان دەکرد، کە سوپای چوارەمی پێکهێنابوو(٣٨) ئەم سوپایانە، بە چوار ڕێگای جیاوازدا، بەرەو ڕۆژهەڵات بەرێکەوتن، فەرماندەکان ڕێکەوتن لە پەرژینەکانی قوستەنتینە یەکبگرن، ژمارەیان نزیکەی سی هەزار سەرباز بوو. ئەلکسیۆس کۆمنین بە ئاسانی شارەزای خوو و خەسڵەتی ئەو ڕۆژئاواییانە بوو، بە سیاسەتی ژیرانەی توانی بیری ڕاستڕەوی دەرەبەگی بقۆزێتەوە. بۆ چەسپاندنی مافەکانی لەسەر گەلێ لەو خاکانەی کەلە دەستی تورکەکان وەردەگیرایەوە. لەبەرامبەر یارمەتیدانیان هەندێ مەرجیان بەسەریاندا سەپاند،ئەویش بێنە ژێر دەسەڵاتیەوە وەك ئیمپراتۆرێك، هەر زەوییەکیش لە تورکەکان وەردەگیرێتەوە، بەو بدرێت، ئەگەر ئەو خاکە پێشتر سەر بە ئیمپراتۆریەتی بیزەنتی بووبێ.

فەرماندە سەلیبیەکان دوای گفتوگۆیەکی زۆر بەمە رازی نەبوون، دوای سوێند خواردن، رێگای پێدان بە ئاسیای بچوکدا تێپەرن (٣٩) سوپاکانی سەلیبی دوای تێپەڕبوونیان، بەرەو(( نیقیە)) رۆیشتن و لەبەر گرنگی شوێنی جوگرافیایی دەستیان بەسەراگرت، ئەگەر بەدەستی سەلجوقیەکانەوە بمایەتەوە، دەبووە جێگای مەترسی لەسەر رێگای هاتوچویان لەگەڵ شامدا. لەم کێشەیەدا، ئامانجیان لەگەڵ ئامانجی بیزەنتەدا یەکیان گرت ئیمپراتۆری بیزەنتی رای وابوو، دەبێ کارێکی وا بکرێت هێزی سەلجوقی لەناو ببرێ و پایتەختەکەیان(( نیقیە)) دەستی بەسەرا بگیرێ. لە ٢١ جەمادی یەکەمی ساڵی ٤٩٠ کۆچی/٦ ئایاری ١٠٩٧ زاینی هێزەکانی سەلیبی گەیشتنە پایتەختی سەلجوقیەکان. لەدەوری پەرژینەکەیدا باروبنەیان خست و ئابڵۆقەیان دا، لە رۆژئاوایەوە نەبێت کە گۆلێکی لێیە. سوپای بیزەنتی بەفەرماندەی((تاتیکیوس)) یارمەتیانی دا. ئیمپراتۆریش بەردەوام لەرێگای دەریا و دەشتاییدا یارمەتی بۆ دەناردن، لەبەر سەختی شوێنەکەیان هێرشیان بۆ نەبرد. پەرژینەکانی چوار میل درێژ بوو، دوو سەد و چل تاوەریشی لەسەربوو، بێجگە لەوەش ئاوێکی تەنك لە دەوری شوورەکەدا بوو، کە ئاستەنگی بۆ پەیدا کردبوون و یەکسەر هێرشیان بۆ نەبرد (٤٠) ((قلیج ئەرسەلان)) لەسەرەتاوە سوپای بۆ رۆژئاوا نەنارد تا بەرەنگاری هاتنی سەلیبیەکان بکات و ریگایان لێ بگرێ، وای بەباش زانی، لە رۆژهەلات بمێنێتەوە، هەر لەسەر ئەو رایەی مایەوە، تاکو سەربازگەکە داوای یارمەتی لێکرد فریای شارەکە بکەوێت. هەر چەندە سوپایەکی زۆر لەناوشاردا بوو، پێویستی خێرای بەیارمەتی دەرەوە هەبوو هێزێکی سەربازی نارد، دواجاریش دوای شکاندنی ئابڵۆقەکەی ((مەلتیە)) (٤١) خۆی گەیاندێ... پێشەنگی سوپاکەی سەلجوقی نەگەیشت، تا ئەوکاتەی سەلیبیەکان ئابڵۆقەکەیان لەسەر شارەکە توند کرد، نەیتوانی بچێتە ناو شەرەکەوە، دوای هەندێ هێنان و برد ن کشایەوە، چاوەڕیی گەشتنی سوڵتانی دەکرد لەگەڵ سوپاکەیدا کە بەرە بەرە لەشارەکە نزیك دەبووەوە.(٤٢) دوای توندکردنەوەی ئابڵۆقەی شارەکە، دواکەوتنی هێزی سەلجوقی، سوپاکەی ناوەوە ویستی بیداتە دەستی ئیمپراتۆری بیزەنتییەوە.

ئیمپراتۆر((بوتومیتس))ی نارد تا لەو بارەیەوە وتوێژ بکەن، بەڵام وتوێژەکە راگیرا، کاتێ هەواڵی گەیشتنی سوڵتان راگەیەندرا.(٤٣) قلیج ئەرسەلان، لەلای باشوورەوە گەیشتە شار دەستبەجێ هێرشی کردە سەر سەلیبیەکان هەوڵی ئەوەی دەدا رێگایەك بکاتەوە و لێی بچێتە ژوورەوە... شەڕ دەستی پێکرد، رۆژێکی خایاند بێ ئەوەی بتوانێ رێگایەك بۆ خۆی بکاتەوە. ئەوجار وای بەباش زانی دەست لەشارەکە هەڵگرێ رووبەرووی چارەنووسی خۆی ببێتەوە، دواجار بۆ چیاکانی دەوروبەر کشایەوە، رێگاشی بەسەربازگەکەی ناوەوە دا بە ئازادی هەلسو کەوت بکات(٤٤) ئابلۆقەکە پێنج هەفتە بەردەوامی کرد، سەلیبیەکان لەو ماوەیەدا زیانێکی زۆریان لێکەوت، تا ورەیان بەرزبێتەوە و ورەی تورکەکان نەهێڵن، هەندێ لە دیلەکانیان سەربڕی. بە نووکی رمەکانیانەوە کردن و بەرزیان کردبۆوە و بەدەوری پەرژینەکاندا دەسوڕانەوە، دواجار سەرەکانیان فڕێ دەدایە ئەو دیوو پەرژینەکانەوە.(٤٥)

## مێژووی سەلجوقیەکانی رۆم لە ئاسیای بچووکدا

سەختی و قایمی پەرژینەکانی شار، رۆڵێکی دیاریان گێڕا لە درێژکردنەوەی ماوەی ئابلۆقەکە، ئەو خواردەمەنی و ئازوقانەی لەرێگای گۆلەکەوە بە رەزامەندی ئیمپراتۆر دەگەیەنرایە ناو شارەکەوە ورەی دانیشتوانەکەی بەرز راگرتبوو[٤٦]. ئیمپراتۆری بیزەنتی دەرکی بە زەحمەتی هەڵوێستی سەلیبیەکان کردبوو، ویستی ئەوە بۆ فەرماندەکانیان بسەلمێنێ کەوا یارمەتی ئەم بۆیان پێویستە. هەرواش بوو، ناچاربوون، داوای یارمەتی لێ بکەن، لەسەر داوای ئەوان هێزێکی دەریایی پێدان، ئیتر رێگایان لەگەیشتنی ئازووقە گرت بۆ شارەکە[٤٧]. لەهەمان کاتدان پلانی دادەنا، دەست بەسەر شارەکەدا بگرێ بەبێ بەشداربوونی سەلیبیەکان.

سوپاکەی ناوشار، دوای ئەوەی کەشتیە سەربازیەکانیان لە گۆلەکەدا بینی، زانیان ئیمپراتۆری بیزەنتی سیاسەتی گۆڕاوە بەرامبەریان، بەبێ گەیشتنی ئازووقە بۆ شارەکە دانیشتوانەکەی تووشی قات و قڕی دێن، بۆیە بڕیاریان دا خۆیان بەدەستی سەلیبەکانەوە بدەن. بەڵام لە توندوتیژی سەلیبیەکان ترسان، وایان

بەباش زانی شارەکە بەدەستی ئیمپراتوری بیزەنتەوە بدەن، وتووێژ لەنێوان سەربازگەکەی ناوشار و نوێنەرانی ئیمپراتۆر بە فەرماندەی (بوتومیتس) دەستی پێکرد(٤٨).

ئیمبراتوری بیزەنتی ئەم دەسپێشخەرییەی پێ خۆش بوو، لەلایەن سەربازگەکەی ناوەوەی شارەکەوە. چونکی دەترسا فەرماندەرەکانی سەلیبی شارەکەی بەدەستەوە نەدەن، ئەگەر ئەوان داگیری بکەن، لەکۆتاییدا بڕیار درا شارەکە بەدەستەوە بدەن بەرامبەر پارێزگاری ژیانی دانیشتوانەکە(٤٩). ئەلکسیوس کومینن هێزی بیزەنتی بۆ شارەکە هێنا، سەلیبیەکان سەریان سوڕما کە بینیان ئاڵای ئیمپراتۆر بەسەر پەرژینەکانەوە دەلەرێتەوە، بێ ئەوەی ئاگایان لە وردەکاری وتووێژە نهێنییەکان هەبێ کە لە نێوان سەربازگەکەی ناو شار و ئیمپراتۆر رویدا.

بۆ جێبەجێ کردنی رێکەوتنەکە، تورکەکان، لەگەڵ خێزانەکانیاندا لەژێر پاسەوانیەکی توندا، بۆ قوستەنتینیە یان سەربازگەی بیزەنتیەکان لە (بیلکانوم) لەشار دەرچوون، خوشك و ژن و منداڵەکانی سوڵتانیش لەگەڵ دانیشتوانەکاندا دەرچوون، زۆری نەبرد، ئیمپراتۆر هەموویان بەبێ سەرانە بۆ سەرکردە سەلجوقی گەڕاندەوە، (بوتومیتس)ی رێزلێناو کردیە فەرمانڕەوای نیقیە(٥٠).

ئەوەی لەنووسینەکانی مێژوونووسەکانی شەڕەکانی سەلیبی لاتین بکۆڵێتەوە، دەبینێ ئەو رێگایەی ئەلکسیوس کومینن بەکاری هێنا بۆ دەست بەسەراگرتنی شارەکە بووتە جێگای توورەبوونیان. ئەوەش دەڵێن: کاتێ ئیمبراتور بینی، سەلیبیەکان خۆیان ئامادە دەکەن بەزۆر نیقیە داگیر بکەن، ترسا بکەوێتە دەستیان بە ئیمبراتوری نەدەنەوە وەك ئەو رێکەوتنەی لەنێوانیاندا هەبوو. چونکی ئامانجی ئەوەبوو بۆ ژێر دەسەڵاتی ئیمپراتۆری بگەڕێننەوە، نەیویست تووشی زیان بێ، کەوتە وتووێژ لەگەڵ تورکەکاندا تاکو بەبێ شەڕ شارەکەی بدەنێ، بۆیە رازی بوو بە مەرجەکانیان و بەسەلامەتی لەشارەکە دەرچنە دەرەوە.

وا دیارە ئەم لێکدانەوەیان راستە، (ئەنا کومینن) دەڵێ: ئیمپراتۆر دەیویست خۆی لەگەڵ هێزی سەلیبیەکاندا لەشەڕی تورکەکاندا بەشداری بکات. بەڵام

لەزۆربیەکەیان ترسا، دوار ئەگەری سەرنەکەوتنی لەو بارودۆخە ناسکەدا، گورزێکی کوشندە بوو لێی دەرکەوت، بۆیە وای بەباش زانی لەشاری (بیلکانوم) چاوەڕوان بێت و چاودێری گۆڕانی ڕووداوەکان بکات. ئەم خانمە ئەوە ناشارێتەوە کەوا باوکی دەیویست نیقیە بێ پارمەتیدانی سەلیبیەکان بگەڕێتەوە، چونکی مەترسی ئەوەی دەکرد، گەر ببێتە هۆی ئەوان، بەڵێنەکانیان بدەی نەهێنن، بۆیە مەبەستی خۆی ئاشکرا نەکرد پلانێکی دوولایەنەی بەکار هێنا. (بوتومیتس)ی بۆ شارەکە نارد تاکو هێزەکەی ناو شار رازی بکات بەبێ بەرامبەر شارەکەی بەدەستەوە بدەن لەبەرامبەر پاراستنی ژیانیان، لەهەمان کاتیشدا وشیاری پێ دان، ئەنجامەکەی خراپ دەبێ گەر شارەکە بەدەستی سەلیبیەکان بکەوێت(٥١).

پرۆسەی بەدەستەوەدانی شارەکە بەپێی ئەو رێکەوتنە بەرێوەچوو کە لەنێوانی ئەلکسیوس کومینن و سەرکردەکان سەلیبی بەسترابوو. سەرەڕای ئەو پەیوەندییە نهێنیانەی کە لەنێوانی سەلجوقیەکان و بیزەنتیەکاندا بەرێوەچوو لەم بارەیەوە، لەلکسیوس کومینن هەموو بەڵێنەکانی بەجێ هێنا کە لە رێکەوتنەکەدا هاتبوو، تا سەرکردە سەلیبیەکان بۆ رۆژی دوایی سەردانیان کرد و بۆ سوپاسکردن و پیرۆزبایی لێکردنی، بەرلەوەی هێرشەکانیان دەست پێبکەن، کەسیش نارەزا نەبوون لەبەدەستەوەدانی شارەکە، دووبارەش سوێندیان بۆ خوارد، (تانکرد) و (سنجیل) نەبێ. کە هەر لەسەرەتاوە سوور بوون لەسەر ئەوەی پەیمان بە ئیمپراتۆر نەدەن(٥٢).

هەرچی چۆنی بێت، نیقیە لە ١٦ی رەجەبی ٤٩٠ی کۆچی/ ١٩ی حوزەیرانی ١٠٩٧ی زاینی کەوتە ژێر دەستی بیزەنتیەکان، دوای شانزە ساڵ داگیرکردنی لەلایەن سەلجوقیەکانەوە. ئیتر ئیمپراتۆر توانی بەئازادی هەناسە هەڵکێشێ دوای دەرچوون سەلجوقەکان لەم بنکە سەخت و قایمەی پێشەوە(٥٣).

دوای داگیرکردنی پایتەختەکەی قلیج ئەرسەلان بەرەو قونیە رۆیشت. کردی بە پایتەختی تازەی خۆی و بنکەیەکی سەربازی تیادا دامەزراند، تیایدا بەرگری لەخاکەکانی خۆی دەکرد، دواجار لەگەڵ میری دانیشمەندییەکاندا دەستی کردە وتووێژ بۆئەوەی ناکۆکیەکانیان جارێ رابگرن تا لەپێش هێرشی سەلیبیەکاندا

بوەستێ، کە جێگای مەترسی هەردوولایەکیان بوون. داگیرکردنی نیقیە، ترسی ئایندە خستەبەر، لەناوچوونی ماڵ و دارایی و سامانەکەشی کارێکی خراپ بوو[٥٤].
وتووێژی نێوان هەرد خانەوادە تورکیەکە (سەلجوقی و دانیشمەندی) ئاگربەست و شەڕ راگرتنی نێوانیانی لێ کەوتەوە، هەروەها یەکیان گرت بۆ وەستان لەپێش سەلیبیەکاندا کە گەیشتبوونە (کبادوکیە). بەشێوەیەکی کاتیش بێ، کێبڕکێی نێوانیان لەبیر دەرکرد سەبارەت بە (مەلتیە). بەمجۆرە هەموو تورکەکان بەکیانگرت لەئاسیای بچووک بۆ بەرەنگاربوونەوەی سەلیبیەکان لەدەشتاییەکانی (دوریلیوم)[٥٥].

## شەڕی دوریلیوم

سەلیبیەکان دوای هەفتەیەك پشوودان دوای داگیرکردنی نیقیە تێهەڵچونەوە، لە (فریجیا)وە کەوتنە رێ، ئەو رێگا رومانیانەیان گرت کە بە (دوریلیوم) و (فیلومیلیۆم) و (قونیە)دا تێدەپەڕێ تا دەگاتە تەرسوس، هێزێکی بیزەنتیش بەفەرماندەی (تاتیکوس)ی بەناوبانگ و خاوەن ئەزموون(٥٦). کەوتبووە تەکیان، لەگوندی (لویکی) راوەستان، لەوێدا ئەنجومەنێکی سەربازیان پێکهێنا، پلانیان بۆ هێرشکەیان دانا، بڕاردرا، سوپاکە بەدوو بەشەوە بکەن، بۆ ئاسانکردنی زەخیرەو ئازووقە، لەکاتی چوونە پێشەوەیانداو لەگەورەترین رووبەریش بەسەر بەرگریکردنی سەلجوقیەکاندا زاڵ بن[٥٧].
بەشی یەکەمی سوپاکە لەنۆرمانی باشووری ئیتالیا و باکووری فەرەنسا، لەدەست و پێوەندی (بوهیموند و تانکرید) و سەربازەکانی (کونت فلاندر و ستیفن بلوا) بوون. سەرەڕای دەلیلە بیزەنتیەکان و فەرماندەکانی (بوهیموند) بەشی دووەم، لەسەربازەکانی باشووری فەرەنسا و لۆرین، کەسەر بە (جودفری و ریموند دی تولوز و سەربازەکانی (کونت فرماندوا) بوون، ریموند سەرکردەیان بوو، بڕیاریان دا لە (دوریلیوم) بەیەك بگەن، دوای ئەوەی بەشێوەی هاوتەریب، لەدووری حەوت میلەوە بەهاوشانی یەکدا رێ بکەن[٥٨].

هەردوو بەشە سوپاکەی سەلیبی بەرەو دەشتاییەکان رۆیشتن، ئەو دەوروبەرە، رووباری (سنغاریوس)ی تێدا تێدەپەڕێ و تورکەکان تیایدا خۆیان ئامادەکردبوو بۆ هێرش بردنە سەریان، بەسواری ئەسپەکانیان دەورەی سوپای بەشی یەکەمیاندا، بەلا رووبەروو نەبوونەوە. سەلیبییەکانیش لەلایەن خۆیانەوە هەوڵیان دەدا، تورکەکان لێکیان دانەبڕێو هەردوو سوپاکە لەیەکتر جیانەبنەوە. بۆیە لە ٢٧ی رەجەب/ ٣٠ی حوزەیران. لەنزیك کەلاوەکانی (دوریلیوم) موڵیان دا[٥٩].

تورکەکان بۆ بەیانیەکەی پەیدابوون، دەستبەجێ دەورەی سەلیبییەکانیان دا و فشاریان خستە سەریان. شەڕ لەنێوانیاندا دەستی پێکرد، لەئەنجامدا سەلیبییەکان سەرکەوتن. لەپێشدا تورکەکان زاڵبوون، بەڵام کە بەشی دووەمی سوپاکەیان بەشداری شەڕەکەی کرد تورکەکان شکان. قلیج ئەرسەلان بۆ ناو بەرزاییەکانی ئەنادۆڵ کشایەوە. بەڵام کوشتاریان کەم بوو، کاتی سەلیبییەکان باڵی چەپی سوپاکەی تورکیان دەورەدا، سەغلەت بوون (بوهیمەند) زامدار بوو و سەلیبییەکان شارەکەیان داگیر کرد[٦٠].

### ئەنجامەکانی شەڕی دوریلیوم

شەڕی دوریلیوم، کە بەشەڕی بەخت دەتوانرێ وەسف بکرێت[٦١]. کاریگەرییەکی خراپی لەسەر سەلجوقیەکان هەبوو، بەشکست هێنانیان، هەندێ لەوەی دەستیان کەوتبوو لە ماوەی بیست ساڵدا، هەر لەشەڕی مانزیکرتەوە[٦٢]، لەدەستیان دا، بەڵام لەلای سەلیبییەکان ڕێزیان پەیداکرد، سەرسامی ئازایەتیان بوون، سەرسام بوون بە بەکارهێنانی هونەری شەڕکردنیان[٦٣]. قلیج ئەرسەلان بۆی دەرکەوت، هەوڵی راگرتنی سەلیبییەکان بێ سوودە، لەگەڵ دەست و پێوەندەکانیان رویان لە چیاکان کرد، بۆ ئەوەی سەلیبییەکان سوود لەدێهاتەکان وەرنەگرن، وێرانیان دەکرد. ئیتر، قلیج ئەرسەلان پرکێشی نەدەکرد لەگەڵ سەلیبیەکاندا رووبەڕوو ببێتەوە بەتەنها[٦٤].

دەرکەوتنی هێزێکی نوێ لەسەر شانۆی رووداوەکان لە رۆژهەڵاتدا، ئەویش هێزی سەلیبیە رۆژئاواییەکان بوو، سەلماندیان کە لەو هێزە بەتواناترن کە ساڵانێك

## مێژووی سەلجوقیەکان

سوپاکانی بیزەنتی خۆیان لەبەریان رانەدەگرت. ئەویش هێزی سەلجوقیەکان بوو[٦٥].

ئەم شەڕە رێگای لەپێش سەلیبیەکاندا والا کردەوە بۆ ولاتی شام، سەلامەتی تێپەربوونیان بەئاسیای بچووکدا دابین کرد[٦٦].

لەدەستدانی (نیقیە) و (دوریلیوم) تیرێکی کوشندە بوو لەخێزانی سەلجوقی و شوێن و پایەیان لەئەنادوڵدا. ئەو دوو شارە خالی وەرچەرخانی کاروباری سەلجوقی بوون. چونکی ئەو زیانانە لێیان کەوت چ مالی چ گیانی، یان لەموڵك و زەوی و زاردا یەکجار زۆر بوون کە کۆتایی بەخەونی بەربلاوبوونەوەیانی هێنا.

بیزەنتە، توانی بەشی رۆژئاوای ئەنادۆڵ کە لەدەستیان دابوو دوای داگیرکردنی (نیقیە) لەلایەن سەلجوقیەکانەوە لەسالی ٤٧٤ی کۆچی/١٠٨١ی زایینی، بگەڕێتەوە، ئەبێ تێبینی ئەوە بکرێ، ئەم سەرکەوتنە، ئەنجامێکی راستەوخۆی لەشکرکێشی یەکەمی سەلیبیەکان بوو.

پرۆسەی گەڕانەوەکە بووە مایەی گۆڕانێکی گرنگ لە خەریتەی خاکەکاندا، لەکاتێکدا سنووری سەلجوقی–بیزەنتی، لەسالی ٤٧٨ی کۆچی/١٠٨٥ی زاینیدا، بە (نیقیە و نیقومیدیە)دا تێدەپەڕی، کە زۆر لە دەریای مەرمەڕەو تەنگەی بوسفورەوە دوور نەبوو، دەبینین دوای ئەوەی تورکەکانیان لە (بیسینیا) و (لیدیا) و فیریجیا) دەرکرد و ئەو ناوچانە گەڕانەوە بۆ بیزەنتیەکان[٦٧] سنوورەکان گۆڕان، بەمە ئیمپراتۆرییەت تۆڵەی خۆی کردەوە، لەو کارەساتەی کە بەدەستی سەلجوقیەکان بەسەریاندا هات لە شەڕی (مانزیکرت)[٦٨].

دوای شکستهێنانی سەلجوقیەکان لەشەڕی (دوریلیوم) دانیشتمەندییەکان دەسپێشخەری بوون لە بەرەنگاربوونەوەی سەلیبیەکان، هەروا لاوازیان و ئەو کارەساتانەی بەسەریاندا هات بەهەل زانی و سوودیان لێ بینی گوشاریان خستە سەر مەلتیە، کە پێشتریش قلیچ ئەرسەلان لە رۆژگارێکدا لەسەری شەڕیان بوو[٦٩].

سەرەرای لاواز بوونی هێزی سەلجوقی، لەگەڵ سەلجوقیەکانی رۆژهەلاتدا نێوانیان تێکچوو، چونکی قلیچ ئەرسەلان، دانی نەدەنا بەسەلاتەکەیاندا، بەلام ئومێدێکی کەمی هەبوو زانی چۆن کەڵك لە کۆچبەرە تورکەکان وەرگرێ کە بۆ ئاسیای

بچووك دەڕۆیشتن، ئەو کۆچبەرانەی هێنایە ناو سوپاکەیەوەو کردنی بەسەرباز و سوپایەکی جەنگاوەری بەهێزی راهێنراوی لێیان پێك هێنا[70].

## دەستپێکردنەوەی پێشەوە چوونی سەلیبییەکان بەرەو وڵاتی شام

سەلیبییەکان بەردەوام بون و بۆ پێشەوە دەچوون تا گەیشتنە (قونیە)، گەلێ زەحمەتیان کێشا، بەتایبەتی سەختی رێگاو بان و کەمی خواردن و ئاو و گەرمای هاوین. شارەکەیان بەچۆڵی بینی، لەهەندێ ئەرمەنی بەولاوە کەسی تیادا نەمابووەوە، ئەوانیش لەدەوروبەرەکەی دەژیان. تورکەکان شارەکەیان بەجێ هێشتبوو و پەنایان بۆ چیاکان بردبوو[71]. ئەم شارە بەپیتو فەرەی شارەکە سەرنجیانی راکێشا، بەتایبەتی، ئەم شارە وەکو مێژوونووسێکی نەناسراو باسی دەکات: (ناوچەیەکی بە پیتە، خواردەمەنی زۆرە، هەموو جۆرە ژیانێکی تیادایە)[72] ماوەیەك لەوێ حەسانەوە، بەر لەوەی بەرەو شاری (هرقلە) بڕۆن، ئەرمەنیەکان ئامۆژگاریان کردن لەگەڵ خۆیاندا ئاو هەڵگرن[73].

تورکەکان جارێکی کە ویستیان نەهێڵن بەرەو پێشەوە بڕۆن. ئەمجارەیان میر حەسەن و گومش تەکین ئەحمەد دانیشمەند، فەرماندەییان دەکرد. بەڵام هەوڵەکانیان بێ سوود بوو، سەلیبییەکان سوور بوون بەناوچەکەدا تێپەڕن.

کە گەیشتە (هرقلە)، (تانکرد و بلدوین) لەسوپا سەرەکیەکە دابڕان و روویان لە (قیلیقیە) کرد، کە دەکەوێتە بەشی باشووری رۆژهەڵاتی ئاسیای بچووك، بەو نیازەی ئاواتەکەیان بەدی بهێنن و چەند ئیمارەتێکی تیادا دامەزرێنن)[74].

سوپاکەی دیکە بەرەو قەیسەری کەوتەڕێ و داگیری کرد، ئەم شارەش تورکەکان چۆڵیان کردبوو، هەروەها سەلیبییەکان دەستیان گرت بەسەر (کومانا) کە قەڵایەکی ئەرمەنی بوو لەچیای تۆرۆسدا و جێگایەکی گرنگ بوو، دانیشمەندیەکان ئابلۆقەیان دابوو کە سەلیبییەکان لەو ناوە نزیك بوونەوە، خۆیان ونکرد[75].

سەلیبییەکان ئەمجا چوونە (کوکست) ئەمەش شارێکی بەپیتەو دانیشتوانەکەی ئەرمەنی بوون. بەگەرمی پێشوازیان لێکرد، دوای ئەوەی پێویستیەکانیان لەشارەکە دابین کرد، بەرەو (مرعش) رۆیشتن و داگیریان کرد،[76] بارودۆخیان تا

نەگەیشتنە ناوچەی ئەرمەنیەکان باش نەبوو. ئەرمەنیەکان پێویستیەکانیان بۆ دابین کرد و بەگەرمی پێشوازیان لێ کردن. دەرکەوت تورکەکان لە راگرتنی چوونە پێشەوەی سەلیبیەکان سەرنەکەوتن، زانیان کۆتایی نزیك بۆتەوە. شارەکان چۆڵ کرابوون، دێهاتەکانی خاپوور بوون، هێزەکانتان پچڕ پچڕە، بیزەنتیەکان ئەو شارانەیان گەڕاندەوە کە لەدەستیان دەرچوو بوون. سەلیبیەکان هەندێ لەو شارانەیان بۆ بیزەنتیەکان گەڕاندبووەوە. ئەو شارانەش لە موسڵمانەکانیان داگیرکردبوو، وەکو (کومانا) و (مرعش).

## سەلیبیەکان قیلیقیە داگیر دەکەن:

بونی ئەرمەنیەکان لە قیلقیلیە بەو ژمارە زۆرییە، هۆکارێکی سەرەکی بوو بۆ ئاسانکردنی ئەرکی سەلیبیەکان و دەست بەسەراگرتنی ئەم هەرێمە. زۆربەی دانیشتوانی شار و قەڵاکان لەرەگەزی ئەرمەنی بوون، سەربازگەی سەلجوقیشی لێ بوو. کە سەلجوقیەکان لەو شارە گەورانە ئەو هێزانەیان دانابوو، لەوانە (تەرسوس) و (ئەدەنە)و (مەسیس) ئەو هێزانە هەر لەکاتی سلێمان کوڕی قوتولمشەوە لەوێدا بوون[٧٧]. (تانکرد) بەرەو شاری تەرسوس رۆیشت، دانیشتوانە ئەرمەنیەکان داوایان کردبوو. هێزەکەی تورك بەرەنگاریان بووتەوە، بەڵام سەرنەکەوتن، تورکەکان گەڕانەوە ناو شارەکەو خۆیان تێدا قایمکرد، لەم کاتەدا، (بلدوین) بەفەرماندەیی هێزێکی سەلیبییەوە گەیشت، لەئابلۆقەدانی شارەکە بەشداربوو، تورکەکان زانیان هێزی سەلیبییەکان یەکجار زۆرن و ناتوانن خۆیان راگرن، وایان بەباش زانی لەشارەکە دەرچن، بەتایبەتی پەیوەندیان لەگەڵ حکومەتی ناوەندیدا پچڕابوو، نەیاندەتوانی بەرەنگاری بکەن، ئەرمەنیەکان دەروازەکانی شاریان بۆ سەلیبییەکان کردەوە، بەبێ کوشتا و شەڕ هاتنە ناو شارەوە[٧٨]. داگیرکردنی (تەرسوس) لەلایەن (تانکرید)ەوە، ترسی خستە دڵی سەربازەکانی ئەو سەربازگەیەی لەناو شارەکاندا بوون، ئەوانیش وایان بەباش زانی، بکشێنەوەو بەرەو باکوور برۆن. بەمجۆرە (ئەدەنە) و (مەسیسە)ش کەوتە دەستی (تانکرید)ەوە. (ابن القلانسی) دەڵێ: سەلیبیەکان دەستیان خستە سەر ئەو کەلەبەر و رێگایانەی[٧٩] بەگرنگیان دەزانی. سەلیبیەکان دوای ئەوەی،

دەستیان بەسەر (قیلیقیە)داگرت، سەربازگەی سەلیبیان لە تەرسوس و ئەدەنەو مەسیسە دانا.

لێرەدا جێگەی باسکردنی ئەو ناکۆکیەی نێوان (تانکرید) و (بلدوین)ینە کە هەندێجار دەگەیشتە خوێنڕشتن سەبارەت دەستبەسەراگرتنی قیلقیە، تەنها ئەوەندە بەسە بزانین هەردووکیان، ئەوەیان مەبەست بوو لێرە بۆیان نەهاتەدی، (بلدوین) ناوچەکەی بەجێهێڵاو چووە لای سوپای سەرەکی سەلیبیەکان، کە لە (مرعش) بووە.. (تانکرید) چووە لای ئەو سەلیبیانەی کە ئەنتاکیە بوون[٨٠]. گومانی تیادا نەما، بوونی سەلجوقی لەم ناوچەیەدا کۆتایی پێهات، ئیتر دەکەوێتە دەستی ئەرمەنیەکانەوە.

### دامەزراندنی ئیمارەتی رەها

سەلیبیەکان چوونە ناو ئاسیای بچووکەوە دوای داگیرکردنی (نیقیە). هەروەها دەستیشیان بەسەر قیلیقیەدا دەڕۆیی. ئەمجا بەرەو وڵاتی شام بەرێ کەوتن. گەیشتنە (ئەنتاکیە) و ئابلۆقەیان دا، جارێکی کە (بلدوین) لە سوپا سەرەکییەی سەلیبی لە عینتاب جیابووەوە[٨١]. روویکردە رۆژهەڵات، بەڵکو لەوێ لەناوچەی فورات سەرکەوتن بەدەست بهێنێ دوای دوای ئەوەی لە (قیلقیە) سەرنەکەوت. بەتایبەتی میر سوروس، فەرمانڕەوای رەها[٨٢]. داوای یارمەتی لێکرد، تا بڕواتە هانایەوە پێش لە ئیسلامەکان بگرێت کە بەفەرماندەیی (کربوغا)ی فەرمانڕەوای موسڵ هێرشیان هێنابوو (بلدوین) بەزیرەکی خۆی ئیمارەتێکی لە (رەها) دامەزراندبوو. بەڵام زۆری نەبرد ئەرمەنیەکان (سوروس)یان کوشت. (بلدوین) ژنەکەی بۆ خۆی خواست و دەسەڵاتیشی بەدەستەوە گرت، لە ٤٩١ی کۆچی / ١٠٩٨ی زاینی. بەمجۆرە یەکەم ئیمارەتی سەلیبی لە رۆژهەڵاتی ئیسلامیدا دامەزرێنرا[٨٣] (بلدوین) بۆ فراوانکردنی دەسەڵاتەکەی (تل باشر)[٨٤] و (راوندان)[٨٥] و (سمیسات)[٨٦] (سروج)[٨٧] ی داگیرکرد لەگەڵ گەلێ جێگاو شاردا لە باکووری جزیرەی فورات. ئیمارەتە سەلیبیەکان فراوانتر بووەوە رۆژهەڵات و رۆژئاوای رووباری فوراتی گرتەوەو لە ئیمارەتی موسڵ نزیك بووەوە، شارەکانی دیاربەکریش وەکو (نسیبین) و (ماردین) و (حەڕان) بەڵکو باکووری عێراقیش

کەوتنە ژێر هەڕەشەی داگیرکردنەوە. هەروەها دەستی بەسەر ئەو ڕێگەیەشدا گرت کە بۆ حەڵەب و موسڵ دەڕۆیشت.

گرنگی ئەم ئیمارەتە لەوەدا بوو بووە پەرژینێك لە باکووری ڕۆژهەڵات، (بلدوین) بەئەنجامدانی ئەم کارە دڵخۆش بوو، ئیتر ئەوەندە پێویستی بەیارمەتی سوپای سەلیبی نەبوو، کە تا ئە کاتەش هەوڵی گەیشتنی (ئەنتاکیە)ی دەدا،

ئیمارەتی (ڕەها÷ گەورەترین ئیمارەتی سەلیبی بوو، لەهەمووشی زیاتر زیان و ئازاری گەیاندە موسڵمانەکان.

## دامەزراندنی ئیمارەتی ئەنتاکیە

لەمانگی ذولقەعدەی ساڵی ٤٩٠ی کۆچی / تشرینی یەکەمی ١٩٠٧ی زایینی. سەلیبیەکان گەیشتنە ئەنتاکیە. ئابڵۆقەیان دا، ئابڵۆقەکە حەوت مانگ درێژەی کێشا، بارودۆخی سەلیبیەکان باش نەبوو، قاتو قڕی تیایاندا بڵاوبووەوە، تووشی تەنگژەیەکی ڕاستەقینە بوو بوون. لەبەرامبەر ئەمەدا، موسڵمانەکان لەناو شارەکەدا ریزەکانی خۆیان ڕێکدەخست، جێگای خۆیان قایمدەکرد بۆ بەرگریکردن لەخۆیان و موڵکەکانیان، موسڵمانەکانی دەرەوەی شاریش ناڕێکی کەوتە نێوانیانەوە، لەو کاتانەشدا، سوپایەکی ئیسلام بەفەرماندەی (کربوغا)ی فەرمانڕەوای موسڵ بەرەو شارەکە دەهات، بەڵام درەنگ گەیشت..

لەم ناڵەباری و خراپی بارودۆخەی سەلیبیەکان، (بوهیموند) پیلانێکی چنی، بەدیهێنانی ئارەزوو و حەزەکانی لەوەدا دەبینیەوە، چووە پاڵ سەلیبیەکان، مەبەستی دامەزراندنی ئیمارەتی نورمانی بوو لە ڕۆژهەڵاتی ئیسلامدا، نیازی خۆی ئاشکرا کرد، ئەگەر فەرماندەکانی سەلیبی ڕازی نەبن دەسەڵاتی ئەنتاکیە بەدەستەوە بگرێت دوای ئەوەی دەستی بەسەرا دەگرن، ئەوا لەوێ نامێنێ و دەڕوات. سەلیبیەکان لەمە ترسان، داواکەیان قەبوڵکرد، (بوهیموند) لەگەڵ ئەرمەنیەکاندا پیلانێکی ڕێکخستبوو، ئەو بورجە (تاوەر) بکاتەوە.. سەلیبیەکان چوونە ژوورەوە. بوهیموند دەستی بەسەر قەڵاکەدا گرت، جاڕی دامەزراندنی ئیمارەتی ئەنتاکیەی سەلیبی لەجەمادی ئاخری ٤٩١ی کۆچی / سەرەتای

حوزەیرانی ١٠٩٨ی زاینی، راگەیاند. ئەمە دووەم ئیمارەتی سەلیبی بوو دوای ئیمارەتی رەها.[٨٨]

## دامەزراندنی مەملەکەتی بەیتولەقدس

لەمانگی سەفەری سالّی ٤٩٢ی کۆچی / کانوونی دووەمی ١٠٩٩ی زاینی، سەلیبییەکان دوای دوو دلّیەکی زۆر، بەرەو شام کەوتنەرێ. میرانی شارە ئیسلامیەکان دەرکیان بەمەترسی هەلّوێستەکە کرد، چونکی هێزێکی ئیسلامی گەورە لەدەورو بەریاندا نەبوو پارێزگاریان بکات، بۆیە بریاری پەیرەوکردنی سیاسەتی میانرەوانە کرد، لەگەلّ سەلیبییەکاندا رێك بکەون و داواکانیان قەبولّبکەن. بۆ نموونەی ئەو میرانە (سلطان ابن منقذ صاحب شیزر و (بنی عمار) لەتەرابلس[٨٩].

سەلیبییەکان رێگای کەناری (شام)یان گرت و بەرەو باشوور رۆیشتن، تا لە (ئەرسوف)[٩٠] کە بۆ (یافا)[٩١] دەروا لایان دا، دوا جار بەناو ولاّتەکەدا راستەوخۆ بەرەو (المقدس) رۆیشتن و ئابلّۆقەیان دا، ئابلّۆقەکە پێنج هەفتەی خایاند لەنێوان (رەجەب و شەعبان / حوزەیران و تەممووز) توانیان رۆژی هەینی ٢٢ی شەعبان / ١٥ی تەمموز چوونە ناویەوە. کوشتارێکی بێ وێنەیان تیادا ئەنجامدا.

کەسی تیادا رزگاری نەبوو. فەرماندەی هێزەکەی فاتمیەکان نەبێت (افتخار الدولە) لەگەلّ ژمارەیەك لەپیاوەکانی دا. (جودفری دی بوایون) کرایە حاکمی شارەکە و نازناوی (حامی القبر المقدس – پارێزەری مەزاری پیرۆز)[٩٢] یان پێ بەخشێ. بەلاّم ئەم ئیمارەتە زۆری نەبرد، لەمانگی رەمەزانی سالّی ٤٩٣ی کۆچی / تەممووزی ١١٠٠ی زاینی، بووە مەملەکەت. دوای کۆچی دوایی (جودفری) و (بلدوین) یان لە ئیمارەتی (رەها)وە هێنا تا ببێتە فەرمانرەوای (بیت المقدس) لەمانگی سەفەری سالّی ٤٩٤ی کۆچی / کانوونی یەکەمی ١١٠٠ی زاینی کاروباری بەدەستەوە گرت[٩٣].

## ناکۆکی لەسەر مەلّتیە

رووداوە سیاسیەکان گۆران بەسەریاندا هات و بەرەو باشی دەرۆیشتن، دوای ئەوەی دەرکەوت سەلیبییەکان لە هێرشەکانیاندا مەبەستیان جێگیر بوون نەبووە

لەناوچەکەدا لەهەمان کاتدا، ئیمپراتۆریەتی بیزەنتی هەوڵی بەدەست هێنانەوەی موڵکەکانی بوو، بەڵام بۆی نەلوا، تەنها توانیان بەشی رۆژئاوا بگەرێننەوەو دەست بەسەر کەنارەکەدا بگرن.

ساڵی ٤٩٣ی کۆچی / ١١٠٠ی زاینین سەر لەنوێ(کمشتکین ئەحمەد دانیشمەند) هەوڵی گرتنی مەلتیەی دایەوە.

فە رمانڕەوای شارەکە (جبریل) داوای یارمەتی لە (بوهیموند) میری ئەنتاکیە کرد، بەڵێنی پێدا ئەگەر شارەکە رزگار بکات بیداتە دەستی (بوهیموند)ەوە. میری سەلیبی یارمەتی بۆ نارد(٩٤)، دەیزانی ئەرمەنیەکان تا چ رادەیەك گرنگ و چ رۆڵێك دەتوانن بگێڕن لەو کارانەوە کە پەیوەندیان بەمێژووی ناوچەکەوە هەیە. بەتایبەتی، لەو ناکۆکیەی کە لەنێوان ئەو و ئیمپراتۆریەتی بیزەنتیدا هەیە سەبارەت بەناکۆکی لەمەڕ ئەنتاکیەوە، دوای دەرکردنی لەژێر دەسەڵاتی ئیسلامەکان. بۆیە سوور بوو لەسەر پارێزگاریکردنیان. لەو بڕوایەدا بوو، کەوا (نورمانەکان) و (ئەرمەنیەکان) بەرژەوەندی هاوبەشیان هەیە، ئەویش دوژمنایەتی کردنی بیزەنتی و تورکەکانە(٩٥).

لەمانگی ذو القعدەی ساڵی ٤٩٣ی کۆچی / ١١٠٠ی زاینی (بوهیموند) بە هێزێکی کەم ژمارەوە(٩٦) ئەنتاکیەی بەجێهێشت بەرەو (مەلتیە) گەورە رێ. بێ ئەوەی گوێ بداتە ئەو بۆسانەی تورکەکان بۆیان دانابوو، کاتێ بەهۆی سیخوڕەکانیانەوە زانیبوویان بەوێدا گوزەر دەکات. (میرسالرنو)ی ئامۆزای هاو رێگای بوو، بەڵام کەوتە ناو یەکێ لەو بۆسانەوە، خۆی و ئامۆزاکەیان بەدیل گرتن لەلایەن (گوموشی تەکین ئەحمەدی دانیشمەند)ەوە. هەردوو کیانی بەقەڵای (نیکسار) گواستەوە، کە دەکەوێتە باکوری رۆژهەڵاتی ئاسیای بچووکەوە، لەنزیکی کەنارەکانی دەریای رەش(٩٧).

گومانی تێدا نیە بەدیل گرتنی (بوهیموند) کارەسات بوو بۆ بیزەنتیەکان، چونکی رۆڵێکی گەورەی هەبوو لەشەڕی موسڵمانەکاندا، یەکێ لە مێژوونووسانی ئەرمەن دەڵێ: ناوی بوهیموند ترسی دەخستە دڵی موسڵمانەکانەوە تا بگاتە خوراسان(٩٨). گوڕوتینێکی دایە موسڵمانەکان، کاریگەری لە شکستهێنانی

سەلیبیەکان دەرکەوت. نورمانەکان هەر زوو دوای بەدیل گرتنەکەی کشانەوە لە حەلەب (رصوان) کە یەکێ بوو لە سەرکردەکانی (حەلەب) ورەی بەرز بووەوەو هێرشی کردە دانەوێڵەکان و لەنزیکی (سرمین) سەربازگەیەکی دانا. میری (حمص)یش، قەلای (ئەسفۆنیا) کە دەکەوێتە رۆژئاوای سرمینەوەو باکووری (معر النعمان)ی[99]. گەڕاندنەوە ژێر دەسەلاتی خۆی.

(گوموش تەکین ئەحمەدی دانیشمەند) ئەم سەرکەوتنەی قۆستەوە، ئابلۆقەکەی لەسەر مەلیتە توندتر کردەوە، بۆ ئەوەی ترس بخاتە دڵی دانیشتوانەکەیەوە، سەری کوژراوەکانی سەلیبی و ئەرمەن، ئەوانەی سەر بە بوهیموند بوون، بەنوکی رمەکانیانەوەی کرد و بەدەوری پەرژینەکەدا دەسوڕانەوە. دیلەکانیشی پێوەند کردبوو و پێشی خۆی دابوون. کە بوهیموند زانی بەدیل دەگیرێ، نامەیەکی بۆ بلدوین فەرمانڕەوای رەها نارد داوای لێکرد بە هانایەوە بچێ.

ئەمیش لێی نەوەستا، چونکی زۆر گرنگی بە سەلامەتی ئیمارەتەکانی سەلیبی دادا، بەهێزێزکەوە بەرەو مەلتیە رۆیشت، کەمیری دانیشمەندی زانی وا نزیك بۆتەوە، وای بەباش زانی بەرەو ولاتەکەی خۆی بکشێتەوە، تالانی و دیلێکی زۆریشی لەگەڵ خۆیدا هەلگرت، بۆ ئەوە کشایەوە، تا نەکەوێتە نێوان دوو هێزەوە، بڕیاریش ئەوەبوو لە هەلێکی تردا هێرش بکاتە سەر مەلتیە. ئەمە ئەوە دەگەیەنێ تورکەکانی ئاسیای بچووك خاوەنی وشیاری سیاسین لە پلاندانانی سەربازیدا.

(بلدوین) کەوتە دووی (گوموشی تەکین ئەحمەدی دانیشمەند) بەتەمای دەستگیر کردنی و تەفروتونا کردنی هێزەکەی بوو، گوموشی، بەتەواوی دوور کەوتبووەوە، بلدوین نەیوێرا دوای بکەوێ، نەکو بکەوێتە ناو بۆسەیانەوە. ناچار وازی هێناو بۆ (مەلتیە) گەڕایەوە.

(جبریل)ی فەرمانڕەوای شار، ئاشکرای کرد کەوا چۆتە پاڵ (بلدوین) و سەر بەرەو لەژێر فرمانی ئەو دایە. دواجار گەڕایەوە رەها، دوای ئەوە هێزێکی سەربازی هێشتەوە بۆ پارێزگاری کردنی، بەلام ئەو هێزە بەشی ئەوەی نەدەکرد و هێرشەکانی دانیشمەندەکان راگرێ[99].

## هاتنی کۆمەڵانی سەلیبی دیکە بۆ ڕۆژهەڵات

هەرکە ڕۆژئاوای ئەوروپی هەواڵی سەرکەوتنەکانی کۆمەڵانی سەلیبیان زانی کە لەوڵاتی شام و فەلەستین بەدەستیان هێناوە، ئەو میرانەش کە لەوەو پێش بەشدار نەبوو بوون نەهاتبوون بۆ ڕۆژهەڵات، زۆر بەگەرمییەوە ئارەزووی هاتنیان کەوتە سەر، زۆریشی بەمەبەستی تەماحی دنیایی و دەستکەوت تاڵانی کردن بوو، سەرەڕای هۆکاری دینی و پاداشتی خێرو خۆشبوون لە گوناحەکانیان، لە ڕۆژهەڵاتیش سەلیبیەکان پێویستیان بە جەنگاوەری داگیرکەر هەبوو، بۆ ئەوەی:

- بەردەوامبوونی شەڕ دژی موسڵمانەکان.
- دەستکردنەوە بە فراوانخوازی.
- پاراستنی ئەوەی بەدییان هێنا بوو و دەستیان کەوتبوو.
- پارێزگاری لەو مافانە، دژی هەوڵی لەدەست وەرگرتنیان لەلایەن موسڵمانەکانەوە.

کۆمەڵگای ڕۆژئاوا بەدەنگ ئەم دیاردەیەوە هات، وشیار کردنەوەی سەلیبیەت هاتەکایەوە کە بووە هۆی هاتنی کۆمەڵانی سەلیبی دیکە بۆ ڕۆژهەڵات، (لومباردیەکان) پێشەنگی ئەو کۆمەڵە نوێیانە بوون، لەساڵی ٤٩٤ی کۆچی / ١١٠١ی زاینی، لەئیتاڵیا دەرکەوتن، بە فەرمانداوەی (ئەنسلم بوی) سەرۆکی ئەسقوفەکانی میلان و ژمارەیەك لە میرەکان، لەوانە (ئەلبرت کونت بیاندرات، و جیوبرت کونت بارما و هیوکونت مونتیلبو)[١٠٠] وادیارە ئەم کۆمەڵە لومباردیانە، سەرەڕای ژمارەی بەشداربووان تیایدا[١٠١]. لە ڕووی چۆنیەتیەوە لەگەڵ کۆمەڵە گشتیەکانی پێشتردا جیاوازیان نەبوو، بە بەڵگەی ئەوەی، ژمارەی سوارەی جەنگاوەری کەم تێدا بوو، زۆربەیان لەخەڵکە سادەو گشتیەکە بوون، جەنگاوەر نەبوون و بێ نیزام بوون[١٠٢]. کە گەیشتنە دەوروبەری قوستەنتینە، دەستیان کردە تاڵان کردن، ناچار ئیمپراتۆری بیزەنتی بەپەلە بۆ ئاسیای بچووکی گواستنەوە، ئەمە لەمانگی (جەمادی یەکەم / ئادار دا ڕوویدا، لە نیقومیدیە، مانەوە، چاوەڕێی کۆمەڵانی دیکە بوون[١٠٣]. زۆری نەبرد، کۆمەڵێکی دیکە گەیشتن، ئەمانە لە فەرەنسیەکان بوون و بەفەرماندەی (ستیفن بلوا) بوو،

ژمارەیەك لە میرەکان چوونە پاڵی، لەوانە (ستیفن کونت برجندیا) و (هیو کونت بروی) و (بلدوین کوشت جراندیریە) و (هیو بیرفون) ئەسقوفی سواسون، لەگەڵ دەستەیەکی ئەڵمان، بەفەرماندەی (کونراد)[١٠٤] ئەم کۆمەڵە، لە بسفور پەڕینەوە، لە نیقیە، مۆڵیان دا، لە نزیکی سەربازگەکەی لۆمباردی، ژمارەی هەردوو کۆمەڵەکە لەنێوان دوو سەدو سێ سەد هەزار جەنگاوەر بوون[١٠٥]. ئیمپراتۆری بیزەنتی ئەلکسیوس کومینن. هاوڕێیەکی بەناوی (ریمونت کونت تولون)ی کردە فەرماندەیان، ئەمانیش کۆمەڵێك سەربازی بیزەنتیان بەفەرماندەی (تسیتاس)[١٠٦] هاتنە ناویانەوە.

## شەڕی مەرسیفان

بەمەبەستی گەیشتن بەخاکی پیرۆز، سوپایەکی گەورەی سەلیبی لە (نیقومیدیە)ەوە بەرەو (دوریلیوم) بەڕێکەوت، لە چوونە پێشەوەی سوپاکەشدا ئەو ڕێگایە بکاتەوە کە بە ئاسیای بچووکدا تێدەپەڕی. بۆیە ئیمپراتۆر ستیفن بلوا (رایسپاردن سوپاکە بەو ڕێگایەدا بڕوات کە لەپێشوودا کۆمەڵانی سەلیبی پێیدا ڕۆیشتبوون کە بەسەر (دوریلیوم و قونیە)دا تێدەپەڕی. بەڵام (لۆمباردیەکان) ڕازی نەبوون بەرەو خاکی پیرۆز بڕۆن، هەتا (بوهیموند) لە دیلکردنەکەی ڕزگار نەبێ، کە بە پاڵەوانی خۆیانیان دادەناو تاقە جەنگاوەرێك بوو بڕوای تەواویان پێ بوو کە بەرەو سەرکەوتنیان دەبات، سووربوون لەسەر ئەوەی لەشکرکێشییەکە بوو (کبادوکیە)[١٠٧] بڕوات. (إبن الاثیر) دەڵێ: ئامانجی ئەو کۆمەڵە سەلیبیە ڕزگارکردنی (بوهیموند÷ بوو لەدیلی[١٠٨].

سەرەڕای نارەزایی دەربڕینی هەندێ فەرماندە میرەکان، لەشکرەکەش ڕوویکردە خاکەکانی دانیشمەندیەکان، لەڕێگای ئەنقەرەوە کە لەژێر دەسەڵاتی قلیج ئەرسەلاندا بوو، دەستیان بەسەراگرت و بەردەوام بوون ڕووەو (کنگری) کە دەکەوێتە باشووری (بافلاجونیا)وە، بەمەبەستی ئەوەی ڕێگای سەرەکی دا بڕۆن کە دەیانگەیاندە (ئەماسیە) و (نیکسار). بۆ ئەوەی سەلیبیەکان نەهێڵێ بەرەو پێشەوە بڕۆن. قلیج ئەرسەلان، بەرە بەرە لەپێش هێزی سەلیبیەکاندا دەکشایەوە، شێوازی وێرانکردنی پەیڕەو دەکرد لە کشانەوەکەیدا، هەر شتێك

## مێژووی سەلجوقیەکان

سوودی بۆ سەلیبییەکان هەبوایە دەیسوتاند، بەتایبەتی ئازوقەو خواردن[١٠٩]، لە هەمان کاتدا، هێزەکانی تورك لە هاوپەیمانیەکی نوێدا دەستیان بە کۆبوونەوە کرد لەبەرامبەر مەترسی سەلیبییەکاندا (گوموشتی تەکین ئەحمەدی دانیشمەند) هاوپەیمانێتی لەگەڵ (قلیج ئەرسەلان)دا نوێکردەوە، داواشیان لە (رەزوان) کرد لە حەلەبەوە ژمارەیەك سەرباز بنێرێ[١١٠].

سەلیبییەکان گەیشتنە (کنگری)، لێرەدا تورکەکان بەهەموو هێزیانەوە خۆیان ئامادە کردبو، شارەکەیان بۆ نەگیرا، ناچار کەوتنە رێ، دوای ئەوەی دێهاتەکانی دەوروبەریان تالانکرد. بەڵام بەهۆی کەمی خواردن و ئازووقە ماندوو بوونیان پێوە دیار بوو، گەرماکەش کاری خۆی دەکرد، بۆیە (ریموند) پێشنیاری کرد، بۆ ئەوەی سوپا لە تەفرو توونای مسۆگەر لابدات، روو لە باکووری رۆژهەڵات بکەن و بچنە (قەستەمونی) و لەوێشەوە خۆیان بگەیەننە شارێکی بیزەنتی لەسەر کەناری دەریای رەش. لە چوونیاندا بۆ قەستەمونی بەهۆی نەمانی زەخیرەو خواردەمەنی و سووتاندنی بەروبوومی کشتوکاڵ و پرکردنەوەی بیرە ئاوەکان لەلایەن تورکەکانەوە و هێرشی کتو پڕ و لەسەریەکەیان، سەلیبییەکان کەوتنە دۆخێکی سەختەوە، لەئەنجامدا بڵاوەیان لێکرد، تا ریموند کۆیکردنەوە. کە گەیشتنە دەوروبەری (قەستەمونی)، دەبوایە (ریموند) بەنێو هێزەکانی تورکدا خۆی بگەیاندایەتە کەناری دەریا. بەڵام دیسانەوە، (لومباردیەکان) لەسەر ئەوە پێیان داگرت بەرەو رۆژهەڵات بڕۆن، ناچار لایەنەکانی دیکە بە رای لۆمباردیەکانیان کرد[١١١].

سوپای سەلیبی لە رووباری (هالیس) پەڕینەوە بۆ وڵاتی دانیشمەندییەکان، گەیشتنە شاری (مەرسیفان) کە لەنیوەی رێگای نێوان رووبارەکەو (ئەماسیە)دایە[١١٢]، تورکەکان کە زانیان هێزی سەلیبییەکان ماندوو شەکەتە، بەرەو روویان چوون و رووبەڕووی یەك بوونەوە. زۆری نەخایاند سەلیبییەکان شکان و لەشەڕەکە هەڵاتن، لەدوای خۆیانەوە قەشەو ژنەکانیان بەجێهێشت، (ریموند) چووە سەر گردێك خۆی پاراست تا هێزی فەرەنسی و ئەڵمانیەکان فریای کەوتن و رزگاریان کرد، کە تاریك داهات، کەزانی سەرکەوتن وەدەست ناهێنێ،

هەلآت و سەربازگە سەلیبیەکەی بەجێهێشت، تەنها شەرکەرەکانی تیادا نەمابوو، ئیتر هەمووی کەوتە دەستی تورکەکان و[١١٣] بەتالآن بردنیان. کە شەڕیش کۆتایی هات، کەوتنە دویان، تەنها سوارەکان خۆیانیان پی رزگار کرا، زیانی سەلیبیەکان، چوار لەسەر پێنجی سوپاکەیان بوو[١١٤]. ژمارەیەکی زۆریش چەکیان دەست کەوت، دیلەکانیانیش لە بازاڕی کۆیلەکاندا فرۆشت. پاشماوەیەك (ریموند) خۆی گەیاندە (بافرا) کە بەندەرێکی بچووکی بیزەنتیەکان بوو لەسەر دەریای رەش و لەنزیکی (سینوب) لەوێوە کەشتیەکی بیزەنتی گەیاندیە قوستەنتینیە[١١٥].

مێژوونووسی لاتینی (ئەلبرت ئول اکس) ئاماژە بۆ ئەوە دەکا، گوایە (ریموند) لەلایەن تورکەکانەوە بەرتیلی پێدرابوو بۆ ئەوەی سوپاکە بۆ قەستەمونی ببات، بەلآم ئەمە دوورە لەواقعەوە، چونکی ئەوەی بزانی لەشکرکێشیەکە چی رووداوی تـوش هـات و چـەند (ریمونـد) هەولێدا لومباردیەکان رازی بکات نەرۆنە ولآتی دانیشمەندیەکان، و هەوڵدانی بۆ دەرکردنی سوپاکە لەو تەنگژەیە، هەڵهاتنیشی لە شەرەکە، هەستی کرد بەردەوام بوون لەشەرکردن ئەنجامی نابێ و بێ سوودە، بەتایبەتی کاتی لۆمباردیەکان گەرانە دواوە و (بجناك)یش چاویان لەوان کرد و شەرەکەیان بەجێ هێلآ.

## شەڕی هرقلەی یەکەم

ئەو ناوبانگەی سەلیبیەکان وەدەستیان هێنابوو بەهۆی سەرکەوتنیانەوە لە دوریلیوم، لەکارەساتی شەرەکەی (مەرسیفان))دا لەدەستیاندا، ئەوەش دوا کارەسات نەبوو، لەو کاتەی لۆمباردیەکان (نیقومیدیە)یان بەجێهێشت، سوپایەکی فرەنسی بەفەرماندەی (ولیم کونت نیڤر) بەفەرماندەی سوپایەکی پانزە هەزار سوارەوە پیادەوە[١١٦] گەیشتنە قوستەنتینیە، (ولیم) بەپەرۆش بوو بەزووترین کات بگاتە لومباردیەکانی لەقوستەنتینیەوە بۆ نیقومیدیە رۆیشت، لەوێ زانی کەوا سەلیبیەکان کام رێگایان گرتووە. بۆیە (کونت) بەرەو (قونیە) چوو، کە گەیشتە قونیە، ئابلۆقەی خستە سەر شارەکە، هێزێکی سەلجوقی پارێزگاری شارەکەی دەکرد، زۆر هەولی گرتنی دا، نەیتوانی بۆیە وازی لێ هێنا[١١٧].

سەلجوقیەکان لەگەڵ هاوپەیمانەکانیدا لەو ماوەیەدا لۆمباردیەکانیان تەفرو تونا کردبوو و لەناویان بردبوون. قلیج ئەرسەلان و گوموشی تەکین ئەحمەدی دانیشمەند، هەواڵی ئەم دوژمنە تازەیەیان پێ گەیشت، هێشتا لەناو گەرمی سەرکەوتنەکانیاندا بوون، بەرەو باشوور کەوتنەڕێ، بەر لە (ولیم) گەیشتنە (هرقلە).

سوپاکەی (نیڤر) لەسەرخۆ لەقونیەوە بەرەو ڕۆژهەڵات دەڕۆیشتن، کە نزیکی هرقلە بوونەوە، ماندوو بوو بوون، تورکەکان هێرشیان کردە سەریان، نەیان توانی بەرگری بکەن، شەڕەکە زۆری نەخایاند، سوپای فرەنسی هەموویان کوژران، تەنها (کونت) و شەش کەس لەدەستو پێوەندەکانی بەزیندوویی مانەوە[118].

**شەڕی دووەمی هرقلە**

لەو کاتەی لەشکرەکەی (نیڤر) بە ئاسیای بچوکدا دەگەڕا، دوا تاخمی ئەو کۆمەڵانەی سەلیبی گەیشتنە قوستەنتینیە. لە فەرەنسیەکان و ئەڵمانیەکان پێکهاتبوو بە فەرماندەیی (ولیمی نۆیەم دوق ئەکویتین و لفی چوارەم دوق باڤاریا) کە ژمارەیان شەست هەزار جەنگاوەر بوو.

ئەم هەموو کۆمەڵە لە قوستەنتینیە بەرەو قونیە بەڕێکەوتن، هەمان ئەو ڕێگەیەیان گرت، کە (بوهیموند) پێشتر پێیدا ڕۆیشتبوو. تورکەکان هەمان پلانیان بەکار هێنا کە پێشتر بەکاریان هێنابوو، ئەویش ئازووقە سوتاندن و پڕکردنەوەی بیرە ئاوەکان.

کە گەیشتنە قونیە، شارەکەیان بە چۆڵی بینی، سەربازەکانی سەلجوقی پێ یانیان چۆڵ کردبوو، دوای ئەوەی بەرەنگاری لەشکرکێشیەکەی (نیڤر) بوونەوە، هەرچی خواردن و ئازووقەشی تیابوو بردبوویان، ئەوەی سەلیبیەکان سوودیان لێ دەبینی لەناویاندابوو یان وێرانیان کردبوو[118].

سەلیبیەکان لە قونیە نەمانەوە، چوون بۆ (هرقلە) ڕێگایەکی پەنجاو پێنج میل درێژیان بڕیبوو، زۆر ماندوو و شەکەت ببوون، برسێتی و تینوێتی کاری کردبووە سەریان، تورکەکان جار نەجارێ هێرشیان دەبرد و دەستیان دەوەشاند و هەندێکیانیان لێ دەفڕاند، کە چوونە ناو شارەکەوە چۆڵ بوو[119].

موسڵمانەکان لەهەل دەگەڕانن بۆسەیان لەدارستانەکانی دەوروبەری هرقلە بۆ دادەنان، کاتێ خەریکی ئاو خواردنەوە بوون لە غەفڵەتدا هێرشیان بردە سەریان، شڵەژان، تورکەکان کەوتنە گیانیان هەموویانیان کوشت، ژمارەیەکی زۆر کەمیان لێ قوتار بوو، لەوانەی قوتار بوون: (ولیمی نۆیەم) و (لفی چوارەم) بەرەو تەرسوس رۆیشتن لەوێشەوە بۆ ئەنتاکیا چوون[١٢٠].

## ئەنجامی شەڕەکانی ساڵی ٤٩٤ی کۆچی / ١١٠١ی زایینی

هەرسێ کۆمەڵەکە، بە کۆتاییەکی دڵتەزێن کۆتاییان پێهات ئەنجامەکانی لەلایەکەوە کاری کردە سەر جوڵانەوەی سەلیبیەکان، لەلایەکی ترەوە کاری کردە سەر تورکەکان بەگشتی و سەلجوقیەکان بەتایبەتی. گرنگترین ئەو ئەنجامانە ئەمانەن:

- سەلجوقیەکان تۆڵەی (دوریلیوم)یان کردەوە، ئیتر لە ئەنادۆڵ نەتوانرا دەربکرێن، سەرکەوتنە یەك لەدوای یەکەکان ورەیانی بەرز کردەوە.
- ئەو رێگایەی ئاسیای بچووکی بە وڵاتی شام دەبەستەوە بۆ سوپای سەلیبیەکان و بیزەنتیەکان بووە مایەی مەترسی. هەرچەند کۆمەڵە بەراییەکنی سەلیبی توانیان پیایدا تێپەڕن. بەڵام کۆچبەرە سەلیبیەکان ترسان بەو رێگایەدا بڕۆن. کە لەقوستەنتینیەوە بۆ ئیسوس دەڕۆیشت، ئیتر هەر لە رێگای دەریاوە دەهاتن، هەرچەندە رێگای دەریا، ئەرکی زۆرتر بوو، کەم کەسیان دەیانتوانی ئەو خەرجە دابین بکەن. ئیتر چەند ساڵێك ئەو رێگایە بە رووی سەلیبیەکاندا داخرا[١٢١].
- سەلیبیەکان گوناهی ئەوەیان بەسەریاندا هات خستیانە ئەستۆی بیزەنتیەکان، پڕوپاگەندەی ئەوەش بڵاوبووەوە، کەوا (ریموند) ئامۆژگارییەکانی ئیمپراتۆری بەجێ دەگەیاند، کاتێ سوپاکەی بەو رێگایەدا برد و سەربازەکان لەبۆسەدا کوژران[١٢٢]، ئیتر ئەوەی بەسەریان هات لۆمەی بیزەنتیەکانیان کرد، هەرچیان بەسەردا هات لەچاوی ئەوانەوە دەیانزانی.

- قلیج ئەرسەلان کەوتە شانازیکردن بەم سەرکەوتنانە، هەروا هەموو تورکەکانی ئەنادۆڵیش بەم سەرکەوتنانەوە دەیاننازی، ئیتر توانی دەسەڵات بەسەر بەرزاییەکاندا بکێشێ و لە (قونیە)ی پایتەختی، توانی دابنیشێ، کە کەوتۆتە سەر رێگای سەرەکی قوستەنتینیە و وڵاتی شام[١٢٣].

- دانیشمەندیەکان لە دۆڵی فورات بەبێ بەربەست دەستیان بە فتوحاتی خۆیان کردەوە. تا گەیشتنە دەوروبەری ئیمارەتی (رەها) هەروەها (مەلتیە)یان داگیر کرد و لە ٢٣ی ذو الحجەی ٤٩٥ی کۆچی / ١٨ی ئەیلولی ١١٠٢ی زاینی (١٢٤) (جبریل)ی فەرمانڕەوای شارەکەیان بەدیلی گرت.

- رۆیشتنی سەلیبیەکان بۆ وڵاتی شام، جارێکی کە ناکۆکی و کێبڕکێ لەنێوان سەلجوقیەکان و دانیشمەندەکاندا سەریهەڵدایەوە، دوو خێزانی دەست رۆیشتووی تورکیش، لەسەر دەست بەسەرا گرتنی (مەلتیە) و، -جزیە-ی بوهیموند، ناکۆکی کەوتە نێوانیانەوە، ئیتر لەو ناوچەیە بەرەی تورکەکان هەڵوەشایەوە[١٢٥].

## سەلجوقیە گەورەکان و سەلجوقیەکانی روم

بەر لەوەی کۆتایی بە ململانێی سەلجوقیەکان و سەلیبیەکان لەسەردەمی (قلیج ئەرسەلان) کۆتایی پێ بێت، دیاردەیەك هەیە کە سەرنج رادەکێشێ: ئەویش ئەوەیە کەوا سەلجوقیە گەورەکان لە خوراسان و ئێران و (ئەتابەکیەکانیان) لە موسڵ، و سەلجوقیەکانی شام لەو قۆناعەدا دەستیان هەڵگرت لەیارمەتیدانی براکانیان سەلجوقیەکانی رۆم، لەدژی سەلیبیەکان، هەروەها هەوڵی ئەوەشیان نەدەدا سنوورێك بۆ فراوان بوونیان لە شام و عێراق رابگرن. هەروەها لەو بارودۆخە خراپەش سودیان وەرنەگرت لە دوای بەدیل گرتنی بوهیموند هاتبووە ئاراوە، تاکو رێرەوەی جوڵانەوەی سەلیبیەکان لە رۆژهەڵاتی ئیسلامیدا بگۆڕن و سەلیبیەکان دەرکەن، هەرچەندە سەلجوقیە گەورەکان هێزی سەرەکی ئیسلامی بوون لەجیهانی ئیسلامی سوننەدا لەو کاتەدا.

سەلجوقیە گەورەکانی دەستەوەستان راوەستابوون دەیانڕوانیە هاتنە پێشەوەی کۆمەڵانی سەلیبی بەرەو وڵاتی شام لە رێگای ئاسیای بچووکەوە، یارمەتی ئەو

هێزە تورکانەشیان نەدەدا کە لەگەڵیانادا بە شەڕ هاتبوون بۆ لەناوبردنی ئەو کۆمەڵانەی لەباکوری وڵاتی شام و باکوری عێراق کۆببونەوە و ببوونە جێگای مەترسی و هەڕەشە بۆ ئاسایشی خەلافەتی عەباسی لەبەغدا.

دووبەرەکی لەناو ریزەکانی سەلجوقیە گەورەکان و تێکچوونی ریزەکانیان و ناکۆکی ناوخۆ لەنێوان سەرکردەو فەرماندەکانیان ببوە هۆی ئەوەی بەو جۆرە هەڵسو کەوت بکەن، لەگەڵ سەرکەوتنی سەلیبیەکان، دەسەڵاتی ناوەند شلۆق بوو، دەسەڵاتی سوڵتان (برکیاروق) بەسەر فەرمانڕەوای ناوچەکاندا لاواز بوو، زۆری نەبرد ناکۆکی توندتر بوو لەنێوان میرەکانی سەلجوقی و فەرماندەکانیدا، ئەمە زیاتر لاواز و بێ هێزی کردن، بۆیە نەیانتوانی هیچ کاردانەوەیەکیان هەبێ دژی سەلیبیەکان لە ئاسیای بچووك و وڵاتی شام. لەو شەڕە ناوخۆیانەدا ئاماژە بۆ ئەو شەڕە دەکەین کە لەنێوان سوڵتان (برکیاروق) و (سوڵتان محمد)[١٢٦] برایدا رویدا، هەروەها ئەو شەڕو کوشتارەی نێوان فەرماندە سەربازیەکان و هەڵسوڕێنەرانی کاروبار دەربارەی موسڵ رویدا لەدوای (کربوغا) لە ذو لقعدەی ساڵی ٤٩٥ی کۆچی / ئەیلولی ١١٠٢ی زاینی[١٢٧] ئەم روداوانە کاری کردە سەر سەرجەم ئەو هەرێمانەی سەر بەدەوڵەتی سەلجوقی بوون، گەندەڵی بڵاوبووەوە، تاڵان و بڕۆ دەستی پێکرد، دێهاتەکان سوتێنرا، حکومەتی ناوەند بێ توانا لێی کەوت، لەلایەکی ترەوە میرە دەرەبەگەکان دەسەڵاتیان پەرەیسەند.

ناکۆکی و دوژمنایەتی لەنێوان سەلجوقیەکانی وڵاتی شام، لە تێکچون و دابەشبوونی نێوان سەلجوقیەکانی خوراسان و ئێران کەمتر نەبوو، لەئەنجامی ئەوەدا، لە وڵاتی شام بوونە دوو بەشەوە، (رضوان کوڕی توتوش) حەڵەبی بەدەستەوە گرت. (دەقاق)ی برای بووە فەرمانڕەوای دیمەشق، ئەم دوو برایە بەناکۆکی خێزانیەوە خەریك بوون، هەریەکەیان دەیویست ئەوەی کەیان لەناو ببات و دەست بەسەر موڵکەکانیدا بگرێت، تا کار گەیشتە شەڕێکی خوێناوی، (رضوان) بۆ دیمەشق هێرشی برد، (دەقاق)یش چەندین جار دەچووە سەر حەڵەب، بەڵام نەیدەتوانی بچێتە ژوورەوە[١٢٨]. هەریەکێ لەو برایانە، تەماحی ناوچەیی هەبوو، لەسەر حیسابی دراوسێ موسڵمانەکانیان. (رضوان) ویستی

دەست بەسەر ناوچەی باکوری دیمەشقدا بگرێت لەسەر حیسابی (ئەراتقەکان). هێرشی کردە سەر (سروج) و شاری (رەها)ی گرت. هەروەها (دەقاق)یش بەهەمان نیازەوە هێرشی کردە سەر (رەحبە)[١٢٩] و داگیری کرد[١٣٠]. هەروەها (دیاربەکر)ی داگیر کرد و (میافارقین و حمص) کەوتنە ژێر دەسەڵاتیەوە[١٣١]. ناکۆکی نێوان میرە دەرەبەگەکان دووبەرەکی و ناکۆکیەکانی توندتر کرد، هەتاخمێکیش یارمەتی یەکێ لەبراکانی دەدا.. لەو ناکۆکیانە، ناکۆکی نێوان میر (جناح الدولە) (ئای تەکین) مێردی دایکی (رضوان) و (ئەتابەگ) و نێوان (یاغی سیان) گەورەی ئەنتاکیە، ئەمە بووە هۆی ئەوەی (رضوان) دەست لە فراوانکردن لەباکووری شام هەلگرێ و گەڕایەوە حەلەب[١٣٢]. ئەم ناکۆکیەش وایکرد (یاغی سیان) وەلای سیاسی خۆی بگۆڕێ، دەستی لە (رضوان) بەردا و چووە پاڵ (دەقاق)[١٣٤]. (جناح الدولة)ش کەوتە ململانێی (رضوان) و ساڵی ٤٩٠ی کۆچی / ١٠٩٧ی زاینی، لە (حمص) سەربەخۆیی خۆی ئاشکرا کرد. ئاشکرایە سەلجوقیەکانی شام دەرکیان بە مەترسی باری سیاسی نەدەکرد نەیان دەزانی سەلیبیەکان چەند جێگای مەترسین تاکو گەیشتنە ئەنتاکیە، ئەو کاتە (رضوان) لەناو سوپای موسڵمانەکاندا بەشدار بوو کە بۆ رزگارکردنی شارە ئابلۆقە دراوەکە نێررابوو[١٣٤].

## ململانێی قلیج ئەرسەلان لەگەڵ دانیشمەندەکاندا

لەساڵی ٤٩٦ی کۆچی / ١١٠٣ی زاینی، شەڕ لەنێوان دوو بنەماڵەی تورک لەئاسیای بچووک بەرپابوو، دوای ئەوەی (بوهیموند) بەرەڵلاکرا، سەرکردەکانی سەلیبی، لەئەنتاکیەو ئیمارەتی (رەها) کەوتنە گومانەوە لە (تانکرد). کە دوای دەرچوونی بوهیموندی خاڵۆی کرابووە سەرپەرشتیکاری ئیمارەتی ئەنتاکیەو دەیویست دەست بخاتە کاروباری هەردوو ئیمارەتەکەوە، مەترسی شەڕی ناوخۆ لەئەنتاکیە دەکرا، (بلدوین)ی میری (رەها)، بۆ رێگەگرتن لە شەڕی ناوخۆ، (بوهیموند)ی بەرەڵلاکرد و گەڕانیەوە بۆ ئیمارەتەکەی خۆی، کەوتە وتووێژ لەگەڵ (گوموش تەکین)ەوە، بۆ بەردانی، لەو وتووێژەدا (بتریارك برنارد) بەشدار بوو.

وادیارە هەواڵی وتووێژەکە گەیشتبووە ئیمپراتۆری بیزەنتی (ئەلکسیوٚس کومینن) ئەویش هاتە ناوەوە بەمەستی تێکدانی ئەو هاوپەیمانیەی نێوان (قلیج ئەرسەلان) و (گوموش تەکین) و سزادانی بوهیموند، کە ڕێکەوتنەکەی قوستەنتینیەی شکاند کاتێ ئەنتاکیەی بەدەستی خۆی هێشتەوەو، بۆ بیزەنتیەکانی نەگەڕاندەوە، لەراستیدا دەیویست سزای (نورمان) بدا، بوهیموندی بەبەهانە کردبوو، دەیویست سوودیش لەو بارودۆخە وەرگرێ کە دوای سەرنەکەوتنی کۆمەڵانی سەلیبیەکان هاتبووە ئاراوە لەساڵی ٤٩٤ی کۆچی / ١١٠١ی زاینیدا لەمیری دانیشمەند داوای پارەیەکی زۆری کرد بەبڕی دووسەد و شەست هەزار دینار. لەبەرامبەر بە دەستەوەدانی بوهیموند[١٣٥]. ئەم هەواڵە گەیشتە (قلیج ئەرسەلان)، داوای لە (گوموش تەکین) کرد نیوەی ئەو پارەیەی پێ بدات، چونکی گەورەی تورکانی ئاسیای بچووکەو ساڵی ٤٩٤ی کۆچی / ١١٠١ی زاینی لەدژی لۆمباردیەکان یارمەتی داوە. بەڵام میری دانیشمەند بەم داواکاریە رازی نەبوو، داواکەی بیزەنتیەکانیشی بەدواوەدا، تاکو (قلیج) نیوەی ئەو پارەیەی دەست نەکەوێت.

(بوهیموند) هێشتا دیل بوو بەرنەدرابوو، ئاگای لەم کەینو بەینەوە بووەوە. (گوموش تەکین)ی ئاگادار کردەوە، کەوا سوڵتانی سەلجوقی و ئیمپراتۆری بیزەنتی دوو دوژمنی هاوبەشی ئەون، لەبەر بەرژەوەندی خۆیان بەرەڵای دەکەن، توانی قازانجی هاوپەیمان بوونی لەگەڵ سەلیبیەکان دژ دوژمنی هاوبەش، بسەلمێنێ، گوموش تەکین بەرەڵاکردنی رازی بوو لەبەرامبەر سەد هەزار دینار.

لەکاتی وتووێژدا وا ڕێکەوت دانیشمەندیەکان هێرشیان بۆ (مەلتیە) برد، (جبریل) کە فەرمانڕەوای شارەکە بوو داوای یارمەتی لە (بلدوین)ی زاوای کرد، بەڵام یارمەتی نەدا، نەیویست لەم کاتە ناسکەدا، کارێکی خراپ بەرامبەر میری دانیشمەندا نەکات، نەکو وتووێژەکان سەرنەگرێ. هەواداری (جبریل) بۆ مەزهەبی ئەرسەدوکسی و میللەتەکەشی خۆشی نەدەویست، دوو هۆی دیکە بوون. سریانیەکان لێی خۆش نەدەبوون چونکی قەشەیەکیانی کوشتبوو ئەویش (سعید کوڕی صابونی) بوو کە بەتۆمەتی خیانەتەوە کوشتبووی[١٣٦].

## مێژووی سەلجوقیەکان

سوپای دانیشمەندیەکان ئابلۆقەکان لەسەر شارەکە توندتر کردەوە، تاکو داگیریان کرد. (جبریل) دیل کرا، بەلام قەلاکە نەگیرا، فەرماندەی دانیشمەندیەکان داوای لێکرد، داوا بکات قەلاکەش خۆی بەدەستەوە بدات، بەلام سەربازەکاین بەقسەیان نەکرد و خۆیان بە دەستەوە نەدا، لەبەردەم پەرژینەکانیدا هەلیانواسی[١٣٧].

(قلیج ئەرسەلان) لەو کاتەدا بۆ ئەنتاکیە دەچوو. کە گەیشتە نزیکی مرعش، هەواڵی (فدیە)کەی بیست، گەڕایەوە بۆ وڵاتی خۆی، جاڕی شەڕکردنی دا، بەمجۆرە لەئاسیای بچووکدا ریەکانی تورك تێکچوو، تاکو ئیسلامەکان پشتی بگرن، داوای لەسەلجوقیە گەورەکان و خەلیفەی عەباسی کرد بەگژ گوموش تەکین دا بچن، ئەویش داوای یارمەتی لە ئیمپراتۆری بیزەنتی کرد[١٣٨].

هەردوو سوپای تورك لە ذو لقعدە / ئاب کەوتنە شەڕێکی سەختەوە. سوپای سەلجوقی تیایدا سەرکەوت، قلیج ئەرسەلان سەرەڕای سەرکەوتنی هێرشی بۆ مەلتیە نەکرد، بەرەو شام رۆیشت، نوێنەرێکی بۆلای (رضوان) فەرمانڕەوای حەڵەب نارد. داوای لێکرد رێگای بدات و یارمەتی سوپاکەی بدات، خەڵکەکە ئەمەی پێ باش بوو[١٣٩].

شەڕ لەنێوان هەردوو سەرکردە تورکەکە بەردەوام بوو، تاکو ساڵی ٤٩٩-١١٠٥ز[١٤٠] کە گوموش تەکین کۆچی دوایی کرد. بەڵام دواتر لەسەردەم جێنشینەکانیدا شەڕ دووبارە دەستی پێکردەوە.

دوای گوموش تەکین، ئیمارەتی دانیشمەندی بەسەر هەردوو کوڕەکەیدا دابەشکرا. کوڕە گەورەکەی غازی ٤٤٩-٥٢٩ کۆچی / ١١٠٥-١١٣٥زاینی، سیواس و موڵکەکانی باوکی لە ئەنادۆڵ بەڕێوە دەبرد. (مەلتیە) و موڵکەکانی دانیشمەندیەکان لەوڵاتی شام کەوتە بەشی کوڕە بچووکەکەی (یاغی سیان - ئەغوسیان)[١٤١]. (قلیج ئەرسەلان)، هەر لەسەردەمی گوموش تەکین)ەوە بە تەمای ئەوە بوو قەیسەری و سیواس لەدەستی دانیشمەندیەکان دەربکات و دەست بەسەر موڵکەکانیاندا بگرێت وا فرسەتی بۆ رەخسا بۆ بەدیهێنانی ئەو مەبەستەی، بچووکی تەمەنی (سن یاغی سیان) و کەم ئەزموون و نەشارەزا بونی

وایکرد بەرەو رۆژهەلآت بڕوات و هێرش بکاتە سەر مەلتیە، بەتایبەتی دوای ئەوەی لەگەڵ ئیمپراتۆری بیزەنتیدا رێکەوتنی ئاشت بوونەوەی بەست، کە گەیشتە شارەکە ئابلۆقەی دا مەنجەنیقی لەسەر بورجەکانی دابەست دوای ئەوەی بە (مەنجەنیق) کەوتە لێدانی، داگیری کرد[١٤٢]. قلیج ئەرسەلان، نازناوی سوڵتانی بۆخۆی دانا، هەوڵیدا لەئاسیای بچووك و دەرەوەیدا تورکەکان دانی پێدا بنێن، مێژوونووسە موسڵمانەکان ناوی (شا)یان لێنا، (متی زهاوی) و (میخائیل سریانی) بە سوڵتان ناویان بردووە، هەروەها (إبن العبری)یش بە سوڵتان ناوی هێناوە[١٤٣].

## فراوانبوونی سەلجوقیەکان بەرەو جزیرەی فورات و فوراتی سەروو- مردنی قلیج ئەرسەلان

ناوبانگی (قلیج ئەرسەلان) گەیشتە هەموو لایەکی جیهانی ئیسلامی. موسڵمانان هیوای ئەوەیان دەخواست جوڵانەوەی جیهاد دژی سەلیبیەکان بەدەستەوە بگرێ، ئەمەی بەهەل زانی، سنووری سەڵتەنەتەکەی بەرەو رۆژهەلآت فراوان کردەوە، دەست بەسەرا گرتنی مەلتیە لەجێگای خۆیدا بوو، دانیشتوانی (میافارقین) ئەمەیان بەهەل زانی و شارەکەیان بەدەستەوەدا، ضیاء الدین محمد) وەزیری شارەکە ساڵی ٤٩٨ی کۆچی / ١١٠٥ی زاینی، شارەکەی را دەستی کرد، هەوەها (رەحبە)ی لەدەستی میر (جاولی) دەرکرد، میرەکانی دیاربەکریش دانیان نا بەدەسەلآتیدا، دواجار (خمرتاش السلیمانی) ئەتابەگی[١٤٤] بەوالی دامەزراند و وەزیر (ضیاء الدین) گەڕایەوە مەلتیە و لەوێ جێنشین بوو[١٤٥].

(قلیج ئەرسەلان) دواجار چاوی بڕیە (رەها) ساڵی ٤٩٩ی کۆچی / ١١٠٥ی زاینی بە سوپایەکی گەورەوە، چووە دەوروبەری شارەکە، بەلآم بۆی داگیر نەکرا، لەسەر سەختی شوورەکانی، روویکردە (حەڕان) لەسەر داوای (جکرمشەکان) کە لەشارەدا دادەنیشتن، شارەکەیان بەدەستیەوەدا، چەند رۆژێك تیایدا مایەوە، لەم کاتەدا نەخۆش کەوت، بۆ (مەلتیە) گواستیانەوە، بەلآم دەستو پێوەندەکانی لە (حەڕان) مانەوە[١٤٦].

سوڵتانی سەلجوقی دوای چاکبوونەوەی لەنەخۆشیەکەی بڕیاریدا موسڵ بهێنێتە ژێر دەسەلآتی خۆیەوە[١٤٧]، لەوێشەوە بەرەو رۆژهەلآت بڕوا و موڵکەکانی

## مێژووی سەلجوقیەکان

سەلجوقیە گەورەکان لە خوراسان و ئێران دەستیان بەسەرا بگرێت و هەموو سەلجوقیەکان بە بەشە جیاجیاکانیانەوە بکەونە ژێر دەسەلاتیەوە، ئەو کاتە موسڵ لە ژێر دەسەلاتی سەلجوقیە گەورەکاندا بوو، (جکرمش) فەرمانڕەوایی دەکرد، ناچار کەوتە ناو ناکۆکیەکانی سەلجوقیەکانەوە لە رۆژهەلات. کاتێ سولتان (برکیاروق) ناچار بوو مولکەکانی لەگەڵ سولتان محمدی برایدا دابەش بکات. موسڵ، کەوتە بەشی سولتان محمد، کەوتەرێ بۆ ئەوەی لەدەستی بسێنێتەوە، بەلام (جکرمش) رێگای لێ گرت و ئابلۆقەیدا. لەناو ململانێی ناو خێزانی سەلجوقیەکاندا، فەرمانڕەوای شارەکە ویستی، بانگی سەربەخۆیی بدات، خۆی دایە پاڵ سولتان (برکیاروق) و پەیوەندی لەگەڵ سولتان محمد دا پچڕاند. بەلام زۆری نەخایاند (برکیاروق) لە ٤٩٨ی کۆچی / ١١٠٨ی زاینی کۆچی دوایی کرد و لەو کاتەشدا سولتان محمد ئابلۆقەی شاری موسڵی دابوو، (جکرمش) هیچ بیانویەیکی بەدەستەوە نەما، ناچار چووە ژێر دەسەلاتیەوە، (محمد) دۆستایەیت خۆی بۆ دەربڕی و سەرکێشی نەکرد بچێتە ناو شارەوە[(١٤٨)] سولتان محمد، نارەحەت بوو لەبەرامبەر ئارەزووی سەربەخۆیی (جکرمش) لەهەمان کاتیشدا هێزی سوپاکەی لەزیاد بووندا بوو، بەتایبەتی دوای ئەوەی توانی ئەو ئابلۆقەیەی لەلایەن (شا رضوان) و (ئیلغازي کوري ئەرتق) و (الاصبهذ صباوه) و (ئەلبی کوری ئەرسەلان تاش)[(١٤٩)] بە هاوپەیمانی ئابلۆقەی شارەکەیان دابوو، کە مەبەستیان گرتنی (نسیبین) بوو، خرابووە سەری لێی دەرچێ. هەروەها، گومانی لەمەبەستەکانی دەکرد بەتایبەتی کاتێ رێکەوتنێکی نهێنی لەگەڵ قلیج ئەرسەلاندا بەست، بۆ دوژمنایەتیکردنی ئەو، بەو بەلگەیەی دەست و پێوەندەکان (جکرمش) شاری (حەڕان)یان بەدەستی (سولتانی سەلجوقی)یەوەیاندا، سەرەڕای ئەمەش (جکرمش) ئەو بەلێنانەی بە سولتان محمد دابوو کە پارەی بۆ ببات بەجێ نەهێنا[(١٥٠)].

لەئەنجامی ئەمەدا سولتان محمد هەولی دا موسڵ لەدەستی دەربهێنێ کە بەدەستی (جکرمش) ەوە بوو، بیداتە دەستی (جاولی سقاوه)[(١٥١)]، (جاولی) بەرەو موسڵ کەوتەرێ، بۆ وەرگرتنی موسڵ، بەلام (جکرمش) چووە پێشی بۆ

بەرەنگاربوونەوەی، بەڵام لەو شەڕەدا کە لە دەرەوەی موسڵ روویدا شکستی هێنا لەدێی (باکلبا)ی سەر بە (ئەربل)، بەدیل گیرا. لەبەر ئەوەی دانیشتوانی موسڵ (جکرمش)یان خۆشدەویست (زنکی) کوڕیان لەجێگاکەی دانا، تەمەنیشی یانزە ساڵان بوو، بەناوی ئەویشەوە خوتبەیان دەدا[١٥٢].

لەم بارودۆخە ناسکەدا، (زەنکی) نامەی بۆ (قلیج ئەرسەلان) نارد، داوای یارمەتیدانی لێ کرد و بەڵێنی ئەوەشی پێدا موسڵ و ئەوەی سەر بەموسڵە تەسلیمی دەستی ئەوی بکات، سوڵتانی سەلجوقی، داواکردنی یارمەتیەکەی پێ خۆش بوو، بڕیاریدا لەسەر شانی میرە ناکۆکەکان دەسەڵاتی خۆی فراوان بکاتەوە، ئەو کاتە لە (مەلتیە) بوو، لەبەر ئەوەی ژمارەی هێزەکانی کەم بوون، داوای گەڕانەوەی ئەو هێزە سەربازییەی کرد کە بۆ قوستەنتینیەی ناردبوو، بۆ یارمەتیدانی ئیمپراتوری بیزەنتی لەشەڕی دژی (بوهیموند)ی میری ئەنتاکیەدا[١٥٣]، بۆیە لەنسیبین مایەوە چاوەڕێی گەیشتنی هێزەکەی بوو، بەڵام رووداوەکان بەپەلە تێدەپەڕین، تەکتیکەکەی دواکەوت. لەنسیبینەوە گەڕایەوە موسڵ، (جاولی) زانی لەشارەکە کشاوەتەوە، بەتایبەتی (جکرمش) کوتوپڕ مرد کاتێ دیل بوو، بەنیاز بوو وەکو ئامرازێك بۆ رێکەوتن بەکاری بهێنێ، لەلایەکی ترەوە دەرکی بەوە کرد کەوا (قلیج ئەرسەلان) بە هێزە توانایەوە ناتوانێ لەگەڵیا رووبەڕوو ببێتەوە، بۆیە هەوڵیدا، هاوپەیمانیەك لەدژی پێکەوە بنێ، تاخۆی بەهێز بکات[١٥٤]. لەئەنجامی ئەم گۆڕانکاریانە، (جاولی) بۆ سنجار، دواجار بۆ (رەحبە) رۆیشت. لەدۆڵی فورات نیشتەجێ بوو، خۆی بۆ بەرەنگاربوونەوە ئامادە کرد. تا هەڵوێستی خۆی بەهێز بکات کەوتە وتووێژکردن لەگەڵ (رضوان)دا لەسەر ئەوە رێکەوتن (قلیج ئەرسەلان) لەموسڵ دەرکەن، دواجار بە هاوبەشی هێرشە بۆ بیزەنتیەکان بەرن، تا لەو شوێنانەی سەر بە (رضوان)ە دەریان بکەن[١٥٥] لەم کاتەدا (قلیج ئەرسەلان) گەیشتە موسڵ و دەروازەکانی شاریان بۆ کردەوە، دانیشتوانەکەی پێشوازییەکی گەرمیان لێکرد، بەڵێنی پێدان رێز لەئازادیەکانیان بگرێت. هەندێ گۆڕانکاری لەشارەکەدا کرد، لەوانە: ناوی سوڵتان (محمد) لەخوتبەکاندا هەڵگرت، دوای ناوی خەلیفە ناوی خۆی دەخوێنرایەوە، گرنگی بەژیانی سەربازەکاندا، باج و خاوەی

لەسەر خەڵکەکە هەڵگرت، جیاوازی لەنێوانیاندا نەدەکرد، (محمد عبدالله بن القاسم الشهرزوری) بە قازی شارەکە دامەزراند، ویلایەتی دایە دەست (أبی البرکات محمد بن خمیس)[١٥٦].

سوڵتانی سەلجوقی، دوای رێکخستنی بارودخۆی شارەکە بڕیاریدا شەڕی (جاولی) بکات، بە سوپایەکی گەورەوە لەموسڵ دەرچوو، لە (شمسانیە) دابەزی[١٥٧]. (مەلەك شا)ی کوڕی لە (دار الأمارە) دانا، ئەو کاتە تەمەنی یانزە ساڵان بوو هێزێکیشی بۆ پاراستنی ئاسایش لەوێدا هێشتەوە.

وا دیار بوو، قلیج ئەرسەلان، نەیدەویست دەمو دەست شەڕ دەست پێ بکات، لەلایەکەوە ژمارەی سەربازەکانی کەم بوون، لەلایەکی ترەوە دوژمنەکەی بەهێز بوو، (جاولی) لە (ماکسین)[١٥٨] هێزەکەی موڵی خواردبوو، ئامادە بوو بڕوات بۆ موسڵ و شارەکە بۆ دەسەڵاتی خۆی بگەڕێنێتەوە. کەمی هێزی دوژمن و دواکەوتنی گەیشتنی هێزی سەربازی لەوڵاتی بیزەنتەوە بەهەل زانی، بەرەو خاپور کەوتەڕێ[١٥٩]، چوار هەزار جەنگاوەری لەگەڵدا بوو، بەرەی قلیج ئەرسەلان درزیان تێکەوتبوو، بەهۆی جیاوازی راو بۆچوونیان سەبارەت بە بەشداری شەڕکردنەوەیانەوە. (ابراهیم ینال) خاوەنی ئامەد کشایەوە[١٦٠]، هەروەها (میافارقین)یش کشایەوە. بەبیانووی ئەوەوە گوایە، لەشەڕەکەدا سەرناکەوین ئەگەر لەوڵاتی بیزەنتیەکانەوە سەلجوقیەکان فریامان نەکەون، ئەمە کاریگەرییەکی خراپی کردە سەر ورەی هێزەکانی سەلجوقی، (قلیج ئەرسەلان) ماوەی کشانەوەی نەبوو، ناچار بڕیاری شەڕکردنیدا بۆ ئەوەی ورەی سەربازەکانی بەرز بکاتەوە، هێرشی کردە سەر دوژمنەکانی، ئازایەتیەکی بێ وێنەی نواند، گەیشتە (جاولی) خۆی، شمشێری بۆ داهێنا، بەڵام زامداری نەکرد، شەڕ بەسەرکەوتنی (جاولی) کۆتایی پێهات. کە زانی شکستی هێناوە ویستی هەڵبێ، خۆی خستە ناو رووباری خاپورەوە، ئەسپەکەی بەرەو قوڵایی بەکێشی کرد و لە ئاوەکەدا خنکاو لەشەکەی دوای چەند رۆژێك سەر ئاوەکە کەوت. لە (شمسانیە) ناشتیان، لەساڵی ٥٠٠ی کۆچی / ١١٠٧ی زاینی (جاولی) گەڕایەوە موسڵ و

دەستی بەسەرا گرت، مەلەك شای کوڕی قلیج ئەرسەلان بۆ (سولتان محمد) نارد[١٦١].

## کاریگەری مردنی قلیج ئەرسەلانی یەکەم

بەمجۆرە پەردە لەسەر ژیانی سولتان قلیج ئەرسەلانی یەکەم دادرا، کە بە کەسایەتیەکی دیار دادەنرێت لەناو سەلجوقی رۆمدا، رۆژهەڵات بەگشتی، بەهەموو تاخمێکیەوە مردنی ئەم پیاوە کاریگەری لەسەریان هەبوو.

- سەلجوقیەکانی رۆم، پیاوێکیان تیا دەرنەکەوت جێگای قلیج ئەرسەلان بگرێتەوە، لەلایەن ئیمپراتۆریەتی بیزەنتییەوە فشارێکی زۆریان خرایە سەر و جارێکی کە دەستیان لە کاروباری ناوخۆیان وەردایەوە. ئەلکسیوس کومنین، توانی جارێکی تر ناوچەکانی رۆژئاوای ئاسیای بچووك بخاتە ژێر دەسەڵاتی خۆی.
- مردنی قلیج ئەرسەلان، تەمەنی دەوڵەتی سەلجوقی درێژکردەوە، وایکرد سەد ساڵی دیکە بمێننەوە. دووبەرەکی کەوتە نێوان سولتانەکان و میرەکانەوە، شەڕی ناوخۆ سەریهەڵدا، سەرەڕای مەترسی دەرەوە، وەکو مەترسی (حەشیشیەکان)[١٦٢] و مەترسی سەلیبیەکان، قلیج ئەرسەلانی هاندا، دەست بکێشێتە کاروباری رۆژهەڵاتەوە، تا دەست بەسەر فەرمانڕەواییدا بگرێت و سەر لەنوێ هەموو هێزەکانی سەلجوقی یەك بخاتەوە لەرۆژهەڵات دەیتوانی ئەو کارانە جێ بەجێ بکات، بەڵام کۆچی دوایی، سەلجوقیەکانی لەنەمان رزگار کرد و تەمەنیان درێژتر کرد.
- مردنی قلیج ئەرسەلان بە قۆناغێکی گەلێ گرنگ دادەنرێت لەجیابوونەوەی سەلجوقیەکانی رۆم، لەسەلجوقی رۆژهەڵات، ئەوەی شایانی باسە، دەوڵەتی سەلجوقی رۆم تا ئەو کاتە بەناو سەر بە سەلجوقی گەورە بوون، تا لە ٥٥٢ی کۆچی / ١١٥٧ی زاینی، دوای لەناوچوونی ئەم دەوڵەتە لەسەر دەستی (قرەخەتاییەکان)[١٦٣]، سەربەخۆییان وەدەست هێنا.
- مردنی قلیج ئەرسەلان، بووە هۆی ئەوەی سەلجوقیەکانی شام ببنە خاوەن هێزێکی وا بتوانن دەوڵەتێك دابمەزرێنن، یەکێ لەدیاردەکان داهێزرانی سولتانی

## مێژووی سەلجوقیەکان

سەلجوقی لە شام و عێراق، پەیدابوونی چەند خێزانێکی دەسەڵاتدار کە هیچ پەیوەندییەکیان بە سەلجوقیەکانەوە نەبوو، لەوانە چەند یەکەیەکی سیاسی بوون، بەناوی (ئەتابەگیەکان)ەوە بوون، خاوەنەکەشی بە (ئەتابەگ)[(١٦٤)] ناو دەبرا.

- مردنی قلیج ئەرسەلان، مەترسییەکی گەورەی لەدڵی ئیمپراتۆریەتی بیزەنتی لابرد. (بوهیموند) لەساڵی ٥٠١ی کۆچی / ١١٠٧ زاینی، خۆی ئامادە دەکرد بۆ بەلقان هێرش ببات و لەقەڵای (دورازو) سەختەو، دەستی پێکرد، ئەلکسیوس کومنین سنوورەکانی باشووری رۆژهەڵاتی وڵاتەکەی کردە قوربانی لەپێناو رزگارکردنی (دورازو)دا، لەگەڵ قلیج ئەرسەلاندا پەیمانێکی بەست، یارمەتی سەربازی لێ وەدەستکەوت، بەڵام مردنی کوتو پڕی و نەبوونی کەسێکی بەتوانا جێگەکەی بگرێتەوە، ماوەی ئەوەی بۆ رەخسا، خۆی بۆ رووبەڕوو بوونەوەی بوهیموند تەرخان بکات، ئەوەبوو ساڵی ٥٠٢ی کۆچی / ١١٠٨ی زاینی شکستی پێ هێنا[((١٦٥))].

- مردنی قلیج ئەرسەلان بارودۆخی نادیاری لەئاسیای بچووك خوڵقاند، مەلەك شای کوڕە گەورەی، لەلای سوڵتان محمد بەدیل گیرابوو، خێزانەکەی دەستی بەسەر مەلتیەو هەرێمەکانی رۆژهەڵاتدا گرت، بەیارمەتی میر (ئای دبر) و چووە ژێر دەسەڵاتی، (توغرول ئەرسەلان)ەوە و دانی پێدانا کە فەرمانڕەوای (وڵاتی رۆم)ە، دوو براکەی دیکە، (مەسعود و عەرەب) یەکەمیان لەوڵاتی دانیشمەندیەکان دەژیا و دووەمیان لە قونیە جێنشین بوو[(١٦٦)].

- روخانی دەسەڵاتی ناوەندی سەلجوقیەکانی رۆم لە قازانجی بیزەنتیەکاندا نەبوو، سەرەڕای ئەمەش، ئیمپراتۆری بیزەنتی توانی دەست بەسەر هەندێ لەقەڵاکانی سنووردا بگرێت[(١٦٧)] بەڵام نەیویست سەرکێشی بکات و بۆ (قیلیقیە و شام) لەشکرکێشی بکات، ئەمەش لە قازانجی سەلجوقیەکاندا بوو.

## بەشی پێنجەم
## مەلەك شای کوڕی قلیج ئەرسەلان
## ٥٠٢-٥١٠ی کۆچی / ١١٠٩-١١١٦ی زاینی
## بارودۆخی سیاسی لەئاسیای بچووك لەدوای مردنی قلیج ئەرسەلان

مەلەك شای کوڕی قلیج ئەرسەلان، دوای ئەوەی لەدەرباری سوڵتان محمد لەساڵی ٥٠٢ی کۆچی / ناوەڕاستی ١١٠٩ی زاینی، هەڵهات دەسەڵاتی بەدەستەوە گرت. چەند کارێکی کرد بۆ جێگیربوونی دەسەڵاتەکەی، ئامۆزایەکی ناکۆکی لەنێوانیاندا هەبوو لەسەر دەسەڵات، مەلەك شا کوشتی. سەرچاوەکان ناوی ئەو ئامۆزایەیان نەهێناوە، (توغرول ئەرسەلان) برای لەسەر تەخت لادا، هەردوو براکەشی (مەسعود و عەرەب) بەندی کردن و تاکو لەسەر شانۆی سیاسی دوریان بخاتەوە[1].

سوڵتانی سەلجوقی لەپێشدا، گرنگی بە پایەختەکەی (قونیە)دا و لەسەر تەرزی شارە ئیسلامیەکان نۆژەنی کردەوە دواجار ئاوڕی لەو کێشانە دایەوە کە روو بەڕووی بوونەوە، بارودۆخی سەڵتەنەتەکە نائارام بوو، میرەکان دەیانویست سەربەخۆ بن، خۆری سەڵتەنەتەکە بەرەو ئاوابوون دەڕۆیشت و دەسەڵاتی ناوەند هەر لەناوەڕاستی ئەنادۆڵ فەرمانڕەوایی دەکرد، بیزەنتیەکان ئەم بارودۆخەیان قۆستەوە هێرشیان کردە سەر کەنارەکانی دەریا، بە پیتترین خاکیان خستە ژێر دەسەڵاتی خۆیانەوە لە رۆژئاوای وڵات و کەنارەکانی دەریای رەش و کەنارەکانی باشووری لەسەر دەریای سپی ناوەڕاست تا دەگاتە شاری ئەنتاکیە[2]، چاودێری توندیان خستە سەر سنوورەکان. هەروەها پەرژینەکانی شاری (دوریلیوم)یان

نۆژەنکردەوە، کە (زاخاس) رووخاندبوونی، دانیشمەندییەکان فەرمانڕەوایی ناوچەی باکووری رۆژهەلاتی ئاسیای بچووکیان کرد، (جزیرە) ش کەوتە ژێر دەسەلاتی (ئەراتیقەکانەوە)[٣]، (زەنکی)یەکانیش[٤] لە دیاربەکر و موسڵ و ئامەد فەرمانڕەوا بوون.

## مەلەك شا و کارەکانی

مەلەك شا، ئامانجێکی کردبووە چاو، ئەویش، یەکخستنی سەلجوقیەکان بوو لە ئاسیای بچووك و یەکخستنی ریزەکانیان لەبەرامبەر مەترسیەکانی دەرەوەو گەڕانەوەی مۆڵکەکانی باوکی. لەهاتنی تورکمان بۆ بەرزاییەکانی ئەنادۆڵ سودێکی زۆری بینی، هێزێکی سەربازی لەو تورکمانانە پێکهێنا بۆ بەدیهێنانی مەبەستەکانی خۆی.

لەوکاتەدا میر حەسەن، فەرمانڕەوای کەبادوکیە لەمیرە هەرە بەهێزو تواناکانی تورك بوو لە ئاسیای بچووکدا، ساڵی ٥٠٤ی کۆچی / ١١١٠ی زاینی، هەوڵیدا دەستی بەسەر مولکەکانی ئیمپراتۆریەتی بیزەنتیدا بگرێ، بەرەو فیلادلفیا کەوتەرێ بەنیازی داگیرکردنی ئەزمیر. ئیمپراتۆری بیزەنتی ئەلکسیوس کومینن، پێشی ئەم هێرشەی تورکەکانی گرت، (یوستاتیوس)ی فەرماندەی گشتی هێزەکانی پیادەی بیزەنتی لە ناوچەی باشووری رۆژهەلاتی ئاسیای بچووك دامەزراند، دەرکردنی تورکەکان لەو هەرێمە پێ سپارد، میر حەسەن خۆی لەبەر هێزەکانی فەرماندە بیزەنتیەکە رانەگرت. بەتایبەتی هێزەکەی، کردبووە چەند بەشێکەوە تا بۆ زۆرترین جێگا لەخاکی دەوڵەتی بیزەنتیدا هێرش بەرن، تووشی چەند شکستیەك هات، ناچار بەرەو بەرزاییەکانی ئەنادۆڵ کشایەوە[٥].

مەلەك شا، هەموو مولکەکانی باوکی لەناو ئەنادۆڵ دەستکەو. دوا جار لەگەڵ میر حەسەن بەرەو رووی یەك بوونەوە، بەسەریا سەرکەوت و مولکەکانی ئەویشی خستە ژێر دەسەلاتی خۆیەوە[٦]. دوای ئەوەی ریزەکانی سەلجوقیەکانی کردەیەك و دەوڵەتی ریکخستەوە، بڕوای بەخۆی کرد، کەوتە گێڕانەوەی مولکەکانی باوکی کە لەکاتی لەشکرکێشی سەلیبی یەکەمدا لەدەستیان دەرچوو بوو، لەو

کارەساتانە بەسەر باوکیدا هاتبوو سوودی لێ بینی، لە کێشەکانی رۆژهەلاتیش خۆی دوورخستەوە.
مەلەك شا، هەر لەسەرەتاکانی سالّی ٥٠٦ی کۆچی / ناوەڕاستی ١١١٢ی زاینیەوە، دەستی بەهێرش کردن کرد بۆ سەر مولّك و خاکی دەولّەتی بیزەنتی، هێرشی بۆ فیلادلفیا کرد، هەروەها بۆ هەندی ناوچەکانی کەناری دەریای رەش، تاکو فەرماندەی بیزەنتی (قوستەنتین جابراس) لەپڕدا لەدەوروبەری شاری (سوبلیانوم) بەرەنگاری بووەوەو بەسەریا سەرکەوت، مەلەك شان ویستی ئاگربەست لەگەلّ ئەلکسیوس مۆر بکات و وای دەربڕی کەوا دەمێکە دەیەوێ پەیوەندیەکی ئاشتیانە لەنێوان موسلّمانەکان و بیزەنتیەکاندا هەبێت(٧).
مێژوونووس، (ئاننا کومینن) کە ئەو هەوالّەی گەیاندووە، مەرجەکانی ئەو ئاشتبوونەوەیەمان پێ راناگەیەنێ، بەلاّم ئاشکرایە مەلەك شا دەستی لەسەر هیچ ناوچەیەك لەو ناوچانەی لەژێر دەستیدا بوون هەلّنەگرتووە، وادیار بۆ ئەوەی سوود لەکاتەکە وەربگرێت و ریزەکانی خۆی رێك بخاتەوە بۆ ئەوە ئاشتبۆتەوە، تاکو خۆی بۆ شەڕی دیکە ئامادە بکات، بەبەلّگە ئەوەی جارێکی کە دەستی بەهێرش بردن کردەوە، بەپەلە هێزێکی سەربازی نارد و گەیشتە پەرژینەکانی شاری (نیقیە). (یوستاتیوس) فەرمانڕەوای شارەکە بەپەلە ئیمبراتوری ئاگادار کردەوە، لە هەمان کاتدا، (محمد)ی فەرماندەی بەرەو رۆژئاوا ملی نابوو، تاکو گەیشتە شاری (بومانیوم)، لەوێ بەسەر فەرماندەیەکی بیزەنتیدا سەرکەوت و ژمارەیەك لەسەربازەکانی بەدیل گرتبوو، لەلایەکی ترەوە، فەرماندەیەکی دیکەی سەلجوقی بەناوی (مانالوك) هێرشی بۆ (ئەبیدۆس) بردبوو، کە دەکەوێتە دەردەنیلەوە و دەستی بەسەر شاری (سێزیکوس) گرتبوو و فەرمانڕەواکەی هەلاّتبوو. مەلەك شا، خۆشی بۆ شاری (برجاموم) هێرشی کرد و داگیری کرد(٨)،
لەئەنجامی ئەم بلاّوبوونەوەی سەلجوقیەکان، ئیمپراتۆری بیزەنتی بڕیاریدا، روو بەڕووی بێتەوە. داوای لە فەرمانڕەوای (نیقیە) کرد لەشارەکەی دەرچێ و دەست بە راونانی تورکەکان بکات، بەلاّم نەکەوێتە شەڕێکی قورسەوە لەگەلّیاندا، لەزۆری سوپاکەیان دەترسا، لەپڕ (کمیتن) هێرشی برد و، بەسەر (میر محمد) دا

سەرکەوت. دەستو پێوەندەکانی کەوتنە بەرزاییەکانی دەورووبەر، بەلام دواجار، خۆیان ڕێکخستەوە و هێرشیان کردە سەر بیزەنتیەکان و شکاندنیان، (کمیتن)یش بەدیل گیرا[٩].

(ئەلکسیوس کومینن) کە هێزە سەربازیەکانی لەبەرامبەر سەلجوقیەکان کەوتبونە پاشەکشێ، بێ ئارام بوو بوو، بەفەرماندەیی خۆی هێرشی بۆ سەلجوقیەکان برد، لە (ئەکرۆکۆس) سوپای سەلجوقی شکاند. ڕێگای هەلاتنیان لێ گرتن، ژمارەیەکی زۆریان کوژرا و زۆریشیان دیل کران[١٠] فەرماندە (محمد) سەرکەوتنێکی کەمی بەدەس هێنا بە کوشتنی دوو فەرماندەی گەورەی بیزەنتی (تسیبوراس) و (ئەبیلاس) بەلام (کمیتن) خۆی رزگار کرد و خۆی گەیاندە هێزەکەی ئیمپراتۆر[١١].

تورکەکان، هێرشیان بۆ شارەکانی بیزەنتە دەبرد و تالانیان دەکرد، ئیمپراتۆر لەناوچەی (دوریلیوم) هێرشی کرد و بەسەریاندا سەرکەوت، هەرچیەکیان تالان کردبوو لەگەڵ چەند دیلێکدا لەدەستی تورکەکانیان دەرهێنا[١٢] ساڵی ٥٠٩ی کۆچی / ١١١٥ی زاینی، مەلەك شا بڕیاریدا بۆ (نیقیە) هێرش ببات، تا لەدەستی بیزەنتیەکانی دەربهێنێ، لە قۆنیەوە کەوتەڕێ، تیپێکی بۆ سووسە کردن (استطلاع) ناردبوو، تا ئاگای لەجولانەوەکانی بیزەنتیەکان ببێ لەناوچەی (دوریلیوم). ئیمپراتۆری بیزەنتی هێزێکی سەربازی ئامادەکرد و لە قوستەنتینیەوە کەوتەڕێ تا بەردەم هێرشی سەلجوقیەکان بگرێت. تیپێکی سەربازی بۆ (لۆباریوم) نارد، بۆ چاودێریکردنی ئەو ڕێگایەی سوپاکەی تورکی لێوە دەهات و هەلوێستی سەربازی پێ رابگەیێنێت. دواجار رووی کردە (نیقومیدیە) نزیکەی ساڵێك لە بەرزاییەکانی (بێسینیا)دا دەگەڕا و چاودێری ناوچەکەیدەکرد(١٣)، بەلام لەگەڵ سوپای تورکدا روو بەڕوو نەبووەوە.

تا دەهات سەلجوقیەکان هێرشەکانیان توندتر دەکردەوە، ئەمە پاڵی بە ئیمبراتورەوە نا، بڕیاری هێرشکردن بدات، بچێتە سەریان و دەسەلاتیان لەناو ببات، بەنەخۆشی بەسەرکردایەتی سوپاکەی بەرەو (نیقیە) کەوتەڕێ، لەنزیکی (فیلومیلیوم) لەگەڵ سوپای تورکدا شەڕێکی قورس بەرپابوو. ئیمپراتۆر، (ئەندرۆنیکۆس)ی کوڕی لەو شەڕەدا کوژرا، کە فەرماندەی باڵی چەپی سوپاکە،

## مێژووی سەلجوقیەکان

بیزەنتی بوو[١٤]، بەسەر کەوتنی بیزەنتی کۆتایی بەشەڕەکە هات. سوڵتانی سەلجوقی هەڵهات و لەبەرزاییەکانی ئەو دەوروبەرە خۆی شاردەوە، ریزەکانی خۆی کۆکردەوەو دیسانەوە هێرشی کردە سەر سوپای بیزەنتیەکان. ئەم پێکدادانەی نێوان سەلجوقی و بیزەنتی ئەنجامێکی یەکلاکەرەوەی نەبوو، بۆیە هەردوولا ناچار بوون ئاشت ببنەوە. مەلەك شا، هەستی بەمەترسی دەکرد کە لەلایەن براکەوە هەڕەشەی لێ دەکرا، ئەمەش دوای ئەوەی (مەسعود) لەلایەن میرەکانی (مەلتیە)وە لە زیندان بەرەڵلاکراو نازناوی سوڵتانی سەلجوقیان پێ بەخشی و لەگەڵ (دانیشمەندییەکانیشدا) ببوە هاوپەیمان. لەلایەکی ترەوە (ئەلکسیۆس) نەخۆش کەوت و نەیتوانی بەردەوام بێ لەشەڕ کردن.

بەمجۆرە دەبینین، هەردوو سەرکردەکە، پاساوی شەڕ نەکردنیان هەبوو و ساڵی ٥١٠ی کۆچی / ١١١٦ی زاینی، ئاشتی لەنێوانیاندا بەرقەرار بوو، بەپێی ئەو رێکەوتنە، پەیوەندییەکانی ئایندەیان رێکخست، ئەو پەیمانەی نێوانیان بریتی بوو لە:

- ئەو خاکانەی سەلجوقیەکان داگیریان کردبوو، لەپێش ئەوەی رومانۆس دیوجینۆس بچێتە سەر تەخت، وەك خۆیان بمێننەوە.
- لەو شوێنانەدا، سەلجوقیەکان ئەمانیان پێ بدرێ و هێرشیان نەکرێتە سەر.
- مەلەك شا، بەڵێن دەدا دەستدرێژی نەکاتە سەر تورکە نەسرانیەکان، ئەوانیش هێرش نەکەنە سەر موڵکەکانی بیزەنتیەکان و سنوورەکان نەبەزێنن[١٥].

بەپێی ئەم لەیەکگەیشتنە، بارودۆخی ئاسیای بچووك ئارام بووەوە، بەم شێوەیەی خوارەوە:

سەلجوقیەکان لەبەرزاییەکانی ئەنادۆڵ لەناوەڕاستی ئاسیای بچووك کۆببونەوە. سەرەڕای سەرنەکەوتنی مەلەك شا لەگەڕانەوەو بەدەستهێنانی موڵکەکانی باوکی، بیزەنتیەکان دەستیان گرت بەسەر هەموو کەنارەکانی (ترابزون) تا دەگاتە (سلوقیە) و (قیلیقیە)، لەگەڵ هەرێمی ناوەوە کە دەکەوێتە رۆژئاوای ئەنقەرەوە، یانی هەموو ئەو شوێنانەی دەکەونە رۆژئاوای ئەو هێڵەی کە لە (سینوب) لەباکوورەوە دەست پێدەکات تاکو (فیلومید) و کەنارەکانی باشووری ئەنادۆڵ[١٦].

## کۆتایی مەلەك شا

کاتێ مەلەك شا، خەریکی کۆبوونەوە بوو لەگەڵ ئەلکسیۆسدا بۆ ئیمزاکردنی پەیمانی ئاشتی، هەواڵی شۆڕشی مەسعودی برای پێگەیشت، لەهەولێکیدا بۆ دەست بەسەراگرتنی دەسەڵات، دوای ئیمزاکردنی پەیمانەکە، بەپەلە گەڕایەوە بۆ بە رەنگاربوونەوەی شۆڕشی براکەی، ئیمپراتۆر یارمەتی سەربازی خستەبەر دەستی بەڵام رازی نەبوو(١٧)، کۆمەڵێ سەربازی نارد، تا دەنگو باسی براکەی پێ راگەیەنن، ئەو کۆمەڵە کە مەسعودیان بینی وا لەگەڵ هێزێکی گەورەدا نزیك دەبێتەوە، هەستیان کرد بەسەر سوڵتاندا دەتوانێ سەربکەوێت، بۆیە چوونە ناو ریزەکانی مەسعودەوەو لەسەر ئەوە رێکەوتن، ئەوەیان بینیوە بیشارنەوەو باسی نەکەن، کە گەڕانەوە، بەمەلەك شایان گوت، هیچیان نەدیوەو سوپای مەسعودیان بەچاو نەبینیوە. سوڵتان بڕوای کرد. بێ دەربەست کەوتەڕێ، براکەی، بەیارمەتی میری دانیشمەندی(غازی) کە مەسعود کچەکەی خواستبوو لەپڕ هێرشیان بردو هەردوو سوپاکە سەلجوقی رووبەڕووی یەك بوونەوە، میر غازی، خۆ گەیاندە ناو سوپاکەی مەلەك شا، خۆی پێ گەیاند و رمێکی لێ دا، بەڵام بەری نەکەوت. هێزەکەی مەلەك شا بەگوێرەی هێزی براکەی نەبوو، ناچار لەمەیدانی شەڕەکە کشایەوە، بۆ شاری (تیراجیوم)ی نزیك (فیلومیلیوم) رۆیشت. (بوخان)ی فەرماندەی ئەم پێشنیارەی پێدا.. لەوێدا سەربازگەکەی بیزەنتیەکان بەو پێیەی دۆستی ئیمپراتۆرە[١٨]. پێشوازیان لێکرد، مەسعود، دوای کەوتبوو، هات و ئابلۆقەی شارەکەیدا، (بوخان) لێرەدا خیانەتی لە سوڵتانەکەی کرد، سەربازگەکەی رازی کرد، دەروازەی شارەکەبۆ مەسعود واڵا بکەن، بەو جۆرە مەسعود و هێزەکەی چوونە ناو شارەکەوە، (بوخان) مەلەکشای دەسگیر کرد و چاوی هەڵکۆڵی، ئەوجار، مەسعود، براکەی کوشت و دەسەڵاتی بەدەستەوە گرت (١٩). بەمجۆرە ژیانی مەلەك شا کۆتایی هات، کە لەپێناوی یەکگرتنەوەی سەلجوقیەکان و گەڕانەوەی مۆڵکەکانی باوکی هەوڵێکی زۆریدا.

# پەراوێزەکانی بەشی پێنجەم

١. إبن القلانسی: ص ٢٥٤. إبن العبری: ص ١٣١–١٣٢.

٢. ئەنتاکیە: شارێکی گەورەی رۆمە، لەسەر کەناری دەریای سپی ناوەڕاستە، الحموی: ج١، ص ٢٧٠؟

٣. ئەراتقە: دەگەڕێتەوە بۆ (ئەرتەق کوڕی ئەکسەك) سەر بەهۆزی (دەقر)ی تورکن، سەر بە (غوز)ن، لە دیاریەکر ئیمارەتیان دامەزراند لەنێوان سالآنی (٤٦٥–٨١٢ی کۆچی / ١٠٧٢–١٤٠٩ی زایینی دا). بڕوانە: خلیل، عمادالدین: الولایات الارتقیە فی الجزیرە والشام.

٤. زەنکیەکان: بڕوانە بەشی شەشەمی ئەم کتێبە.

٥. رنسیمان: ج٢، ص ٢٢٤.

٦. Alexiad: P375.

٧. Ibid: P368

٨. Ibid: P376

٩. (ئانتا) بەدرێژی باسی ئەم شەڕە دەکات. Alexiad: P377

١٠. Alexiad: P378

١١. Alexiad: P391-392

١٢. Ibid: P394.

١٣. Ibid: P403

١٤. Ibid: P394

١٥. Alexiad: P404

١٦. Chalandon: Les comnenes II et Mannel –PP265-265

رستم: ج١، ص ١٣٢

١٧. Alexiad: P406

١٨. Alexiad: P407

١٩. إبن العبری: ص ١٣٢

## بەشی شەشەم
## روکنەدین مەسعود کوڕی قلیج ئەرسەلان
## مەسعودی یەکەم
## ٥١٠-٥٥٠ی کۆچی / ١١١٦-١١٥٥ی زاینی
## بارودۆخی سیاسی لەئەنادۆڵ دوای کوشتنی مەلەکشا

مەسعود لەدەرباری دانیشمەندیەکاندا گەورە بوو و پەروەردە بوو، دوای ئەوەی بەهۆی یەکێ لەفەرماندە دۆستەکانەوە لە زیندانی براکەی هەڵات، بە میر غازی کوڕی گوموشی تەکینەوە پەیوەندی کرد، زانی بەرژەوەندی هاوبەشیان هەیە، ئەویش دژایەتیکردنی مەلەکشا بوو، کە دەبوایە یارمەتی یەکتر بدەن لە ئایندەدا، ئەو پەیوەندی و یارمەتیدانی یەکترە وایکرد رۆڵێکی دیار لە کاروباری ئاسیای بچووکدا بگێڕن[1]. (غازی دانیشمەند) چاوی بڕی بووە بەندەرەکانی دەریای رەش، تاکو ببێتە دەروازەیەك بۆ ئیمارەتەکەی، دوای ئەوەی فراوان بووەوە، لە رووباری (هالیس)ەوە تا فوراتی گرتبووەوە. لەپێناو ئەوەدا گوشاری خستە سەر خاکی بیزەنتی لەبافلاجونیا. مەسعود لە قونیە دانیشت دوای ئەوەی مەلەکشای برای کوشت. بەشی باشووری ئاسیای بچووکی بەڕێوە دەبرد، کە لە رووباری (سنگاریۆس)ەوە تا چیای تۆرۆسی گرتبووەوە ' لەژێر فەرمانی غازی دانیشمەندی مامیدا[2]. (عەرەب)ی برای لەدوای هەڵاتنی لەقونیە، ئەنقەرەو قەستەمی کەوتە دەس دوای کوشتنی مەلەکشا. برای چوارەمیان (توغرول ئەرسەلان) لە مەلتیە مایەوە لەژێر چاودێریکردنی دایکی و ژنی دووەمیدا (بەڵەکی ئەرتەقی) وەکو پێشتر باسمان لێوە کرد.

بەمجۆرە، دەسەڵاتی سەلجوقی بووە سێ ئیمارەتی بچووکەوە لەدەوروبەری قونیەدا، لەژێر چاودێری و پارێزگاری دانیشمەندیەکاندا بوون. کە هەموو شتێکیان بەدەستەوە بوو لەناوچە تورکیەکانی ئاسیای بچووکدا.
مەسعود دوای ئەوەی لەسەر تەخت دانیشت، هەوڵی خۆ چەسپاندن و خۆ بەهێزکردنیدا، کە خۆی بەهێز کرد بڕیاریدا لەسەر شانی بیزەنتیەکان شوێنی زۆرتر بخاتە ژێر دەسەڵاتیەوە، بۆ ئەوەی داڵدەی دەستپێوەندەکانی بداو لەوەڕگا بۆ ئاژەڵەکانیان پەیدا بکات. ئیمارەتە بچووکەنی لەئەنادۆڵ هێنایە ژێر دەسەڵاتی خۆیەوە، تاکو لەدواییدا بتوانێ یەکێتی سیاسی بۆ هەموو تورك ئەنجام بدات، ئەمە ئاواتی ئایندەی بوو هەوڵی بۆ دەدا، هەرەشەی خستە سەر دۆڵی (مياندەر) و ڕێگای ئەنتاکیەی لە بیزەنتیەکان بڕی، هەرێمی (فریجیا)ی گەڕاندەوە ژێر دەسەڵاتی خۆیەوە. ئیتر بیزەنتیەکان بێجگە لەڕێگای دەریا، بەرەو ڕۆژهەڵات ڕێگایان بەدەستەوە نەما. ئەمجا یەکە یەکە ئیمارە تورکە بچووکەکانی هێنایە پاڵ خۆی، ژمارەیەك لە میرە تورکەکان کەوتنە ژێر دەسەڵاتیەوە بەڵام جۆرێ لەسەر بەخۆییان هەبوو، نەبوونە هێزێك کاریگەریان لەسەر ڕووداوەکان هەبێت.

## ناکۆکی بنەماڵەکان

دابەشکردنی مەملەکەتە لەنێوان براکانی مەلەکشاوە، بووە هۆی ناکۆکی نێوانیان، هەریەکەو دەیەویست لەسەر حیسابی ئەویتر زۆرترین شوێنی دەست بکەوێت، یەکەم دەستوەشاندنی لە مەسعود کەوت، براکەی توغرول ئەرسەلان فەرمانڕەوای مەلتیە، بەردەوام هێرشی دەکردە سەر کەنارەکانی ئەدەنە و دەوروبەری قیلیقیە. توانی هەندێ شاری داگیر بکات، لەوانە (بستان) ئەم کارە مەسعودی نا ڕەحەت کرد.
لەساڵی ٥١٨ی کۆچی /١١٢٤ی زاینی، ناکۆکی نێوان براکان تەقییەوە، لەئەنجامی کوشتنی (بەلەك ئەرتەقی) لەکاتی ئابلۆقەدانی قەلانی (منبیج)دا[٣]، غازی دانیشمەند، ئەم ڕووداوەی کردە پاساو بۆ هێرشکردنە سەر مەلتیە. بەیارمەتی مەسعودی زاوای ئەو شارەیان داگیر کرد و خستیە سەر موڵکەکانی دیکەیەوە. کە

## مێژووی سەلجوقیەکان

زاواکەی داوای گەڕانەوەی کرد بەو پێیەی مولکی سەلجوقیەکانە، رازی نەبوو بیگەڕێنێتەوە[٤]، توغرول، لەشارەکە دەرچوو و پەنای بردە بەر سەلیبیەکان، کە لەو کاتەدا ئابلۆقەی شاری (حەڵەب)یان دابوو، بەڵام بەدەنگیەوە نەچوون، ئەوجا بڕیاریدا دەست لە مەلتیە هەڵگرێ و داوای لێخۆشبوونی لە غازی دانیشمەند کرد. بەڵام دەبینین، جارێکەی کە لەساڵی ٥٢٢ی کۆچی / ١١٢٨ی زاینی هێرش بۆ مەلتیە دەباتەوە بەڵام سەرکەوتن وەدەست ناهێنێ، ئیتر دوور کەوتەوە لەشانۆی رووداوەکاندا دیار نەما[٥].

ئەم یارمەتی یەکتردانەی سەلجوقی و دانیشمەندیەکان لە دژی توغرول ئەرسەلان، (عەرەب) پێی ناخۆش بوو، لەدەستدانی مەلتیەش تووڕەی کردبوو، سەرەڕای حاڵی خێزانەکەیان پەرش و بڵاو بوو بوون و موڵکەکانیان لەدەست دەرچوو بوو، بڕیاریدا رووبەڕووی مەسعودی برای ببێتەوە، کە تۆمەتی خیانەتی دابووە پاڵ. ویستی لەسەر تەخت لای بدات و خۆی لەجێگاکەی دابنیشێ و سەلجوقیەکان لەژێر دەسەلاتی خۆیدا کۆ بکاتەوە.

(عەرەب) هێزێکی سەربازی گەورەی کۆکردەوە، نزیکەی سی هەزار سەرباز دەبوو، ساڵی ٥٢٠ی کۆچی / ١١٢٦ی زاینی، بەرەو قونیە کەوتەڕێ تاکو داگیری بکات، ئەوەی بەهەل زانی غازی دانیشمەند، لەدۆڵی فورات و باشووری رۆژهەلاتی ئەنادۆڵ بوو، لەم کاتەدا هەندێ لەمیرەکانی ئەنادۆڵ کە لەخواستەکانی مەسعود و مامەی ترسان[٦]، هاتنە پاڵ هێزەکەی (عەرەب).

مەسعود ئامادەبوو لەگەڵ هێزی سەربازی براکەیدا رووبەڕوو ببێتەوە، مامی لەناوچەکەدا نەبوو، بۆیە ناچار پەنای بۆ قوستەنتینیە برد و داوای یارمەتی لەئیمپراتۆری بیزەنتی (یوحنا کومنین) کرد، یوحنا ببوە جێنشینی ئەلکسیۆس باوکی لەساڵی ٥١٢ی کۆچی / ١١١٨ی زاینی. یوحنا، پێشوازی لێکرد و دیارییەکی زۆری پێشکەشکرد، ناکۆکی نێوان تورکەکانی پێ خۆش بوو تاکو دەست بخانە کاروبارییانەوە[٧].

لەئەنجامی ئەو وتووێژە سیاسیانەی لەنێوانیاندا روویدا، ئیمپراتۆری ئامۆژگاری سەرکردە سەلجوقیەکەی کرد، لەگەڵ (غازی دانیشمەند)دا هاوکاری بکات تا

براکەی لەسەر تەحت لادەدات. مەسعود ئەم ئامۆژگارییەی ئیمپراتۆری پەسەند کرد، لەقوستەنتینەوە بەرەو سیواس رۆیشتن لەگەڵ (مامیدا) پلانی هێرشکردنە سەر (عەرەب)یان دانا، ئەوجا هێزێکی زۆریان کۆکردەوەو بەرەو قونیە کەوتنەڕێ، (عەرەب) نەیتوانی روو بەڕوویان بوەستێ، لەشار وەدەرکەوت و خۆی گەیاندە میری ئەرمەنی (ئوروسی یەکەم)[8] لە قیلیقیە رازی کرد یارمەتی بدات، لەساڵی ٥٢١ی کۆچی / ١١٢٧ی زاینی. هێرشی بۆ (قونیە) کرد، دوو شەڕی قورس لە دژی براکەی و مامی بەرپا بوو لەرۆژئاوای ئاسیای بچووکدا[9].

عەرەب لەیەکێ لە هێرەشەکانیدا بۆ سەر هێزەکانی دانیشمەند (میر محمد کوڕی غازی دانیشمەند)ی بەدیل گرت و لەئەنقەرە زیندانیکرد، براکەی (یاغان) بە هانای (محمد)ەوە چوو بۆ رزگارکردنی ئەویش شکستی هێناو هەڵهات[10] ئەم سەرکەوتنە (عەرەب) بەدەستی هێنا ورەی پێ بەرز بووەوە، بەرەو (غازی دانیشمەندی) رۆیشتن شەڕ لەنێوانیاندا بەرپا بوو، هێزەکەی عەرەب زاڵتر بوو، ناچار غازی کشایەوە، بەڵام جارێکی کە خۆی کۆکردەوەو چووە سەر بەرزاییەك و لەوێ سوپاکەی مۆڵدا و کەرناو بۆقی لێدا، وەك ئەوەی کەوا عەرەب شکستی هێناوە، بەم فێڵە، هێزەکەی عەرەب بڕوایان هات و هەر یەکەو بەلایەکدا هەڵات. هێزەکانی دانیشمەند دوایان کەوتن تا دەوروبەری ئەنقەرە. ئابلۆقەی ئەنقەرەیان دا، عەرەب لەناو شارەکەدا بوو، لەو دیو پەرژینەکانەوە، شەڕ لەنێوانیاندا دەستی پێکرد، میر یاغان، بەدیل گیرا، کە کوڕی دووەمی غازی دانیشمەند بوو، بۆ تۆڵە سەندنەوە چەند دێیەکی دەوروبەریان تاڵان و وێران کرد[11]. سەرکەوتنێکی کەمی بەدەست هێنا، (عەرەب) شکستی هێناو شەڕ راگیراو خۆی گەیاندە قوستەنتینە، ئیمپراتۆری بیزەنتی پێشوازی لێکرد ژیانی ئەوێی پێ خۆش بوو بۆیە ژیانی لەوێ بەسەر برد. کە دوای چەند ساڵێك لەوێدا کۆچی دوایی کرد[12].

بەمجۆرە، دوای سێ ساڵ ناکۆکی، دەوروبەر بۆ مەسعود چۆڵ بوو، دەسەڵاتی کەوتە دەست، بەڵام دەسەڵاتێکی بێ هێز و بێ توانا، کەوتە پاڵ دانیشمەندییەکانەوە. مەسعود لەژێر چاودێری (غازی)دا فەرمانڕەوایی دەکرد، تا (غازی) لەساڵی ٥٢٩ی کۆچی / ١١٣٥ی زاینی کۆچی دوایی کرد.

## پەیوەندییەکانی سەلجوقی – دانیشمەندییەکان

میر غازی، لەمەلتیە کۆچی دوایی کرد، چوار کوڕی لەپاش بەجێما. (محمد) لەسەر وەسەیتی خۆی ئیمارەتەکە کەوتە دەستی (یاغی ئەرسەلان، یەعقوب ئەرسەلان) و (عین الدوله) و (یاغان)[١٣]، ناکۆکی کەوتە نێوانیانەوە لەسەر ئیمارەتە تورکەکانی ئەنادۆڵ، بەڵام (محمد) توانی تواناو دەسەڵاتی خۆی بسەلمێنێ، کە براکانی (عین الدوله) و (یاغان) داوای دابەشکردنی موڵکەکانیان کرد، بەتایبەتی ئیمارەتی سیواس، محمد رازی نەبوو، جاڕی شەڕکردنی دا و توانی هەردووکیان دەستگیر بکات، (عین الدوله)ی زیندانی کرد و (یاغان)ی کوشت) ساڵی ٥٢٩–٥٣٧ی کۆچی / ١١٣٥–١١٤٢ی زاینی ئیمارەتی بەڕێوەبرد[١٤].

مەسعود، ناکۆکیەکانی براکانی دانیشمەندییەکانی بەهەل زانی، بەپێی بەرژەوەندی خۆی دەجولایەوە، دەیویست، لەژێر چاودێری دانیشمەندیەکان خۆی رزگار بکات و دەسەڵاتەکەی لەسەر حیسابی دانیشمەندیەکان فراوانتر بکاتەوەو تەنها خۆی فەرمانڕەوایی ئاسیای بچووك بکات. (محمد کوڕی غازی) ئەو هێزەی نەبوو بتوانێ بەربەرەکانی بکات. سێ ئامانجی لەپێش چاوی خۆی دانابوو هەوڵی بەدیهێنانیانی دەدا:

- دەست بەسەراگرتنی موڵکەکانی دانیشمەندییەکان.
- فراوانکردنی ئیمارەتەکەی بەرەو رۆژهەڵات.
- بەرەنگاریکردنی ئەو بیزەنتیانەی چاویان لەخاکی سەلجوقی بڕیوە.

کێشەی دانیشمەندییەکان لە پرۆژەی فراوانکردنەوە دەسەڵاتەکەی گرنگتر بوو، بۆ ئەوەی خۆی بۆ تەرخان بکات، لەگەڵ ئیمپراتۆری بیزەنتی (یوحنا کومنین)دا پەیمانی ئاشتبوونەوەی بەست، بەڵام دانیشمەندییەکان ئەوکاتە بیزەنتیەکان گوشاریان خستبووە سەریان، بەهۆی کردەوەکانی (محمد) کە لەناوچەکانی قیلیقیەی سەروو دەستدرێژی دەکرد، (محمد) توانی بووی قەڵای (ڤاهکا) بگرێت و بەرەو رۆژئاوا کەوتبووە رێ تا گەیشتبووە رووباری (سنغاریۆس) و هێرشی کردبووە سەر قەستەمونی و بە هێز و شەڕ گەرشاندبوویەوە، لەگەڵ (قوستەنتین گابراس)ی فەرمانڕەوای ترابزون پەیمانی بەستبوو بۆ پارێزگاری باڵی سوپاکەی

لەباکوور، کاتێ کە چوو بووە ناو خاکی بیزەنتیەکانەوە[١٥]. دەبوایە یوحنا کومینن لەشکرێکی ئامادە کردبا بۆ هێرشی (محمد دانیشمەند) لەم هێرشەیدا دوو شت یارمەتیدەری بوون:

یەکەم: سەرهەڵدانی ململانێی ناوخۆ لەنێوان میرەکانی دانیشمەند دا.

دووەم: مەسعودی سەلجوقین بەلای خۆیدا رایکێشابوو.

وادیارە میر محمد، هەستی کردبوو کەوا هێزەکانی ناتوانێ لەگەڵ سەلجوقیەکان و بیزەنتیەکاندا پێکەوە، بەشەڕ بێ. بۆیە هەوڵیدا مەسعود رازی بکات و دەست لەهاوپەیمانی بیزەنتیەکان بەردا، لەمەیاندا سەرکەوتنی وەدەست هێنا، هەردوو سەرکردە تورکەکە ناکۆکیەکانیان وەلاوە ناو لەدژی بیزەنتیەکان یەکیان گرت. محمد بەڵێنی بە مەسعود دا دەست لەهەندێ شار هەڵبگرێ کە زووتر لەدەستی (عەرەب) دەریکردبوو. وەکو ئەنقەرە، کومانا، جانجری[١٦].

ساڵی ٥٣٤ی کۆچی / ١١٣٩ی زاینی، یوحنا کومنین بو قەستەمونی هێرشی برد، شارەکە خۆی بەدەستەوە دا، (قوستەنتین غابراس)ی هاوپەیمانی (محمد دانیشمەند) ملی بۆی خەواند، دواجار بەرەو (جانجری) رۆیشت و داگیری کرد، هێزێکی سەربازی تیادا بەجێهێشت[١٧]. دانیشمەندیەکانی لە (بیسینیا) و (بافلاجونیا) دەرکرد، بەردەوام بوو لە چوونە پێشەوەیدا بەدرێژایی دەریای رەش بەرەو رۆژهەلات.

وا دەردەکەوێت، ئەو پەیوەندیە ئاشتیانەی نێوان مەسعود و محمد تاکو مردنی محمد، بەردەوام بووە، بە بەڵگە ئەوەی هاوکاری یەکتریان کردووە لە بەرپەرچدانەوەی لەشکرکێشیەکەی بیزەنتیەکان، کاتێ هێرشی بۆ (نیکسار) برد لەساڵی ٥٣٥ی کۆچی / ١١٤٠ی زاینی، کەسەر بە دانیشمەندیەکان بوو[١٨].

ئیمارەتی دانیشمەندی تووشی دابەشبوون بووەوە لەدوای مردنی میر محمد، کە وەسیەتی بۆ (زەنون)ی کوری کردبوو بەر لەمردنی، کاروباری ئیمارەتەکە هەڵسورێنێ، بەلام (خاتون)ی خێزانی، (یاغی ئەرسەلان کوری غازی) بانگ کرد و شووی پێکرد و کردیە والی سیواس. (زەنون) ئەوێی بەجێ هێلاو لەقەیسەری

دانیشت، هەروەها (عین الدولە) لە مەلتیە نیشتەجێ بوو، بەمجۆرە ئیمارەتی دانیشمەندی بووە سێ بەشەوە[١٩].

ئەم دابەشبوونە هەلێکی باش بوو بۆ مەسعود دەسەلاتی بەسەر ولاتی ئەنادۆلدا بچەسپێنێ، هەروەها دەستی گرت بەسەر هەموو ئەو هەرێمانەی رۆژهەلات تا دەگاتە رووباری فورات. ناکۆکی ناو ئەم خێزانە ئیمارەتەکەی لاواز کرد و هێزەکانیشی بێ تواناو بێ دەسکەوت، بۆ مەسعود گەلێ کاری ئاسان کرد. مەسعود دەستی بە خۆهەلقورتاندن کرد لە کاروباری ناوخۆی میرەکانی دانیشمەند، بەدوای خالی لاوازییاندا دەگەڕا، تۆوی ناکۆکی چاند لەنێوان (عین الدولە) و (یاغی ئەرسەلان) کە لە سیواس بوو، بەلێنی بە یەکەمیان دا هەندێ دەسەلاتی پێ ببەخشێ ئەگەر ببێتە هاوپەیمانی. (عین الدولە) بە مە رازی بوو، بەلام رێکەوتنەکەیان زۆری نەخایاند، مەسعود سالی ٥٣٨ی کۆچی / ١١٤٣ی زاینی هێرشی کردە سەر مەلتیە و ئابلوقەی دا، بەلام لەبەر سەختی جێگاکەیان گەڕایەوە، بەلام بۆ سێ سال هەموو هاوینێک هێرشێکی بۆ دەبرد، بۆی نەدەگیرا[٢٠]، بەلام توانی (بستان) داگیر بکات، هێرشی بۆ سیواس برد، لە مولکەکانی (عمادالدین زەنکی) دامەزرێنەری دەولەتی زەنکی لەموسل نزیک بووەوە، کە ئەو دەمە دەکۆشا (ئەرتەقیەکان) لە دیاربەکر لەناو بەرێت، چوونە ناو ناوچەکانی رۆژهەلاتەوە، نیازی مەسعودی ئاشکرا دەکرد کەوا دەیویست لە دەوروبەری فورات رۆلی گرنگی هەبێ[٢١]، وا دیارە ئەم نیازەی بەدی نەهات بەهۆی هەلوێستی (عمادالدین زەنکی)یەوە، بەلام دەسەلاتی خستە سەر هەموو ئەو هەرێمانەی لەرۆژهەلات تا دەگاتە فورات. کە لەژێر دەسەلاتی دانیشمەندییەکان بوو.

بەپێی وتەی (إبن الاثیر) مەسعود، شوێنەکانی (میر محمد)ی دوای مردنی خستە ژێر دەسەلاتی خۆیەوە[٢٢]. دواجار مەسعود ناوچەکەی بەجێهێشت و دەسەلاتی خۆشی تیادا دانەمەزراند، بۆ قونیە گەڕایەوە، رووبەڕووی هاوپەیمانی دانیشمەند هەولیان دەدا یەک بگرن بۆ رووبەڕووبوونەوەی مەترسیەکانی مەسعود، بەلام دەیانزانی بەتەنیا پێیناناکرێ بۆیە پەنایان بۆ ئیمپراتۆری بیزەنتی مانوێل کومینن

برد، کە ساڵی ٥٣٧ی کۆچی / ١١٤٣ی زاینی، ببوە جێنشێنی (یوحنا کومینن)ی باوکی، لەگەڵیا پەیمانی هاوپەیمانیان بەست[٢٣].

لەئەنجامی ئەم ڕێکەوتنەدا کە لەسەرەتای ساڵی ٥٣٨ی کۆچی / ١١٤٣ی زاینی، بەسترا. مەسعود کەوتە نێوان دووتای دەسارەوە، بەپەلە گەڕایەوە ئەنادۆڵ بۆ بەرەنگار بوونەوەی ئەو هاوپەیمانیە نوێیە، هەردوو میری دانیشمەندیش (عین الدولە) و (یاغی ئەرسەلان) چوونە پاڵ ئیمپراتۆری بیزەنتی و بەفەرمانی ئەو دەجوڵانەوە[٢٤].

## پەیوەندییەکانی سەلجوقییەکان و بیزەنتیەکان لەسەردەمی یوحنا کومینن دا

لە (ربیع الاخر ٥١٢ی کۆچی / ١١١٨ی زاینی) ئیمپراتۆری بیزەنتی ئەلکسیوس کومینن لە قوستەنتینیە دوای نەخۆشیەکی درێژخایەن کۆچی دوایی کرد[٢٥]، ساڵی ٥١٢–٥٣٨ی کۆچی / ١١١٨–١١٤٣ی زاینی (یوحەنا)ی کوڕی بووە جێنشینی.. ئەمیش وەکو باوکی گرنگی بەکاروباری ڕۆژهەلات دەدا، بەمەبەستی:

- گەڕانەوەی سنووری ئیمپراتۆریەت لە ئاسیا بۆ سەردەمی پێش داگیر کردنی لەلایەن سەلجوقیەکانەوە، یانی تاکو ئەنتاکیا و فورات.
- دەرکردنی تورک لە ئاسیای بچووک.
- کردنەوەی ڕێگای ڕۆژهەلات لەپێش بیزەنتیەکاندا
- ناچار کردنی ئەرمەنیەکان لە قیلیقیە و ئیماراتەکانی سەلیبی لە وڵاتی شام بەدەسەڵاتی بیزەنتیەکانیان ڕازی بن[٢٦].

لە ڕاستیدا نەیدەتوانی ئەم کارە ئەنجام بدات تاکو هێزی سەلجوقیەکان لەناو نەبات.. موڵکەکانی بیزەنتیەکانیش لە ئاسیای بچووک کاتێ ئەلکسیۆس مرد بریتی بوو لە ترابزون و هەموو کەنارەکانی دەریای ڕەش و کەناری باشووری دەریای سپی ناوەڕاست تا دەگەیشتە ئەنتاکیە لەوڵاتی شام.لەگەڵ هەموو ئەو شارانەی کەوتبوونە ڕۆژئاوای ئەو هێڵەی بەشاری (سینوب و جانجری و ئەنقەرە و عەموریە و فیلومیلیوم)[٢٧] دا. تێدەپەڕی مەسعود ململانێی بیزەنتیەکانی بەهەل زانی، جارێکی کە دەسەڵاتی سەپاندە سەر ئەو ناوچانەی کەوتبوونە نێوان ڕووباری

(میاندەر) تا دەگاتە ئەنتاکیە. ڕێگای پەیوەندی ئیمبراتورییەتەکەی بۆ رۆژهەڵات بڕی، تەنها دەریایی مایەوە.

ئیمپراتۆڕ جارێکی تر (فیلادلفیا)ی ساڵی ۵۱۲ی کۆچی / ۱۱۱۹ی زاینی خستە ژێر دەسەڵاتی خۆیەوە. بۆ ساڵی داهاتوو (سوزبولیس)[٢٨] داگیر کرد و بەرەو ئەنتاکیە کەوتەڕێ، قەڵاکانی پێشەوەی گرت، ڕێگاشی لەنێوان (ئیسوریا) و (قیلیقیە) و شوێنەکانی بیزەنتە کردەوە[٢٩].

ئەو لەشکرکێشیەی فەرمانڕەوای (ترابزون) قوستەنتین غابراس ساڵی ۵۱۳ی کۆچی / ۱۱۱۹ی زاینی، دژی هێزەکانی ئیسلام ئەنجامی دا، بەهاندان و پشتگیری ئیمبراتور بوو، بە بەڵگەی ئەوەی ئیمپراتۆڕ خۆی لەو ساڵەدا هێرشی کردە سەر ناوچە سنوورییەکان، دوای شکست هێنانی (غابراس) لەبەرامبەر هاوپەیمانی توغرول ئەرسەلانی سەلجوقی فەرمانڕەوایی مەڵتیە و (بەڵەك ئەرتەقی) و (غازی دانیشمەند)ی میری سیواس و (مەسعودی سەلجوقی). ئیمبراتور (فریجیا)ی تێپەڕاند و گەیشتە سنووری سەڵتەنەتی سەلجوقی رۆم. ئەو تورکانەی ویستیان ڕێگای لێ بگرن بەسەریاندا زاڵ بوو (لاذیق)یشی داگیرکرد، قەڵایەکی تیادا کرد دەیڕوانیە ڕووباری (میاندەر) کە بەرەو دەریای سپی دەڕۆیشت. هەروەها لەو دەوروبەرەدا دەستی بەسەر سێ قەڵای دیکەی سەلجوقیەکاندا گرت[٣٠].

بارودۆخی بیزەنتیەکان بەرەو چاکبوونەوە دەڕۆیشت. دوای ئەوەی سێیەکی رۆژئاوای ئاسیای بچوکیان گەڕاندەوە ژێر دەسەڵات، بەهەموو لایەکدا ڕێگای هاتووچۆیان کردەوە، بەڵام ئیمپراتۆڕ دوای دەست بەسەرا گرتنی لازیقیەی ئەنادۆڵ ئیمپراتۆڕ گەڕایەوە قوستەنتینە، هەموو ئامانجەکانی بەتەواوی بەدی نەهێنا، کە دەیویست ئەنتاکیە بگرێ و ڕێگای رۆژهەڵات بکاتەوە[٣١].

لەئەنجامی ئەم بارودۆخە نوێیە، سەلجوقیەکان لەناو جەرگەی نیمچە دورگەکەدا کۆبوونەوە لە دەوروبەری قونیە خڕ بونەوە. بەڵام موسڵمانەکانی لازقیەی ئەنادۆڵ بەئاسانی پەیوەندیان لەگەڵ پایەتەختدا بەردەوام بوو[٣٢] لە گەرمەی ئەم جوڵانەوە سیاسییە نا ئارامەدا، مەسعود، لەپەیمانی لەیەك گەیشتن کە لەنێوان خۆی و یوحنا کومینن بەسترا بوو پەشیمان بووەوەو لێی کشایەوە. لەگەڵ

(محمد)ی دانیشمەند بووە هاوپەیمان، ئەم هەڵگەڕانەوە کوتو پڕەی سوڵتانی سەلجوقی، ئیمبراتوری بیزەنتی نیگەران کرد. چونکی لەخۆ ئامادەکردندا بوو بەرەو شام بکەوێتەڕێ بۆ سزادانی ئەرمەنیەکان و بە کزاچوونی سەلیبیەکان.. لەوە ترسا، مەسعود، ئەم هەڵە بقۆزێتەوەو هێرش بباتە سەر خاکی بیزەنتی کە سەرباز و هێزێکی وای تیادا نییە بەرگری بکات..

هەرواش دەرچوو، مەسعود، سەفەری ئیمبراتوری بەهەل زانی و هێرشی بۆ (کیسوم) کرد[33]، ئابلۆقەی دا، فەرمانڕەواکەی سەلیبی بوو بەناوی (بلدوین) هانای بۆ ئیمپراتۆر برد، کە ئەو کاتە بەرێوە بوو بەرەو باشوور: کە مەسعود زانی هێزەکانی بیزەنتە لەناوچەکەدان، ئابلۆقەی سەر شارەکەی هەڵگرت، کە هێەکانی کەیشتنە وڵاتی شام، مەسعود هێرشی کردە سەر (ئەدەنە)، ئەم کارە وایکرد، یوحنا کومنین لەدژی سەلجوقیەکان چەند کارێکی سەربازی ئەنجام بدات، لە گەڕانەوەیدا لە وڵاتی شام، (کنغری) گرت و مەسعود ناچار بوو داوای ئاشتبوونەوە بکات و بەڵێنیشی دا زیانەکانی ببژێرێ[34].

بەوەندە دەسکەوتی سەربازی بەدەستی هێنا وازی هێنا، ڕەنگە لەبەر ماندوو بوونی هێەکەی بوو بێ دوای ئەو لەشکرکێشیەی بۆ وڵاتی شام، دوا کاری لە ئاسیای بچووك ئەنجامی دا، ئەو هێرشە بوو بۆ سەر میرەکانی دانیشمەند کردی، بۆ تۆڵە سەندنەوەی ئەو هێرشەی ساڵی ٥٢٤ی کۆچی / ١١٢٩ی زاینی بۆ سەر موڵکەکانی ئەنجامیان دابوو.

یوحنا کومنین لە (شەوالی ٥٣٧ی کۆچی / نیسانی ١١٤٢ی زاینی) لە قیلیقیە کۆچی دوایی کرد کاتی خۆی بۆ هێرشی ئەنتاکیە ئامادە دەکرد[35]، وا ڕێکەوت کاتێ یوحنا کومنین بۆ قیلیقیە گەڕایەوە تاکو زستان لەوێ بەسەر بەرێ و خۆی بۆ ئەنتاکیە ئامادە بکات لەبەهاردا، بۆ ڕاو دەردەچێ، بە تیرێکی ژەهراوی خۆی زامدار دەکات بووە هۆی مردنی، بەر لە مردنی (مانوێل) کوڕی کردە جێنشینی خۆی، بڕوای پێ هەبوو، چاوەڕێی ئایندەیەکی باشی لێدەکرد، سوپاکەش لایەنگری بوو[36].

## سەردەمی مانویل کومنین

## ئەو بارودۆخەی مانویل چووە سەر تەختی بیزەنتی

دوای مردنی یوحەنا، مانویل کومنین جێگای باوکی گرتەوە، چوار کوڕی هەبوو، ئەم لە هەموویان منداڵتر بوو، ئەو کاتە بیست ساڵان بوو[٣٧]. کاتێ باوکی هێرشی بۆ ئەنتاکیە بردبوو ئەمی لەگەڵدا بوو، براکانی دیکەی، گەورەکەیان (ئەکلسیوس) باوکی داینابو دوای خۆی ئەو جێگای بگرێتەوە، ساڵی ٥٣٧ی کۆچی / ١١٤٢ی زاینی، لەکاتی هێرشی سەر ئەنتاکیەدا مرد، کوڕی دووەمی (ئەندرۆنیکوس) لەسەر ئەو پاپۆڕەی تەرمی براکەی هەڵگرتبوو و بەرەو پایتەخت کەوتبوونە رێ کۆچی دوایی کرد، کوڕی سێیەم (ئیسحاق) لە پایتەخت بوو، مافێکی شەرعی ئەو بوو ببێتە ئیمپراتۆر[٣٨]، (مانویل) دەبێ دەستوبردی بکردبا بەر لەگەیشتنی هەواڵی مردنی باوکی بە پایتەخت، پشتگیری دەربار و گەل وەدەست بێنێ، لەوە دەترسا (ئیسحاق)ی برای بەو پێیەی ماف ئەوە، رازی نەبێ و شۆڕش بەرپا بکات. لەوەش دەترسا، گەلی بیزەنتە رازی نەبن بە ئیمپراتور هەڵیبژێرن. هەروەها (ئیسحاق کومنین)یش رازی نەبوو پشتگیری بکات، کە ئەویش چاوی تەخت و تاجی ئیمپراتۆری[٣٩] بڕیبوو.. (ئەکسوخوس)ی بە رەچەڵەك تورك و برادەری باوکی بۆ پایتەخت هەنارد، دەسەڵاتی رەهای پێدا نەهێڵێ عەرش داگیر بکەن[٤٠].

(ئەکسوخوس) لەو ئەرکەی پێی راسپێردرابوو سەرکەوت، (ئیسحاق)ی زیندانی کرد، هەروەها (ئیسحاقی) مامیشی دەستگیرکرد ئیتر، لەنانەوەی ئاژاوە دڵنیا بوو. زۆری نەبرد (مانویل) گەیشتە پایتەخت، تەرمی باوکی پێ بوو، بارودۆخەکەی لەبار بینی، کرایە ئیمپراتۆری دەوڵەتی بیزەنتی[٤١].

(مانویل) دەبوایە بەپەلە پشتگیری دەربار و میللەتی مسۆگەر بکردایە بەر لەگەیشتنی هەواڵی مردنی باوکی بۆ پایتەخت. چونکی مەترسی ئەوەی هەبوو براکەی (ئیسحاق) بەو پێیە ئەو میراتگری شەرعیە، هەروەها خەمی ئەوەشی بوو گەلی بیزەنتی رازی نەبێ بە ئیمپراتور هەڵیبژێرن، (ئیسحاق کومنین)ی مامیشی خۆی بەتەمای چوونە سەر تەخت بوو، پشتگیری نەکرد ببێتە ئیمپراتور[٤٢].

(ئەکسوخوس)ی نارد کە بە ڕەچەڵەك تورك بوو[٤٣] و هـاوڕێی نزیکی بـاوکی بـوو، (ئیسحاق)ی زیندانی کرد لەگەڵ مامیدا، ئیتر دڵنیـا بـوو ئـاژاوە ڕوو نـادات، دوای مانگی (مانویل) گەیشتە پایتەخت بووە ئیمپراتۆری دەوڵەتی بیزەنتی[٤٤].

## یەکەم لەشکرکێشی مانویل دژی سەلجوقیەکان

لەسەرەتای فەرمانڕەوایی (مانویل) دا، دانیـشمەندیەکان هاوپـەیمانی بـوون، بۆیـە خـۆی بـۆ شـەڕی سـەلجوقیەکان تـەرخان کـرد، ئـەم هاوپەیمانیـە لـەدۆڵی فـوڕات هەندێ کاری بۆ ئاسان کرد، مانویل سیاسـەتی بـاوکی پـەیڕەو دەکـرد لـە لێـدانی سەلجوقیەکان و کەمکردنـەوەی دەسـەڵاتیاندا لـە ئاسـیای بـچووك[٤٥]، بەتایبـەتی هێرش بردنیان بۆ ناوچە سنووریەکان ببوە هۆی چاندنی ئاژاوە تیایانـدا، چـەندین دێ چۆڵکران و بەهۆی گوشاری سەلجوقیەکان و ڕوویان کـردە شـارەکانی یـان بـۆ ئـەو شـوێنانەی هێرشـی سـەلجوقیەکانی پـێ نەدەگەیـشت. بـۆ ئـەوەی هێرشـی سەلجوقیەکان کەم بکاتەوەو سنوورێکی بۆ دابنـێ، هێڵێکـی سـنووری دیـاریکرد و چـەند بـورج و قـەڵای تیـادا دروسـتکرد و هێـزی لەسـەر ئـەو ڕێگایانـە دانـا کـە سەلجوقیەکان پیایدا تێدەپەڕین و هێرشیان دەبرد، بەمجۆرە تـوانی سـنوورێك بـۆ ئەو هێرشانە دابنێ، تەنها هاوینان جاروبـار هێرشـیان دەکـرد بـەڵام خۆیـان قـەڵاو شوێنە قایمەکان وەدوور دەخست[٤٦].

لە هەرێمی (ملاجنە)، سەلجوقیەکان چووبوونە ناو لە وەرگاکانی بیزەنتیەکانـەوە کە کەوتبوونە نێوان نیقیەو دوریلیوم، مانویل، لـە کۆتـایی سـاڵی ٥٣٩ی کۆچـی / ١١٤٥ی زاینی یەکەم لەشکرکێشی ئەنجامـدا تـا لـەو شـوێنانەیان دەرکـات، بـەڵام لەبەر بـاری تەندروسـتی خـۆی بـوو یـان نـەخۆش کـەوتنی (ماریـا)ی[٤٧] خوشـکی گەڕایـەوە قوسـتەنتینیە ئـەم بەپەلـە کشانەوەیەی (مانویـل) لەناوچـەکەدا چـەند ئەنجامێکی لەقازانجی سەلجوقیەکان لـێ کەوتەوە:

سـەلجوقیەکان هەسـتیان کـرد، ئیمپراتـۆر ئامـادە نـەبوو بکەوێتـە شـەڕێکی درێـژ خایەنەوە. ڕەنگە ئەم کشانەوەیە لەبەر بەرپابوونی ئاژاوە بوو بـێ لـە پایتەختـدا، ئەم بۆشاییە سەربازییەیان بەهـەل زانـی، دەسـتیان کـردە هێـرش بـردن بـۆ سـەر

خاکی بیزەنتیەکان، لەو هۆکارانەی هانیانی دا، زیاد بوونی دەسەڵاتی موسڵمانەکان بوو لە وڵاتی شام، دوای گەڕانەوەی شاری رەها[٤٨].

## مەسعود لەسێ لاوە هێرش دەبات

یەکەم: رووکردە ناوچەی باکووری رۆژئاوای ئاسیای بچووک. سەلجوقیەکان بۆ دۆڵی رووباری (سنغاریۆس) دزەیان کرد و بەرەو پێشوە چوون، تا گەیشتنە شاری (بیسکاس) کە دەکەوێتە نێوان (نیقیە و ملاجنە)وە، هێرشیشیان کردە سەر شاری (ئەمنوس) لەکەناری دەریا[٤٩].

دووەم: ناوچەی رۆژئاوا: سەلجوقیەکان قەڵای (براکانا)ی بچووکیان لە (ئیسوریا) داگیر کرد، لێرەوە هەڕەشەیان خستە سەر ئەو رێگایەی بیزەنتیەکانی بە وڵاتی شام دەبەستەوە. زۆری نەبرد، بۆ دۆڵی رووباری (میاندەر) هێرشیان برد، گەیشتنە دۆڵی سەرووی رووبارەکە. (کلیتانوم)یان گرت و چوونە پێشەوە تا نزیکی دەریاکە چوون. گرتنی قەڵای (براکانا)، تەنها گورز نەبوو بەر ئیمپراتۆریەت بکەوێت لەناوچەکەدا، چونکی سەلجوقیەکان لەو گەڕانەیاندا، هێرشیان کردە سەر موڵکەکانی دانیشمەندیەکانیش کە هاوپەیمانی بیزەنتیەکان بوون، بەتایبەتی ئەو خاکانەیان داگیرکرد کە لەژێر دەسەڵاتی (یاغی ئەرسەلان)دا[٥٠] بوون.

ئەم بڵاوبوونەوەیەی سەلجوقی ترسی خستە دڵی ئیمپراتۆرەوە لەوە ترسا سەلجوقیەکان، ئەو رێگایە لە بیزەنتیەکان بگرن کە بۆ (فیلیفیە) دەڕوات، ئەو کاتە پەیوەندیەکانی نێوان ئەوان و رۆژهەڵاتی ئیسلامی دەپچڕێ، ئیمبراتوریەتیش بە درێژایی پەنجا ساڵ بەتەنگ ئەو رێگەیەوە بوو بە روویاندا دانەخرێ ئەم بارودۆخە سەربازییە نوێیە، هانی دا دژە هێرش دەست پێبکات[٥٢].

## دووەم لەشکرکێشی مانویل دژی سەلجوقیەکان

### ئابلۆقەدانی قونیە

ساڵی ٥٤٠ی کۆچی / ١١٤٦ی زاینی، پایتەختی بەجێ هێشت و هێرشی بۆ ئاسیای بچووک دەست پێکرد، ئامادە نەبوو هێزەکانی دابەش بکات بۆ هێرش کردنە سەر سەلجوقیەکان، وای بەباش زانی لەو ناوچەیەی دەکەوێتە رۆژئاوای رووباری

(سنغاریۆس)ەوە کۆیان بکاتەوەو دەست بە راونانی هێزەکانی سەلجوقی بکات کە لەناوچەکەدا بڵاوەیان لێکردبوو. بەڵام گوشاری سەلجوقیەکان ناچاری کرد، پەنا بباتە چیاکانی دەوروبەر، بۆ سووك کردنەوەی گوشارەکەیان، بڕیاریدا، دەست لە مەسعود بوەشێنێ و لە ماڵەکەی خۆیدا هێرشی بۆ ببات. بۆیە بەرەو (لۆبادیوم) کەوتەڕێ، بەمەبەستی ئەوەی بۆ (قونیە) هێرش ببات، تاکو ناچاری بکات، ئەو هێزانەی لەناو خاکی بیزەنتیەدا بڵاو بوونەتەوە بکشێنێتەوە بۆ ئەوەی پارێزگاری پایتەخت بکەن. بەڵام هێزەکانی لە (لۆبادیوم) کشانەوە تا هێرش بکاتە سەر ئەو هێزەی دوژمن لە دۆڵەکەدا بوون.. لەیەکێ لەو شەڕانەدا زامدار بوو، ناچار بۆ ماوەیەك لە فەرماندەیی ئەما و سوپاکەی بۆ (لۆبادیوم)[٥٣] گەڕاندەوە دوای پشوودانێکی کەم، ساڵی ٥٤٠ی کۆچی / ١١٤٦ی زایینی بەرەو (قونیە) رۆیشت بە رێگای (دوریلیوم– فیلومیلیوم– کوتاهیە)دا[٥٤].

مەسعودیش بەرەو (فیلومیلیوم) رۆیشت و جێگای شەڕەکەی دیاریکرد، بۆیە ئەوێی بۆ شەڕکردن هەڵبژارد چونکی چۆڵکرابوو بەهۆی ئەو شەڕانەی نێوان سەلجوقی و بیزەنتیەکانەوە کەسی تیادا نەمابوو. هێزێکی بچووکی لەپێشدا نارد تا هێزە بیزەنتیەکە تاقی بکەنەوە، پلانی مەسعود ئەوەبوو، هێزەکانی دوژمن بێزار بکاو نەهێڵێ بێنە پێشەوە، چونکی سەلجوقیەکان ژمارەی سەربازیان کەم بوو، چاوەڕێی یارمەتی لە رۆژهەڵاتەوە دەکرد، بۆیە سەلجوقیەکان هەوڵیان دەدا سوپای بیزەنتی بخەنە بۆسەوە، کاتێ لەو شوێنە سەختانەوە تێدەپەڕین، بەڵام ئەم هەوڵانە سەرکەوتنی وەدەست نەهێنا. سوپای سەلجوقی بەرەو قونیە کشایەوە، خۆی ئامادە کرد بۆ بەرەنگاربوونەوەی سوپای بیزەنتی[٥٥].

سوپای بیزەنتی بەردەوام بوو لە چوونە پێشەوەیدا، دەستیان کردە هێرش کردن بۆ سەر سوپاکەی سەلجوقی و سەربازێکی زۆریان لێ کوشتن، لەوانە (خاریس)ی فەرماندە. بیزەنتیەکان بەسەر پردەکانی رۆژهەڵاتدا تێپەڕین کە دەیانی گەیاندە (فیلومیلیوم). شارەکەیان داگیر کرد و سوتاندیان، دواجار چوونە ناو (ئەدریانو بولیس)ەوەو لە (غایتا) لە نزیکی سوپای سەلجوقیەوە، سەربازگەیان دانا، لێرەشدا (مانویل) زیانێکی زۆری سوپاکەی مەسعود گەیاند دانا، لێرەشدا

(مانویل) زیانێکی زۆری بە سوپاکەی مەسعود گەیاند و بەرەو (کابالا) کەوتەڕێ.
مەسعود لەگەڵ سوپاکەیدا چوونە چیاکان، بۆ ماوەیەك لەوێدا لەبەر هێرشی بیزەنتیەکان[٥٦] خۆی راگرت.

لەئەنجامی ئەم گۆڕانکارییە سەربازیانەدا، مەسعود پلانی سەربازییەکەی گۆڕی، لەجیاتی ئەوەی لە قونیە بمێنێتەوە هێزەکەی بە درێژایی رێگای قونیە دامەزراند، تا وای پیشان بدات کەوا هێزێکی زۆر لەناوچەکەدایە بۆ پاراستنی پایتەخت، ئەمە لەلایەك، لەلایەکی ترەوە وای بەباش زانی، لەدەرەوەی پەرژینەکانەوە بەرەنگاریان بێتەوە باشترە.

**مەسعود، هێزەکانی کردە چوار کۆمەڵەوە، دابەشیان کرد، ژمارەیەکی باشیشی لەناو پایتەختەکە دانا بۆ پارێزگاری شارەکە.**

بەشی یەکەمی هێزەکەی، لەباکووری پایتەخت لەسەر رێگا دانا، لە (ئەکساریا)ەوە تاکو (تاتا).

بەشی دووەم: بۆ پارێزگاری پایتەخت

بەشی سێهەم: لەدەوروبەری پایتەخت

بەشی چوارەم: لەسەر رێگای (کابالا)ی دانان، تا نەهێڵن سوپای بیزەنتی بەرەو پایتەخت بێن.

کەهێزی بیزەنتی بەرەو قونیە هاتن، بەشی چوارەمی هێزەکەی سەلجوقی بەرەنگاریان بوونەوە، بەشی یەکەمیشی لەدواوە هێرشی برد، زیانێکی زۆریان گەیاندە سوپای بیزەنتی (مانویل) لەسەر داوای فەرماندەکانی بەپەلە یارمەتی گەیاند، بەڵام شەڕ هەر بەردەوام بوو، (مانویل) بۆ ئەوەی لەم سەغڵەتیە خۆی رزگار بکات هەواڵی کوشتنی مەسعودی بڵاوکردەوە، تاکو ریزەکانی سوپای سەلجوقی بشڵەژێ و تێك بچن، ئەم هەواڵە کاریگەری خۆی کرد، هێزی سەلجوقی کشایەوە ناو شار[٥٧].

هێزەکانی بیزەنتی، پایتەختیان ئابلۆقەدا، دەوروبەری شاریان تالان کرد، لەهەندێ شەڕی سوك بەولاوە هێزی سەلجوقی نەیتوانی لەدەرەوەی پەرژینەکان هیچی دیکە بکات. مانویل ژیرانە لەگەڵ دوژمنەکانیدا هەڵسو کەوتی دەکرد،

ڕێگای لەسەربازەکانی گرت، مەزاری موسڵمانەکان تێکنەدەن، هەروەها ژنەکەی مەسعودی دڵنیا کردەوە کەوا مەسعود لەژیاندایە[٥٨]. بەڵام بیزەنتیەکان نەیانتوانی بچنە ناو شارەکەوە. ئابڵۆقەکە درێژەی کێشا. لە پڕێکا، مانویل فەرمانی کشانەوەی دا، چی گۆڕانکارییەکی سیاسی وایکرد بکشێتەوە؟

ئەوەی ڕاستی بێ، زانیاری وردمان لەبەر دەستدا نییە. لەبەرچی مانویل کشایەوە، سەرەڕای ئەوەش هەڵوێستی بەهێز بوو، بەڵام بەپێی گۆڕانکاری ڕووداوەکان دەتوانین چەند هۆیەك دیاری بکەین:

- دەنگو باسی وا بڵاوبووەوە گوایە مانویل هەواڵی لەشکرکێشی نوێی سەلیبی پێگەیشتووە، بۆیە ویستوویەتی بەرلەوەی ناوچەکە بەجێ بهێڵێ لەگەڵ مەسعود دا ڕێك بکەوێت. بۆ ماوەی دوو ساڵ[٥٩] ئارام بگرێ و ئەملاو ئەولا نەکات، یەکێ لە مێژوونووسان[٦٠]، ئەم هۆیە بەڕاست نازانێ، چونکی لەشکرکێشی سەلیبی لە ٢٦ی شەوالی ٥٤١ی کۆچی / ٣١ی ئاداری ١١٤٧ی زایینی لە (ڤیزیلای) بڕیاری لەسەر درا، ئەو ماوەیە بەدەستەوە نەبوو تا هەواڵەکە بە (مانویل) بگات. لە ڕاستیدا بیرۆکەی ناردنی لەشکرکێشی بۆ ڕۆژهەڵات لە (١١ی ڕەبیعی یەکەمی ٥٤٠ی کۆچی / ئەیلولی ١١٤٥ی زایینی) بڕیاری لەسەر درا، کۆبوونەوەی (ڤیزیلای) هەر بۆ پروپاگەندە بوو و بۆ ئامادەکردنی پێویستیەکان بوو، ماوەی نێوان ئەو دوو مێژووە، ئەوەندە دەبوو هەواڵی لەشکرکێشییەکەی سەلیبی بکاتە (مانویل)[٦١].

(مانویل) کە هەواڵی لەشکرکێشییەکەی بیست نەیتوانی لەشەڕەکەیدا بەردەوام بێ، بۆیە نەیدەتوانی شەڕی سەلیبیەکان بکات هەتا هەڵویستی خۆی بەرامبەر لەشکرکێشی سەلیبیەکان دیاری نەکات. ئەگەر سەلیبیەکان هەڵوێستی دوژمنانەیان لەبەرامبەری هەبوو، ئەوا ناتوانی لەگەڵ هەردوو لایاندا بجەنگێ. بۆیە لەگەڵ فەرماندەکانیدا پلانیان دانا، لەساڵی داهاتوودا شەڕی سەلجوقیەکان بکەن[٦٢].

دەبوایە (مانویل) تا زووە بۆ پایتەختەکەی بگەڕێتەوە. تا ڕوو بەڕووی هەڵوێستی (مامی) ببێتەوە، چونکی بە ئاواتەوە بوو ئیمپراتۆر لەشەڕی سەلجوقیەکاندا بکوژرێ، تا خۆی ببێتە ئیمپراتۆر، (ئیسحاق) لەگەڵ ئیمپراتۆردا بوو، پروپاگەندە

بڵاوبووەوە کەوا مانویل مردووە. ئیسحاق بە پەلە خۆی گەیاندە چادرەکەی ئیمپراتور بۆ ئەوەی دەسەڵات بەدەستەوە بگرێت، بەڵام سەری سوڕما کە (مانویل) لەناو چادرەکەدا بینی[٦٣].

– سەلجوقیەکان شارەکانی بیزەنتیان وێران کردبوو، مێژوو نووسی فەرەنسی، وەسفی ئەو وێرانکارییە دەکات بەسەر شاری (نیقومیدیە)دا هاتبوو لەلایەن سەلجوقیەکانەوە[٦٤].

– هەواڵەکان بە (مانویل) گەیشتبوون کەوا هێزێکی گەورەی تورك گەیشتووەو مەسعود توانیویەتی دەروازەکانی شار دابخات و هێزی بۆ پاراستنی داناوە. ترسا بکەوێتە نێوان هێزەکانی تورکەوە. سوپای تورك لەناو شارەکەو، سوپای تورك لەدەرەوەی شار. بەهەر حاڵ (مانویل) بە رێگای شاخاویدا کەبەرەو گۆلی (کرالیس) دەڕوا، گەڕایەوە وڵات دواجار رێگای (کرالیە)ی لەبەرگرت، لەکشانەوەیدا هۆزە تورکمانیەکان و هێزە نیزامیەکانی سەلجوقی لەناو چیاکاندا بۆسەیان بۆ دادەنان و هێرشیان دەکردە سەریان، زیانی زۆریان لێکەوت، بەتایبەتی بەشی ناوەندی سوپاکە کە بەفەرماندەی (کریتوبولیس) بوو. ئەو هێرشە سوپای بیزەنتی کردە دوو بەشەوەو تووشی شڵەژان و ترس بوون، بەتایبەتی بەشی دواوەوەیان بەنارێکی بلاوەیان لێکرد بەدوای پەناگەیەکدا دەگەڕان لە سەلجوقیانیان بپارێزێ[٦٥]. چەند جارێك (مانویل) هەوڵی کۆکردنەوەی سوپاکەیدا و سەر لەنوێ رێکیان بخاتەوە. بەڵام هێرشە یەك لەدوای یەکەکانی سەلجوقیەکان ماوەی ئەوەی پێ نەدەدان، زۆر بە زەحمەتی لەدەربەند و رێگا شاخاوییەکاندا توانیان دەرچن. دوای ئەوەی زیانێکی زۆریان لێکەوت، خۆیان گەیاندە کەناری گۆلی (کرالیس) دواجار بەرەو پایتەختەکەیان رێگایان لەبەرگرت[٦٦]. دوای کشانەوەی، مانویل نامەیەکی بۆ مەسعود نارد، داوای وتووێژی لێ کرد بۆ ئاشتبوونەوە، سوڵتانی سەلجوقی زوو بەدەنگیەوە نەچوو، چونکی هەواڵی لەشکرکێشیەکەی سەلیبیەکانی بیستبوو، ئاواتی دەخواست،بیزەنتیەکان و سەلیبیەکان شەڕ لەنێویاندا بەرپا ببێ، تاکو مەیدانی سیاسی بۆ سەلجوقیەکان چۆڵ ببێ، بۆیە دانی بەخۆی گرت و دەست بەجێ

وەلامی ئیمپراتۆری نەدایەوەن تا هەموو شتێکی بۆ روون بێتەوە. سالێك چاوەڕێی کرد، ئەوجا سالی ٥٤٢ی کۆچی / ١١٤٧ی زاینی، کە زانی مانویل نیازی ئەوەی هەیە هێرشێکی دیکە بکاتە سەر قونیە ئەوجا وەلامی ئیمپراتوری دایەوە. ئەوەی وایکرد مەسعود رازی بێ ئاشتبوونەوە قەبول بکات، لەوە ترسا بیزەنتییەکان و سەلیبیەکان ببنە هاوپەیمان، بۆیە ئەم ئاگربەستە ماوەی ئەوەی دەدا هێزەکانی رێك بخاتەوە[٦٧].

مەسعود، داوای لەمانویل کرد، قەلای،( براکانا )وەکەئەو داگیری کردووە بگەڕێنێتەوە.. ئیمپراتۆر ئەمەی قەبولکرد، بۆ ماوەیەك وتووێژەکەیان راگیرا، لەبەر رێنەکەوتنیان لەسەر هەندێ جیاوازی راو بیروبۆچوون: کە لەشکرکێشەیکەی سەلبیەکان گەیشت، دووبارە دەستیان بە وتووێژکردەوە. هەردوو ترسیان لەسەلیبیەکان بوو. لەسەر ئەوە رێکەوتنن مەسعود لەئاسیای بچووك بەرەنگاریان ببێتەوە[٦٨]. مێژوونووس (میخائیل سریانی) ئاماژە بۆ ئەوە دەکات: مانویل لەترسی سەلیبیەکاندا لەگەل سەلجوقیەکاندا ئاشت بووەوە، کەوا بۆ دوو سال لەنێوانیاندا هیچ روو نەدات. بەلام (ئودو ئوف) دەلێ ئەو ئاگربەستە بۆ ماوەی دوانزە سال بووە[٦٩]. بەم ئاشتبوونەوەیە، مەسعود ماوەی بۆ رەخسا، کێشانەی چارەسەر بکات، ئەو کێشنەی روو بەڕووی دەسەلاتەکەی ببونەوە. لەوانە هاتنی سەلیبیەکان بۆ جاری دووەم.

## پەیدابوونی ( عمادالدین زەنگی ) دامەزرێنەری دەولەتی زەنگی[٧٠]

ناڕێکی و نائارامی – ژیانی سیاسی ئیسلامەکانی رۆژهەلاتی گرتبووەوە پێش هاتنی سەلیبیەکان. ئەم ناڕێکی و ناارامیە هەموو دەولەت و ئیمارەتە ئیسلامیەکانی گرتبووەوە. لە رۆژهەلات، خەلافەتی عەبباسی کەوتە ژێر دەسەلاتی سەلجوقیە گەورەکان و دواتریش سەلجوقیەکانی عێراق، دواجار دەسەلاتیان بێ هێز بوو و دەولەتەکەیان لەبەریەك هەلوەشێنرا و ناکۆکی کەوتە نێوان میرەکانەوە، بۆ زەوتکردنی دەسەلات.

## مێژووی سەلجوقیەکان

دەوڵەتی فاتیمی لەمیسر بە قۆناغەکانی پیریدا دەڕۆیی میرەکانی دوژمنایەتی خەلیفەکان و پیاوانی دەرباریان دەکرد. هێزی سەلجوقی و فاتیمی لەسەر دەست بەسەرا گرتنی ولآتی شام و دەسەلآت بەدەستگرتن کەوتنە ناکۆکی، هیچ کامیشیان نەیانتوانی بەشێوەیەکی هەمیشەیی و کاریگەر دەستی بەسەرا بگرن، ئەم بارە ئاڵۆزە کەشو هەوایەکی لەباری خوڵقاند بۆ میرە ناوخۆییەکان لە هەرێمی جزیرەو فورات و ولآتی شام، هەر یەکەو چی لەژێر دەستدا بوو دەستی بەسەرا گرت و کێشەو باری تایبەتی خۆی چارەسەر دەکرد، دەچووە پاڵ هەر لایەك بەرژەوەندی تیادا بوایە هەوڵی فراوانکردنی موڵکەکانیان بوون، دەستیان بۆ خاکی میرەکانی هاوسێیان دەبرد، چونکی پەیوەندی سیاسی لەنێوان ئەو قەبارانەدا لاواز بوو، دەسەلآت بەسەر چەند میرێکی تەماحکاردا دابەش بوو، ئیمارەتەکانیان لە موسڵ و ئەنتاکیەو رەها و حەڵەب و دیمەشق و بیت المقدس، بڵآوببوونەوە. هەر یەك لەو یەکە سیاسیە-کۆمەلآیەتیە، قەبارەی تایبەتی خۆی هەبوو، تا رادەیەکیش خۆیایەتیەکی تایبەت. لەم بارودۆخەدا، سەلیبیەکان گەیشتنە رۆژهەلآت، شەڕی سەلیبی لە جزیرەو ولآتی شام هەڵگیرسا، توانیان لەناو جەرگەی جیهانی ئیسلامیدا چەند ئیمارەتێك دامەزرێنن، لاواز بوونی سەلجوقیەکانیان و بێ دەسەلآتی خەلافەتی عەباسی و دەوڵەتی فاتیمی و پارچە پارچە بوونی ئیمارەتە ئیسلامیەکانیان بە هەل زانی و توانیان خۆیان بچەسپێنن، میرە موسڵمانەکان، لەپێشدا تووشی سەرسوڕمان هاتبوون، دەرکیان بەگەورەیی ئەو کارەساتە نەکرد، میللەت و خەڵکەکە لە جزیرەو ولآتی شام و ولآتانی دیکەی ئیسلامی بەدوای سەرکردایەتی بەهێزدا دەگەڕان تا ریزەکانیان یەك بخات و بەرەو جیهادیان ببات بۆ لابردنی مەترسی سەلیبیەکان.

بارودۆخێکی وا هاتە ئاراوە، سەرکردایەتیەکی وا لە ئیمارەتی موسڵەوە دەرکەوت، شوێنی جوگراف لەباری هەبوو، چونکی نزیك ئیمارەتی (رەها)ی سەلیبیەکان بوو، (عیمادالدین) زەنگی کوڕی قسیم الدولە ئاق سنقر) بوو، کە دەگەڕێتەوە بۆ هۆزی (ساب یو)ی تورکمانی. فەرماندەیەکی لێهاتوو بوو، دەرکی بە بارودۆخی جیهانی ئیسلامی کرد لە رۆژهەلآتدا کە لەچی ئاستێکی نزمدایەو چۆن تووشی پارچە

پارچە بوون بۆتەوە. ئەم ئەرکەی خستە سەر شانی خۆی و ساڵی ٥٢١ی کۆچی / ١١٢٧ی زاینی دەوڵەتێکی لە موسڵ دامەزراند، لە بارودۆخێکدا کە گەلێ ئیماراتی ناوخۆیی لە جزیرەو وڵاتی شام سەریانهەڵدابوو، ئالای جیهادی دژی سەلیبیەکان بەرز کردەوە، بەڵام روو بەرووی دووبەرەکی و پارچە پارچە بوونی سیاسی لەناوچەکەدا بووەوە. دەستی بە کۆکردنەوەی هێزە ئیسلامیەکان کرد و خۆی ئامادەکرد بەر لەوەی هیچ هەنگاوێك هەڵبهێنێ بۆ بەرەنگاربوونەوەی سەلیبیەکان، دوای ئەوەی توانی ئەو هێزانە بۆلای خۆی بێنێ، توانی وڵاتی شام بداتە دەم ئیمارەتی موسڵەوە[٧١]. ئەنجا خۆی ئامادەکرد بۆ روو بەروو بوونەوە لەگەڵ سەلیبیەکاندا.

گرنگی عمادالدین زەنگی لەلایەن موسڵمانان زیادی کرد، دوای ئەوەی کەوتە شەڕی بیزەنتی و سەلیبیەکانەوە، کە بووە هۆی ئەوەی ئیمپراتۆری بیزەنتی (یوحنا کومنین) دەست لە داگیرکردنی وڵاتی شام هەڵگرێ و ساڵی ٥٣٢ی کۆچی / ١١٣٨ی زاینی بگەڕێتەوە، بێ ئەوەی ئامانجەکانی بەدی بهێنێ ئەویش داگیرکردنی ئەنتاکیە و قیلیقیە بوو، دەیویست وڵاتی شام داگیر بکاو چەند ئیمارەتێکی سەر بە ئیمپراتۆریەت لە سنوورەکان دامەزرێنێ تا لە رووی هێرشەکانی موسڵمانەکان و سەلیبیەکان بوەستن و دەستیش بەسەر ئەنتاکیەدا بگرێت[٧٢].

## گرتنی رەها بارودۆخی ناوخۆی رەها

بارودۆخی ناخۆی ڕەهابۆ عمادالدین زەنکی لەبار بوو. میرێکی بێ دەسەڵات و لاوازی هەبوو، کەوتبووە دووی ئارەزووەکانی و توانای سیاسی نەبوو، لە راستیدا، مەیلی ئەرمەنیەکانی هەبوو، چونکی دایکی ئەرمەنی بوو، بۆیە بەلای ئەرمەنیەکان و تایفەی نەسرانیە رۆژهەڵاتیەکاندا دەڕۆیی و لە نەسرانیە رۆژئاواییەکان زیاتر بەتەنگیانەوە دەهات، ئەم حاڵەتە سوارەکانی سەلیبی ناڕەحەت کردبوو، جۆرە نائارامیەك لە ناو ئیمارەتەکەدا پەیدابوو بوو. فەرمانڕەواکەی رەها، لەو جۆرە کەسانە بوو تەنها بەرژەوەندی خۆی مەبەست بوو، تا ئەو کاتەی عمادالدین

هێرشی کردە سەر ئیمارەتەکە، شارەکەی بەجێ هێشت و چوو لەسەر گردێك خۆی شاردەوە کە دەیڕوانیە رووباری فوڕات.
ئەوەی شایانی وتنە، ئەم ئیمارەتە جێگای مەترسی بوو لەسەر رێگای هات و چۆی ئیسلامەکان لەنێوان حەلەب و موسڵ و بەغدا و سەلجوقیەکانی رومدا لەئاسیای بچووك. هەروەها ئاستەنگێك بوو لەبەردەم سەرهەڵدانی یەکێتی ئیسلامی لە ولاتی شام و جزیرەدا، بەهۆی ئەوەی لەبەرژەوەندی دوژمنانی عمادالدین دەستی خستە کاروباری ناوچەکەوە[٧٣]. بۆیە گرتنی پێویستیەکی سیاسی و سەربازی و ئابووری بوو.

## گرتنی شارەکە

(عمادالدین) کەوتە چاودێریکردنی ناکۆکیەکانی نێوان میرەکانی سەلیبی، هەڵوێستی لایەنەکان لەناوچەکەدا بواری کۆکردنەوەی هێزەکانی دا و بەرەو رووی ئەو ئیمارەتەی کردەوە، بەتایبەتی بەمردنی ئیمپراتۆری بیزەنتی (یوحنا کومنین) دوژمنێکی سەرسەختی لەکۆڵ بووەوە، چونکی دەسەلاتدارانی دیمەشق بێ یارمەتی سەلیبیەکان[٧٤] نەیاندەتوانی لەدژی بوەستن. مەملەکەتی (بیت المقدس)یش سەر کێشیەکی ئەنجام نادیاریان ئەدەدا. بەلام (ریموند بواتییە)ی میری ئەنتاکیە و (جوسلینی دووەم) میری رەها. ناکۆکیەکانی نێوانیان هەر دوو لایانی ماندوو کردبوو، بەهۆی کێشەی قیلیقیەو بلاوبوونەوە لە ولاتی شامدا.
(عمادالدین زەنگی) هاوپەیمانی (جوسلینی دووەم) و (قەرا ئەرسەلان ئەرتەقی) خاوەنی قەلای (کیفا)[٧٥]. کردە بیانوو هێرش ببات، چونکی زانی لە دژە ئەو ئەو کارەیان کردووە، سەرەڕای ئەوەش هەڕەشە بوو بۆ ئەو[٧٦]، بە سیاسەتی ماندوو کردن دوژمن دەستی بە هێرشە یەك لەدوای یەکەکانی کرد. بەرەبەرە شەڕ بووە شەڕی قەلاکان. لەساڵی ٥٣٨ی کۆچی / ١١٤٣ی زاینی پشتی بە دەسەلاتی بەهێزی خۆی بەست لە دیاربەکر، چەند قەلایەکی سەلیبی گرت کە سەر بە ئیمارەتی رەها بوون، کەوتبوونە ناوچە نزیکەکانی ماردین، وەکو (جملین) و

(مـوزەر)[٧٧] و (تـل مـوزن) و چـەندین قـەڵای دیکـە لـە هـەرێمی (شـبەختان) کـە هەرێمێکە لە دیاربەکر[٧٨]. ئامانجی ئەوە بوو پەیوەندی نێوان (جوسلین) و (قـەرا ئەرسەلان) ببڕێ، تا رێگە لەبەردەمیدا خۆش بێ و گورزێ لـە (رەهـا) بـدات و ئـەو خەونـە بێنێتـە دی کـە بـە درێـژایی سـاڵانی ململانێـی لەگـەڵ سـەلیبیەکاندا بـە ئاواتەوەی بوو.

هەروەها هـەوڵی دا (جوسـلینی دووەمـی) لەشـارەکە دەرکـات، دەیزانـی، تـا لـەناو شارەکەدا بن بـۆی نـاگیرێ، رووی کـردە ئامـەد، وای پیـشاندا دەیـەوێ ئابلۆقـەی بدات و چاویشی لەجمو جوولەکانی میری رەها بوو.

(جوسلینی دووەم) لەگەڵ هێزەکەیدا لەشـارەکە دەرچـوو بـەرەو رووبـاری فـوڕات رۆیـشت بـۆ یارمـەتی (قـەرا ئەرسـەلان)، رێگـای پەیوەنـدی لـەنێوان عمادالـدین و حەڵـەب بـڕی. (عمادالـدین) سـاڵی ٥٣٩ی کۆچـی /١١٤٤ی زایـنی، خـۆی گەیانـدە (رەها) و ئابلۆقەی شارەکەی دا[٧٩]. (جوسلین) بە هانای شـارەکەوە نـەهات، لـەو بڕوایەدا بوو هێزەکەی ناتوانێ شەڕی سوپای زەنکـی بکـات، لـەو بڕوایەشـدا بـوو، سـەختی قـەڵاکان و شـارەکە بـۆ ماوەیـەکی زۆر دەتـوانن بەرگـەی ئابلۆقەدانەکـە بگرێ، دەتوانـێ رێگـای حەڵـەب بگـرێ تـا یارمـەتی نەگاتـە زەنگـی[٨٠]. بەتـەمای گەیـشتنی یارمـەتی بـوو لـە سـەلیبیەکانەوە لـە وڵاتـی شـامەوە، بـە تایبـەتی لـە (ئەنتاکیـە و بیـت المقـدس)ەوە[٨١]، بـەڵام فـەرمانڕەوای ئەنتاکیـە، نەیدەویـست یارمەتی بدات و داوای لێبوردنی لـێ کرد لەجێ بەجێ نـەکردنی داواکـەی، چـونکی نێوان ئەو دوو میرە ناڕێك بوو، لەوەش دەترسا، عمادالدین، لە دوای رەها، هێـرش بۆ ئەو بهێنێ. (جوسلینی دووەم)یش بێ یارمەتیدانی سەرکێشی نـەدەکرد هێـرش بباتـە سـەر عمادالـدین. لـە (تـل باشـر) مایـەوە، چـاوەڕێی یارمـەتی لـە (بیـت المقـدس)[٨٢] دەکـرد شـاژنی (بیـت المقـدس) –میلیـسند– هـەر کـە نامەکـەی پێگەیشت، داوای کۆبوونەوەی ئەنجومەنی کرد، رێگەیان پێدا، هێزێك ئامادە بکـاو بینێرێ. بەڵام هێزەکە کاتێ گەیشت هەموو شتێك کۆتایی پێ هاتبوو[٨٣].

(عمادالدین) ئابلۆقەی سەر شارەکەی توندتر کردەوە. هەموو دەروازەکـانی گـرت، نەیدەهێشت کەس بچێتە ژوورەوەو کەسیش دەرچێ، بۆیـە زەخـیرەو ئازووقـەیان

کەم بووەوە[٨٤] لە (٢٦ی جمادی الاخرە / ٢٣ی کانونی یەکەم) لایەك لە شوورەکە روخا، کە بەدرێژایی چوار هەفتە خەریکی روخاندنی بوون، موسڵمانەکان وەکو سێل چوونە ژوورەوە، دانیشتوانەکەی هەڵاتن و دەچوونە ناو قەڵاکانەوە، سوپاکەی زەنگی کەوتنە گیانیان، دوای دوو رۆژ قەڵاکەش خۆی بەدەستەوە دا، (قەس یەعقوبی برساما) شارەکەی تەسلیمی زەنگی کرد[٨٥].

## ئەنجامەکانی گرتنی رەها

گرتنی رەها دەسکەوتێکی گرنگی عمادالدین بوو، ئەم سەرکەوتنە ئەنجامی گرنگی بۆ جیهانی ئیسلامی بەدەستەوەدا، لەسەر ئاستی جیهانی ئیسلامی دەتوانین ئەم ئەنجامانەی خوارەوەیان لێ دەستنیشان بکەین:

- سەرکەوتنی موسڵمانەکان بە فەرماندەی عمادالدین هێزی موسڵمانانی یەکخست و بەهێزی کرد. ئومێدیان پەیدا کرد دوای ئەوەی یەکەم ئیمارەتی سەلیبی لەناو وڵاتەکەیاندا دامەزرا بوو.
- گرتنی (رەها) سەرکەوتنێك بوو بۆ موسڵمانەکان (موسڵمانان دەسکەوتی وایان دەستنەکەوتبوو، لەهەموو لایەك دەنگی دایەوە، لەهەموو شوێنێ هەواڵەکە بڵاو بووەوە، لە کۆڕ و دانیشتنەکاندا لەهەموو لایەك باس دەکرا، ئەوە (فتح الفتوح) بوو، هەر لە سەرکەوتنی شەڕی بەدر دەچوو)
- ئەم سەرکەوتنە ئەوەی سەلماند، موسڵمانەکان دەتوانن روو بەرووی سەلیبیەکان رابوەستن و کام شوێن سەختە لەدەستیان وەرگرنەوە، رێگاشی بۆ ئەوانەی دوای عمادالدین خۆش کرد، کارەکانی تەواو بکەن و شوێنەکانی دیکەی سەلیبی بگرنەوە.
- گرتنی رها، سەنگی هێزەکانی لەناوچەی رۆژهەڵاتی ئیسلامیدا گۆڕی. هانی موسڵمانانی دا خاکە داگیرکراوەکانیان وەرگرنەوە دوای ئەوەی هەستیان بە لاوازی قەوارەی سەلیبیەکان کرد.

### لەسەر ئاستی نەسرانیەکانیش، ئەوا تێبینی ئەم ئەنجامانە دەکرێ:

- گرتنی (رەها) گورزێکی کوشندە دەبوو بۆ سەلیبیەکان، لەهەموو شوێنێ باس دەکرا، شارەکە پەیوەندی بە کەلەپوور و پاشماوەی نەسرانیەوە هەبوو،

دوای پەنجا ساڵ کە لەژێر دەسەڵاتی (بلدوین دی برایۆن)دا بوو، گرتنی نیشانەی شوومی و نەگبەتیان بوو.

- کە هەواڵی گرتنی رەها گەیشتە (بیت المقدس) شاژن (میلیسند) نوێنەرێکی بۆ ئەنتاکیە نارد، داوای راوێژ و پرسی لێدەکرد سەبارەت بە ناردنی یەکێك لەلایەن باڵیۆزخانەوە تا ئەم هەواڵە بە پاپا بگەیەنێت لە رۆما و داوای لێ بکات لەشکرکێشییەکی نوێ بنێرێ.
- گرتنی (رەها) وای لە ئیمپراتۆر نەکرد، کارێکی سەربازی دژی موسڵمانەکان لە وڵاتی شام ئەنجام بدات.

## لەشکرکێشی دووەمی سەلیبیەکان

لەشکرکێشی دووەمی سەلیبیەکان بۆ یارمەتیدانی سەلیبیەکان لە وڵاتی شام، هۆی سەرەکی گرتنی (رەها) بوو. (پاپا بوجینی سێیەم) ئەو دەمە پەیوەندی بەتینی لەگەڵ دوو میری بەهێز هەبوو لە رۆژئاوای ئەوروپادا، ئەویش (کونراو هو هنشتاوفن) ئیمپراتۆری ئەڵمانیاو (لویسی حەوتەم) شای فەرەنسا کە بە دینداری ناسراو بوو. پاپا، بریاریدا، داوا لە شا لویسی حەوتەم بکات یارمەتی بۆ رۆژهەڵات بنێرێ، لویسی حەوتەم، شای ئەو وڵاتە بوو کە سەرچاوەی زۆربەی میر و فەرماندەکانی سەلیبی بوو کە بەرەو رۆژهەڵات چوو بوون. زۆر ئاسایی بوو، فەرماندەیی لەشکرکێشییەکە بکات.

پاپا، نامەیەکی بۆ لویسی حەوتەم نارد لە (١٣ی جمادی الاخر ساڵی ٥٤٠ی کۆچی / یەکی کانونی یەکەمی ساڵی ١١٤٥ی زاینی)دا بۆ هەموو میرەکان و دیندارەکانی مەملەکەتی فەرەنسا داوایان لێ دەکات فریای سەلیبیەکان لە رۆژهەڵات بکەون، بەڵێنی پێدان لەم دنیا ماڵ و موڵکیان پارێزراوە، لەو دنیاش گوناحیان نامێنێ، لەنامەکەشیدا باسی گرتنی (رەها) دەکات و بووەتە هۆی چ کارەساتێك بۆ قەوارەی سەلیبیەکان لە رۆژهەڵاتدا.

لویسی حەوتەم، کە نامەکەی پاپای وەرگرت، بریاریدا خاچ هەڵگرێ و بەرەو خاکە پیرۆزەکان بروات، بەڵام لەپێشدا ئەم ئارەزووە بەساردێکەوە پێشوازی لێ کرا بەتایبەتی لەلایەن دەرەبەگەکان و ئەو تاخمەی لەدەریا دا بوون. نوبەلا

## مێژووی سەلجوقیەکان

عەلمانیەکان ئەم بڕیارەیان بەهەند وەرنەگرت، هەروەها پیاوێکی سیاسی گرنگ (سوجر) سەرۆکی دێری (سانت دنیس) لە ڕووی بڕیارەکە وەستا، تەنها (ئەسقوف لانجر) لایەنگری شا بوو، بەڵام ئارەزووی شا و پشتگیری پاپا، بووە هۆی بەستنی یەکەم کۆبوونەوە لەگەڵ نوبەلاکانیدا لە (فیزیلای)، بۆ جاڕدانی لەشکرکێشییەکەو پڕوپاگەندە کردن بۆ ڕۆیشتن. لەهەمانکاتدا نامەیەکی بۆ پاپا نووسی، ئارەزووی خۆی دەردەخا بۆ ئەوەی فەرماندەیی لەشکرکێشییەکە بەدەستەوە بگرێت، هەندێ لە پیاوانی ئاینیش کاری پڕوپاگەندەکردنیان خستە سەرشان، لەوانە (برنارد) سەرۆکی دێری کلیرفو کە (کونرادی سێیەم) ڕازی کرد بۆ خاکی پیرۆز بڕوات[٩٠].

دەستکرا بە خۆ ئامادەکردن لویسی حەوتەم، دوو نامەی نارد، یەکێکیان بۆ (ڕوجری دووەم) شای سقلیە و ئەویتریان بۆ ئیمپراتۆر (مانویل کومینن) تا بزانێ تا چەند ئامادەن یارمەتی لەشکرکێشییەکە بدەن. (ڕوجری دووەم) گەرمی ئارەزووی بەشداربوونی خۆی دەرخست و گواستنەوەی سەلیبیەکانی لە ڕێگای دەریاوە خستە سەر ئەستۆی خۆی.

بەڵێنی دا خۆشی بەشدار بێ و کوڕەکەشی لەگەڵ هێزەکەدا بنێرێ، لەهەمان کاتدا هەڕەشەی لە بیزەنتیەکان دەکرد، باسی لە خیانەت کردنی گەورەکانی بیزەنتیەکان دەکرد، هەر لەسەردەمی (ئەلکسیوس کومینن)ەوە[٩١]. ئیمبراتور مانویل وەڵامی (لویسی حەوتەمی) دایەوە، ئاماژەی بۆ ئەوە کرد کەوا ئاگربەستی لەگەڵ سەلجوقیەکاندا بەستووەو ناتوانێ بەلەشکر بەشداری بکات، بەڵام ئامادەیی خۆی دەرخست کەوا پێشوازیان لێبکات[٩٢].

بەمجۆرە لەشکرکێشی دووەم کە لەساڵی ٥٤٢ی کۆچی / ١١٤٧ی زاینی دا بۆ ڕۆژهەلا؟ت هات، شێوازێکی جیاوازی هەبوو لەگەڵ ئەو لەشکرکێشییەی ساڵی ٤٩٠ی کۆچی / ١٠٩٦ی زاینی بۆ ڕۆژهەلات هاتبوون. ئەمەی دوایی شێوەی کۆچکردنی گرتبوو، لە کۆمەڵی جیاجیا پێکهاتبوو، لە نەسرانیەکانی ڕۆژئاوا پێك هاتبوو کەسەر بە ڕەگەز و دەوڵەتی جیاجیا بوون، لەشکرکێشی دووەم، لە دوو سوپای گەورە پێکهاتبوو، کە سەر بە دوو دەوڵەتی ڕۆژئاوای گەورە بوون و دوو

کەسایەتی گەورەی جیهانی کاسۆلیك فەرماندەیی دەکرد، ئەویش (کونرادی سێیەم) ئیمبراتوری ئەلمانیاو (لویسی حەوتەم) شای فەرەنسا بوون[٩٣].
یەکەمیان لەپێشەوە رۆیشت بەحەفتا هەزار سوارەوە سەرەڕای پیادەو ژن و منداڵ[٩٤].
کە سەلیبیەکان گەیشتنە سنووری دەوڵەتی بیزەنتی، هەمان دیمەنەکانی کاتی لەشکرکێشی یەکەم دووبارە بوونەوە. سەربازی سەلیبیەکان بەهەر شارێکدا تێدەپەڕین ئازاری دانیشتوانەکەیان دەدا، تا گەیشتنە قوستەنتینە، ئەمە کێشەی لەگەڵ بیزەنتیەکاندا پەیدا کرد، بەڵام کە نێوان کونرادی سێیەم و مانویل باش بووەوە، رێگا بەکونراد درا بەرەو ئاسیای بچووك بپەڕێتەوە.

## سەلجوقیەکان سوپاکەی ئەڵمانیەکان لەناو دەبەن

کونراد و ئەوانەی لەگەڵیدا بوون، لە بسفور پەڕینەوە بەرەو ئاسیای بچووك کەوتنەڕێ، رووەو رۆژهەڵاتی رۆیشتن تا گەیشتنە (خلقدونیە). داوای لەمانویل کرد، رابەریان لەگەڵدا بنێرێ تا لە ئەنادۆڵ تێدەپەڕن (ستیفن)ی بۆ نارد کە فەرماندەی پاسەوانی (ورنك) بوو، مانویل تەمێی کرد ئەو رێگایە نەگرێ کە بە ناوەڕاستی ئەنادۆڵدا تێدەپەڕێ، تاکو تووشی سەلجوقیەکان نەبن، رێگای کەناری رۆژئاوا بگرن دواجار رێگای باشوور لەبەر بگرن تا دەگەنە ئەنتالیە، کە هەموو ئەو خاکانە لەژێر دەسەڵاتی بیزەنتیەکاندایە. هەروەها پێشنیازی ئەوەی کرد ئەو کەسانەو حاجیانەی نایانەوێ بەشداری لەشەڕکردن بکەن بیانگەڕێننەوە، تاکو دەبنە بارگرانی و کۆسپ لەرێگای بەرەو پێشەوەچوونی سوپادا[٩٥].
مانویل، کە بەوە ناسرابوو، سیاسەتێکی دوو فاقانەی بەرامبەر سەلیبیەکان بەکار دەبرد، نامەیەکی بۆ مەسعود نارد. هانی دەدا، رێگە لە سەلیبیەکان بگرێت، بەپێی ئەو رێکەوتنەی ئەم دواییەی نێوانیان، بۆ پشتگیری ئەمە، رابەرە بیزەنتیەکان هەڵاتن لەئاسیای بچووك، خیانەتیان دەکرد، لەرێگا خواردنەکانیان لێ تێکدەدا، ئاردیان تێکەڵ گەچ دەکرد[٩٦].

کونراد، ئامۆژگارییەکانی ئیمپراتۆری لەگوێ نەگرت، هەموو هێزەکانی، جەنگاوەرەکان و ئەوانەی شەڕکەر نەبوون لەگەڵ خۆیدا هەڵگرت. ئەو ڕێگایەی نەگرت ئیمبراتور بۆی دانابوو، ڕێگایەکی کورتی گرتەبەر تا بگاتە وڵاتی شام، ڕێگاکە سێ هەفتە ڕێ بوو. پایتەختی سەلجوقیەکان کەوتبووە سەر ئەو ڕێگایە، کە دوانزە ڕۆژە ڕێ لە (خەلقدونیە)ەوە دوور بوو، نەیزانی بەم هەڵسو کەوتەی بووە هۆی سەرنەکەوتنی لەشکرکێشییەکەی[97].

کونراد، بەردەوام بوو لە ڕۆیشتن تاگەیشتە شاری (نیقیە) لەوێ بیری لەو کارانە کردەوە کە ئیمبراتور بۆی دانابوو، بڕیاریدان سوپاکەی بکاتە دوو بەشەوە، بەشێکی لەوانە پێکهاتبوو کە بەشداری شەڕکردن ناکەن، ئەمانە بە ڕێگای قەراغ دەریاکە بگرن تا ئەنتالیە، کە بەسەر فیلادلفیا و لازیق دا تێدەپەڕێ. ئەو بەشەکەی دی، جەنگاوەرەکان بوون، کە ئەو ڕێگایە بگرن بەناو ئاسیای بچووکدا تێدەپەڕێ[98].

کونراد، لە (نیقیە)ەوە بەرەو قونیە ڕۆیشت، زەخیرەو ئازووقەی هەشت ڕۆژی بۆ سوپاکە دابین کرد، لەسەر پێشنیاری رابەرە بیزەنتیەکان، کە بەڵێنیان پێدا لەماوەی چەند ڕۆژێکدا دەگەنە شاری (قونیە) و خۆی لەناو بەپیتترین وڵاتدا دەبیبنێتەوەو هەموو پێویستیەکانی تیادا دەست دەکەوێت[99] سەفەرێکی زەحمەت بوو، ڕێگاکەشی سەخت و شاخاوی بوو[100]، زۆری نەبرد ناکۆکی کەوتە نێوان کونرادی سێیەم و رابەرەکانەوە، ئەوانیش سوپاکەیان بەجێهێڵا[101]، (ولیم الصوری) دەڵێ: رابەرەکان بەو ڕێگایەدا بیزەنتیەکانیان برد کە بەدەست سەلجوقیەکانەوە بوو، کە سوپاکە ئەو زەحمەتەیان بینی، کونراد، رابەرەکانی بانگ کرد و پرسی، کەی دەگەینە قونیە، رابەرەکان، وتیان سێ ڕۆژە ڕێ دوورە، بەڵام هەر ئەو شەوە رابەرەکان هەڵاتن، ئەمەیان لەسەر داوای ئیمپراتۆر بوو، یان تورکمانەکان پارەیان پێ دابوون، بەمجۆرە سوپاکەیان بە ڕێگایەکی هەڵەدا بردبوو و بۆ ئەو شوێنانەیان بردبوون، سەلجوقیەکان بتوانن هێرشیان بەرنە سەر، کونراد بەبێ ئەو رابەرانە نەیدەزانی بۆ کوێ بڕوات، هەندێ لە فەرماندەکانی داوای گەڕانەوەیان کرد، هەندێکی کەیان دەیانگوت بەرەو پێشەوە بڕۆین، زەخیرەو

ئازووقەیان کەم بووەوە، سەلجوقیەکان هێرشیان کرد ئەمەیان بە خیانەتکردنی بیزەنتیەکان زانی[١٠٢]، وا دەردەکەوێت، کونراد ئەم رێگایەی هەڵبژارد بوو، رابەرەکان دەستیان لەهەڵبژاردنی رێگاکەدا نەبوو، بەبەڵگەی ئەو نامەیەی بۆ (ویبالد)ی ئەسقوف (کورڤێ) نارد بوو تیایدا دەڵێ: خۆی ئەم رێگایەی هەڵبژارد تا بگاتە وڵاتی شام، زەخیرەو ئارزووقەشی لەگەڵ خۆیدا هەڵگرتبوون هیچ باسی رابەرەکان ناکات، باسی خیانەتکردنیان ناکات، هەڵاتنیان و پەیوەندی نەبووە بە هاتنی سەلجوقیەکانەوە[١٠٣]، وا دیارە، ئازووقەی سەلیبیە بیزەنتیەکان لەشاری (فیلومیلیوم) نەما بوو، ئەو شوێنەی کە سەلجوقیەکان هێرشیان کردبووە سەریان، کاتێ خۆیان لە وڵاتێکدا بینییەوە تا شارەزان و خەریکە لە برسا، رابەرەکانیان بە خیانەتکار لەقەڵەم دا، ئەوانیش لەترسانا هەڵاتوون و دواجار کەوتنە دەستی سەلجوقیەکان[١٠٤].

مەسعود لە بارودۆخی سوپای ئەڵمانی ئاگادار بوو، بەپێی پلانێکی ژیرانە کشایەوە تا گەیشتنە (فریجیا). ئەوجار، هێزەکەی لەسەر چیاکان دانا، کە سوپای ئەڵمان گەیشتە رووباری (باتیس) لە نزیکی (دوریلیوم) سوپای سەلجوقی لەپڕ هێرشیان کرد، ئەوان ماندوو بێ زەخیرەو ئاو بوون، شڵەژانن ویستیان خۆیان بدەنە پاڵ چیاکان، بەڵام سەلجوقیەکان دەورەیان دان و بەتیر کەوتنە ناویان. کونراد، بڕیاری کشانەوەیدا، بەڵام سەلجوقیەکان وازیان لێ نەهێنان، هێرشیان کردە ناوەڕاست و سەرەتاو دواوەو سووپاکەیان، ریزەکانیان شڵەژاو تێکچوو، ژمارەیەکی زۆریان لی کوژراو بەدیل گیران، شەڕەکە، کوشتارێکی ترسێنەر بوو، نۆیەکی سوپاکەیان لەناوچوو، کونراد خۆی لە دوو شوێنەوە زامدار بوو، زامێکی لەسەری بوو[١٠٥]،

کونراد، بەبێ هودە ویستی سوپاکەی کۆ بکاتەوە، بەڵام ئێوارەکەی لەگەڵ چەند کەسێکی هەڵاتن و گەڕانەوە بۆ (نیقیە)، سەلجوقیەکانیش دەسکەوتێکی زۆریان دەسکەوت[١٠٦].

## سەلجوقیەکان ڕێگا لە سوپای فەرەنسی دەگرن

سوپای فەرەنسی، بە فەرماندەی (لویسی حەوتەم) نزیکەی مانگێ دوای سوپای ئەلمانی کەوتنەڕێ. ئەم هێزە، هەر بەقەدەر سوپاکەی ئەلمان بوون، بەلام ڕێکتر بوو، (لویسی حەوتەم) و ژنەکەی (ئیلیانور) لەگەڵ سوپاکەدا بوون[١٠٧].

لەو کاتەی شەڕی بەردەوامبوو لەنێوان سەلجوقیەکان و ئەلمانەکاندا هێزەکانی فەرەنسی لە بوسفور بەرەو ئاسیای بچووك پەڕینەوە، گەیشتنە (نیقیە) شای فەرەنسی هەواڵی شکستهێنانی ئەلمانیەکانی بیست، پەلەی کرد پێیدا بگا و یارمەتی بدات[١٠٨]، هەردوو کیان کۆبوونەوە، بڕیارياندا ڕێگای کەناری دەریا بگرن لەسەڵتەنەتی سەلجوقی بەدوور بن، تا گەیشتە (ئەنتالیە) بەلام سوپاکەیان زۆر ماندوو بوو، بەرە بەرەش لێیان کەم دەبووەوە بەهۆی کەمی ئازووقەو هێرەشکانی سەلجوقیەکانەوە. ئەوانەی پارەیان هەبوو لە ڕێگای دەریاوە گەیشتنە ولاتی شام[١٠٩].

هەردوو شاکە گەیشتنە شاری (ئەمنوس)، تەندروستی کونراد بەرەو خراپی دەڕۆیشت، ناچار گەڕایەوە قوستەنتینیە، شا لویس بەردەوام بوو[١١٠]، (مانویل) ئاگاداری کردەوە، کەوا مەسعود دەیەوێ هێرش بەرێ، ئامۆژگاری کرد لەگەڵیا ڕوو بەڕوو نەبێتەوەو لە قەلاکانی بیزەنتیەکان دوور نەکەوێتەوە. ئەوەی شایانی باسە، هەردوو شای ئەلمانی و فەرەنسی، ڕێگای (میسیا) و (لیبیا) یان گرت بۆ گەیشتن بە (بروسە) لەوێوە بەرەو ئەزمیر و ئەفسس[١١١].

سەرەڕای هەموو شتێك، مەسعود لەشاری (دیکیرفیوم) لە نزیکی ئەنتاکیە، لەدۆڵی (میاندەر)ەوە هێرشی کردە سەر هێزەکانی فەرەنسی. لەسەر ڕووبارەکە شەڕێکی قورس دەستی پێکرد، سەلیبیەکان توانیان لە پردەکەی سەر ڕووبارەکە بپەڕنەوە. ئەوجار مەسعود گەڕایەوە ناو شارەکەو سەلیبیەکانیش بەردەوام بوون لەبەرەو پێشەوەچوون، مەسعود سەرکێشی نەکرد و لە دەشتاییەکەدا نەکەوتە شەڕ لەگەڵیاندا، بەلام هۆزە تورکمانیە کۆچەرییەکان، بەشەڕە تیر شپرزەیان کردبوون، سوپای سەلیبی تاریکی داهات خۆیان لەو ناوە دوور خستەوەو، تورکمانەکانیش کشانەوە[١١٢].

## مەسعود و لەناوچوونی ئیمارەتی (رەها)ی سەلیبی

مەسعود، دوای ئەوەی پەیمانی ئاشتبوونەوەی لەگەڵ بیزەنتییەکاندا مۆرکرد، رووی کردە رۆژهەڵات بۆ فراوانکردنەوەی دەسەڵاتەکەی و بەرەو (قیلیقیە) و دۆڵی فورات کەوتەڕێ. تا دەرگای بەسەر وڵاتی شام دا بۆ بکرێتەوەو بەشێکی لە خاکی سەلیبی بەرکەوێت دوای پارچە پارچە بوونی ئیمارەتی رەها و رۆژئاوای فورات.

ئەو کارەساتەی بەسەر سەلیبیەکاندا هات لە رەها، بەهەل زانی ویستی لە دۆڵی فورات هەندێ جێگای بهێنێتە ژێر دەسەڵاتی خۆیەوە. بەڵام لەساڵی ٥٤٢ی کۆچی / ١١٤٧ی زایینی، ناوچەکەی بەجێهێشت و گەڕایەوە وڵاتەکەی بۆ بەرەنگاربوونەوەی سەلیبیەکان کە ئاسیای بچووکیان تێپەڕاندبوو، بەشێ لەسوپاکەی لە رۆژهەڵات هێشتبووەوە، لەژێر فەرمانەدەی کوڕەکەیدا (قلیج ئەرسەلان). بۆ جێ بەجێ کردنی ئەو سیاسەتەی بۆی دیاریکردبوو[١١٣].

وا دەردەکەوێ، لەسەر دەستی (کونت بلدوین) فەرمانڕەوای (مرعش) هەموو شتێك ئارام بووەوە، بەتایبەتی لە (کیسوم) و (بهسنا)[١١٤] و سنووری مەلتیە و ئەنتاکیەش ئاسایش بەرقەرار بوو.

## دابەشبوونی ئەتابەگی زنگی

(عمادالدین زەنگی) لەکۆتایی ساڵی ٥٤٠ی کۆچی / هاوینی ١١٤٦ی زایینی قەڵای (جەعبەر)[١١٥]ی خستە ژێر دەسەڵاتی خۆیەوە، کە دەکەوێتە سەر رووباری فورات، لەنێوان (بالیس)و (رقە)[١١٦]، لە نزیکی (صفین)[١١٧] کەوتۆتە سەر رێگای دیمەشقەوە، چونکی تێکەڵی موڵکەکانی بوو، ئابڵوقەی داو فشاری خستە سەر، لەم کاتەدا، یەکێ لەپیاوەکانی لەخەودا کوشتی (ئێوارەی ٦ی رەبیعی دووەم ٥٤١ی کۆچی / ١٥ی ئەیلولی ساڵی ١١٤٦ی زایینی)[١١٨] عمادالدین، چوار کوڕی لەپاش خۆی بەجێما، (سیف الدین غازی) گەورەکەیانە، دوا جار (نورالدین محمود) کە شایەکی دادپەروەر بوو، (نصرالدین) میری میران و (أبو الملوك قطب الدین مولود) کە لەهەموویان بچووکتر بوو[١١٩].

ئەو برایانە زەحمەتیان نەکێشا لە هێشتنەوەی پاراستنی موڵکەکانی باوکیان، ئەویش بەهۆی یارمەتیدانی دوو پیاوی عمادالدین، کە ئەمانە بوون: (جمال الدین

محمد الاصفهانی) سەرۆکی دیوان، و (صلاح الدین یاغسیانی) یەکەمیان لە ئابلۆقەدانی قەڵای (جەعبەر) لە گێلی دابوو. ئەو دوو میرە، کە هەواڵی کوشتنەکەیان پێگەیشت، پەیوەندنیان بە (میر زین الدین علی کوجک بکتەکین)ەوە کرد، کە یارمەتیدەری عمادالدین بوو لە موسڵ. داوایان لێکرد بە شوێنی (سیف الدین غازی) دابنێرێ کەلە شارەزوور بوو[١٢٠]، ئەویش ناردی بەدوایدا و هێنای[١٢١].

کوڕی دووەمی (نورالدین محمود) لەگەڵ باوکیدا بوو، ئەموستیلەکەی لەپەنجە دەرهێنا و بەرەو حەڵەب کەوتەڕێ، (رەهاو حەڕان و سروج و حمص و حما)ی خستە ژێر دەسەڵاتی خۆیەوە، دواجار (صلاح الدین یاغسیانی) چووە لای و کاروباری دەوڵەتەکەی بۆ بەڕێوە دەبرد.

## دەستێوەردانی ئەرتەقیەکان

دوای شکستهێنانی لەشکرکێشییەکەی سەلیبییەکان و سەرنەکەوتنیان لە بەدیهێنانی ئامانجی سەلیبیەکان[١٢١]، بارودۆخی سیاسی لە باکووری وڵاتی شام گۆڕا (نورالدین محمود)یش بڕیاری شوێن پێی باوکی هەڵگرت و بڕیاریدا بەرەنگاری سەلیبیەکان ببێتەوە.

(جوسلینی دووەم)ی میری رەها، هێشتا لە (تل باشر) مابوەوە، سەرپەرشتی کاروباری ئیمارەتەکەی دەکرد لە (سمیساط) و (قەڵای رۆم)[١٢٢] و (دلوك)[١٢٣] و (ڕاوەندان) و (قورس)[١٢٤] دواجاریش (مرعش و عزان)[١٢٥] لەلای باکوور لەسەر سنوور و ئیمارەتی ئەنتاکیە[١٢٦].

سەلیبیەکان، سەرەڕای بوونی (جوسلینی دووەم) دوای کوشتنی (ریموند بواتیە)ی میری ئەنتاکیە[١٢٧] پێویستیان بەیەکێکی بەهێز هەبوو تاکو پارێزگاری بەرژەوەندیەکانیان بکات لە باکووری عێراق و وڵاتی شام، چونکی فەرمانڕەوای رەها لە ئاستی رووداوەکاندا نەبوو، نەیتوانی بچێتە ژێر ئەو بارەوە، لەجیاتی ئەوەی موڵکەکانی بگەڕێنێتەوە هێرشی دەکردە سەر (دێرەکان) کە کەوتبوونە سەر رووباری فوراتەوە[١٢٨].

(قەرا ئەرسەلان) فەرمانڕەوای قەڵای (کیفا و خرتبرت)[١٢٩] هەڵپەی ئەوەی دەکرد لە دەستکەوتەکان شتێکی بەرکەوێ، هێرشی کردە بەشی باکووری ئیمارەتی رەها. توانی (بابولا) و (کرکر)ی باکوری (سمیساط) وەربگرێتەوە لەدەستی ئەرمەنیەکان کە سەر بەمیری (مرعش) بوون، هەروەها قەڵای (منصور)ی داگیر کرد[١٣٠].

بەمجۆرە دەسەڵاتی (قەرا ئەرسەلان) گەیشتە ئەو شوێنانەی ئەرمەنیەکانی لێ بوو، کە پێشتر (رینولد) فەرمانڕەوایی تێدا دەکرد[١٣١].

(حسام الدین تمرتاش)ی میری ماردین (سمیساط) و (بیرە)[١٣٢] و (قورس و کفرسوت)ی، هێنایەوە ژێر دەسەڵاتی خۆی[١٣٣].

## دەستێوەردانی زەنگی و سەلجوقیەکان

ساڵی ٥٤٢/١١٤٨ی زاینی، مەسعود گەڕایەوە بۆ بەرەی رۆژهەڵات و فەرماندەی سوپای سەلجوقی بەدەستەوە گرت. دوای هەڵسەنگاندنی باری سیاسی و سەربازی، بڕیاریدا بۆ (مرعش) هێرش ببات (ریموند بواتیە)ی میری ئەنتاکیە بەرەنگاری بووەوە، سوڵتانی سەلجوقی داوای لە (نورالدین محمود) کرد هێرش بکاتە سەر موڵکەکانی ریموند، تا گوشاری لەسەر هێزەکەی کەم دەبێتەوە، میری حەڵەب داواکەی بەجێهێنا، کە چووە ناو دێهاتەکانی ئەنتاکیەوە، (علی وە فاکوردی) سەرۆکی (حەشیشیەکان) و دوژمنی (نورالدین محمود) هێرشی کردە سەریان، ناچار (نوردالدین محمود) کشایەوە، بەتایبەتی لەم کاتەدا ناکۆکی کەوتە نێوان دوو لە فەرماندەکانیەوە: (شێرکو کوردی) و (ابن الدایە) کە لەپیاوانی حەڵەب بوو.

دوای ئەوەی (ریموند بواتیە) کوژرا و (نورالدین محمود) سەرنەکەوت ئەنتاکیە بگرێ، کەوتە هەوڵدانی بەشداریکردنی هێزە ئیسلامیەکان بەداگیرکردنی ئەو شوێنانەی لە ئیمارەتی رەها نەگیرابوون، بە تایبەتی ئەو شوێنە سەختانە کەوتبوونە رۆژهەڵاتی رووباری (عاصی)یەوە، کە لەوێدا مەسعود ئابڵۆقەی لەسەر (مرعش) توند کردەوە بەرلەوەی بڕواتە ناویەوە. ئەو سەربازگەیەی (جوسلینی دووەم) بەجێی هێشتبوو، چوونە پاڵ سەلجوقیەکانەوە.

ئاشکرایە (جوسلینی دووەم) کوشتنی (ریموند)ی بە هەل زانی دەستی بەسەر شارەکەدا گرت، دواجار مەسعود (جوسلینی دووەمی) تا دەووروبەری (تل باشر) راونا. ئەو هێزە سەلیبیەش رێگای لێگرت، بەسەریانا زاڵ بوو، چەند قەڵایەك لەسەر رێگاکە بوون ئەوانەشی داگیرکرد، وەکو (عینتاب) و (دلوك) دواجار ئابلۆقەی (تل باشر)ی دا[١٣٤]، بەڵام وای بەباش زانی لە راونانی دوژمن بوەستێ و بۆ مەرعش بگەڕێتەوە، دوای ئەوەی زانی کەوا یارمەتیەکانی نەسرانیەکان وا نزیك بۆتەوە. نورالدین محمود، لەوە بەولاوە نەچووە پێشەوە، چونکی جوسلینی دووەمی بە تەرەفداری خۆی دەزانی، حەزی نەدەکرد ولات بکەوێتە ژێر دەستی مەسعودەوە[١٣٥]، لەکاتێکدا دەیویست دەست بەسەر هەموو ئیمارەتی (رەها)دا بگرێت، سەرەڕای ئەمەش لە بڵاوبوونەوەی (ئەرتەقی) بەدرێژایی فورات دەترسا، (قەرا ئەرسەلان)یش هێرشی کردبووە بەشەکانی باکوری ئیمارەتی رەهاو (کرکر)ی[١٣٦] داگیر کرد. نورالدین کەوتە نێوان، مەسعود و جوسلینی دووەمەوە پەیمانی ئاشتیان بەست، جوسلین بەپێی ئەو رێکەوتنە دیلە موسڵمانەکانی بەرەڵاکرد، و دوانزە کەرەستەی جەنگیشی پێدرا[١٣٧].

لەساڵی ٥٤٥ی کۆچی / ١١٥٠ی زاینی، ناکوکی کەوتە نێوان محمود و جوسلین، جوسلین، کاتێ بەرەو ئەنتاکیە دەڕۆیشت بۆ راوێژکردن لەگەڵ فەرماندەکانیدا لەبارەی جێنشینێ، رێگا کەوتە دەستی تورکمانەکان، کە نورالدین بەمەی زانی، هێزێکی سەربازی نارد، لەدەستیان وەرگرتەوەو لەحەلەب زیندانی کرد، دوای ئەوەی چاوی هەڵکۆڵی، دوای نۆ ساڵ مانەوەی لە زینداندا کۆچی دوایی کرد[١٣٨].

مەسعود، دیارنەمانی جوسلینی دووەمی لەسەر شانۆی سیاسی بەهەل زانی، ئیمارەتی (رەها)ی بەجێ هێشت و چووە ناو خاکی (کیسوم) و (بهستا) و (رعبان)ەوە لەباکووری ئیمارەتی رەها، ئەم ناوچانەی دایە دەستی قلیج ئەرسەلانی کوری. دانیشتوانەکەی بەرگریان نەکرد، ئەوەی ویستی دەرچوو و روویکردە (عینتاب و تل باشر)، ئەمەی دوایی لەژێر دەسەڵاتی (جوسلینی سێهەمە)وە بوو کە کوری میری رەها بوو، دواجار (تل باشر)[١٣٩]ی ئابلۆقەدا،

لەمەدا نورالدین محمود یارمەتیدا، تاکو مەسعود بەتەنها خۆی فەرمانڕەوایی نەکات.

موسڵمانەکان ئاڵۆزی بارودۆخی سیاسی ناوچەکەیان بەهەل زانی، دەستیان کردە هێرش بردن بۆ سەر قەڵاکان، مەسعود هێرشی بۆ (تل باشر) کرد و ئابڵۆقەیدا، لەم کاتەدا پەیوەندی کرد بە (نورالدین محمود)ەوە، داوای لێکرد، ببنە هاوپەیمانی یەکتر، ئەم هاوپەیمانیە، ژن خواستنی نورالدین چەسپاندنی، کە کچی مەسعودی خواست، (تل باشر)ی کردە شیربایی[١٤٠]، (تمرتاش ئەرتەقی) فەرمانڕەوای ماردین هاتە ناو ئەم هاوپەیمانیەوە.

سوپای موسڵمانان گوشاری زیاتری خستە سەر شارەکە، بەڵام (کونتیسە پیاتریس) خۆی باش ئامادە کردبوو بەجۆرێ هێزەکانی موسڵمانەکان کشانەوە، (نورالدین) توانی (عزان) کە سەر بەئیمارەتی ئەنتاکیە بوو داگیر کرد لە (ربیع الاول ٥٤٥ی کۆچی / تەمموزی ١١٥٠ی زاینی)، هەروەها مەسعود توانی (مرعش) داگیر بکات[١٤١].

دواجار هەردووکیان، مەسعود و نورالدین، پێکەوە هێرشیان کردە سەر سەربازگەکانی بیزەنتیەکان و ئەو قەڵا سەختانەی نەگیرابوون، (ئەرتەق)ەکان، بەپەلە ڕۆیشتن تا بەشی خۆیان دەستکەوێت، دواجار هەمووی کەوتە دەستی موسڵمانەکانەوە، بەمجۆرە دەسکەوتەکان دابەشکرا:-

- مەسعود، مەرعش و رعبان و کیسوم و دلوك و بیت الحصن وعینتابی کەوتە ژێر دەسەڵاتەوە.
- نورالدین محمود، (عزاز و راوندان و تل باشر)ی دەستکەوت.
- (تمرتاش)یش، (سمیساط، بیرە و کفرسوت)ی بۆ خۆی برد.
- قەرا ئەرسەلان، (بابولا، کرکر، کاختی و قەڵای مەنسوری وەکو پێشتر باسمان کرد[١٤٢] کەوتە بەر ئەو.

بەمجۆرە، ئیمارەتی رەهای سەلیبی لە ئارادا نەما، خاکەکەی گەڕایەوە بۆ موسڵمانەکان، مەسعود جێ پێی خۆی لە ناوچەکانی ڕۆژئاوای فورات کردەوە.

بەڵام دواجار گەڕایەوە قلیج ئەرسەلانی کردە فەرمانڕەوای ناوچەی ڕۆژئاوای فورات.

## ململانێی بیزەنتی و ئەرمەنی و رەنگدانەوەی لەسەر بارودۆخی سەلجوقیەکان رۆم

لەو کاتەی موسڵمانەکان خەریکی داگیرکردنی ئەو ناوچانە بوون کە لەپاشماوەی ئیمارەتی رەها مابووەوەو کەوتبوونە دەستی ئیمپراتۆری بیزەنتی. میری ئەرمەنی (سوروسی دووەم) (٥٣٩– ٥٦٣ی کۆچی / ١١٤٤– ١١٦٨ی زاینی) شۆرشێکی ئەرمەنی بەرپا کردبوو تا لەناوچەی قیلیقیە دەسەڵاتی بیزەنتی کۆتایی پێ بینێ. ئەم (سوروس)ە، لە ساڵی ٥٣٨ی کۆچی/ ١١٤٣ی زاینی، لە قوستەنتینە زیندانی بوو هەڵهات و خۆی گەیاندە خاڵۆزاکەی (جوسلینی دووەم)ی میری رەها. ژمارەیەك ئەرمەنی کۆکردەوەو سوپایەکی دامەزراند کە لە دە هەزار جەنگاوەر پێکهاتبوو، توانی قەڵای (ڤاهکا) لەچیای تۆرۆس بگەڕێنێتەوە[١٤٣].

ئیمپراتۆری بیزەنتی (مانویل) خەریکی شەڕی موسڵمانەکان بوو. میری ئەرمەنی ئەمەی بەهەل زانی، خۆی گەیاندە دەشتایی قیلیقیە و بەسەر فەرمانڕەوای بیزەنتیدا سەرکەوت. سەری بڕی و دەستی بەسەر (طرسوس)دا گرت[١٤٤].

ئیمپراتۆر مانویل، سوپایەکی بە فەرماندەیی (ئامۆزاکەی) (ئەندرۆنیکۆس) نارد کە ژمارەی سوپاکەی دوانزە هەزار جەنگاوەر بوون، بۆ تەمێ کردنی (سوروسی دووەم) و گەڕانەوەی ئەو شوێنانەی دەستی بەسەرا گرتبوو، بەڵام سەرکەوتنی وەدەست نەهێنا و هێزەکانی ئەرمەنی سەرکەوتن. (سوروس) کوتو پڕ سوپایەکی بیزەنتی هێرشیان کردە سەر ئەرمەنیەکان، پەرژینەکەی لە شوێنێکەوە شکاند، هێزی بیزەنتی ئاگای لەمە نەبوو، ئەوجا ئەرمەنیەکان لەدەرەوەی پەرژینەکەوە هێرشیان برد[١٤٥] (ئەندرۆنیکۆس) هەڵات و گەڕایەوە قوستەنتینیە.

ئاشکرایە (مانویل) نەیتوانی ئەرمەنیەکان بخاتە ژێر دەسەڵاتی خۆیەوە، کە دەستیان خستبووە سەر شارەکانی قیلیقیە وەکو (سیس) و (عین زربی) و (ئەدەنە) و (طرسوس)، بەڵام دەوڵەتی بیزەنتی بەئاسانی دەستی لەسەر قیلیقیە هەڵنەدەگرت و بەدەست ئەرمەنەوە بمێنێتەوە، چونکی لە رووی سیاسی و

سەربازیەوە گرنگی خۆی هەبوو، سەرەڕای ئەوەش، دەسەڵاتی بیزەنتی بەرە بەرە لە باشووری ڕۆژهەڵات بێ هێز دەبوو. ئەمەش قە قازانجی ئیمپراتورییەتەکەدا نەبوو، بۆیە (مانویل) بەدوای یەکێکدا دەگەڕا، لەجیات ئەو (سورروس) لابدرێ. کەس نەیبینییەوە لە سوڵتان سەلجوقی مەسعود بەولاوە، کە زۆر بەپەرۆشەوە بوو دەست بخاتە کاروباری قیلیقیەوە، وا هەلی بۆ رەخساوە، لەو کاتەدا (عین الدولە بن غازی دانیشمەندی) خاوەنی مەلتیە لەساڵی (٥٤٧ی کۆچی / ١١٥٢ی زاینی) کۆچی دوایی کرد. (ذو القرنین)ی کوری لەدوا بەجێما، بەڵام منداڵ بوو، کەوتە ژێر چاودێری مەسعودەوە[١٤٦]. (یاغی ئەرسەلان) خاوەنی سیواس، هەوڵی دەدا سەر لەنوێ دەوڵەتی دانیشمەندی دامەزرێنێتەوە. میری تازە دانی نەنا بەسەرکردایەتی مەسعود، (ذو القرنین) ئامۆژگاریەکانی مامی قەبوڵکرد و سوپایەکی بۆ ناوچە سنووریەکان رەوانەکرد لەگەڵ سەلجوقیەکاندا، لەترسی هێرشی مەسعوودا، زۆری نەبرد، مەسعود چووە دەوروبەری مەلتیە، دوای ئەوەی (یاغی ئەرسەلانی) رازیکرد و کچەکەی خۆی لێ مارە کرد. ناچار (ذو القرنین) سەر لەنوێ دانی بە سەرکردایەتی مەسعود نا کە دەسەڵاتی خستبووە سەر مەلتیە و سیواس[١٤٧] (سورروسی دووەم) ململانێی نێوان تورکەکان بەگشتی لە ئاسیای بچووکدا بەهەل زانی، ساڵی ٥٤٨ی کۆچی / ١١٥٣ی زاینی چووە ناو (کبادوکیە)وە و دەستی بەسەر هەموو ناوچەکەدا گرت و بەدەسکەوتێکی زۆرەوە لەگەڵ دیلێکی زۆر گەڕایەوە وڵات[١٤٨].

سەرەڕای ئەو سیاسەتە فێڵبازانە کە (مانویل) پەیرەوی کرد لە لێدانی هێزەکانی ئاسیای بچووکدا، پەیمانی لەگەڵ لایەکدا دەبەست و لایەکی دەهێنایە پاڵ خۆی، تا بیانکاتە گژ لایەکانی دیکەدا کە لەگەڵ بیزەنتیەکاندا دوژمنن، تا لاوازیان بکات و دەسڵاتی ئیمپراتۆر بەهێز بێ[١٤٩]. مەسعود، داواکەی ئیمپراتۆری قەبوڵکرد تاکو هێرش بکاتە سەر (سورروسی دووەم) لەبەرامبەر دەسکەوتێکی زۆردا سەرچاوەکانی دیارییان نەکردووە[١٥٠].

مەسعود هەڵساو بڕوات قیلیقیە داگیر بکات بە پشتی بیزەنتیەکانەوەو ناوبانگی هێزەکانی سەلجوقیەوە، کە هەمیشە ترسی لەدڵی ئەرمەنیەکان دەخست[١٥١]،

هێزەکانی سەلجوقی بەرەو ناوچەکە کەوتنە ڕێ و لە شوێنە سنووریەکان نزیک بوونەوە. (سوروس) فەرمانی دا، لە دەربەندە شاخاویەکاندا کە دەکەوێتە سەر سنوور بۆسە دابنێن، بووە هۆی ئەوەی مەسعود نەتوانێ بچێتە ناو قیلیقیەوە[١٥٢].

کە مەسعود خۆی لەو بارە بینی، کەوتە وتوویژ لەگەڵ سوروسی دووەمدا، تا بگەنە چارەیەک، نوێنەری نارد تا پێی بڵێن: نەهاتووە بۆ ئەوەی خاکی ئەرمەنی تێک بدات، بەڵکو هاتووە ئەو خاکانە بگەڕێنێتەوە بۆ بیزەنتیەکان و ئێستا بەدەستی ئەرمەنیەکانەوەیە، هەروەها دانی پێدا بنێن وەکو سەرۆکی ناوچەی ئاسیای بچووک، لەجیاتی ئەوەدا، دەسەلاتی میری دەداتێ.

سوروس بەمە رازی بوو، کە بچێتە ژێر فەرمانی سوڵتانی سەلجوقیەوە، بەڵام رازی نەبوو، ئەو جێگایانەی لەم دواییەدا دەستی کەوتووە، دەستیان لێ هەڵگرێ، لەبەر ئەوەی مەسعود، مەبەستی بوو سوروس بکەوێتە ژێر فەرمانی ئەوەوە، بۆیە بە مەرجەکانی رازی بوو بەبێ شەڕکردن[١٥٣].

(مانویل) ئەم ئەنجامانەی قەبوڵ نەبوو، بۆیە داوای لە (برینولد شایتون) میری ئەنتاکیە کرد، دەیکاتە میری شارەکە ئەگەر یارمەتی بدات دژی سوروسی دووەم. (ریموند) داواکەی ئیمپراتۆری قەبوڵکرد، توانی دوای شەڕێکی کورت لەنزیکی ئەسکەندەرونە، ئەرمەنیەکان بگەڕێنێتەوە بۆ ناو شاری قیلیقیە، ئەو هەرێمەی گەڕاندەوە، پێشکەشی تایفەی (داویە) کرد، کاتێکیش داوای ئەو پارەیەی کرد کە بەڵێنی پێ دابوو، نەیدا. ئەوجا (ریموند) لە ئیمپراتۆر هەڵگەڕایەوەو لەگەڵ سوروسی دووەمدا ئاشت بووەوە، دەستی کردە هێرش بردن بۆ ئەو شوێنانەی بەدەستی بیزەنتیەکانەوە مابوونەوە لەقەلاکانی قیلیقیە[١٥٤].

(مانویل) دوای سەرنەکەوتنی هەوڵەکانی نائومێد نەبوو کەوتە وتوویژ لەگەڵ مەسعود لەساڵی ٥٤٩ی کۆچی / ١١٥٤ی زاینی ئەو کاتە لە دۆڵی فورات بوو، تەماحی لەبەرنا تا بە گژ (سوروسی)دا بکات، ئەم داوایەی ئیمپراتۆر لەم کاتەدا ئەوەی دەگەیاند کەوا مانویل لەتەنگانەدا بوو، تا نامە بۆ دۆڵی فورات بنێرێ و چاوەڕێی گەڕانەوەی نەکات بۆ پایتەخت[١٥٥].

مەسعود رازی بوو، گەڕایەوە سوپایەکی ئامادەکرد و بەرەو ئەرمینیای بچووك کەوتەڕێ، بەچیای (ئەمانۆس)دا تێپەڕی، دواجار چووە (عین زربی) و (مەسیسە). دانیشتوانەکان سەریان سوڕما، خۆیان شاردەوە، لەولاوە، سوروس خۆی بۆ روو بەڕوو بوونەوە ئامادە کرد[١٥٦].

سەلجوقیەکان هیچ شارێکیان بۆ نەگیرا، روویان لە (تل حمدون) کرد[١٥٧] ئابلۆقەیاند لەساڵی ٥٤٩ی کۆچی / ١١٥٤ی زاینیدا. مەسعود لەم کاتەدا، هەندێ لە سوپاکەی جیا کردەوە کە سێ هەزار سەراز بوون بە فەرماندەیی (یەعقوب) فەرمانی پێدا، ئەو رێگایە پاك بکەنەوە کە بۆ ئەنتاکیە دەڕوا[١٥٨].

رەنگە ویستبێتی ئەو هێزە شەڕی سەلیبیەکان بکەن لە ئەنتاکیە، تا رێگایان لەبەردەم چۆڵ ببی، کە بەسەر سوروسدا سەرکەوتن، روو لەوێ بکەن بەمجۆرە قیلیقیە بۆ ئیمپراتۆری بیزەنتی دەگەڕێنێتەوە، خۆیشی ئەنتاکیە دەبا بۆ خۆی، یان رەنگە گەرەکی بووە ئەو هێزە ئابلۆقەی ئەرمەنیەکان بدات و لەپشتەوە هێرش بەرێت، ئەو کاتە دەکەوتنە نێوان دوو ئاگرەوە[١٥٩]، مەبەستی مەسعود لەو هەنگاوەیدا بۆ ئێمە دیار نیی. چونکی لەبەردەم، سوروسی دووەم خۆی پێ رانەگیرا و هێزەکانی ئەرمەن سەرکەوتن، لەوکاتەی بەدەربەندێکی تەسکدا تێدەپەڕی لە نزیکی ئەسکەندەروونە، هەر ئەو رێگایەش هەبوو کە وڵاتی شام بە قیلیقیە دەبەستێتەوە، ئەرمەنیەکان بە فەرماندەیی (ستیفانی) برای سوروس و سوارەکانی (داویە) هێرشیان برد، شەڕێکی سەخت روویدا، یەعقوب کوژرا و هێزەکەی سەلجوقی شکان. مەسعود لەهەمان کاتدا، بەهۆی گەردادوێکی توندەوە لە (تل حمدون) شکستی هێنا، هەرچەندە هاوین بوو، باو باران و بەفرێکی زۆر باری، هەروەها نەخۆشی لەناو هێزەکەیدا بڵاوبووەوە ناچار ئابلۆقەی سەر شارەکەی هەڵگرت و گەڕایەوە[١٦٠]. ئەو شکستهێنانە کە سوپای سەلجوقی تووشی هات، بووە کارەساتێك، سوروسی هێزێکی نارده رێگای گەڕانەوەی هێزەکەی سەلجوقی، لەدەربەندەکاندا هێرشیان بۆ بردن، زۆربەی سەربازەکان، چەکی فرێداو لەئەسپەکانیان دابەزین و بەپیادە هەڵهاتن، لەناو چیاکانیشدا وازیان لێ نەهێنان، زۆریان لێ کوشتن ئەوەی بووە کارێکی سەخت بۆ مەسعود،

سەربازەکانی ئەرمەن چوونە ناو هەرێمی (کەبادوکیە)وە، لەوێ دەستیان بەلانی کرد و هێرشیان کردە سەر شاری (دوالو)، مەسعود کە گەڕایەوە بەمەی زانی[161].

## مردنی سوڵتان مەسعود

دوای شکستهێنانی مەسعود، گەلێ رووداوی گرنگ لە مەیدانی سیاسی لە ئاسیای بچووکدا روویدا، سوڵتان دوای چەند مانگێك لەگەڕانەوەی بۆ پایتەخت کۆچی دوایی کرد. مردنی بووە کۆتایی رێکەوتنی سیاسی لەنێوان میرەکانی موسڵماندا لەئاسیای بچووك کە زۆر هەوڵی ئەمەی دا بەدی بهێنێ و یەکێك بوو لە ئامانجە سیاسییەکانی[162] مەسعود، زۆربەی ژیانی سیاسی لە ناکۆکی و هێرشە سەربازیەکاندا بەسەر برد، بەڵام کاتێ مرد سەڵتەنەتێکی بەربڵاو و بەهێزی بەجێهێشت، کە کاریگەری هەبوو لەسەر شانۆی سیاسیدا لەناوچەکە، ساڵانێکی زۆر فەرمانڕەوایی کرد و سەڵتەنەتی سەلجوقی رۆمی لەناو چوون رزگار کرد. لەسەڵتەنەتێکی بچووکەوە، کردیە دەوڵەتێکی گەورە، دەستی بەسەر هەموو ئەنادۆڵدا گرت، لەسەردەمی ئەودا جوڵانەوەی کارگێڕی و بەڕێوەبردن دەستی پێکرد، گەلێ خزمەتگوزاری کۆمەڵایەتی پێشکەشکرد[163].

## پەراوێزەکانی بەشی شەشەم

١. Michel Le syrien: vol 111, P219

٢. Camb. Hist of Islam: vol 1, P239

٣. مەنیج: شارێکی گەورەیە، بەپیتە، لەنێوان ئەم شارەو فوراتدا سێ فەرسەخە الحموی: ج٥، ص ٢٠٥ – ٢٠٦

٤. Michel Le syrien: vol 111, P219

٥. ابن العبری: ص ١٤١ Michel Le syrien: vol 111, P220

٦. Ibit: P223

٧. ابن العبری: ص ١٤١.

٨. Michel Le Syrien, vol111, PP 222-224

٩. ابن العبری: ص ١٤١.

١٠. Michel Le Syrien, vol111,P P 223-224

١١. ابن العبری: ص ١٤١. Michel Le Syrien, vol111, P224

١٢. Ibit

١٣. ابن العبری: ص ١٤٧. Michel Le Syrien, vol111, P224

١٤. هەمان سەرچاوە: Ibid

١٥. ابن العبری: ص ١٥٤. Mechel Le syrien. Historia, P25

١٦. Kinnamost,J: Epitom Historiarum, PP20-21

١٧. Nicetas, PP 25-27

١٨. ابن العبری: ص ١٥٥

١٩. هەمان سەرچاوە: ص ١٥٥-١٥٦.

٢٠. Mechel Le Syrien, vol111, P 254

٢١. Ibid. Chalandon, P245

٢٢. الكامل ڤ التاریخ: ج٩، ص ٦.

٢٣. Kinnamost: P39-40

٢٤. Chalandon: PP 247-248

٢٥. عمران، محمود سعید: السیاسه الشرقیه للامبراطوریه البیزنطیة ڤ عهد الامبراطور مانویل الاول: ص ٥٢.

٢٦. توفیق، عمر کمال: ص ١٣٩.

٢٧. توفیق، عمر کمال: ص ١٣٩.

٢٨. سوزویولیس: ئوبرولوی ئێستایە لە ئەنادۆڵ.

٢٩. Ramsay: Historical Geography of Asia Minor: P381

٣٠. ابن العبری: ص ١٣٧-١٣٨ Ibid

٣١. Chalandon: PP 247-248

٣٢. Chalandon: PP 247-248

٣٣. کیسوم: دێیەکە، سەر بە سمیساگ، قەڵایەکی لێیە: الحموی ج٤، ص ٤٩٧.

٣٤. Kinnamost: P21. Michel Le syrien: vol 111 PP238-239 Nicetas: PP 44-49

٣٥. ولیم الصوری: ج٢، ص ٧٢٥-٧٢٧.

٣٦. هەمان سەرچاوە: ص ٧٢٧.

٣٧. ولیم الصوری: ج٢، ص٧٢٧. Kinnamost: P21
٣٨. هەمان سەرچاوە: ص ١٠١. Ibid: P 24. Nicetas. P51
٣٩. عمران: ص ١٠٢.
٤٠. عمران: ص ١٠٢–١٠٣. Nicetas: P6K
٤١. Ibid: P20 – Kinnamost: P33، هەمان سەرچاوە: ص ١٠٣.
٤٢. Diehi, C: Histoire 1: Empire Byzantine. P149
٤٣. Kinnamost: P36. Nicetas: P71
٤٤. Ibid
٤٥. عمران: ص ١١٧.
٤٦. Kinnamost: P38 – Nicetas: P71
٤٧. Ibid
٤٨. Ibid
٤٩. Chalandon: P249
٥٠. Chalandon: PP249-250
٥١. Kinnamost: P40
٥٢. Finaly, G: History of Greece from its conquest by the Romans to the present time: vol. 111, P188
٥٣. Kinnamost: P40-42
٥٤. Chalandon: PP 249-250
٥٥. Kinnamost: PP 42-44. Nicetas: P72
٥٦. دەربارەی ئابلۆقەی قونیە بڕوانە:
Kinnamost: PP 40-42..Nicetas: P72..
Chalandon: pp253-254
٥٧. Michel Le Syrie:vol. 111, P275
٥٨. Chalandon: P254
٥٩. عمران: ص ١١٩–١٢٠
٦٠. هەمان سەرچاوە: ص ١٢٢.
٦١. Kinnamost: P52
٦٢. The journey of Louis, V11 to the East: P 89
٦٣. کرالیە: ئاق شەهرە.
٦٤. kinnamost: PP44-47.. Chalandon: P255

٦٥. Chalandon: Ibid: P256.. Ramsay: PP330-331

٦٦. kinnamos: P66. Chalandon: Ibid P257

٦٧. اسحاق، ارمله: الحروب الصليبيه في الاثار السريانيه: ص ١٣٥.

٦٨. Michel Le syrien: vol.111, P275

٦٩. The journey: P55

٧٠. دەربارەی دەوڵەتی زەنگی بڕوانە: تاریخ الزنگيين في الموصل وبلاد الشام.

٧١. بڕوانە: تاريخ الزنكيين في الموصل وبلاد الشام ص ٩٨-١٠٣، ١١٥

٧٢. هەمان سەرچاوە: ص ١٣٨-١٤٦

٧٣. عاشور: ج١، ص ٦٠٤. Grouset: vol. 11 P172

٧٤. دیمەشق ئەوکاتە لە ژێر فەرمانڕەوایی (ئال بوری کوڕی طغتكين) بوو دیمەشق بەدەستیانەوە بوو، لەگەڵ (حەما) لە باکوور و حوران لە باشوور. ئەمانە بەمیراتی فەرمانڕەواییان لە سەلجوقیەکانەوە بۆ مایەوە. (معين الدين) فەرمانڕەوای بەعلەبەك دەسەڵاتدار بوو.

٧٥. قەڵای کیفا: شارو قەڵایەکە، دەڕوانێتە دیجلە، لەنێوان ئامەد و جزیرە. الحموي: ج٢، ص ٢٦٥.

٧٦. رنسيمان: ج٢، ص ٣٧٩.

٧٧. الموەزەر: لە جزیرەیە، الحموي: ج٥، ص ٢٢١.

٧٨. تل موزن: شارێکی کۆنە، هەمان سەرچاوە: ج٢، ص٤٥.

٧٩. ابن الاثير: ج٩، ص ٧.

٨٠. رنسيمان: ج٢، ص٣٧٩.

٨١. وليم الصوري: ج٢، ص ٧٣٧-٧٣٨.

٨٢. رنسيمان: ج٢، ص ٣٧٩-٣٨٠.

٨٣. هەمان سەرچاوە: ج٢، ص ٣٨٠.

٨٤. وليم الصوري: ج٢، ص ٧٣٩.

٨٥. هەمان سەرچاوە: ص ٧٣٨، ابن العبري: ص ١٥٦-١٥٧

٨٦. هەردوو سەرچاوەکەی پێشوو: ص ٧٣٩-٧٤٠. ص ١٥٦-١٥٧. رنسيمان: ج٢،ص٣٨٠-٣٨١

٨٧. ابن الاثیر: التاریخ الباهر، ص ٦٩.

٨٨. قاسم، محمد عبده: ماهیه الحروب الصلیبیه ص ١٢٧.

٨٩. رنسیمان: ج٢، ص٢٩٧.

٩٠. بڕوانە دەقی نامەکە لە: Eugenius 111, Letter to Louis: V 11. R.H.G.f xv, PP429-430

٩١. odo of Dueil: PP7-8

٩٢. Ibid

٩٣. Ibid: P11

٩٤. Menuel, Letter to Louis VII in R.H.F.G.XV, P9

٩٥. Camb, Med. Hist: vol v, PP307-353

٩٦. ولیم الصوری: ج٢، ص ٧٦١.

٩٧. Kinnamost: PP80-81. old of Dueil: P51

٩٨. اسحاق ارمله: ص ١٢٥.. Nicetas: PP88-89

٩٩. Oman: vol. 1, P245Dstrojorskyp339

١٠٠. Kinnamost: PP80-82

١٠١. ولیم الصوری: ج٢، ص 762

١٠٢. odo of Dueil: P91

١٠٣. Ibid

١٠٤. تاریخ الاعمال المنجزه، فیما وراو البحار: ج٢، ص٧٦٢

١٠٥. عمران: ص ١٤٦

١٠٦. Oman: vol 1, P245

١٠٧. Kinnamos: PP81-82. Nicetas: P89. odo of Duie P91

( ئودو اوف دویل) لەگەڵ ئیمبراتوری ئەلمانیدا بووە ئەو شایەت حاڵە.

١٠٨. ولیم الصوری: ج٢، ص ٧٦٤-٧٦٦

١٠٩. ولیم الصوری: ص٧٦١-٧٧٢

١١٠. odo of Dueil: P97

١١١. Ibid: P105. Camb. Med. Hist of Islam vol 1, PP241-242

١١٢. ولیم الصوری:ج٢، ص ٧٦٧. بڕوانە پەراوێزی ١، عمران: ص ١٥٥.

١١٣. odo Of Dueil: PP103-102

١١٤.ولیم الصوری: ج٢، ص ٧٦٨-٧٧٢

١١٥.ولیم الصوری: ج٢، ص ٧٦٨-٧٧٢

١١٦. بهستا: قەڵایەکی سەختە لەنزیکی مرعش و سمیساطز الحموي: ج١ ص٥١٦

117. قەڵای جعبر: لەسەر فوراتە بەرامبەر (صفین) لەپێشدا بە (دوسر) دەناسرا، کابرایەك لە (بنی نمیر) بووە خاوەنی، دەڵێن ناوی (جعبر کوری مالك) بووە بەناوی ئەوەوە ناونراوە، الحموی: ج٤، ص ٣٩٠

١١٨. (رقە) شارێکی بەناوبانگە، لەسەر فوراتە، هەمان سەرچاوە: ج٣، ص٥٨.

١١٩.(صفین) شوێنێکە لە نزیك (رقە) لەسەر کەناری فوراتە. بەلای رۆژئاوادا، هەمان سەرچاوە: ص٤١٤.

١٢٠. ابن الاثیر: الکامل ف التأریخ: ج٩، ص١٣ بروانە: تاریخ الزنگیین ف الموصل وبلاد الشام: ص ١٥٨-١٦١.

١٢١.هەمان سەرچاوە: ص ٧٦.

١٢٢. شارەزوور: دۆڵێکی بەرینە، لەنێوان هەولێر و هەمەدان: الحموی: ج٣، ص ٣٧٥.

١٢٣. ابن الاثیر: ج٩، ص٨٤-٨٥.

١٢٤. ابن اللانسی: ص ٤٤٥. ابن الاثیر: ج٩، ص ١٣.

١٢٥. سەلیبیە رۆژئاواییەکان لە لەشکرکێشی دووەمدا دەبوایە لەنێوان دوو ڕێبازی سیاسیدا یەکێکیان هەڵبژێرن کە دوو رای جیاوازن، رای یەکەم فەرمانڕەواکانی ئیمارەتە سەلیبیەکانی باکوور بوون. ئەنتاکیەو رەها و تەرابلوس. رای دووەم: هی فەرمانڕەواکانی (بیت المقدس) بوو کە قەناعەتیان بە سەلیبیەکان کرد روو بەڕووی دیمەشق بوەستن.

١٢٦. قەڵای روم: قەڵایەکی سەختە لە رۆژئاوای فورات. الحموی: ج٤، ص٣٩٠.

١٢٧. دلوك، شارۆچکەیەکە لە دەوروبەری حەڵەب: هەمان سەرچاوە: ج٣، ص ٤٦١.

١٢٨. قورس: دۆڵێکە لە دەوروبەری حەڵەب، هەمان سەرچاوە: ص ٤١٢.

١٢٩. عزاز، أعزاز: شارەو قەڵایە، لەباکووری حەڵەبدایە. هەمان سەرچاوە: ج٤، ص ١١٨.

١٣٠. Grousset: vol. II P 284

١٣١. ریموند بواتیە، لەمانگی سەفەر ساڵی ٥٤٤ی کۆچی/حوزەیرانی ١١٤٩ی زاینی کوژرا، شێرکو کوشتی، کە فەرماندەیەکی نورالدین محمود بوو، دوای شەڕی (نیتەب) بڕوانە: تأریخ الزنگیین: ص ٢٦١-٢٦٥.

١٣٢. Michel Le Syrien: vol. III, P283

١٣٣. خرتبرت: قەڵایە، لەو پەڕی دیاربەکرە. الحموی: ج٢، ص٣٥٥.

١٣٤. قەڵای مەنسور، لەدیاربەکرە، هەمان سەرچاوە: ص ٣٦٥.

١٣٥. ابن العبری ص ١٦٤-١٦٥.. Michel Le Syrien: vol. III PP249-295

١٣٦. بیرە: شارێکە لە نزیك سمیساط، الحموی: ج١، ص ٥٢٦.

١٣٧. ابن العبری: ص ١٦٥.

١٣٨. Gregoire Le Pretre: chronique: P167

١٣٩. Michel Le Syrien: vol. III P290

١٤٠. کرکر: قەڵایەکە لەنێوان ئامەد و مەلتیە، الحموی: ج٤، ص ٤٥٣.

١٤١. ولیم الصوری: ج٢، ص٧٩٣.

١٤٢. ابن القلانسی: ص ٤٨١. ابن الاثیر: ج٩، ص٧٩.

١٤٣. ابن القلانسی: هەمان سەرچاوە، lbid.Grejoirelepretre:p162.

١٤٤. تاریخ الاعمال المنجزه فیما وراء البحار: ج٢،ص ٨٠٠-٨٠١.

١٤٥. ابو شامە، شهاب الدین عبدالرحمن اسماعیل المقدسی: کتاب الروضتین فی اخبار الدولتین النوریه والصلاحیه: ج٢، ص١٨٤.

١٤٦. ابن القلانسی: ص٤٨١. ابن العبری: ص ١٦٥.

١٤٧. ابن القلانسی: ص ٤٨١-٤٨٩. ابن العبری: ص ١٦١-١٦٥.

١٤٨. استارجیان: تاریخ الامه الارمینیه: ص٢١١.

١٤٩. Sempad: chronique du Royaume de la petite Armente in R.H.C. Doc Arm vol. I, P619

١٥٠. استارجیان: ص 211. Gregoire le pretre. P169

١٥١. Michel le syrien: vol. III, P304-305

١٥٢. ابن العبری: ص١٦٧-١٦٨.

١٥٣. هەمان سەرچاوە: ص١٦٨.

١٥٤. عمران: ص١٩٤.

١٥٥. استارجیان: ص٢٢١. Gregoire le pretre. P169

١٥٦. Ibid: P170

١٥٧. Michel le syrien: vol. III, P310

١٥٨. Gregoire le pretre: PP170-171

١٥٩. ابن العبری: ص ١٦٩.

١٦٠. عمران: ص١٩٧.

١٦١. Gregoire le pretre: P171

١٦٢. تل حمدون: شارێکی ئەرمەنیە لە قیلیقیە.

١٦٣. عمران: ص١٩٨.

# بەشی حەوتەم
# عیزەدین قلیج ئەرسەلان کوڕی مەسعود
# قلیج ئەرسەلانی دووەم
# ٥٥٠-٥٨٨ی کۆچی / ١١٥٥ – ١١٩٢ی زاینی

## دەسەڵات بەدەستەوە گرتنی قلیج ئەرسەلان

مەسعود مرد هیچ سوودێکی لەهاوپەیمانێتی لەگەڵ (مانویل)دا نەکرد، بەڵکو بەپێچەوانەوە، ئەم هاوپەیمانیەی زیانی پێ گەیاند، سوپاکەی لەبەرامبەر، (سوروسی دووەمدا) تێکشکا و ژیانیشی خستە سەری، دەبوایە کوڕەکەی و جێنشینی (قلیج ئەرسەلان) سەر لەنوێ سوپای رێکخستایەتەوە تاکو بتوانێ روو بەرووی مەترسیەکان کە دەورەی دەوڵەتی سەلجوقیان دابوو، بوەستێ.

قلیج ئەرسەلانی دووەم، بووە جێنشینی باوکی، میرێك بوو لەو میرانەی تواناییەکی لە رادەبەدەریان هەبوو. زیرەك و بەئاوەز، لەناو میرەکانی سەلجوقیدا جێگایەکی تایبەتی هەبوو، بەڵکو لەهەموویان درەوشاوەو بەناوبانگتر. یەکەم فەرمانڕەوای سەلجوقیە، نازناوی سوڵتانی بۆ خۆی دانا لەسەر سکەی پارە. ئەوەی شایانی باسە سەرچاوە ئیسلامیەکان، ئەو نازناوەیان بەسەلجوقیە گەورەکان دەوت و میرەکانی ئەنادۆڵ تەنها نازناوی (شا)یان هەبوو[1].

قلیج ئەرسەلان، هەر لە رۆژگاری باوکیەوە فەرمانڕەوایی دەکرد،، بەفەرمانڕەوای ئەو وڵاتانەی دامەزراند کە لەباشووری رۆژهەڵاتی ئاسیای بچووك، دەستیان بەسەرا گیرابوو[2]، حەزی دەکرد تا خۆی لە ژیاندا بوو لەسەر تەخت دابنیشێ[3].

پەیڕەوی ڕێبازی سیاسی باوکی لەبەرگرت، کاری بۆ یەکگرتنی سیاسی تورکەکانی سەلجوقی دەکرد و هەوڵی دەدا لە ڕووی ئابووری و ڕۆشنبیری وڵاتەکەی پێشبکەوێت(٤).

## ناکۆکی لەئاسیای بچووک

قلیج ئەرسەلان، هەر لەسەرەتای ژیانی سیاسیەوە وەکو فەرمانڕەوایەك، گەلێ کێشەو ئاستەنگی هاتە پێش، هەر لە شۆڕشی (شاهنشا)ی برایەوە بیگرە تا دەگاتە، چاو لێ بڕینی دانیشمەندییەکان و زەنگیەکان لە موڵکەکانی و هەوڵدانی ئەرمەنیەکان بۆ تۆڵەسەندنەوە لە سەلجوقیەکان کە چەندین دەستدرێژیان کردە سەر قیلیقیەو بڕیاری ئیمپراتۆری بیزەنتی و هەوڵدانی بۆ گێڕانەوەی موڵکەکانی بیزەنتیەکان لە ئاسیای بچووك.

ئەم کێشانە مەترسی نەمانی دەسەڵات بوون، دەبوایە قلیج ئەرسەلانی دووەم خۆی ئامادە بکات بۆ پارێزگاری لە وڵاتەکەی و ڕوو بەڕووی تەماحکاران بوەستێ لەپێناوی مانەوەدا.

(شاهنشا) ی کوڕی مەسعود، شۆڕشی لە دژی قلیج ئەرسەلانی برای بەرپا کرد، لە (کنغری) و (ئەنقەرە) دانیشت کە کاتی خۆی باوکی پێی دابوو، سەرەڕای قەستەمونی و ئەو وڵاتەی کەوتبووە سەر دەریای ڕەش(٥).

(یاغی ئەرسەلان) میری سیواس، خۆی خستە ناو ناکۆکی نێوان دوو براکەوە، لایەنگری (شاهنشا)ی دەکرد و لە دژی (قلیج) هاوپەیمانیەکی دروستکرد، کە لە میری مەلتیە (ذو القرنین) و فەرمانڕەوای قەیسەری (ذو النون) و میر ئیبراهیم کوڕی محمد پێکهاتبوون(٦).

(یاغی ئەرسەلان دەرکردنی هەندێ لە میرەکانی لەلایەن قلیج ئەرسەلانەوە بەهەل زانی، هێزێکی گەورەی کۆکردەوەو بەرەو خاکی سەلجوقی کەوتەڕێ، هێرشی کردە سەر قونیە و (لاریسا)ی داگیرکرد، بەڵام میرەکان لەهەردوو دەوڵەتەکە کەوتنە نێوانیان و ئاشتبوونەوە(٧). هەروەها (نورالدین محمد زەنگی) ڕۆڵێکی باشی لەم ئاشتبوونەوەدا هەبوو. ئەو وایدەبینی، کەوا ئەم ناکۆکییە، سەلیبیەکان

بیزەنتیەکان بەهێز دەکات و دوا هێرش دەبەنە سەر ئیسلامەکان (زۆر بە باشی ناوبژی کرد، هەوڵی زۆردا و نێوانیان چاك بووەوە)[٨].

دەرکەوت ئەو ئاشتبوونەوەیە هەر رواڵەت بوو، زۆری نەبرد (یاغی ئەرسەلان) هێرشی کردە سەر موڵکەکانی سەلجوقییەکان، قلیج ئەرسەلان، نەیتوانی بەرەنگاری بێتەوە، چونکی هێزەکەی درەنگ گەیشتن و رێگایان بۆ نەگیرا، (یاغی) رێگایەکی دیکەی گرتبوو لەکاتی گەرانەوەیدا[٩]. (یاغی) تا گوشاری سەلجوقیەکان کەم بکاتەوە، داوای یارمەتی لە (نورالدین محمود) کرد ئەمیش، سوور بوو لەسەر وەدەستهێنانی بەشی سەلجوقی رۆم لە ئیمارەتی (رەها)، وادیار بوو، لەسەر ئەوە رێکەوتبوون بە گژ قلیج ئەرسەلاندا بچن و موڵکەکانی دابەش بکەن[١٠].

(نورالدین محمود) هێرشی کردە سەر ئەو شوێنانەی ئیمارەتی رەها کە بەدەستی سەلجوقیەکانەوە بوو، وەکو (عینتاب) و (دلوك) و (رعیان)، ناکۆکی نێو خێزانەکەی بەهەل زانیبوو. کاتێ قلیج ئەرسەلانی دووەم، گەرایەوە پایتەخت و لەشەری دانیشمەندیەکان بووەوە، کردەوەکانی (نورالدین)ی زانی، لەمە سەری سورما، چونکی خزمایەتی و ژن و ژنخواز بوون، نامەیەکی گلەیی بۆ نارد و ئەوەشی بە درۆ خستەوە گوایە پیلانی لە دژ گێراوە، وەزیری میسری (ساڵح کوری رزیك) کەوتە ناوبژیان و ئاشتی کردنەوە، نورالدین، داوای لێبوردنی لە قلیج کرد[١١].

ئەم لێکگەیشتنەش کاتی بوو، ئەمە رێگربوو لەبەردەم نیاز و تەماحی، یاغی ئەرسەلانی دووەم) و لەسەر دەسەڵات لایبدات و (شاهنشا)ی برای لەجێگەکەی دابنێت، بەڵام بارودۆخی سیاسی لەبار نەبوو تا ئەم دوو خێزانە تورکە بەردەوام بن لە دوژمنایەتیکردنی یەکتردا، زانا گەورەکان و پیاوانی هەردوو دەوڵەت کەوتنە ئارایانەوە، جارێکی کە ئاشتبوونەوە[١٢]. داگیرکردنی خاکی سەلجوقیەکان لەلایەن ئەرمەنیەکانەوە، یەکێ بوو لەو هۆیە دیارانە بووە کۆتایی پێ هێنانانکۆکیەکانیان. ئەوانە، مردنی مەسعود و ئەو نائارامی و ئاژاوەیەی دوای مردنی لەناو وڵاتی ئەنادوڵ سەریهەڵدا بەهەل زانی، بۆ تۆڵە سەندنەوە لە سەلجوقیەکان، کە دوو جار

لە کۆتایی دەسەڵاتی سوڵتانی سەلجوقی کۆچکردوودا هێرشیان کردبووە سەر ئیمارەتەکەیان.
(سوروس) فەرماندەیی لەشکرکێشیەکانی ئەرمەنی نەدەکرد، رەنگە لەوە دەترسا لە وڵات دوور بکەوێتەوەو بیزەنتیەکان هێرشیان بۆ بەرن. (ستیڤانی) برای بەو کارە هەڵسا. دەبینرێت هێزەکانی ئەرمەنی، هێرشی نەدەکردە سەر موڵکە راستەقینەکانی سەلجوقیەکان، بەڵکو هێرشیان کرە سەر (کیسوم) و بهسنا و مرعش) ئەم شارانە لەو دواییانەدا، لە پاشماوەی ئیمارەتی رەها بوون کەوتبوونە ژێر دەسەڵاتیانەوە. ئەوەی پاڵی بە ئەرمەنیەکانەوە دەدا هێرش بۆ ئەو شوێنانە بەرن، ئەو جێگایانە لە ژێر دەسەڵاتی (ژنەکەی جوسلینی دووەمدا) بوو، کە بە بنەچە ئەرمەنی بوو، بۆیە بە ماف خۆیانیان دەزانی و هەوڵی گەڕانەوەیان دەدا بەڵام (ستیڤانی) نەیتوانی دەست بەسەر (بهسنا) و (مرعش)دا بگرێت، تەنها (کیسوم)ی تاڵان کرد بەڵام قەڵای (برتونك)ی گرت و دواجار گەڕایەوە[١٣].
دوای ئاشتبوونەوەی قلیج ئەرسەلان و یاغی ئەرسەلان، (شاهنشا) هێدی بووەوە، سوڵتانی سەلجوقی خۆی تەرخانکرد بۆ پارێزگاریکردنی وڵات، لەهەڕەشەکانی دەرەوە، بێجگە لە ئەرمەنیەکان، ئیمپراتوریەتی بیزەنتیش پەیدابوو دەیوسیت، ئەنادۆڵ لەدەستی تورکەکان دەربهێنن و دەست بەسەر سەلیبیەکانیشدا بکێشن لەباکووری وڵاتی شام و ئەرمەنیەکانیش لە قیلیقیە. هەروەها (نورالدین محمود)یش چاوی بڕیبە شارە سەلجوقیەکان کە لە ئیمارەتی (رەها)دا بوون.

(قلیج ئەرسەلانی دووەم) هێرشی کردە ناوچەی باکوری شام و هەرێمی فورات تا گەیشتە ئەنتاکیە و هەڕەشەی خستە سەر ناوچەی حەلەب[١٤] بۆ ئەوەی لەپشتەوە لێی نەدەن لەو کاتەی خەریکی ململانێ بوو لەگەڵ بیزەنتیەکاندا، لەگەڵ هێزەکانی نەسرانی ناوچەکەدا کەوتە وتووێژ، بەتایبەتی لەگەڵ، (بلدوینی سێیەم) شای بیت المقدس و (رینولد شایتون) میری ئەنتاکیەدا و سوروسی دووەم. هەر یەکێ لەوانە نوێنەریان بۆ قونیە نارد تاکو لەگەڵ سوڵتاندا رێك بکەون[١٥]، بەڵام تەنها لەگەڵ ئەرمەنیەکاندا هاوپەیمانی مۆر کرد، کە دەیانویست

## مێژووی سەلجوقیەکان

قلیج ئەرسەلان بۆلای خۆیان رابکێشن، چونکی ئیمپراتوری بیزەنتی (مانویل) خاکەکانی قیلیقیەیان داگیر کردبوو، قەلای (برتونك)یان بۆ گێرایەوە لەساڵی ٥٥٢ی کۆچی / ١١٥٧ی زاینیدا[١٦]، میرەکانی دانیشمەندیشی بڵاوە پێکردن کاتێ (ذو النون) خاوەنی قەیسەری هێنایە پاڵ خۆی[١٧].

لەیەك نزیکبوونەوەی ئەرمەنی-سەلجوقی، ترسی خستە دڵی ئیمپراتۆری بیزەنتیەوە (مانویل) وا هەستی کرد، دژی ئەوە، ئەم ترسەی ساڵی (٥٥٣ی کۆچی / ١١٥٨ی زاینی) راست دەرچوو، بەلام مەترسیەکە لەو هاوپەیمانیەوە نەبوو، بەڵکو لە هاوپەیمانیەکی نوێوەی نێوان تورکەکان بەگشتیەوە بوو. سەلجوقیەکان و دانیشمەندییەکان ناکۆکیەکانی خۆیان بەلاوە نا لەم قۆناغەدا، یەکیانگرت لەبەرامبەر مەترسیەکانی بیزەنتیەکاندا، ساڵی ٥٤٢ی کۆچی/١١٤٧ی زاینی، ئاگربەستیان لەنێواندا مۆر کردبوو هەڵوەشایەوە.

سەلجوقیەکان هێرشیان کردە سەر موڵکەکانی بیزەنتیەکان، (سلوقیە) و (لارندا)یان داگیر کرد، کە کەوتبوونە بەشی باشووری رۆژهەلاتی ئاسیای بچووك، دانیشمەندیەکان لەهەرێمی باکووری رۆژهەلات چووبوونە پێشەوەو دەستیان گرتبوو بەسەر شاری (یونە و بافرا)دا کە دەکەونە هەرێمی (بنطس)قوة[١٨].

وا دەردەکەوێ سیاسەتی (مانویل) لەم قۆناغەدا، وای گەرەك بوو شەڕی ئەرمەنیەکان بکەن. بەبەڵگەی ئەوەی (ئەلکسیوس جیفارد)ی بۆلای قلیج ئەرسەلانی دووەم و یاغی ئەرسەلان نارد بۆ بەستنی ئاشتی لەگەڵیاندا، لەنێوان لایەنەکان ئاشتی بەسترا، سەلجوقیەکان و دانیشمەندیەکان ئەو شارانەی دەستیان بەسەرا گرتبوو، بۆ بیزەنتیەکانیان گەڕاندەوە، گومانی تێدا نییە (مانویل) گەلێ پارەو دیاری، بەتورکەکان دا تا رازی بوون. بەلام بەم کارە، تورکەکانی کردە پەرژینێ لەنێوان خۆی و ئەرمەنیەکاندا[١٩]، لەساڵی ٥٥٣ی کۆچی / هاوینی ١١٥٨ی زاینی، لەسەر ئاگربەست رێکەوتن.

دەستێوەردانی بیزەنتی لەکاروباری ولاتی شام ورەنگدانەوەی لەسەر بارودۆخی سەلجوقیەکان

نوێکردنەوەی هاوپەیمانی لەگەڵ (بیت المقدس)دا

(بلدوینی) سێیەم شای بیت المقدس، هەستی کرد، دەبێ پەنا بۆ هێزێکی دەرەوە ببات لەبەرامبەر هێرشەکانی (نورالدین محمود)دا کە بەردەوام هێرشی بۆ سەر موڵکەکانی سەلیبی دەبرد، بەدووری زانی (رینولد شایتون) خاوەنی ئەنتاکیە یارمەتی بدات. چونکی خەریکی بەرژەوەندی خۆی بوو، روویکردە قوستەنتینیە، سوپای بیزەنتی ئەو کاتە، بەهێزترین سوپا بوو لەجیهانی نەسرانیدا لەرۆژهەلأت.

ئەو پلانەی (بلدوینی سێیەم) دایناوبوو بۆ دەستەبەرکردنی (مانویل) ژن خوستن بوو. بۆ ئەم مەبەستە لەناوەڕاستی ساڵی ٥٥٢ی کۆچی / ١١٥٧ی زاینیدا نوێنەرانی بۆ دەرباری بیزەنتی نارد بەسەرۆکایەتی (ئەتارد) سەرۆکی ئەسقوفی (ناصرە) کە لەرێگا کۆچی دوایی کرد و بەئەندامێتی هەریەك لە (همفری دووەم سید تبنین)[٢٠] و (جوسلین بسیلیوس و ولیم دی باری) خوازبێنی (ئەمیرە تودورە)ی کچی ئیسحاقی برای ئیمبراتوریان کرد[٢١].

(مانویل) پێشوازی گەرمی لەنوێنەران کرد و رازی بوو (ئەمیرە)یان پێ بدات، وتووێژەکانیان لەبارەی بارودۆخی سەلیبەکان کرد کەوا لە بارێکی نالەبار دان و هێزی (نورالدین محمود)یش لەبەهێزبووندایە و ئیمپراتۆر لەمبارەیەوە دەتوانێ چۆن یارمەتیان بدات.

لەمانگی رەجەبی ساڵی ٥٥٣ی کۆچی / ١١٥٨ی زاینیدا ئەم کارە ئەنجامدرا، (مانویل) ئەم کارەی بۆ قازانجی خۆی بەکارهێنا، تاکو هەوڵێکی تر بدات و مافەکانی ئیمپراتوریەت لە قیلیقیە و ئەنتاکیە بگەڕێنێتەوە.

وا دەردەکەوێت، پەیمانی بەشای سەلیبی دا، بەشداری هاوپەیمانیەك بکات دژی نورالدین محمود) و تەمێکردنی (رینولد شایتون) چونکی (قبرص)ی داگیر کردوە، کە سەر بە بیزەنتیەکان بوو، لەساڵی ٥٥١ی کۆچی / ١١٥٦ی زاینیدا بەبەشداری (ثوروسي دووەمی ئەرمەنیدا)[٢٢].

## مانویل قیلیقیە داگیر دەکات

هەرکە ئەمیرەی بیزەنتی (تیودورە) لەهاوینی ٥٥٣ی کۆچی / ١١٥٨ی زاینی قوستەنتینیەی بەجێهێلا و بەرەو (بیت المقدس) کەوتەڕێ، (مانویل) بە فەرماندەکردنی سوپایەك کە بە پەنجا هەزار سەرباز مەزەندە دەکرێ، بەرەو قیلیقیە کەوتەڕێ بۆ گەڕانەوەی مافەکانی ئیمپراتۆریەت، دواجار بەرەو ئەنتاکیە بڕوات و داگیری بکات و رینولد شایتون) تەمێ بکات[٢٣].

مانویل، لەباکووری رۆژئاواوە بەرەو باشووری رۆژهەلاتی ئاسیای بچووك رۆیشت وای دەردەخست دەیەوێ شەڕی سەلجوقیەکان بکات، تا راستی مەبەستەکەی ئاشکرا نەبێت زۆر بە نهێنی دەرچوو بوو.

میری ئەرمەنی سوروسی دووەم ئەو دەمە لە تەرسوس بوو، گومانی نەبوو کەوا بیزەنتیەکان دەیانەوێ خاکەکەی داگیر بکەن، تا لەپڕێکدا، لەمانگی رەمەزانی/ تشرینی یەکەم، ئاگادار کرایەوە کەوا سوپای بیزەنتی رۆژە رێیەك دوورە لەتەرسوسەوە بۆ چیاکان هەلات، مانویل گەیشتە دەشتاییەکانی قیلیقیە، هەندێ شار و قەلاکانی تەرسوسی داگیر کرد لەگەلّ (تل حمدون) و (عین زربی) و (مەسیسە)دا، قیلیقیە کەوتە بەر دەستی، سوروسی دووەم لەشوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر هەلّدەهات و خۆی دەشاردەوە[٢٤].

مانویل داوای لە رینولد شایتون کرد، لەبەردەمیا ئامادە بێ بۆ لێپێچینەوەی لەگرتنی (قبرص)دا. فەرمانڕەوای ئەنتاکیە، هاتنی ئیمپراتۆری زۆر پێ ناخۆش بوو، ئەوەشی دەزانی، کەوا ناتوانی بەرەنگاری ئەم سوپا زۆرەی پێ ناکرێ، داوای یارمەتی لە شا بلدوین کرد، گوێی بەوە نەدا کەوا شای (بیت المقدس) لە ئیمپراتۆر زیاتر پێی ناخۆشە خۆی دواخست و نەهاتە لای، چاوەڕێی ئەوە بوو، بێتە ئەنتاکیە، بەلام ئەوانەی لەگەلّیدا بوون ئامۆژگاریان کرد رازی بێ و مل بخەوێنێ، هات و لەمەسیسە لایەنگری خۆی بۆ دەرخست[٢٥].

### مانویل لە ئەنتاکیەدا

(بلدوینی سێیەم) کە زانی (مانویل) لەئەنتاکیە نزیك بۆتەوە بەپەلە بەرەو باکوور رۆیشت، ئەوە پێ ناخۆش بوو کە لە (رینولد شایتون) خۆشبووە، دەسبەجێ

داوای کۆبوونەوەی کرد لەگەڵ ئیمپراتۆردا. لەئەنجامی وتووێژی نێوانیاندا لەسەر ئەمانەی خوارەوە ڕێکەوتن:

- بەستنی پەیمانێك لەنێوانیاندا
- پەیوەندی بلدوینی سێیەم و برینولد شایتون چاك ببێتەوە. یەکەم بەڵێنی ئەوەی پێدا لەلایەن ئیمپراتۆرەوە لە سوروسی دووەم خۆشبێ و لێی ببورێ.
- ئیمپراتۆر یارمەتی سەربازی بەسەلیبیەکان بدات.

دوای ئەوەی (مانویل) چووە ناو شاری ئەنتاکیەوە لەمانگی (ڕەبیعی دووەم ٥٥٤ی کۆچی/١١٥٩ی زاینی) وتووێژی دیکەی لەگەڵ (بلدوینی سێیەم و رینولد شایتون) کرد زۆر بە نهێنی بەڕێوە چوو، هەر سێ لا ڕێکەوتن کەوا هێرشێك دژی موسڵمانەکان بەرپا بکەن و لەشاری حەڵەبەوە دەست پێبکەن[٢٦].

ئاشکرایە ئەو ڕووداوانەی ڕوویاندا بۆ پێداگرتنی سەلیبیەکان دەگەڕێتەوە لەسەر مانویل بۆ لەناو بردنی هێزی ئیسلامی کە ڕۆژ بەڕۆژ پەرە یدەسەند و (نورالدین محمود) فەرماندەیی دەکرد و هەوڵی دەدا لە وڵاتی شام دەسەڵاتی بەهێز بکات و ببوە مایەی مەترسی لەسەر ئیمارەتەکانی سەلیبی، ئەو رازی بوونەش لەسەر داواکردنی هێرشکردنە سەر موڵکەکانی (نورالدین محمود) بۆ ئەوە بوو، سەلیبیەکان بیر لە ڕووداوەکانی ئەنتاکیە نەکەنەوە[٢٧].

## مانویل لە وڵاتی شامدا

سوپای سەلیبی و بیزەنتی بەرەو لای ئیسلامەکان کەوتنەڕێ، (نورالدین محمود) ترسی لێ نیشت، نامەی بۆ (والیەکان و قەڵاکان نارد) لەکاری ڕۆمەکانیان ئاگادار کردەوەو داوای لێکردن وریا بن و لەئامادەباشیدا بن بۆ جیهاد بەرامبەر ئەوانەی دەیانەوێ لەناویان بەرن[٢٨]. لەپڕێکدا موسڵمانەکان و بیزەنتیەکان ئاشت بوونەوە لە ٥٥٤ی کۆچی/ ١١٥٩ی زاینیدا، هەروەك هیچ شتێك ڕوینەدابێ.

نووسەری ئەرمەنی (گریگوار)ی قەشە، باس لەمە دەکات و لەگەڵ (ابن القلانسی)دا یەك بۆچوونیان هەیە، پیاوانی نورالدین، دوو دڵ بوون بۆ سەربازگەی

ئیمپراتۆر بچن، سەرۆکی موسڵمانەکان ئامادەی شەڕکردن بوو، لەهەموو لایەکەوە میرەکان و والیەکان سەربازیان دەهات[٢٩].

لەگەڵ ئەم ژمارە زۆرییەیاندا، وای بەباش زانی لەگەڵ (مانویل) ئاشت بێتەوە، تاکو مەملەکەتەکەی نەکەوێتە نێوان دوو دوژمنەوە، سەلیبیەکان لە باشوورەوەو لە باکوریشەوە بیزەنتیەکانئیمپراتۆر، دوای گفتو گۆکانی، لەگەڵ نوێنەرانی (نورالدین)دا، رایگەیاند کەوا لەشکرکێشیەکەی دواخرا، دوای ئەوەی هەردوولا لەسەر ئەمانەی خوارەوە رێکەوتن:

- (نورالدین محمود) شەش هەزار دیلی نەسرانی ئازاد بکات، کە لەشەڕی سەلیبی دووەمەوە دیل کرابوون.
- بەڵێن بدات یارمەتی (مانویل) بدات لەدژی سەلجوقیەکانی رۆم.

ئەم نزیکبوونەوەیە کە لەنێوان (نورالدین) و (مانویل) روویدا خاسیەتێکی بەنرخی هەیە ئەگەر لایەکی بەهێزی وەکو سەلجوقیەکانی رۆم مەترسیەکی گەورەی دەبێ بۆ سەر بیزەنتیەکان. دوای رێکەوتنەکە مانویل بەرەو رۆژئاوا رۆیی و گەڕایەوە بۆ وڵاتەکەی خۆی[٣٠].

## پەیوەندییەکانی سەلجوقی-بیزەنتی بەر لەشەڕی میریوکیفالون

## لەشکرکێشی یەکەمی مانویل لە دژی سەلجوقیەکان

مانویل لەکاتی گەڕانەوەیدا لەئەنتاکیەوە بۆ ئەرمینیای بچووك و لەوێوە بۆ سلوقیە و ئەوجا لارندا[٣١]. رۆیشت. سەرەڕای بەئاسانی بەو رێگایەدا رۆیشت، بەڵام رێگایەکی پڕ مەترسی بوو، چونکی بەناو خاکی سەلجوقیدا تێدەپەڕی. مانویل بۆ ئەوە ئەو رێگایەی لەبەرگرت چونکی پەیمانی ئاشتبوونەوەی لەگەڵ قلیج ئەرسەلانی دووەمدا بەستبوو، رەنگە لەخۆبایی بوونی سەرکەوتنەکەی بووبێ کە لە ئەرمینیای بچووکدا لە باکووری شام بەدەستی هێنا، بۆیە ئەو رێگایەی لەبەرگرت. کە سوپای بیزەنتی لەشاری قونیە نزیك بووەوە، دانیشتوانەکە سەریان سوڕما و ترسیان لێ نیشت، وایانزانی مانویل ئابلۆقەی شارەکە دەدا، بەڵام سوپای بیزەنتی بە رێگای خۆیدا رۆیشت بەرەو (فیلومیلیوم)، کە گەیشە (کوتاهیە) تورکمانەکان هێرشیان کردە سەریان و هێرشیان کردە دواوەوەی

سوپاکەیان، ئەو کۆمەڵانە دەستیان لەیەخەیان نەکردەوە تا قوستەنتینیە، ئەم کارەی سەلجوقیەکان تۆڵەکردنەوە بو لە ئیمبراتور، چونکی پەیمانی ئاشتبوونەوەی لەگەڵ (نورالدین)دا بەستبوو[٣٢]. ئەم هێرشکردنانەی تورکمانەکان، ئیمبراتوری تورە کردبوو، قلیج ئەرسەلانی بە بەرپرسی ئەو هێرشانە دادەنا، ویستی تەمێی بکات، بۆیە بەرەو ئاسیای بچووك رۆیشت دوای سێ مانگ لەگەڕانەوەی لە کۆتایی ساڵی ٥٥٤ی کۆچی/١١٥٩ی زاینی، بۆ ئەوەی تۆڵە لە سەلجوقیەکان بکاتەوە. بەرەو هەرێمی (بیسینیا) کەوتەرێ، کە هۆزەکانی تورکمان لەوێ دەژیان، لەدەریای سیستوس پەرییەوەو هەندێ شاری داگیر کرد، هەروەها هێرشی کردە سەر تیپە چەکدارەکانی سەلجوقیەکان، کە لەدۆڵی رووباری (تمبریس) کۆببونەوە[٣٣].

سەلجوقیەکان بەرەنگاری ئەم هاتنە ناوەوەی بیزەنتیەکانیان کرد. ئەوەندە بەدەستو برد هێرشیان دەکردە سەر سەربازەکانی بیزەنتی، ئەوانەی بۆ سووسەکردن دانرابوون نەیاندەتوانی جوڵانەوەکانیان دیاری بکەن و پێی بزانن.

لەشکرکێشیەکەی مانویل کورت بوو، زۆری نەخایاند بە هاتنی وەرزی زستان و نەخۆشی ژنەکەیەوە کە زۆری نەبرد کۆچی دوایی کرد، گەڕایەوە[٣٤].

## لەشکرکێشی دووەمی مانویل لە دژی سەلجوقیەکان

(قلیج ئەرسەلان) نووسراوێکی بۆ (مانویل) نارد، داوای پەیمانی ئاشتی لێکرد، بەڵام (مانویل) رازی نەبوو. جارێکی کە کەوتە خۆ ئامادەکردن بۆ هێرش کردنە سەر موڵکەکانی سەلجوقیەکان[٣٥].

رەنگە پەیوەندییەکانی سوڵتان سەلجوقی لەگەڵ دانیشمەندیەکان و زەنگیەکاندا بەرەو خراپی دەڕۆیشت، پەیوەندی بەو داواکردنەوە هەبێ، یاغی ئەرسەلان، هێرشی بۆ دەوروبەری (بستان) بردبو، هەروەها (نورالدین محمود) لە ناوەڕاستی فوراتەوە هاتبووە ناو موڵکەکانی سەلجوقیەکانەوە[٣٦].

دانیشمەندییەکان سوور بوون شەڕی سەلجوقیەکان بکەن، بارودۆخی دەوروبەریان هاندەر بوو بۆ ئەمە، بەتایبەتی دوای مردنی (ذو القرنین)ی میری مەلتیە،

## مێژووی سەلجوقیەکان

لەکۆتایی ٥٥٦ی کۆچی/١١٦١ی زاینیدا، کوڕەکەی (ناصرالدین محمد) لەدوای خۆی دەسەڵاتی بەدەستەوە گرت[٣٧].

وادیارە تەماح و هاندانی (مانویل) وایانکرد، (یاغی ئەرسەلان) هێرش بکاتە سەر (مەلتیە) و داگیری بکات، میرە گەنجەکەی (محمد) کە نەوەی (عین الدولە)ی برای بوو، خستە ژێر فەرمانی خۆیەوە، (قلیج ئەرسەلان) بە فراوانبوونی موڵکی میری سیواس و زیادبوونی دەسەڵاتی رازی نەبوو، بۆیە کەوتە شەڕ لەگەڵیدا بۆ ئەوەی نەهێڵێ مەلتیە[٣٨] بگرێت، وا دەردەکەوێت سوڵتان وای دادەنا کەوا مەلتیە لەژێر دەسەڵاتی ئەودایە، بەو پێیەی (ذو القرنین)ی میری مەلتیە، دانی بەدەسەڵاتی سوڵتاندا نابوو بەر لەمردنی و لایەنگری سەلجوقیەکانی دەکرد. (یاغی ئەرسەلان) هێرشی کردە سەر (بستان) لەلای سیواسەوە، سەرکەوتنی بەدەست هێنا، (قلیج) ناچار بوو لە شارەکە دەست هەڵگرێ[٣٩].

لەهەمان کاتدا (نورالدین محمود) هێرشی کردە سەر موڵکەکانی سەلجوقی، وادیارە ئەمە بەپێی ئەو رێکەوتنەی لەگەڵ (مانویل)دا لەساڵی ٥٥٤ی کۆچی/١١٥٩ی زاینی دا، ئەنجامدا، توانی دەست بەسەر (بهسنا) و (رعبان) و (کیسوم) و (مرعش)دا بگرێت، هەروا هێرشی بۆ چەند شارێکی دیکەش کرد[٤٠]. بەمجۆرەقلیج ئەرسەلان، لە سێ لاوە هەڕەشەی لێدەکرا:

لەبەرەی دانیشمەندیەکانەوە لە سیواس لەباکووری رۆژهەڵاتەوە، بەرەی (نورالدین محمود) لە رۆژهەڵاتەوە، بەرەی ئیمبراتوری بیزەنتی (مانویل) لە رۆژئاواوە، کە بەپەلە کاری بۆ ئەوە دەکرد دەست بەسەر هەندێ ناوچەی سەلجوقیەدا بگرێت و دواجار هێرشێکی بەربڵاو بکات کاتێ شەڕ لەنێوان سەلجوقیەکان و دانیشمەندیەکاندا بەرپا دەبێ[٤١].

قلیج ئەرسەلانی دووەم، هەست کرد ناتوانێ لەسێ بەرەوە لەیەک کاتدا شەڕ بکات. بۆیە پەنای بۆ ئاشتبوونەوە برد، لە ئیسلامەکانەوە دەستی پێکرد، لەپێشدا لەگەڵ (نورالدین محمود)دا ئاشتبوونەوە، لەئەنجامی ئەمەدا سەلجوقیەکان ئەو شارانەیان بۆ گەڕایەوە کە (نورالدین) دەستی بەسەریاندا گرتبوو[٤٢]. دواجار لەگەڵ (یاغی ئەرسەلان)دا رێکەوتن کەوا سوڵتانی سەلجوقی

واز لە (بستان) بهێنێ لەگەڵ ناوچەکانی دەوروبەریدا لە چیای (لکام) و بیداتە دەستی (یاغی ئەرسەلان) وەکو پێشتر باسی لێوەکراوە[٤٣]، ئەوجا کەوتە وتووێژ لەگەڵ بیزەنتییەکاندا، بەمەبەستی ئاشتبوونەوەیەکی کە. (مانویل) داواکەی قلیج ئەرسەلانی دووەمی رەتکردەوە خۆی ئامادەکردبوو بۆ داگیرکردنی خاکی سەلجوقی. یەکێ لە فەرماندەکانی (یوحنا کونتوستیفانوس)ی بۆلای (رینولد شایتون) و (سوروسی دووەم) نارد، بۆ کۆکردنەوەی هێز کە ئەو دوو سەرکردە سەلیبی و ئەرمەنیە بەڵێنیان دابوو لەو کاتەی ئیمبراتور قیلیقیەو ئەنتاکیەی داگیر کردبوو. هەروەها هەندێ هێزی کرێگرتەشی لە دورگەی (رودس) کۆکردەوە، بەر لەوەی بەرەو خاکی پیرۆز بکەوێتەرێ، ئەم کۆکردنەوەیە بۆ لەناوبردنی سەلجوقیەکان بوو[٤٤].

(مانویل) لەپایتەختەوە کەوتەرێ، چووە دۆڵی (میاندەر)، لەهەمان کاتدا (یوحنا کونتوستیفانوس) لە قیلیقیەدا، (قلیج) ناچار سوپاکەی دابەشکرد، بۆ بەرەنگاربوونەوەی هەردوو سوپاکەی بیزەنتی، بۆیە توانای شەڕکردنی لاواز بوو. (مانویل) سەلجوقیەکانی لەغەفڵەتدا گرت، لە (فیلادلفیا)وە هێرشی برد، چونکی ئەو راپورتانەی گەیشتبوونە (قلیج) لە وبڕوایەدا نەبوو بگاتە ئەو شارە.. بەڵام سوڵتانی سەلجوقی توانی، لە روویاندا راوەستێ، دوای ئەوەی هێزەکانی رێکخستنەوە بەجۆرێك ئیمبراتور سەری سوڕما. شەڕی لێدەو بکشێوەی بەکارهێنا، بەوە شەوی نەوەستا، هێرشی کردە (فیلانا) و (لازیق)[٤٥] لەو کاتەی (مانویل) پەرییەوە بۆ ئاسیای بچووك بۆ شەڕی قلیج ئەرسەلانی دووەم، کەوتە گفتو گۆوە لەگەڵ میرە موسڵمانەکاندا لەناوچەکە، بۆ ئەوەی هەموو لایەکی لێ ببڕێ، نەتوانێ بە هەموو لایەکدا بجووڵێ و لەگەڵ ئیسلامەکاندا بەرەیەك دامەزرێنێ لەدژیدا، لەو گفتوگۆیەدا (یاغی ئەرسەلان و شاهنشا) بەشدار بوون، بۆ ئەوەی قلیج هەوڵەکانی ئیمبراتور تێك بدات، قلیج کەوتە وتووێژ لەگەڵ (یاغی ئەرسەلان)دا، توانی بۆ لای خۆی رایکێشێ، هەروەها لەگەڵ (شاهنشا)ی برایدا رێکەوت و چەندین شاری بۆ گەڕاندەوە[٤٦]. سوپای بیزەنتی کەوتە بەر هێرشی توندی سەلجوقیەکان، بەتایبەتی لەناوچە شاخاوییە سەختەکاندا، بەڵام کە

## مێژووی سەلجوقیەکان

گەیشتنە دەشتاییەکان، بیزەنتیەکان خۆیان کۆکردەوە کەوتە شەڕێکی سەختەوە، سەلجوقیەکان شکان، چەند شارێکی داگیر کرد، کە (یوحنا کونتوستیفانوس) گەیشت، سەلجوقیەکان جارێکی تر شکستیان هێنا(٤٧).

**هەندێ سەرکەوتنی دیکەی بیزەنتیەکان بەسەر سەلجوقیەکاندا**

لەناو ئەم بارودۆخەدا، قلیج ئەرسەلان، ناچار بوو سەر لەنوێ داوای ئاشتبوونەوە لە ئیمبراتوری بیزەنتی بکات، بەڵێنی دا هەموو ئەو دیلە بیزەنتیانەی لەلایەتی ئازادیان بکات(٤٨) لەو کاتەی خەریکی گفتوگۆ بوون، (یوحنا کونتوسیتفانوس) لەلایەن پیاوەکانی سوڵتانەوە، بۆسەیان بۆ دانابوو، ئەم رووداوە لەبەرژەوەندی (مانویل)بوو زیاتر پێی لەسەر مەرجەکانی داگرت (قلیج ئەرسەلان)یش، نەرمی پیشاندا، لەسەر ئەمانەی خوارەوە رێکەوتن:

- رێزگرتن لە سنوورەکانی نێوانیان.
- دانانی تیپێکی سەربازی بۆ نەهێشتنی دەستدرێژیکردن بۆ سەر سنوورەکان.
- گەڕنەوەی شارە بیزەنتیەکان کە لەم دواییانەدا داگیرکراون.
- تیپێکی سەربازی سەلجوقی لەگەڵ سوپای بیزەنتیدا لەکاتی پێویست بەشداری شەڕ بکەن.
- ساڵێ جارێك سەردانی ئیمبراتور بکات(٤٩).

دەتوانین بڵێین (مانویل) لەم پەیمانەدا سەرکەوتنی بەدەستهێنا کە لە کۆتایی ساڵی ٥٥٧ی کۆچی/١١٦١ی زاینیدا بەسترا. توانی تا ماوەیەك فراوانبوونەوەی سەلجوقیەکان لە ئاسیای بچووکدا راگرێ، دوای تەواو بوون و ئامادەکردنی کاروبارەکان، لەبەهاری ساڵی ٥٥٨ی کۆچی/ ١١٦٢ی زاینیدا سەردانێکی فەرمی بۆ قوستەنتینیە بکات، هەزار سواری لەگەڵدا بوو، ئیمبراتور بەگەرمی پێشوازی لێکرد و ئاهەنگی بۆ گێرا و دیاریەکی زۆریشی پێدا (٥٠). رێکەوتنەکەیان ئەم سەردانەی دیاریکردبوو، تاکو ئەوەش بزانێ کەوا (یاغی ئەرسەلان) خەریکی چی پیلانێکە لە دژی، تاکو لەسەر فەرمانڕەوایی لایبدات و یەکێکی دیکە لەبراکانی دابنێ(٥١). بەڵام لەکاتی سەردانەکەیدا، لەگەڵ ئیمبراتور رێکەوتن هەندێ گۆڕانکاری لەپەیمانەکەیاندا بکەن لەوانە:

- دان بەوەدا دەنێ کەوا دوژمنەکانی ئیمپراتور دوژمنی ئەویشن.
- ئەو شارانەی کە پێشتر بەشێك بوو لە ئیمپراتوریەتی بیزەنتی بۆ (مانویل) دەبێ بیگێڕنەوە، لەوانە (ئەماسیە)و دەوروبەرەکەی.
- تیپی سەربازی دابمەزرێنرێ و بەناوچەکاندا بگەڕێ بۆ پاراستنی لە هێرشی هۆزە تورکمانەکان.
- لەگەڵ لایەنی سێیەمدا، هیچ رێکەوتنێك ئەنجام نادرێ بەبێ رەزامەندی ئیمپراتور[٥٢].

سەردانەکەی قلیج ئەرسەلان بۆ قوستەنتینیە لە هەردوو پایتەختەکە پێشوازی باشی لێکرا و پێیان خۆش بوو، هەرچەندە (مانویل) بەتەواوی هەموو لایەکی لێ بڕیبووەوە وەك لەژێر دەسەڵاتی ئەودا بێ، سەرەڕای ئەو قازانجەی ئیمپراتور بەدەستی هێنا، ئەوەی پێ خۆش هات کەوا بەهێزترین میری موسڵمانان هاتووە بۆلای و لەبەردەم گەلەکەیدا وەلای خۆی پێشکەشی دەکات. بەڵام ئەم سەردانە ئەنجامی سیاسی گرنگی لێ نەکەوتەوە. سەردانێکی دۆستانە بوو، لەوانەشە جۆرە سیخوڕیکردنێك بێ، تاکو لایەنی بێ هێزی و توانای ئیمپراتورییەتەکە لە نزیکەوە بزانێ. گومانی تێدا نییە، سوڵتانی سەلجوقی گەلێ نهێنی کۆشکی ئیمپراتوری زانی بەتایبەتی پەیوەندیان بە دانیشمەندیەکانەوە. بەبەڵگەی ئەوەی قلیج لەپێش دەستو پێوەندەکانیدا ئاشکرای کرد، دوای گەڕانەوەی بۆ پایتەختەکەی، چەند زیان بە ئیمپراتوریەتی بیزەنتی دەگەیەنێ، ئەوەندە بەخشش و دیارییەکانی ئیمپراتور بەنرخن، ئەمە بەڵگەی ئەوەیە کە زیرەکی سیاسی هەبوو، ئەوەشی زۆر پێ گران بوو کەوا ئیمبرتور (شاهنشا)ی برای لەلای خۆی هێشتبووەوە[٥٣].

(مانویل) بڕوای وابوو کەوا سەلجوقیەکانی خستۆتە ژێر دەسەڵاتی خۆیەوە بەڵام ئەمە کاتی بوو، هەر بەڕواڵەت سەرکەوتنی بەدەستهێنا بوو، کە (قلیج ئەرسەلانی دووەم) کەلکی لێ وەرگرتبوو لە ململانێی لەگەڵ دانیشمەندیەکاندا. لەساڵانی ٥٥٨-٥٦٩ی کۆچی/ ١١٦٢-١١٧٣ی زاینی هێرشی سەلجوقیەکان بەدرێژایی سنورەکان بەردەوام بوو

**لەناوبردنی ئیمارەتی دانیشمەندی لە سیواس**

ئەو سەرکەوتنەی قلیج ئەرسەلان لەپایتەختی بیزەنتی بەدەستی هێنا، ترسی خستە دڵی میری سیواس (یاغی ئەرسەلان)ەوە نامەی بۆ نووسی، ئاگربەست لەنێوانیاندا ببەستن، سوڵتان داواکەی قەبوڵکرد و پەیوەندی نێوانیان چاك بووەوە[٥٤]. ئەم چاکبوونەوەی نێوانیان، کارێکی کاتی و پێویستیەکی قۆناغەکە بوو، (یاغی ئەرسەلان) دەیویست، هەناسەیەك بدا و خۆی ئامادە بکات. چونکی هێشتا هەستی بەمەترسی (قلیج ئەرسەلانی دووەم) دەکرد، ترسی ئەوەی هەبوو دەست بەسەر ئاسیای بچووکدا بگرێت و خۆی دەسەڵاتی بەسەر هەموو تورکەکاندا هەبێ، بۆیە لەناوبردنی یا کەمکردنەوە دەسەڵاتەکانی مەبەستی دانیشمەندیەکان بوو.

لەساڵی ٥٦٠ی کۆچی/١١٦٤ی زاینی، شەڕ لەنێوانیاندا نەما، کاتێ قلیج ئەرسەلان، کچی فەرمانڕەوای (ئەرزنی رۆم) میر عزالدین سلدق کوڕی عەلی) خواست، میری دانیشمەند یاغی ئەرسەلان، هێرشی کردبووە سەر کەژاوەی بووك لەو کاتەی بەرەو قونیە دەیانبرد، رفاندبووی و لە برازاکەی مارەی کردبوو –ذو النون کوڕی محمد– داواشی لە بووکە کردبوو، لەدینی ئیسلام هەڵگەڕێتەوە، تاکو سوڵتان مارەیی نەیەت[٥٥] ئەم رووداوە، بووە هۆی هەڵگیرساندنی شەڕ لەنێوانیاندا، میری دانیشمەند، لەم شەڕەدا سەرکەوت، ناچار سوڵتانی سەلجوقی داوای یارمەتی لە ئیمپراتۆری بیزەنتی کرد. کاتێ قلیج ئەرسەلانی دووەم لە سیواس نزیك بووەوە، تا هێرش ببات، لەم کاتەدا هەواڵی مردنی یاغی ئەرسەلانی پێگەیشت[٥٦] ئیمارەتی دانیشمەندی، دوای مردنی (یاغی) دابەشکرا. لە (بستان) دانیشتوانەکەی (جمال الدین)ی کوڕیان لەجێگای دانا، بەڵام زۆر نەمایەوە، ئامۆزاکەی (ابراهیم کوڕی محمد) لێی هەڵگەڕایەوە و وڵاتی بەدەستەوە گرت، بەڵام دوای چەند مانگێك (اسماعیل)ی کوڕی چووە جێگاکەی، ئەم گۆڕانکارییە سیاسیانە، نا ئارامی و ئاژاوەی نایەوە (قلیج) ئەمەی بەهەل زانی، چووە سیواس و ئیمارەتەکەیان لەناو برد و کەوتە دەستی خۆیەوە.

ئەم رووداوە سیاسی و سەربازیانە کە لە ئاسیای بچووکدا روویاندا تا ساڵی ٥٦٩ی کۆچی/١١٧٣ی زاینی، ئاڵۆز و نادیار بوون. بەلام دەبینین لە کۆتاییدا قلیج ئەرسەلانی دووەم دەستی بەسەر زۆربەی ناوچەکاندا گرت.
لەساڵی ٥٦١ی کۆچی/١١٦٨ی زاینیدا، قلیج ئەرسەلان دەسەڵاتی لەناو ئەنادۆڵ دا فراوانکردەوە، رووباری (طومە) و شاری (طرندە)ی گرت[٥٧]، لەگەڵ (بستان) و (جیدوك)[٥٨]دا بۆ ساڵی داهاتوو، (شاهنشا)ی برای، لە (ئەنقەرە) و (کنغری) دەرکرد، هەروەها هێرشی کردە سەر موڵکەکانی دانیشمەندیەکان لە مەلتیە، و ساڵی ٥٦٤ی کۆچی/١١٦٨ی زاینی، قەیسەری خستە ژێر دەسەڵاتیەوە، کە لەژێر فەرمانڕەوای ( ذو النون) بوو، کە هاوپەیمانی کۆنی بوو[٥٩].
لەئەنجامی ئەم گۆڕانکاریە سیاسیانە، (ذو النون) چووە پاڵ (شاهنشا)و هەردووکیان داوای یارمەتیان کرد لە دەرەوە. چونکی (مانویل) لەو کاتەدا لە ئەوروپا سەرقاڵ بوو، نەیتوانی دەستی یارمەتیان بۆ درێژ بکات، ئەوجا روویان کردە (نورالدین محمود) کە لەمەسەلەکەیان گەیشت و بڕیاریدا یارمەتیان بدات[٦٠].
بەمجۆرە جارێکی کە (نورالدین محمود) کەوتە ناو کێشەکانی ئاسیای بچووکەوە، ئەو بەو پێیەی بەهێزترین میری رۆژهەڵاتەو کار بۆ یەکگرتنی موسڵمانەکان دەکات، بۆ بەرەنگاربوونەوەی سەلیبیەکان، بە فراوانبوونی دەسەڵاتی (قلیج ئەرسەلان) رازی نەبوو، هەستی کرد بەرەو مەلتیە بڕوات دەبێتە جێگای مەترسی ئەو، چونکی دەست بەسەر ئەو رێگایەدا دەگرێت کە بۆ دۆڵی فورات دەڕوات، بڕیاریدا نەهێڵێ بێتە پێشەوەو وڵاتی دانیشمەندیەکان داگیر بکات.
ساڵی ٥٦٧ی کۆچی/١١٧١ی زاینی، هاوپەیمانیەکی پێکەوەنا، کە بریتی بوو لە دانیشمەندیەکان و میری موسڵ و ماردین، قەڵای زیاد و هاوپەیمانەکەی میری ئەرمەنی (ملیح) فەرمانڕەوای قیلیقیە[٦١]. هەموویان لەسیواس کۆبوونەوە، کە پایتەختی (اسماعیل کوڕی ابراهیم) بوو، تا لە رووی هێرش بردنە سەر موڵکەکانی دانیشمەندیەکان راوەستن، بەلام (نورالدین) لەجاڕدانی شەڕدا پەلەی نەکرد و دەستی کردە خەڵەتاندنی هاوپەیمانەکان، کاتێ پێیان راگەیاند، کەوا نیازیان وایە

بەبێ ئەو شەڕ بەرپا بکەن. ساڵی ٥٦٨ی کۆچی/١١٧٢ی زایینی، بەفەرماندەیی خۆی هێرشی کردە سەر سەلجوقیەکان.

- لێرەدا دەبێ بپرسین هۆی چی بوو نورالدین خۆی دواخست لە هێرش بردنە سەر سەلجوقیەکان، گەلێ هۆی هەبوو، لێرەدا هەندێکی بەیان دەکەین:

- - لەو کاتەدا (نورالدین محمود) کەوتە خەمی ئەو رووداوانەی لە رۆژهەڵاتی مەملەکەتەکەیەوە روویان دەدا دوای مردنی (قطب الدین)ی برای کە لەساڵی ٥٦٥ی کۆچی/١١٧٠ی زایینی میری موسڵ بوو، هەردوو کوڕەکەی (سیف الدین غازی) و (عماد الدین) ناکۆکی کەوتە نێوانیانەوە، نورالدین تا حەوت هەشت مانگ دوای گرتنی موسڵ، نەیتوانی چارەسەری ئەو کێشەیە بکات.

- نورالدین، خۆی بۆ چارەسەرکردنی کێشەی میسر تەرخانکرد، کە موسڵی داگیر کرد، (صلاح الدین ایوبی) کە یاریدەدەری بوو خۆی چەسپاند و ناخۆشی نەکەوتە نێوانیانەوە دوای رووخانی دەوڵەتی فاتیمی، چونکی پەیوەندیەکانی نێوانیان دیاریکرا[٦٢].

- نورالدین محمود، هەوڵی دەدا یەکێتی ئیسلامی بەدی بهێنێ، نەیدەویست قلیج ئەرسەلان لاواز بکات، کە ئەویش بەرەیەکی ئیسلامیە. هەروەها بەهیوای ئەوەوە بوو قلیج هێرش بۆ ئەنتاکیە ببات و بیزەنتیەکان سەغڵەت بکات، ئەو کاتە دەوڵەتی بیزەنتی خۆی لەنێوان دوو دوژمندا دەبینیەوە، ئەویش (قلیج ئەرسەلانی دووەم) و (ملیح) میری قیلیقیە دا. بۆیە، داوای لێکرد بێتە ناو هاوپەیمانیەوە بۆ جیهاد کردن دژی سەلیبیەکان و بیزەنتیەکان.

بەڵام (قلیج ئەرسەلانی دووەم) پەیمانی لەگەڵ دەوڵەتی بیزەنتیدا بەستبوو، ترسا هاوپەیمانی لەگەڵ (نورالدین محمود)دا، ئیمبراتور تۆڵەی لێ بکاتەوە، بۆیە داواکەی (نورالدین)ی رەتکردەوە. بۆ ئەوەی بێ لایەنی خۆی بسەلمێنێ، ساڵی ٥٦٨ی کۆچی/١١٧٢ی زایینی لەگەڵ ئیمبراتوردا کۆ بووەوە، پابەند بوونی خۆی لەسەر پەیمانەکەی دووپات کردەوە لەئاست ئەم قەبوڵنەکردنەی سەلجوقیەکان، (نورالدین محمود) هیچ رێگا چارەیەکی بۆ دەست بەسەرا گرتنی (قلیج ئەرسەلانی دووەم) نەبینی لەوەی زیاتر گوشاری زۆر بخاتە سەری و هێرش بۆ سەر

موڵکەکانی بکات.. (بهسنا) و (مرعش) و ئەو قەڵایانەی لەنێوان ئەو دوو شارەدا هەبوون دەستی بەسەریاندا گرت، هێزێکی سەربازی بۆ سیواس نارد، چووە ناو شارەکەوەو (ذو النون)ی تیادا کردە فەرمانڕەوا، سوڵتانی سەلجوقی نەیتوانی بەرەنگاری بکات[٦٣].

هەردوو لا هێزەکانیان هێنایە قەیسەری[٦٤]، هاوپەیمانەکان لەسەر رووباری (بیراموس) مۆڵیان خوارد، هێزەکەی (قلیج ئەرسەلان)یش بەو بەر رووبارەکەوە بوون. بۆ ماوەی شەش مانگ، بەرامبەر یەکیان گرت، (قلیج ئەرسەلان) کە ئەو هێزەی دوژمنەکانی بینی، بیری لە ئاشتبوونەوە کردەوە، بەتەنها چارەی دانا بۆ دەرچوون لەم تەنگژەیە. نامەی بۆ (نورالدین محمود) نارد بۆ ئەم مەبەستە، لەم ماوەیەدا هیچ جوڵانەوەیەکی سەربازی روویندا[٦٥]. ئەوەی پاڵی بە (نورالدین محمد)ەوە نا، ئاشتبوونەوە قەبوڵبکات، سەلیبییەکان گوشاریان خستبووە سەر موڵکەکانی لەولاتی شام و سەلیبییەکان لەو کاتەدا لەشاری (حمص)بوون[٦٦] هەروەها دەیویست (قلیج ئەرسەلانی دووەم) بهێنێتە ناو بەرەی ئیسلامی یەکگرتووەوە، (ابن الاثیر) هەندێ لایەنی ئەو رێکەوتنەو، داواکانی (نورالدین محمود) کە سوور بوو لەسەر جێبەجێ کردنیان، کە بەم شێوەیە: (من هەندێ کارو رێسام لەتۆ دەوێت، دەست لەچی هەڵگرم، لە سێ شت واز ناهێنم):

یەکەم: ئیسلامبوونی خۆت نوێ بکەیتەوە، چونکی من تۆ بە موسڵمان نازانم[٦٧].

دووەم: ئەگەر داوای سەربازم لێ کردی، دەبێ بیان نێریت، چونکی شوێنێکی زۆری ولاتی ئیسلامت لەژێر دەستدایە چوویتە پاڵ رۆمەکان، لەگەڵیاندای، یان دەبێ سەربازەکانت بنێری تا شەڕی (فرەنج) بکەم، یاخود خۆت دەست بکەی بە جیهاد کردن و شەڕی رۆمەکان بکەی.

سێیەم: کچەکەت لە (سیف الدین غازی برازام) مارە بکەیت.

قلیج ئەرسەلان، کە ناوەڕۆکی نامەکەی زانی وتی: (نورالدین دەیەوێ تۆمەتی زەندەقەم بداتە پاڵ، داواکانی بەجێ دەهێنم، لەسەر دەستی نوێنەرەکەشی ئیسلامبوونی خۆم نوێ دەکەمەوە)[٦٨].

(ابن الاثیر) هەموو بەندەکانی ئاشکرا نەکردوە، ئەو لایەنانەی پەیوەندی بە بارودۆخی میرە موسڵمانەکانەوە هەیە باسی نەکردووە، دوای تەواو بوونی پەیمانەکە (نورالدین) گەڕایەوە و سوپاکەی لە سیواس مایەوە لەگەڵ (فخرالدین عبدالمسیح)دا بەلای (ذو النون)ەوە لەوێ مایەوە تا (نورالدین) کۆچی دوایی کرد ئەوجا سەربازەکانیشی لەوێ نەمان و قلیج ئەرسەلان و موڵکەکانیشی گەڕانەوە[٦٩].

بەڵام دەتوانین شێوەی گفتوگۆکەو داواکارییەکان وەکو لەسەرچاوە نەسرانیەکاندا باسی لێوەکراوە، بەم شێوەیە بووە: دەبێ قلیج ئەرسەلان ئەمانەی خوارەوە بکات:

- دیلەکان بەرەڵلا بکات، کاتێ لە مەلتیە بەدیلی گرتبوون،
- ناوچەکان بۆ شاهنشا و ذو النون بگەڕێنێەوە.
- برازاکانی، هەر چواریان، کە لەلای زیندانی کرابوون ئازاد بکرێن.

قلیج ئەرسەلان، بەندی یەکەمی جێبەجێکرد و دوو بەندەکەی دوایی قەبوڵ نەکرد. بۆیە هاوپەیمانەکان گوشاریان خستە سەری، ئەویش هەڕەشەی کوشتنی برازاکانی کرد، دواجار لەسەر ئەمانەی خوارەوە رێکەوتن:

- قەیسەری بۆ (ذو النون) بگەڕێتەوە.
- شاهنشا، لە ئەنقەرە دابنرێت[٧٠].

بەمجۆرە، نورالدین بۆی نەکرا هەموو موڵکەکانی شاهنشا، بگەڕێنێتەوە، (نورالدین) لە ١١ شەوالی ٥٦٩ی کۆچی/١٥ی ئایاری ١١٧٤ی زاینی[٧١] کۆچی دوایی کرد. ئیتر ئەو گوشارەی سەر قلیج هەڵگیرا، مردنیشی ئاماژەیەك بوو بۆ سەرەتای روخانی ئیمارەتی دانیشمەند.

وا رێکەوت ساڵی ٥٦٨ی کۆچی/١١٧٢ی زاینی (اسماعیل کوڕی ابراهیم) لەکاتی شۆڕشێکدا کە لە سیواس خەڵکەکە لە دژی جەورو چەوساندنەوە راپەریبوون کوژرا، ژنەکەشیان لەگەڵیدا کوشت، کە خوشکی قلیج ئەرسەلان بوو، دانیشتوانەکە (ذو النون)یان هێنا، کە ئەو کاتە بۆ دیمەشق هەڵاتبوو، هێنایان و دەسەڵاتیان دایە دەستی لە شوێن (برازاکەی ئیسماعیل) بووە فەرمانڕەوای

شارەکە، (ذو النون) رازی بوو، کە لە سیواس نزیك بووەوە، دانیشتوانەکە دەرچوونە پێشوازی و رەزامەندی خۆیان بۆی پیشاندا[72].

قلیج ئەرسەلان، مردنی (نورالدین) و گەڕانەوەی هێزەکانی نورەدین و گۆڕانکارییە سیاسیەکانی سیواس، بۆ لەناوبردنی ئیمارەتی دانیشمەندی لەو شارەدا بەهەل زانی، هێرشی کردە سەر موڵکەکانی (ذو النون) و دەستی بەسەر سیواس و قەیسەری و کومانا و گەلێ شاری دیکەدا گرت. کە ناچار کرابوو پێشتر لە کەبادوکیەی رۆژهەڵات چۆڵی بکات[73].

(ذو النون) لەگەڵ (شاهنشا)دا، بۆ قوستەنتینیە هەڵاتن، تاکو (مانویل) یارمەتیان بدات.

بەمجۆرە ئیمارەتی دانیشمەندی لەسیواس روروخا و قلیج ئەرسەلان ساڵی ٥٧٠ی کۆچی/١١٧٤ی زاینی پەردەی بەسەریا دادایەوە[74].

سوڵتانی سەلجوقی ئەو توانایەی لەبەرەنگاربوونەوەی سیاسەتی (نورالدین محمود) و مانویل لە ئاسیای بچووکدا دەرخست، لە ناوچەکەدا ناوی دەرکرد، بووە ئەو سەرکردەیەی کە توانای یەکگرتنەوەی ئاسیای بچووکی هەیەو بەرەنگاری هێزی نەسرانیەکان بێتەوە، بەچاوی ترسەوە دەیڕوانیە نورالدین و مانویل. یەکەمیان مرد و هیچی پێ نەکرا، دووەمیان خەریکی کاروباری مەجەڕ و بەلقان بوو، کە ماوەی بۆ قلیج رەخساند دەستی بەسەر زۆربەی ناوچەکانی ئاسیای بچووکدا گرت و بەرەو فوڕات رۆیشت و ئامادەش بوو لە رووی بیزەنتیەکانیشدا بوەستێ.

## سەرهەڵدانەوەی ناکۆکی لەگەڵ بیزەنتیدا

### شەڕی میریوکیفالون

دوای ئـــەوەی((مانویـــل)) کێـــشەکانی لـــە ئـــەورووپا چارەســـەرکردولەگەڵ ((بوندوقیەکاندا)) پەیمانی ئاشتبوونەوەی بەست،گرینگی دایە کاروباری ئاسیای بچوك،دوای ئەوەی قیلج ئەرسەلان بۆماوەی دوانزە ساڵ پشتگیری دەسەلاتەکەی کـرد، هەسـتی کرد،بەهێزبوونی سـوڵتان بەسـەر ناوچـەکەدا مەترسـیەکی گـەورە پێکدەهێنێ لەسەر سیاسـەتی بیزەنتـی. سـەرەڕای ئەمـەش دەیویـست، ڕێگاکـان مسۆگەر بکات بۆ بیزەنتیەکان، سوڵتان توانی تورکەکان یەك بخـات و هەسـتی بـە گوشاری تورکەکان دەکرد لەسەر سنوورەکانی ڕۆژهەلاتی ئیمپراتۆریـەت، چـونکی سـەلجوقیەکان بـەردەوام هەڕەشـەیان لـە دۆڵـی رووبـاری ((میانـدەر)) دەکـرد. و زیانێکی زۆریان بە خەڵکی دێهاتەکان دەگەیانـد. لەراسـتیدا سـالانی ٥٥٨–٥٧٠ ی کۆچی /١١٦٢–١١٧٤ ی زاینی ئارام نەبوو، قلیج ئەرسـەلانی دووەم، بەنـد ەکـانی پـەیمانی سـاڵی ٥٥٨ کۆچـی / ١١٦٢ زاینـی جـێ بـە جـێ نـەکرد، شـارەکانی بـۆ ئیمپراتۆر نەگەڕاندەوە، هەروەها هێرشـی سـەلجوقیەکان بـەردەوام بـوو بـۆ سـەر ناوچە سـنووریەکان. کـاتێ ئیمپراتـۆر داوای لێ کـرد ئـەو هێرشـانە ڕاگـرێ.زۆر بـە زیرەکانە وتی : مـن ئاگـام لێ نـەبووە و بەمـەش رازی نـیم، داوای لێبـوردنی کـردو هەندێ دیاریشی بۆ ناردبوو ((٧٤)) بە هـۆی سیاسـەتی کـەڵك وەرگـرتن لـە کـات، قیلج ئەرسەلانی دووەم توانی خـۆی بـەهێزبکاو تورکـەکانیش یـەك بخـات، کەچـی ئیمپراتۆر هیچ کارێکی وا جددی ئەنجام نـەدا، لـەوەی زیـاتر هەنـدێ شـوێنی قـایم کرد لە دۆڵی رووباری میاندەر و رووباری هرمس، تا شارەکانی ناوچەکە بەیەکـەوە ببەستێتەوە ((٧٥))

## پێشەکیەکانی جەنگەکە

لەساڵی ٥٦٨ی کۆچی / ١١٧٢ ی زاینی پەیوەندیەکانی نێوان سەلجوقیەکان و بیزەنتیەکان ئاڵۆز بوو، کاتێ قیلج ئەرسەلانی دووەم و ((نورەدین مەحمود)) بوونە هاوپەیمانی یەکتر، ((مانویل)) ئەم هاوپەیمان بوونەی بە دژی خۆی لە قەڵەمدا، بەمە ئاڵۆز بوو کەوتە کۆششی سەرنەگرتنی، پەیوەندی بە سوڵتانی سەلجوقیەوە کرد و ئامادەیی خۆی بۆ نیشاندا هێرش بکاتە سەر ((نورەدین)) ئەگەر هات و ((نورەدین)) دەستدرێژی کردە سەر سەلجوقیەکان بە مەرجێ لەو هاوپەیمانیە بکشێتەوە.. وا دەردەکەوێت "قیلج ئەرسەلانی دووەم بەم داوایەی ئیمپراتۆر رازی نەبوو. بەڵام مردنی ((نورەدین)) ئەو هەوڵدانەی راگرت. ئیتر بە رواڵەت وا دەردەکەوت پەیوەندیان دۆستانەیە. بەڵام لە راستیدا وا نەبوو. هەر لایەکیان خۆی ئامادە دەکرد هێرش بۆ ئەویتربەرێ و لە هەل دەگەڕان ((٧٦)) ئەو هەلە رەخسا، لە ساڵی ٥٧٠ی کۆچی / ١١٧٤ زاینی، لە ئاسۆی سیاسیدا، هەندێ هۆکار یارمەتی بەرپابوونی شەڕی دا، هەندێکیان پەیوەندیان بە سەلجوقیەکانەوە هەبوو، هەندێکی تریان پەیوەندیان بە بیزەنتیەکانەوە هەبوو،

ئەوەی پەیوەندی بە سەلجوقیەکانەوە هەبوو، دەتوانین ئەم هۆیانە دەستنیشان بکەین :-

-پەنابردنی هەریەك لە شاهنشا و ذوالنون بۆ قوستەنتینیە وپێشوازی کردنیان لە لایەن ئیمپراتۆرەوە، کە بووە هۆی مەترسی قیلج ئەرسەلان.

-هاتنە ناوەوەی ئیمپراتۆری ئەڵمانی((فردریك بربروسا)) بۆ ناو مەسەلە سیاسیەکان، کاتێ نامەی لەگەڵ قیلج ئەرسەلانی دووەمدا گۆڕییەوە، بەو پێیەی بەهێزترین و سەخت ترین دوژمنی ئیمپراتۆریەتی بیزەنتیە لە رۆژهەلاّتدا و هاندانی بۆ شەرکردن لەگەڵ بیزەنتیەکاندا، دەیویست سەرنجی((مانویل)) راکێشێ بۆ گرینگیدان بە کاروباری ئەورووپی ((٧٧))

-لە ناو بردنی ئیمارەتی دانیشمەندی لە لایەن قیلج ئەرسەلانەوە و لە سیواس هانییدا لەگەڵ((مانویل)) دا شەڕبکات، دوای ئەوەی هەستی کرد ئاسایشی

## مێژووی سەلجوقیەکان

سەلجوقیەکان لە ستورەکانی رۆژئاوا بەدی نایەت تاکو ئەو شارانەی بیزەنتیـەکان لە ئاسیای بچوك ماونەتەوە نەخاتە ژێر دەسەلاتیەوە ((٧٨))

ئەوەی پەیوەندی بە بیزەنتیەکانەوە هەبوو دەتوانین ئەمانە دیاری بکەین :

-مانویل بە بەستنی پەیمانیك لەگەڵ ((بندقیە))دا لە کێشەکانی بووەوە، هەروەها سەرهەڵدانەوەی ناکۆکی لە نێوان ((پاپا)) و((فردریك بربروسا)) ماوەی پێدا خـۆی بـۆ کاروبـاری رۆژهـەلات تـەرخان بکـات و لەگـەڵ سـەلجوقیەکاندا شـەڕ دەسـت پێبکاتەوە و سنورێك بۆ بلاوبوونەوەی سەلجوقیەکان دابنێت ((٧٩))

-قایمکردنی شاری ((لازیق)) لە دۆلی رووباری ((میاندەر)) بیزەنتیەکانی هاندا بـۆ ناوچەکە بگەڕێنەوەو ئـاوەدانی بکەنـەوە. باجیـان دایـە خەزێنـەی ئیمپراتۆریـەت، مانویل هەستی بەم سوودە کرد، بۆیە کەوتە هەوڵی ئەوەی دانیشتوانەکەی تیـادا بمێنێتەوە ((٨٠)) کە مانویل داوای لە قیلج ئەرسەلان کرد، موڵکـەکانی شاهنـشا و (ذوالنون) بۆیان بگەڕێنێتەوە شەڕ هەڵگیرسا. هەروەها مانویـل داوای گەڕانـەوەی شـارە بیزەنتیـەکانی کردبـوو بـەپێی ڕێکەوتنەکـەی سـاڵی ٥٥٨ی کۆچـی /١١٦٢ زاینی ((٨١))

((مانویل)) ئەم داخوازیانەی بۆ قیلج ئەرسەلانی دووەم نارد پێشەکی داینابوو جیّ بەجێیان ناکـات، بۆیـە خـۆی بـۆ شـەڕ ئامـادەکرد. سـوڵتانی سـەلجوقیش، وەکـو دەیبینین، سەڵماندی کە پیاوێکە دەتوانێ دەوڵەت بەڕێوەببات، پلانێکـی ژیرانـەی ئەنجام دا، داشینابووئەو داوایانە جیّ بەجیّ نەکات، بۆ ئـەوەی وادەری بخـات کـە نیازی خراپ نییە، داوای لێکرد نوێنەری خۆی بنێریّ تـا شـارەکانی بـە دەسـتەوە بدەین مانویل ((ئەلکسیوس ئـوف ئـولیس))ی لەگـەڵ هێزێکـی سـەربازیدا رەوانـە کرد. کە شەش هەزار سەرباز بوون بۆ جیّ بەجێکردنی ئـەو کـارە ((٨٢)). ((قـیلج ئەرسـەلان)) نوێنـەری بـۆ لای دانیـشتوانی ئـەو شـارانە نـارد، بـەڵێنی پێـدان لـە بیزەنتیەکانیان بپـارێزی و خـەلاتیان بکـات، ئەگـەر بمێننـەوە لـە ژێـر دەسـەلاتی سوڵتانداو شارەکانیان نەدەنە دەستی نوێنەری ئیمپراتـۆرەوە ((٨٣)) ((مانویـل)) ئەم کارەی ((قیلج ئەرسەلانی دووەمی)) بە (ئیهانە) لە قەڵەم داو بە فێڵی زانی کە نابیّ لە ئاستیا بیّ دەنگ بـیّ، بـیری لـەوە دەکـردەوە کـە هێـز بـەکار بهێنـیّ دژی

سەلجوقیەکان، لەو کاتەدا هێزەکانی بیزەنتی بە فەرماندەیی ئیمپراتۆر گەیشتنە شاری دوربیلیوم ((٨٤)) ((شاهنشا)) ویستی ئەم لە شکرکێشیەی بیزەنتی سودی لێ وەربگرێ بۆ گەڕانەوەی ناوچە لە دەستچوەکان، ئیمپراتۆری هانیدا بۆ (ئەماسیە) هێرش ببات، کە دەکەوێتە ڕۆژهەلاتی ((جانجری))یەوە ئەوەشی بە ئیمپراتۆر ڕاگەیاند، کەوا دەست و پێوەندەکانی لە شارەکەدان و رقیان لە سوڵتانە. دەستی یارمەتی بۆ درێژ دەکەن. شاهنشا، بە ئومێدی ئەوە بوو دەست بە سەر شارەکەدا بگرێت لە بری موڵکەکانی کە قیلج ئەرسەلانی دووەم داگیری کردبوون((٨٥)) ((مانویل)) ئامادە نەبوو شەڕی لابەلا بکات، بۆیە داوای لە فەرماندەکەی کرد ((غابراس)).. بۆ ناوچەکانی نزیکی ئەماسیە بڕوات. هێزەکان کۆ بکاتەوە و هێرش بکاتە سەر شارەکە. ((غابراس)) لەرێگای ((بافلاجونیاوترابزون)) ەوە، بەرەو شارەکە کەوتە رێ، شاهنشاش کەوتە تەکیان هەردوو سوپاکە بەجیا کەوتنە رێ. ئەمە کارئاسانی کرد بو قیلج ئەرسەلان.کە لە هێرشێکی کتوپڕدا دای بەسەر هێزەکەی شاهنشادا.وپەرش و بلاوبوون ((٨٦))..بەلام ((غابراس)) توانی بگاتە((ئەماسیە))..دانیشوانەکەی پێشوازی لێیان کرد داوایان کرد بچنە ناو شارەکەوە. بەلام ترسا، قیلج ئەرسەلان ئابلۆقەی شارەکە بدات،چونکی لەو ناوانەدا بوو، بڕیاری کشانەوەیان دا بەتایبەتی هاوپەیمانەکەیان((شاهنشا)) شکستی هێنابوو. دوایی هەردوو هاوپەیمانەکە گەڕانەوە ((دوریلیوم)) قیلج ئەرسەلان شارەکەی داگیرکرد((٨٧)) لەئەنجامی سەرنەکەوتنی بەسەر قیلج ئەرسەلاندا و بەردەوامبوونی هێرشیان بۆ سەر خاکی بیزەنتی، مانویل دەستی کردە قایمکردنی بنکە سنوورییەکان، بەتایبەتی ((برغمە)) و((گلبارا)) هێزی پارێزگاریکردنی لەسەر ڕووباری ((مياندەر))و((هرمس)) دانا، بەمجۆرە بەربەستێکی دروستکرد بۆ پارێزگاری شوێنەکانی لە ڕۆژئاوای ئاسیای بچوکدا لە بەرامبەر هێرشەکانی سەلجوقیەکاندا، هەروەها شاری ((سوبلايون))ی قایمکرد، تا ئەو ڕێگایە بپارێزێ کە بۆ قونیە دەڕوات((٨٨)) بەلام ئەم کارەی درەنگ کرد، چونکی قیلج ئەرسەلان دەستی بەسەر زۆربەی ئاسیای بچوکدا گرتبوو، دەوڵەتێکی بەهێزی دامەزراندبوو لە

جێگـای ئیمارەتـە بـچووکەکان، کـە لـە نێـوان یەکـدا نـاکۆك بـوون هەمیـشە بیزەنتیەکان کـەڵکیان لـەو ناکۆکیـەوە وەردەگـرت ((٨٩)) ئـەم خـۆ قایمکردنـەی بیزەنتیـەکان، ئـەوەی دەگەیانـد نیازیـان خراپـە، یـەکێکی نـارد و پرسـیاری ئـەو کارانەی لێکردن. ((مانویـل)) بەیـەکێ لـە فەرماندەکانیـدا پێـی راگەیانـد ئێـوە لـە پێشدا کاری دوژمنانەتان ئەنجامداوە و ئێوە بوونە هـۆی ئـەوەی ((غـابراس)) لـەو کارەیـدا سـەرنەکەوێت و داوای لێکـرد شـاری(( ئەماسـیە)) بگەڕێنێتـەوە، بـەڵام سوڵتانی سەلجوقی رازی نەبوو ((ئەماسیە)) بگەڕێنێتەوە، نێردراوەکـەی بیزەنتـی بە سەرنەکەوتنی گەڕایەوە((٩٠)) بەڵام وای بەباش زانی دەرگای وتووێژ دانەخات، نوێنەرێکی بۆلای ئیمپرا تۆر نارد، داوای تـازە کردنـەوەی پـەیمانی سـاڵی ٥٥٨ ی کۆچی /١١٦٢ زاینی لێکرد بەڵام مانویل رازی نـەبوو بـە بیـانووی ئـەوەی سـوڵتان رێزی لە بەڵێنەکانی خۆی نەگرتووە، لە بارەی جێبـەجێ کردنـی بەنـدەکانی ئـەو پەیمانـەی لەنێوانیاندایـە ((٩١)). هـەموو شـتێك ئـەوەی دەردەخـست کـەوا شـەڕ بەرپادەبێت ئیتر هـەردوولا خۆیـان بـۆ ئامـادە دەکـرد. ((مانویـل))رەنـگ و بـۆی سەلیبی دەدایە لە شکرکێشیەکەی، تاکو سۆزی هێزەکانی نەسرانی بـۆلای خـۆی راکێـشێ لـە رۆژئـاوای ئـەوروپادا، سـوپایەکی ئامـادەکرد لـە رەگـەزی جیاجیـا پێکهـاتبوو، وەکـو سـەلیبی، مەجـەری، سـربی، ئینگلیـز. نامەیەکیـشی بـۆ پاپـا ئەسکەندەری سێهەم نووسی، لە گۆڕانکاریەکانی ئاسیای بچووکی ئاگادار کـردەوە و دەڵێ کاتی ئـەوە هـاتووە شـەڕێکی سـەلیبی نـوێ دەسـت پـێ بکـات، داوای لێ دەکات هێزی سەربازی بنێری تا شەڕی سەلجوقیەکان و موسـڵمانەکان بکـات. لـە پێش چاوی رۆژئاوا وا خۆی نیشاندا کەوا خۆی بۆ لە شکرکێشیەکی گەورە ئامـادە دەکـات ((٩٢)) ئـەوەی ((مانویـل)) لـە پاپـا داوای کردبـوو هێـز بنێـرێ شـەڕی سەلجوقیەکان بکات، لەلای ئەوانەی سەر بە پاپا بـوون. والێکدرایـەوە کـەوا خـۆی بۆ لە شکرکێشی سـەلیبی ئامـادە دەکـات لـە دژی جیهـانی ئیـسلامی، بەتایبـەتی سـوپاکەی لـە رەگـەزو میللـەتی جیاجیـا پێکهـاتبوو، داواکـەی پاپـا لـە (لویـسی حەوتەم) شای فەرەنسا بۆ خۆ ئامادەکردن بۆ لەشکرکێشی سـەلیبی، هـەر لەبـەر ئەو مەبەستە بوو، سەرەرای ئەوەش، لە ئەورویا و لـەناو کۆمـەڵگاکانی ئـەورووپادا

ئەستوورەی کاهین یوحنا بڵاوببۆوەو، کە داوای لە ئیمپراتۆری بیزەنتی کردبوو، هاوکاری یەکتر بکەن بۆ لە ناوبردنی جیهانی ئیسلامی. ئەوروپیەکان چاوەڕێی ئەو کاتەیان بوو کە ئەو ((کاهینە)) دەردەکەوێت تا لەگەڵ ((مانویل))دا موسڵمانەکان لە ناو دەبەن ((٩٣)).

## ڕووداوەکانی شەڕەکە

لە کۆتایی ٥٧١ ی کۆچی /هاوینی ١١٧٦ زاینی، ((مانویل)) بەرەو خاکی سەلجوقیەکان کەوتە ڕێ، سوپاکەی ژمارەی گەیشتبووە سەد هەزار جەنگاوەر، ((دیلوتی تورك)) و ((ذوالنون دانیشمەندی)) یان لە گەڵدا بوو ((٩٤))، ڕێگای، ((لازیق)) و دۆڵی سەرووی ڕووباری ((میاندەر)) یان گرت، کە گەیشتنە ناوچە شاخاویەکان کە دەکەوێتە نزیك سنوورەوە، نامەیەکی لە سوڵتانی سەلجوقیەوە پێگەیشت، داوای تازە کردنەوەی پەیمانەکەی لێ دەکات. بەڵام قەبوڵی نەکرد، سوپاکەیان هەمووی لە پێش (لویادیۆم)) کۆبۆوە ((٩٥)) ((مانویل)) وای بەباش زانی، بەر لەوەی لە ((لویادیوم))دەرچێت سوپاکەی بکاتە دوو بەشەوە، بەشی یەکەمی ((ئەندرۆنیکوس فاتازس))ی ئامۆزای و ((ذوالنون)) فەرمانڕەوای پێشووی سیواس فەرماندەی بوون، کە نزیکەی سی هەزار سەرباز دەبوون، ئەرکی ئەوەیان پێ ڕاسپێرابوو لە باکوورەوە هێرش بکەنە سەر سەلجوقیەکان و ((ذوالنون)) بۆ وڵاتەکەی خۆی بگەڕێننەوە. بەشەکەی دی، کە بەشی سەرەکی سوپاکە بوو، ئەرکی ئەوە بوو لە ڕۆژئاواوە بەرەو قونیە بڕوات ((٩٦)) بەشی یەکەم ((بافلاجونیای)) تێپەڕاند بەرەو ((نیکسار)) ڕۆیشت لە ژێر دەسەڵاتی ((ذوالنون))دا بوو پێشتر، چونکی هەندێ لە هەوادارانی دانیشمەندیانیان تێدا بوو. کە گەیشتنە شارەکە ئابلۆقەیان دا، ئابلۆقەکە توند بوو چونکی هێزەکە زۆر بوو ونزیکی هەرێمی ((بافلاجونیا)) بوو کە زەخیرەو چەکیان بۆ ئامادە دەکرد.کە فەرماندەی هێزی شارەکە زانی ناتوانی بەرەنگاری سوپاکەی بیزەنتی و هاوپەیمانەکانی ببێتەوە.پەنای بردە بەر فێڵکردن، فەرمانی دا، تیر بۆ سەربازگەکەی بیزەنتی بنێرن ئەو تیرانە نامەیە یان پێوە بوو بۆ فەرماندەی بیزەنتیەکان،هۆشیاری پێ دەدا کەوا دانیشمەندیەکان، ئەوانەی فەرماندەیەتیان

پێ سپێراوە هەوڵ دەدەن خیانەت لە بیزەنتیەکان بکەن و دەیانەوێ فەرمانـدەی بیزەنتی بە دەستی سەلجوقیەکانەوە بدەن کە بۆ سەیان بۆ ئەم مەبەستە داناوە، و چـاوەڕێی هـەلێکی لـەبارن. ((فاتـازس)) بـڕوای بـەو نامانـە هێنـا، چـاوەڕێی خیانەتکردنی ((ذوالنون)) بـوو، لەبـەر ئەمـە چـوونە نـاو شـارەوەیان دواخـست.. ئاژاوەو نارێکیش کەوتە ناو سوپای بیزەنتیەوە، دوو دڵی لـە نێوانیانـدا بلاوبـۆوە، ئـەوەی زیـاتر بـووە هـۆی شـپرزەی و ئاڵۆیـان ئـەو پرووپاگەندەیـە بـوو کـە سەلجوقیەکان لەبارەی مردنی ئیمپراتۆر(مانویل)ەوە بلاویان کـردەوە، ناچـاربوون ئابلۆقەی سـەر شـارەکە هـەڵگرن و بـەنارێکی بکـشێنەوە، سـەلجوقیەکان کەوتنـە دوویان و لە پێش پەرژینی شارەکەدا کەوتنـە شـەرکردن لەگەڵیانـدا و بەسـەریاندا سـەرکەوتن و زیـانێکی زۆری گیانیـان لێ کـەوت، لـە ناویانـدا ((فاتـازس)) بـوو، سـەرەکەیان بـۆ سـوڵتانی سـەلجوقی بـرد ((٩٧)) ((مانویـل)) بـە هـەواڵی شکستهێنانی هێزەکـەی دڵتـەنگ بـوو، بـە ڕێگـاوە بـوو بـەرەو قونیـە دەڕۆیـشت. وایزانی هێزەکانی سەلجوقی هێشتا لـە بـاکوورن و پایتـەختی سـەلجوقی چـۆڵە و کەس نییە پارێزگاری لێ بکات، پێی هەڵگرت تـا لـە پـڕ بەسـەریاندا بـدات، ڕێگـای ((دوریلیوم))ی نەگرت، کە ڕێگایەکی سروشتی بوو بۆ قونیە، بـەڵکو بـەرەو لازیـق ڕۆیشت کە دەکەوێتە سەر ڕووباری میاندەرەوە، بە دۆڵی ڕووبارەکـەدا ڕۆیـشت تـا گەیشتە ((سوبلایون)) دواجار چووە باکوری گۆلی ((ئەجردیر)) لە وێـشەوە بـەرەو بەرزاییەکان کە دەیگەیاندە زنجیرە چیایەکی بەرز بە ناوی چـیای ((سـوڵتان)) لـە ڕۆژهـەلاتی (سـوبلایون) لـە نزیکـی قونیـە. ویـستی لـە دەربەندەکـەی چـیاکە بپەڕێتـەوە کـەناوی ((دەربەنـدی تزیبرتـن))ە کـە دەکەوێتـە کۆتـایی قـەلای ((میریوکیفـالون)) بۆ ئـەوەی ڕاستەوخۆ بـچێتە بەرامبـەر قونیـەوە ((٩٨)) قـیلج ئەرسـەلان، لـەم کاتـەدا شـوێن پێـی سـوپاکەی بیزەنتـی هەڵـدەگرت، کـەوتبووە دوویان، ئەو ڕێگایانەی دەبوایە پێیدا بڕۆیشتنایە بەر لـەوەی بگەنـە ئـەوێ تێکیـان دەدا، کشتوکاڵ و دانەوێڵەیان دەسوتاند زەخیرەو ئازووقـەیان لـە دێهاتەکانـدا نـە دەهێشت نەکو بیزەنتیـەکان سـوودی لێ ببیـنن، بـیرو کانیـەکانیان ژاراوی دەکـرد ((٩٩)) لە هەمانکاتدا، سەربازی کۆدەکرد و ئامادەی دەکردن تا سـوپاکەی خـۆی

لــە هاوشــانی ســوپای بیزەنتیــەکان دەدا بــەلاَم لــە چــەك و کەرەســتەی شــەڕ نەدەگەیشتنە بیزەنتیـەکان، بـەلاَم لـە خـۆ ئامـادەکردن و خێرایـی و جولاَنـەوەدا لـەوان باشـتر بـوون، دواجـار هێزەکـانی دابـەش کـرد، شـوێنە بەرزوبلَنـدەکانیان گرت...((مانویل)) لە بەرەوپێشەوە چونیدا دوو هەلَەی گەورەی کرد:
یەکەم:گرنگی بە سووسەکردنی ناوچەکە نەدەدا، کە ئەوە یەکەم کاری سەربازییە.
دووەم :بە گوێی فەرماندەکەی ((بالتروی)) نەکرد، هوشیاری پێدابوو بە دەربەندە شاخاوییەکاندا تێنەپەڕێ.((مانویل)) بەرای میرە گەنجەکانی دەکرد، دلَگەرم بوون بۆ شەڕو سەرکەوتن وە دەست هێنان ئیمپراتۆریش دلَگەرم بوو بۆ شەڕ دوای ئـەو هەموو خۆ ئامادە کردنە بۆ ئەم لـە شـکر کێشیەی ((١٠٠)) مانویـل بـەردەوام بـیَ لەبەرەو پێشەوە چوون بـەو دەربەندانـەدا لـەو کاتانـەدا سـەلجوقیەکان هێرشیان نەبرد، جار جارێك نەبیَ و دواجار بە پێی پلانێکی سەربازی دەکشانەوە تـا هـانی بیزەنتیـەکان بـدەن دەربەنـدەکان بەرنـەدەن، پێـشەنگی سـوپاکەیان چـووە نـاو دەربەندەکەوە، بیزەنتیەکان وایان زانی، سەلجوقیەکان ناتوانن لـە شـوێنێکی وادا شـەڕبکەن، بۆیـە زۆرتـر رۆیـشتن لـە هـەمان کاتـدا سـوپای سـەلجوقی، لەسـەر چیاکانەوە ئامادە بوون کە بیزەنتیەکان نەیان دەدیت هەردوولای دەربەندەکـەیان گرتبوو.((١٠١)) سوپای بیزەنتی دەبوایە دەمیل بەو دەربەندەدا ریَ بکەن تا لێی دەربچن و بگەنە دەشتایی بەردەم قونیە، بۆیە گالێسکەکانیان، کەرەسـتەکانیان، لەگەلَ سەربازەکاندا دەربەندەکەیان پڕکردبوو، لەم کاتەشـدا نەخۆشـی سکـچوون تیایاندا بلاَببووەوە، هێزیـان نـەمابوو، گالێسکەکان لەبـەر گرانـی بارەکانیـان زۆر لەسەرخۆ دەڕۆیشتن، ئـیتر لەبـەر قـەرەبالغی پێـشەو دواوەی سـوپاکە لـە جوولـە کەوتبوو ((١٠٢)) سەلجوقیەکان ئەمـەیان بەچـاو دەدی، چـاوەڕێی هـەلێکی لـەبار بوون تا هێرش بەرن. مانویل هەستی کرد، هەلَەیەکی سـەربازی گـەورەی کـردووە کاتیَ بینی سوپاکەی خزاندۆتە ئەو دەربەندەوە. بۆ ئـەوەی هێزەکـانی سـەلجوقی سەرقالَ بکات، ((بالدوینی ئەنتاکی)) بـە هێزێکـی سـوارەوە نـاردە بەرزاییـەکان و هێرشیان کردە سەر هێزێکی سەلجوقی بەلاَم شکستیان هێنـاو خـۆی ئەوانـەی لـە گەلَیدا بوون کوژران((١٠٣)) سەربازەکانی ناو دەربەندەکە ئەوەیان بینی، شـلَەژان

و ورەیان بەردا. لەساتێکی لەباردا، هێرشی کردە سەر پێشەنگی سوپای بیزەنتی، بەمەبەستی ئەوەی لە چوونە پێشەوەی بخات، پێشەنگی سوپاکە خۆی راگرت و پەنایان بردە بەر بەرزاییەکان و کەرەستەو شتو مەکەکانیان لە دۆڵەکە هێشتەوە، ئیتر سوپاکەیان نەیتوانی بەرەو پێشەوە بڕوات و کەوتە بەردەستی سەلجوقیەکان، دوای ئەوەی سەلجوقیەکان سوپاکەیانیان راگرت، هێرشیان بۆ ناوەڕاستی سوپاکەیان برد، بەمەبەستی ئەوەی کەرتیان بکەن، لەمەدا سەرکەوتن بە هۆی هەڵەیەکی فەرماندەی دواوەی سوپاکە کەلەسوپاکە دوورکەوتبۆوە،ئەمجا((گا )) کانیان دایە بەر تیر و ژمارەیەکی زۆریان لێ کوشتن، ئەمە وایکرد نەتوانن بەرەوپێشەوە بچن و نێوانیان فراوانتر بووەوە، سوپاکەیان ریزەکانیان لەیەك ترازا، هەر کۆمەڵێك بەجیا کۆبوونەوە، ئەوەندەش چووبوونبە یەکا، ماوەی جوڵانەوەو شەڕکردنیان نەبوو، ئەمجا سەلجوقیەکان هێرشیان کردە سەر دوواوەی سوپاکە، بڵاوەیان لێکرد، هەوڵیان دا بچنە سەر بەرزاییەکان، لەبەر تۆزوخۆڵ یەکتریان نەدەبینی و بەر یەکتر دەکەوتن کە بووە هۆی کارەساتێکی راستەقینە. دواجار هەموو قورسایی خۆیان خستە سەر بەشی دواوەی سوپاکە و تیربارانیان کردن، گا بەردی گەورە گەورەشیان تل دەکردە خوارەوە کە زیاتر شڵەژان و بەیەکا دەهاتن ((١٠٤)) لە ئەنجامی ئەم بارودۆخە سەربازییە شپرزەیەی سوپای بیزەنتی، هەوڵیان دەدا هەرچۆنی بێ خۆیان لەو بارە دەرکەن.بەڵام سەلجوقیەکان هەموو لایەکیان لێیان بڕیبوو، نەیانتوانی خۆیان رزگار بکەن، گالێسکەکانیش زیاتر رێگایانی گرتبوو، سوپاکە تووشی نائومێدی و ورە بەردان هاتبوون. ((مانویل)) لە پێش هەموویانەوە ترسی لێ نیشت، هەوڵی هەڵاتنی دا، بۆئەوە ی بیزەنتیەکان بترسێنن و زیاتر شپرزەیان بکەن، سەری بڕاوی فەرماندەکەیان ((بلدوین)) یان کردە دارێکی درێژەوە و نیشانی سوپاکەیان دەدا، شەوانیش دەنگە دەنگ و هاواریان دەکرد، وایان پیشان دەدا هێرش دەبەن و لە ناویان دەبەن، ئەمە کاریگەرییەکی زۆری کردبووە سەریان ((١٠٥))کاتی ئەوە هات، بەجارێ هێرش بەرنە سەریان، لەپڕێکا هێرشیان کرد کەوتنە کوشتاریان، تا گەیشتنە ئازووقەوکەرەستە و گالێسکەکەی شاهانەی لێ بوو، تالانیان کردو

سوتاندیان، شەڕ تا تاریکی داهات بەردەوام بوو((١٠٦)) هەرچۆنێ بوو((مانویل)) توانی لە دەربەندەکە دەرچێت و خۆیان کردە دۆڵێکی تەنیشتیانەوە، هەندێ لە سەربازەکانی خۆیان پێ گەیاندبوو، بەلآم سەلجوقیەکان، پێشیان لێگرتن و ژمارەیەکی زۆریان لێ کوشتن و هەندێکیشیان بەدیلی گرت. مانویل توانی هەڵبێ، کەوتە ناو ئەو دۆڵانەوە، تا پەیوەندی بە هەندێ لە هێزەکانیەوە کرد، بەلآم شەڕ حەوت رۆژ دەوامی کرد((١٠٧)) سوپای بیزەنتی بە تەواوی شڕ ببوو، ژمارەیەکی زۆریان کوژراو بەدیل گیرا، ئەوەی رزگاری بوو بەو دەشتانەدا بلآو ببوونەوە.

## ئاشتبوونەوە لە نێوان هەردوولایاندا

((مانویل)) لەم بارودۆخە سەختەدا، لە ئاشتبوونە وە بەولاوە هیچی دیکەی لەبەردەمدا نەبوو، ((میخائیلی سریانی)) دەیگێڕێتەوە " داوای لە قیلج ئەرسەلان کرد، ئاشت ببنەوەو ئەو شارانەی بەدەستەوە بدات کە قایمکاری تیایاندا کردووە..کە((دوریلیوم))و((سوبلایون)) بوون، لەبەرامبەر ئەمەدا، ئەوەی لە هێزی بیزەنتی مابووەوە ژیانیان بپارێزی و رێگایان بدات بکشێنەوە((١٠٨)) مێژوونوس((نیکتاس)) دەڵێ : سەلجوقیەکان بەرەو هێزەکانی بیزەنتی رۆیشتن، دواجا دەڵێ : یەکێ لە سەرکردە تورکەکان فەرمانی بەهێزەکانی سەلجوقی دا شەڕ راگرن، دوجار چووە لای ئیمپراتۆرو ئەسپێکی زینکراوی دیاری سوڵتان پێشکەش کرد. داوای ئاگربەستی کرد لە بەرامبەر ئەمەدا، ئەو قایمکارییەی لە دوریلیوم و سوبلایون کردوویەتی بیڕوخێنێ((١٠٩)) ئیمپراتۆری بیزەنتی لەو نامەیەیدا بۆ هنری سێیەم لەبارەی ئاشتبوونەوەی لەگەڵ سەلجوقیەکاندا دەگێڕێتەوە دەڵێ : سوڵتانی سەلجوقی لێی پاڕایەوە ئاشت ببنەوە، لەبەرامبەر ئازادکردنی هەموو دیلەکانی بیزەنتی و لەگەڵ ئیمپراتۆردا ببێتە هاوپەیمان دژی دوژمنەکانی. ئەویش بەدەنگ ئەو داوایەوە چوو، دوای ئەوەی زانی بەردەوام بوونی شەڕ بێ سوودە، چونکی کەرەستەکانی جەنگی لەدەستدابوو((١١٠)) مانویل : لەنامەیەکی دیکەدا، کە بۆ ئیمپراتۆری ئەڵمانی ((فردریک بربروسا))ی نووسیبوو دەڵێ : هەڵوێستی سوڵتانی سەلجوقی لاواز بوو، بەلآم فردریک دواجار راستیەکانی زانی. وەلآمی نامەکەی دایەوە، کەوا ئیمپراتۆری ئەڵمانی، کە لە

## مێژووی سەلجوقیەکان

ئەبانزەکانی رۆمانە گەورەکانەوە، هێزی لێیان وەرگرتووە، دەبێ فەرمانڕەوایی ئیمپراتۆریەتی رومانی بکات، بە هەردووبەشەکەیەوە، رۆژهەلاَت و رۆژئاوا((١١١)) هەرسێ گێڕانەوەکە، ئەوە دەسەلمێنن، کەوا ئاشتبوونەوە لەنێوانی سولَتان و ئیمپراتۆردا ئەنجامدرا و هێزەکانی بیزەنتی لە بارودۆخێکی خراپدا بوون، نەیان دەتوانی بەردەوام بن لە شەڕکردن، بەلاَم هێزەکانی سەلجوقی، ئامادەبوون بۆ شەڕ.. لێکۆلَەرەوان گێڕانەوەکەی ((میخائیل سریانی)) لە هەموویان زیاتر پەسەندەکەن، چونکی لە لایەکەوە لە مێژوونووسێکی بێ لایەنەوە دەرچووە، لەلایەکی ترەوە سوپای بیزەنتی شڕ بووبوو، نەتوانای شەڕکردنی مابوو، نە بەرەنگاریکردن بەلاَم، لێکۆلَەرەوە لەگەل ئەوەدانییە، کەوا ئاشتبوونەوە کە لەبەرامبەر تێکدانی ئەو خۆئامادەکردنە بوو لە شاری دوریلیوم و سوبلایون کرابوون.نەکو دانەوەی ئەو دوو شارە بە سەلجوقیەکان ئەمەش بە پێی ئەو رووداوە مێژووییانە کە دوای ئەوە روویاندا((١١٢)) هەرچی چۆنێ بێ، بناغەی ئاشتبوونەوەکە لە سەر دوو بەند دامەزرا

- مانویل، دەست بەجێ لە خاکی سەلجوقی دەکشێتەوە.
- ئەو ئامادەکاریانەی لە دوو شارەکەدا کراون تێکدەدرێن.

ئەم بەندەی دوایی گرنگیەکی زۆری بۆ سەلجوقیەکان هەبوو، چونکی رێگەی دان بەبێ بەربەست بەرەو رووباری میاندەر برۆن. لەلایەن ((میخائیل سریانی))یەوە ئاماژەیەك لەم بارەوە کراوە : گوایە سولَتان باجی خستۆتە سەر ئیمپراتۆر ((١١٣)) قیلج ئەرسەلان، دوای ئاشتبوونەوەکە هێزێکی سەربازی بە فەرماندەیی سێ لە میرەکان خستە تەکی ((مانویل)) تا گەیشتە سنوور نەکو تورکمانەکان هێرشی بۆ ببەن ((١١٤)) هۆزەکانی تورکمان ئەم ئاشتبونەوەیان پێ باش نەبوو، گازندەیان لە سولَتان کرد بۆ ئەم هەلَوێستەی، ئەوانە لە هەموو کەس زیاتر تێکەلاَوی بیزەنتیەکان دەبوون چونکی هاو سنووربوون و خۆیان بەرژەوەندی خۆیان باش دەزانی و پێویستیان بە خاکی تر هەبوو چونکی ژیانێکی کۆچەرانەیان بەسەر دەبرد. بۆیە راو بۆچونیان لەگەلَ سولَتاندا لەمبارەیەوە جیاواز بوو. دەبوایە پرسێکی بەوان بکردایە، لە ئەنجامی ئەمەدا هێرشیان کردە سەر

هێزەکەی بیزەنتی لە کاتی کشانەوەیاندا، بیزەنتیەکان نارەزابوون و گوناهەکەیان خستە ئەستۆی سەلجوقیەکان. بەلآم سەلجوقیەکان پۆزشیان بۆ هێنانەوەو رایانگەیاند دەسەلآتیان بەسەر تورکمانەکاندا ناشکێ ((١١٥))

**ئەنجامەکانی شەرەکە :-**

– بروایەکی وا لە ئارادا بوو کەوا دەبێ سەلجوقیەکان بەردەوام بن لەبەرەو رۆژئاوا چوون، چونکی رێگا تا قوستەنتینیە لە بەردەمیاندا کرابووەوە، بەلآم قیلج ئەرسەلان بەلای ئەم کارەوە نەچوو وگرنکی پێ نەدا، چونکی قازانجی خۆی لە بەرەو رۆژهەلآت چووندا دەدی، تا دەست بەسەر جیهانی ئیسلامیدا بگرێت، ئەمە بۆ چوونێکی هەلەیە، چونکی بارودۆخی سیاسی دەولەتی سەلجوقی رۆم لەو کاتەدا و باری سەربازی سوپای سەلجوقی و بیزەنتی، وای پێویست دەکرد کەلك لە سەرکەوتنەکانی وەربگرێ و ئاسیای بچووك --- داگیر بکات لەگەل قوستەنتینیەدا و بیزەنتیەکان دەربکات و لە ولآتەکەی خۆیدا پێی خۆی قایم بکاو بچەسپێنێ، بەر لەوەی بەرەو رۆژهەلآتی ئیسلامی بروات.

– شەری ((میریوکیفالون)) لە شەرە گرنگەکانی مێژووی رۆژهەلآت بوو، ((مانویل)) گرنگی ئەو کارەساتەی زانی، لەگەلّ شەری ((مانزیکرت)) دا بەراوردی دەکرد، کە سەدسالّ لەوەو بەر روویدا بوو. تا قەبارەی شەرەکە بۆ رۆژئاواییەکان دەربخات کە لە هەموو شەرەکانی تر گەورەتر بوو. وا خۆی نیشان بدات، لە فەرماندەی ئەو شەرە باشترە کە بەدیل گیرابوو، کەچی خۆی بەدیل نەگیرا و هەولّیشی دەدا لە مەترسیەکانی کەم بکاتەوە.....

– شەرەکە لاوازی ئیمپراتۆرییەتی بیزەنتی ئاشکراکرد لە رووی سەربازییەوە.

– سولّتانی سەلجوقی سوودی لە سەرکەوتنەکەی وەرگرت، سەلماندی کە لەسەر بروادینی خۆی ماوەتەوە. چونکی بەوە تاوانبار دەکرا کەوا بروای بە مەزهەبی فەیلەسوفەکان هێناوە و دەستی لە جیهاد هەلگرتووە. هەندێ لە دەسکەوتەکانی بۆ خەلیفەی عەباسی نارد و شاعیرەکان بە قارەمانی ئیسلام ناویان هێنا ((١١٦))

– شەری ((میریوکیفالون)) هونەری سەربازی تێدا بەکار هێنرا و سەلجوقیەکان ئەو هونەرەیان لە شەرەکەدا بەکارهێنا کە بووە مایەی سەرکەوتنیان.

## پەیوەندی سەلجوقیەکان بە بیزەنتیەکانەوە لە دوای شەڕی میریوکیفالون ((١١٧))

دوای ئـەوەی ((مانویـل)) گەڕایـەوە بـۆ پایتەختەکـەی، لـە بەنـدی تێکـدانی ئامادەکارییەکانی دوریلیوم و سوبلایون پەشیمان بووەوە، هەر چەند لە کاتی گەڕانەوەیدا، کاتێ بەشاری ((سوبلایون))دا تێدەپەڕی فەرمانی دابوو، لایبدەن.. بەلاّم کە گەیشتە پایتەخت پەشیمان بووەوە، سەرەڕای ئەوەی چەند جارێك قیلج ئەرسەلان ئەو داوایەی دووبارە کردبووەوە، ناچار سەرکردەی سەلجوقیەکان کەوتە سەر ئەوەی بە هێرشکردن گوشار بخاتە سەری بەر لەوەی بیزەنتیەکان خۆیان ئامادە بکەن و ئەوەی لە دەستیان دابوو لە شەڕەکەی میریوکیخالون پەیدای بکەنەوە ((١١٨))، بۆیە سوپایەکی بیست و چوار هەزار کەسی نارد، تا هێرش بکەنە سەر دۆڵی رووباری ((میاندەر)) لە بەشی باشوری رۆژئاوای ئاسیای بچوکدا و ناوچەکە پاك بکەنەوە ((١١٩)) سوپای سەلجوقی لەم کارەی سەرکەوت، چونکی توانی بچێتە قولاّیی دۆڵی رووبارەکەوە و شاری ((بلاتیە)) و ((ترالس)) و ((ئەنتاکیە)) و ((میاندەر)) تالاّن بکات ((١٢٠)) ((مانویل)) هەواڵی ئەم هێرش بردنە سەر خاکەکەی پێ گەیشت، ترسا سەرکردایەتی سوپاکەی بکات و بچێتە بەرەنگاریکردنیان، هێشتا بە دەست سەختی گورزی شەڕی ((میریوکیفالون))ەوە دەینالاّند، باری تەندروستیشی باش نەبوو، بەرەنگار بوونەوەی سەلجوقیەکانی بەچەند فەرماندەیەکی سپارد.داوای لێکردن، پەلەی رووبەروو بوونەوە نەکەن تا لەسەرکەوتن دڵنیا نەبن، تاکو توشی کارەساتێکی وەکو میریوکیفالون نەبنەوە. سوپای بیزەنتی لەنزیکی ((هیلیوم)) مۆڵی خوارد، تا رێگای یارمەتی لە سوپای سەلجوقی ببڕێ، لەوێدا پردێك هەبوو، دەگەیشتە دۆڵی رووبارەکە. دوای شەڕێك کە زۆری نەخایاند توانیان سوپای سەلجوقی بشکێنن لە کاتی پەڕینەوەدا بە سەر پردەکەدا ((١٢١)) بەلاّم ئەم سەرکەوتنە، بۆ ماوەیەکی کورت بەری لە هاتنی سەلجوقیەکان گرت. ((مانویل)) بڕیاریدا خۆی سەرپەرشتی شەڕەکە بکات، بەلاّم نەیتوانی بەریان لێ بگرێت. ناچار گەڕایەوە دواوە ((١٢٢)) ئەو سەرکەوتنەی بیزەنتیەکان لەسەر پردی میاندەر، هانیدان، سوپایەکی دیکەیان بە فەرماندەی

((ئەندرۆنیکوس)) و ((مانویل کانتاکوزین)) نارد سەلجوقیەکان بەشەو هێرشێکی کتو و پڕیان کرد، هەردوو فەرماندەکە شکان، سەلجوقیەکان تاکو شاری ((لازیق))ی رۆژئاوا دویان کەوتن ((١٢٣)) هێرشەکانی سەلجوقی تەنها بۆ دۆلی رووباری میاندەر نەبوو شەڕەکان گەیشتە باکوور لە نزیکی رووباری ((هالیس)) سەرەتای رووبەروو بونیان لە ئابلۆقەدانی شاری ((کلیودوبولیس))ەوە دەستی پێکرد. کەبە((ئاسکی شهر)) بەناوبانگە. ئیمپراتۆر خۆی بۆ یارمەتیدانی شارەکە دەرچوو و توانی ئابلۆقەکە بشکێنێ ((١٢٤)) ئەو شەڕانەی لەنێوان سەلجوقیەکان و بیزەنتیەکاندا دوای میریوکیفالون روویاندا، ئەوە دەردەخەن کەوا سەلجوقیەکان پلانەکانیان گۆڕی کە لە سەر دزی و تالأنکردن دامەزرابوو، کەوتنە سەر ئەوەی خاکی نوێ بهێننە ژێر دەسەلأتی خۆیانەوە لەسەر شانی ئیمپراتۆریەتی بیزەنتی، بەهۆی کاریگەری هۆزە شەڕکەرەکانی تورکمانی ناوچە سنووریەکان. بە بەلگەی ئەوەی، سولتانی سەلجوقی سالی ٥٧٨ی کۆچی / ١١٨٢ی زاینی، هێزێکی نارد و ((سوزوبولیس)) و ((کوتاهیە)) و ((دوریلیوم))ی داگیرکردو ((دەنزلی)) و ((ئەنتاکیە))شی ئابلۆقە دا، ئالۆزی بارودۆخی سیاسی قوستەنتینیەی بەهەل زانی بوو لە دوای مردنی مانویل لە سالی ٥٧٧ی کۆچی/١١٨١ی زاینی. کوڕە بچووکەکەی ((ئەلکسیوس)) چوو بووە سەر تەخت، لەبەر سێبەری ئەو پیلانانەی ئەندرۆنیکوس کومینن کردبووی بۆ ئەوەی دەست بەسەر دەسەلأتدا بگرێت

## دوا هەولی بیزەنتییەکان بۆ شەڕی سەلجوقی

## گۆڕانکاری سیاسی لە بیزەنتە :-

بە مردنی ئیمپراتۆر ((مانویل)) قۆناغی یارمەتی یەکتردانی بیزەنتی و سەلیبی کۆتایی پێهات، ئیمپراتۆریەتی بیزەنتی کەوتە سیاسەتی خۆ دوورخستنەوە لەگەل سەلیبیەکان و لاتینەکان بەگشتی و لەگەل ئەیوبیەکاندا خۆیان نزیك کردەوە و پەنای بۆ ئەوان دەبرد بۆ رایی کردنی سەلجوقیەکان. ((ئەلکسیوسی دووەم)) بووە جێنشینی باوکی، هێشتا مندالێ بوو پانزە سالی تێنەپەڕاندبوو. وەکو باو بوو، دایکی ((ماریە ئەنتاکی)) کاروباری عەرشی بەڕێوەدەبرد. چونکی لە بنەچەی لاتین بوون، بۆیە دانیشتوانی قوستەنتینیە خۆشیان نەدەویست. شاژن،

ئەلکسیوس کومنین، کە کوڕی برای مێردەکەی بوو لەگەڵ خاڵۆی ((ماریە)) کە شاژنی ((بیت المقدس)) بوو، راوێژکاری بوون و پەیوەندی بەتین کەوتە نێوانیانەوە، هەردوو پشتیان بە رەگەزی لاتینی دەبەست، بۆیە ناکۆکی کەوتە نێوانیانەوە لەگەڵ میللەت و چینی دەوڵەمەندا. گۆرانکارییە سیاسیەکان، پاڵی بە ئیمپراتۆر ((ئەلکسیوسی دووەم))ەوەنا سیاسەتی خۆ نزیککردنەوە لە ((سەلاحەدین ئەیوبی)) گرتەبەر کە ئەودەمە ئەستێرەی لە رۆژهەڵاتدا گەشاوە بوو، گۆرانکارییەکان بە ئاشکرا دەرکەوتن، کاتێ ئیمپراتۆر نوێنەرێکی بۆ قاهیرە نارد لە ((سەفەری ٥٥٧ی کۆچی / حوزەیرانی ١١٨١ی زایینی)) تا پەیمانی ئاشتی لەگەل ((سەلاحەدین ئەیوبی)) دا ببەستن ((١٢٥)) سەرەرای روخانی دەسەلآتی ناوەندی لەبیزەنتە، بەلآم ئەو سیاسەتە نوێیە، نەگۆرا. ((ئەندرۆنیکۆس کومنین)) ئامۆزای ((مانویل)) بە ئاسانی بەسەر تیپە سەربازیەکانی بیزەنتەدا سەرکەوت، ژنە ئیمپراتۆر) لە پایتەخت تەنها مایەوە، لە لاتینەکانی شار بەولاوە کەس یارمەتی نەدا. لەویش کوشتارێك پەیدابوو، ژمارەیەك لە بازرگانە ئیتالیەکان مانەوە، لە رێگای دەریاوە بەرەو رۆژئاوا هەلآتن، رێگا کرابووەوە لە بەرامبەر ئەندرۆنیکوس بەرو قوستەنتینیە. کە چووە ناو پایتەختەوە ((ئەلکسیوسی دووەمی )) گرت و زیندانی کرد و چاوی هەڵکۆڵی. فەرمانی دا، ژنە ئیمپراتۆر هەڵواسن، کورە بچووکەکەیان ناچار کرد، بەڵگەی دەست لە دەسەلآت هەڵگرتن ئیمزا بکات، دواجار ((ئەلکسیوس)) کوژراو ((ئەندرۆنیکۆس)) بووە ئیمپراتۆر((١٢٦))

## هاریکاری نێوان بیزەنتیەکان و ئەیوبی، لەسەردەمی ئەندرۆنیکۆس و رەنگدانەوەی لە سەر باری سیاسی سەلجوقیەکان

بەر لە هاتنی لە شکرکێشی سێیەمی سەلیبیەکان بۆ رۆژهەلآت وا روویدا لە نێوان ئیمپراتۆری بیزەنتی ئەندرۆنیکۆس کومنین و سەلاحەدینی ئەیوبیدا لەیەك نزیك بوونەوە، بە مەبەستی پارێزگاری بەرژەوەندیەکانی هەردوولا، کە ئەویش بەرەنگاربوونەوەی لاتینیەکان بوو بە شێوەیەکی گشتی، سەلجوقیەکانی رۆم لە ئاسیای بچوك بە شێوەیەکی تایبەتی. بیزەنتیەکان هیوایان دەخواست، تورکەکان

لـە ئاسـیای بـچووك دەربکـرێن، موڵکـەکانیان بـۆ بگەڕێتـەوە، بـەڵام لـە شـەڕی میریوکیفـالون زیـانێکی زۆریـان لێکـەوت، وایکـرد نـەتوانن ئامانجـەکانیان وەدی بهێنن. سەلجوقیەکان ببونە مایەی مەترسی بۆ سـەر موڵکـەکانی بیزەنتیـەکان لـە دەریای ئیجەدا، ئـاواتی ئەوەشـیان نـەما دورگـەی قـوبرس بگەڕێننـەوە لەدەسـت لاتینیـەکان کـە یارمـەتی ئیمارەتـەکانی سـەلیبیەکانیان دەدا لـە وڵاتـی شـام. سەلاحەدینی ئەیوبی، لەگەڵ ئیمارەتە سەلیبیەکاندا ڕووبەڕوو بـووەوە. هـەروەها ویـستی سـەلجوقیەکانی ڕۆم لـە ئاسـیای بـچووك بخەنـە ژێـر دەسـەڵاتیەوە. دوای ئەوەی دەرکەوت دەیانەوێ بەرەو ڕۆژهەڵات بڕۆن و بوو بوونە مایەی نارەحەتی لە سـەر موڵکـەکانی لـە بـاکووری شـام. ڕۆژئـاوای ئـەورووپا گوشـارێ بـوون لەسـەر ئەندرۆنیکۆس کومنین و سەلاحەدینی ئەیوبی. ئەو هەوڵانەی مانویـل کـومنین، بـۆ گەڕانەوەی ئەو هەرێمانەی ئیمپراتۆر لە ئیتالیـا لـە دەسـتی دابـوون بـووە مایـەی لەیـەك دوورکەوتنـەوەی لەگـەڵ ئیمپراتۆریـەتی ڕۆژئـاوا. لەسـاڵی ٥٨٠ی کۆچـی /١١٨٤ی زاینی ((هنری)) کوڕی ئیمپراتۆر فردریکی یەکەم ((کونـستانس))ی کـچی ((ولـیم دووەمـی)) شـای سـقلیە و میراتگـری موڵکەکـەی خواسـت. ئیمپراتـۆری بیزەنتی دەیزانی، سقلیەکان زۆر نابا هێرش دەکەنە سەر موڵکەکانی بیزەنتـە. تـا نەکەوێتـە نێـوان دوو هێـزەوە، سـقلیەکان لـە ڕۆژئـاواوە و سـەلجوقیەکان لـە ڕۆژهەڵات، کەوتە کار ڕایی پێویست بۆ پاراسـتنی سـنوورەکانی ڕۆژهەڵاتـەوە، بـۆ ئەوەی خۆی بۆ کێشەکانی ڕۆژئاوا تەرخان بکات. خـۆی لـە سـەلاحەدینی ئـەیوبی نزیك کردەوە وباڵیۆزێکی بۆ لای نارد لە ناوەڕاستی ساڵی ٥٨١ی کۆچی / هـاوینی ١١٨٥ی زاینیـدا، داوای بەسـتنی هاوپـەیمانی لەگەڵـدا کـرد. لەسـەر ئەمانـەی خوارەوە:—

—سەلاحەدین دان بە ئەندرۆنیکۆس کومنین دابنێ چونکی ئیمپراتۆرە.

هەردوولا، یارمەتی یەکتربدەن لە دژی سەلجوقیەکان، ئەگەر ئاسیای بچووکیان لـە دەست سـەلجوقیەکان وەرگرتـەوە، بخرێنـە پـاڵ موڵکـەکانی ئیمپراتۆریـەت تـاکو ئەنتاکیەو ئەرمینیە.

—ئەندرۆیکۆسی کومنین یارمەتی سەلاحەدین دەدا لە دژی سەلیبیەکان لە ولاتی شام ((١٢٧)) نازانرێ تا چەند سەلاحەدین ئەم پێشنیارانەی ئەندرۆنیکۆسی لا پەسەند بووە. چونکی ئەندرۆنیکۆسی کومنین لەساڵی ٥٨١ی کۆچی / ئەیلولی ١١٨٥ ی زاینی، لەسەر تەخت لابرا بەر لەوەی سەلاحەدین وەلامی بداتەوە. بەمجۆرە سەلجوقیەکان لەو هاوپەیمانیە رزگاریان بوو، لەوانە بوو ببوایە مەترسی بونیان.

## لەناوبردنی ئیمارەتی دانیشمەندی لە مەلتیە

قیلج ئەرسەلان، دوای سەرکەوتنی لە میریوکیفالون، ئاوڕی بۆ رۆژهەلات دایەوە، تا دوا ئیمارەتی دانیشمەندی لە مەلتیە لە ناوببات و خاکەکانی بخانە پاڵ سەڵتەنەتەکەی و تورکەکان بکات بەیەك لەژێر فەرماندەی خۆیدا، ئەم ئیمارەتە بووە مەیدانی ململانێی نێوان سەلجوقی و دانیشمەندی، سیاسەتی گشتی سەلجوقیەکان لە ئاست دەست بەسەرا گرتنی مەلتیە بۆ ساڵی ٥٤٧ یکۆچی / ١١٥٢ ی زاینی دەگەڕێتەوە، لە سەردەمی سوڵتان مەسعودی سەلجوقیەوە باوکی قیلج ئەرسەلانی دووەم. سوڵتانی سەلجوقی ساڵی ٥٦٧ ی کۆچی ١١٧١ ی زاینی هێرشێکی توندی کردە سەر مەلتیە، بەرپا بوونی ناکۆکی ناوخۆی نێوان گەورە پیاوانی لەسەر میراتی تەخت لەدوای مردنی میری دانیشمەند ((١٢٨)) ((ابی القاسم بن ذی القرنین)) بەهەل زانی، ئەوانە بوون بە دوو بەشەوە. لایەکیان لایەنگری برای گەورەی ((ابوالقاسم)) میری لەسەر تەخت لابراو ((ناسرەدین مەحەمەد کوڕی ذوالقرنین)) بوون. تاقمی دووەم لایەنگری دامەزراندنی براکەی تریان فەرەیدون دەکرد. تای تەرزووی ئەمان سەنگتربوو. ئەوەش پەیوەندی بەوەوە هەبوو تا چەند سولتان قیلج ئەرسەلانی دووەم خۆی هاویشتبووە ناوەوە لە کێشەکەدا. کە داوایەکی ((ناسرەدین مەحەمەد))ی قەبوڵ نەکرد بۆ مەلتیە بگەڕێتەوە. دواتر مەلتیە تووشی هەژانی سیاسی ناوخۆیی بوو. ((ناسرەدین)) توانی ساڵی ٥٧١ کۆچی / ١١٧٥ زاینی عەرش وەدەست بهێنێتەوە. سوڵتانی سەلجوقی ئەمەی پێ ناخۆش بوو، تەماحی کردە مەلتیە و هێرشی بۆ برد،

ئابلۆقەیدا، چوار مانگی خایاند. ((ناسرەدین) نەیتوانی بەرەنگاری سەلجوقیەکان ببێتەوە، ترسا، میرەکان یاخی ببن، بۆیە یەکێکی بۆلای قیلچ ئەرسەلان نارد، کەوا شارەکەی دەداتە دەستی، بەمەرجێ ژیانی بپارێزێ، سولتان رازی بوو، ((ناسرەدین)) چووە قەلأی ((زیاد)) کە لە مەلتیەوە نزیکە، سالی ٥٧٣ کۆچی / ١١٧٧ زاینی، قیلچ چووە ناو شارەکەوە، بەو جۆرە دوا ئیمارەتی دانیشمەندی روخا، لە ئەنادۆلدا، تەنها تورکە سەلجوقیەکان مانەوە ((١٢٩))

## سەلجوقیەکان بەرەو رۆژهەلات دەچن

## پەیوەندیان لەگەل ئەیوبیەکاندا دامەزراندنی دەولەتی ئەیوبی

ئەیوبیەکان دەگەرێنەوە بۆ ((ئەیوب کوری شادی)) لە شاری دوین ((١٣٠)) کە دەکەوێتە، دوا سنووری ئازەربایجان لە نزیکی تەفلیس لە ئەرمینیا. دانیشتوانی ئەو شارە لە کوردە روادیەکانن، کە لقێکە لە ((هەزبانی)) ئەم هۆزە لە کوردە بە ناوبانگەکانن کەس بە کۆیلەیانی نەکردووە ((١٣١)) لە سەدەی شەشی کۆچیەوە / دوانزەی زاینی، کاتێ ((شادی)) لەگەلێ دووکوری دا((ئەیوب)) و((ئەسەدەدین شێرکۆ))ناوچەکەی خۆیان بەجێ هێشتووە بۆ تکریت کۆچیان کردووە، کە دەکەوێتە رۆخی دەستە راستی دیجلەوە لە باکووری سامەرا، (بەهرۆز) کردوویەتی بە فەرمانرەوای شارەکە، چونکی پەیوەندی و هاورێیەتیان پێکەوە هەبووە، کە ((شادی)) مردووە ((نەجمەدین ئەیوب)) جێگای گرتۆتەوە ((١٣٢)) (نەجمەدین ئەیوب) لەگەل (عمادەدین زەنکی) ئەتابەکی موسلْ هاوکاری کردووە، بەهرۆز ئەمەی پێ ناخۆش دەبێ و بە دەرچوونی داناوە لە دەسەلأتی بەغدا، ئەو خێزانەی لە تکریت دەرکردووە، ئەو دوو برایە چوونەتە لای ((عمادەدین زەنکی)) لەکاتی ململانێی ئیسلامیەکان و سەلیبیەکان لە سەر میسر ((نورەدین مەحمود))ی کوری عمادەدین،ئەسەدەدین شێرکۆ))ی بۆ میسر ناردووە، بۆ دەرکردنی سەلیبیەکان. لە ژێر سێبەری فاتمیەکاندا دەسەلاتی بەدەستەوە گرتووە، (عاصند) کە دوا فەرمانرەوای فاتیمیەکان بوو، بەوەزیر دایمەزراندووە، برازاکەی (سەلاحە دین)ی لەگەلدا بووە، کە (ئەسەدەدین شێرکۆ) کۆچی دوایی

کردووە (سەلاحەدین) لە جێگاکەی بووە بە وەزیر دوای ئەوەی بەسەر کێشەکاندا سەر دەکەوێت، دەوڵەتی فاتمی روخاندووە و لە خوتبەدا ناوی خەلیفەی عەباسی (المستضئ)ی هێناوە لە ژێر پێ داگرتنی (نورەدین مەحمود) دا، ئەویش لە ساڵی ٥٦٧ کۆچی / ١١٧١ زاینی دا بووە ((١٣٣))

(سەلاحەدین) لە میسر دەمێنێتەوە و دەوڵەتی ئەیوبی دادەمەزرێنێ، دوای مردنی ((نورەدین مەحمود)).. دواجار ولاتی ((شام)) دەهێنێتە ژێر دەسەلاتی خۆیەوە و فەرمانڕەوایی هەردوو ولاتەکە دەکات. بەهەوڵی ((عمادەدین زەنکی))و((نورەدین مەحمود))ی کوڕی، یەکێتی ئیسلامی قوناغێکی پێشکەوتووی بڕیبوو، ((سەلاحەدین)) ئەو یەکگرتنەی چەسپاند و موسڵمانانی بەرەو جیهاد دژی سەلیبیەکان برد، بۆ گەڕانەوەی ئەو ناوچە ئیسلامیانەی کەوتبووە ژێر دەستیان، تا رادەیەك لەمەدا سەرکەوتنی وەدەست هێنا. ئەوەبوو میسر و ولاتی شام و هەرێمی جزیرە بوونە یەك پارچە. کە هۆیەکی گەورە بوو بۆ سەرکەوتنی موسڵمانەکان لە شەڕی (حطین) دا کە لە مانگی رەبیعی دووەمی ٥٨٣ یکۆچی / تەمموزی ١١٨٧ ی زاینیدا روویدا و (بیت المقدس) گەڕایەوە ((١٣٤))

یەکەم رووبەڕوو بوونەوە لە نێوان سەلجوقیەکان و ئەیوبیەکاندا

دوای ئەوەی ((قیلج ئەرسەلان)) ئیمارەتی دانیشمەندی لە مەلتیە رووخاند، کەوتە بیری ئەوەی بەرەو باشوور بڕوا تاکو ((رعبان))و((کیسوم)) بخاتە ژێر دەسەلاتیەوە، وا دەردەکەوێ نیازی وابوو دەست بکێشێتە کاروباری ولاتی شامەوە، تاکو رێگای بەرەو فوڕات دابین بکات، ئەمە سیاسەتێکی گشتی سەلجوقیەکان بووە هەر لە سەردەمی دامەزرێنەری سەڵتەنەتەوە ((سلیمان کوڕی قتولمش))دا ویستی ئەو ساردیەی نێوان ((سەلاحەدین ئەیوبی)) و ((ئیسماعیل کوڕی نورەدین))ی خاوەنی حەڵەب، بقۆزێتەوە. لە راستیدا لە فراوانبوونی دەسەلاتی (سەلاحەدین)) دەترسا و لە حەڵەب گوشاری خستبووە سەری.. بۆ ئەوەی لە بەرامبەر موسڵمانەکان بە دەست درێژکەر دانەنرێت، نوێنەرێکی بۆ دیمەشق نارد، لەگەڵ ((سەلاحەدین))دا کۆبوەوە و داوای دوو قەلای لێکرد، بە بیانووی ئەوەی پێشتر موڵکی سەلجوقیەکانی رۆم بوونە، باوکی دەستی بەسەرا

گرتبوون، دواجار داونیەتی بە ((نورەدین مەحمود)). ئەم داوایە (سەلاحەدین)ی تورە کرد، قسەی گرانی پێ وتبوو و هەرەشەی لە قیلج ئەرسەلان کردبوو. نوێنەرەکە گەڕایەوە قونیە، هەواڵەکەی گەیاند، سولتانی سەلجوقی تورە بوو، ساڵی ٥٧٥ ی کۆچی ١١٧٩ی زاینی. هێرشی بۆ قەڵای ((رعبان)) برد، کە ناوچەی فوراتی دەپاریزا و لەسەر رێگای حەلەب—سمیساط دا بوو، ئەو کاتە بە دەستی میر (شەمسەدین کوڕی مقدەم)ەوە بوو، هێزەکەی سەلجوقی بەبیست هەزار جەنگاوەر مەزەنە کرا، یەکێکی دیکە بە سێ هەزار شەرکەری داناوە. (سەلاحەدین) هەواڵی هێرش بردنەکەی بیست، هێزێکی سەربازی نارد لە هەزار سوار پێکهاتبوو بە فەرماندەیی (مزەفەرتەقیەدین عومەرشاهنشا)ی خاوەنی (حماة) ((١٣٥)) هێزی ئەیوبیەکان گەیشتە دەوروبەری سەربازگەکەی سەلجوقیەکان، سووسەی شوێنەکەیان کرد، هەستیان کرد بێ ئاگان، بەهەلیان زانی و هێرشیان کردە سەریان، هێزی سەلجوقیەکان پەشۆکان، و دەستیان کردە هەڵهاتن، زۆریان بەدیلی گیران، دواجا (مزەفەرتەقیەدین عمر) دیلەکانی ئازاد کرد، قیلج ئەرسەلان گەڕایەوە مەلتیە ((١٣٦))

## دووەم رووبەڕووبوونەوە لە نێوان سەلجوقیەکان و ئەیوبیەکاندا

پەیوەندیەکانی سەلجوقیەکان و ئەیوبیەکان بە گرژی مایەوە، ساڵی ٥٧٦ ی کۆچی / ١١٨٠ی زاینی، ناکۆکی کەوتە نێوان قیلج ئەرسەلانی دووەم و سەلاحەدین، بەهۆی کێشەیەکی خێزانیەوە ئەویش ئەوە بوو، سولتانی سەلجوقی لەگەل (ئەرتەقیەکاند) پەیوەندی سیاسی بەست لە قەڵای کیفا، لە ئەنجامی ئەو رێکەوتنە (سەلجوقە خاتوون)ی لە (نورەدین مەحەمەد کوڕی قەرا ئەرسەلان) مارە کرد و قیلج ئەرسەلان چەند قەڵایەکی پێ بەخشی کە نزیکی وڵاتەکە بوون. دوای ماوەیەك، (نورەدین مەحەمەد) دڵی لە کچە گۆرانی بێژێك دەچێ و مارەی دەکات. ژنە سەلجوقیە واز لێ دێنێ، کچە، نامە بۆ باوکی دەنووسێ و گلەیی خۆی دەکات. باوکیشی نامەیەك دەنێرێ یان لەگەڵیا باش بە، یاخود دەستی لێ هەڵگرە. بەڵام ئەو گوێی پێ نەدابوو. ئەوجا قیلج ئەرسەلان هێزێك بۆ سەر نورەدین دەنێرێ بۆ تەمێ کردنی. (نورەدین) پەنا بۆ سەلاحەدین ئەیوبی) دەبات

(سەلاحەدین) نامەیەك بۆ قیلج ئەرسەلان دەنێرێ، داوای لێ دەکات دەستدرێژی نەکاتە سەر ئیمارەتی (کیفا) وەلامی دەداتەوە ئەو چەند قەلایەکی بە نورەدین داوە کاتێ کچەی پێداوە. لەبەر ئەوەی زاواکەی رەفتاری لەگەلٚ کچەکەیدا باش نییە، بۆیە بڕیاری داوە، ئەوەی پێی داوە لێی وەرگرێتەوە. چەند جارێکی تر نامەیان کەوتە نێوانەوە. ناچار (سەلاحەدین ئەیوبی) بە هێزێکی سەربازییەوە بڕوا بۆ ئەنادۆل، تا قیلج لە سنووری خۆی دەنەنەچێ (نورەدین)یش کەوتە تەکی، چووە (تل باشر) لەوێوە بۆ (رعبان).. ئەمە گەیشتە قیلج ئەرسەلان. ئەویش خۆی تەیار کرد. هەرسێ لایان لە مانگی جەمادی یەکەم /تشرینی یەکەم، لەسەر رووباری (گوك صو) بەرامبەر یەك وەستان. دوای وتووێژێکی زۆر، (سەلاحەدین) لەسەر قسەی خۆی سوور بوو، هەڕەشەی هێرشی بۆ مەلتیە و شوێنەکانی دیکەی سەلجوقیەکان کرد، ئەگەر قیلج ئەرسەلان سوور بێ لەسەر تەمێ کردنی نورەدین. میری سەلجوقی، کاتێ لە سەربازگەکەی (سەلاحەدین) دەبێ بەچاوی خۆی لێهاتوویی (سەلاحەدین دەبینێ) بۆیە زۆر هەولٚی دا لە رووی ئاینیەوە کێشەکە بۆ (سەلاحەدین) روون بکاتەوە. سەلاحەدین بڕوای بە قسەکانی کرد، دواجار لەسەر ئەمانە رێکەوتن:-

-نورەدین سالێکی کە گۆرانیبێژەکە تەلاق بدات.

ئەگەر تەلاقی نەدا (سەلاحەدین) و (قیلج ئەرسەلان) دەکەونە شەڕی (نورەدین)ەوە

هەموو میرەکانی موسل و دیاربەکر و ئەرتەقیەکان دێنە ناو ئەم ئاشتبوونەوەیەوە (١٢٧) وا دیارە رێکەوتنێکی دوولایەنەش لە پەراوێزی وتووێژەکەی (سەلاحەدین) و (سولٚتانی سەلجوقی) یەوە ئەنجام درا. لەسەر ئەوە رێکەوتن (سەلاحەدین) یارمەتی سەلجوقیەکان بدات لەشەڕی دژی ئەرمەنیدا لە قیلیقیە..کە هەمیشە هێرشیان دەکردە سەر خاکی سەلجوقیەکان، بە بەلٚگەی ئەوەی، بەر لەوەی بگەڕێتەوە ولاتی شام، هێرشی کردە سەر ئەرمەنیەکان.

## ململانێی قیلج ئەرسەلانی دووەم لەگەڵ سەلیبیەکاندا لە لەشکرکێشی سێیەمی سەلیبیدا سەلیبیەکان هاوار بۆ رۆژئاوای ئەوروپی دەبەن

لەساڵانی ٥٨٣-٥٨٦ ی کۆچی / ١١٨٧-١١٩٠ی زاینیدا، سەلاحەدین توانی دەسکەوتی زۆر گەورە وەدەست بهێنێ. هەرکە شەڕ لە (حطین) تەواو بوو و سەلیبیەکان زیانی گەورەیان لێکەوت، نوێنەر بەرەو رۆژئاوا کەوتنە رێ، تا بارودۆخی سەلیبیەکان لە رۆژهەلاتدا بە شاو میرەکانی ئەوروپا بگەیەنن، دوای گرتنی (بیت المقدس) دیسان، نوێنەران بەرەو ئەوروپا رۆیشتن، ئەوەی شایانی باسە، موڵکەکانی سەلیبیەکان لە رۆژهەلاتدا کەم بوونەوە بە رادەیەك لە سەرەتای ساڵی ٥٨٦ یکۆچی / ١١٩٠ی زاینیدا، لە مەملەکەتی(بیت المقدس) دا تەنها شاری (صور)یان بە دەستەوە مابوو، لە ئیمارەتی (تەرابلوس) تەنها شاری (تەرابلوس) و قەلای (انطرطوس) و (قەلای کوردان) و هەندێ بنکەی لاوەکی دیکە یان بە دەستەوە بوو، لە ئیمارەتی (ئەنتاکیە) تەنها پایتەختەکەو بەندەری (سویدی) و قەلای (مرقب) مابووەوە (١٣٨) لە راستیدا ئەم زیانە و ئەم (فەتحە) لە کۆمەلگای ئەوروپیدا کاردانەوەیەکی توندی هەبوو ئەو دوو کارەساتە ترسێکی گەورەی لە دڵنا، نەسرانیەکان بڕوایان وابوو لە ئەنجامی گوێ نەدانیان و وەلامنەدانەوەی ئەو داوایانە بوو کە چەندین جار لە مەملکەتی (بیت المقدس)ەوە لەم ساڵانەی دواییدا داوایان دەکرد ((١٣٩)) ئەو سەلیبیانەی لە شاری (صور)بوون، کەوتنە سەر ئەوەی ئەگەر یارمەتیان لە رۆژئاواوە پێ نەگات، ئەوا فرسەتی مانەوە لە شارەکەمدا دەبێتەوە دوای ئەوەی هیچ ئومێدێکیان نەمابوو بۆ گەڕانەوەی ئەو ناوچانەی لە دەستیان دەرچووبوو.

زۆری نەبرد ((کونراد دی مونتیفیرات)) پارێزەری شاری ((صور))، ((جوسیاس)) ی سەرۆکی ئەسقوفی ((صور)) ی نارد بۆ رۆژئاوای ئەوروپی لە ناوەراستی ٥٨٣ی کۆچی / کۆتایی هاوینی ١١٨٧ ی زاینیدا داوا لە پاپا و شاو میرەکانی ئەوروپا دەکات، بەپەلە یارمەتی بنێرن...

((جوسیاس)) گەیشتە((صقلیە)) لەگەڵ شاکەیدا ((ولیمی دووەم)) کۆببووەوە، داواکەی قەبوڵ کرد، دوای ئەوەی دەنگوباسی کارەساتەکەی گوێ لێبوو کە لە

ڕۆژهەڵاتدا بەسەر سەلیبیەکاندا هاتبوو. چونکی لەگەڵ بیزەنتیەکاندا لەشەڕدا بوو، پەیمانی ئاشتبوونەوەی لەگەڵ ئیمپراتۆری بیزەنتیدا گرێدا، تاکو بپەرژێتە سەر کێشەی سەلیبیەکان. دوا جار هێزێکی دەریایی و چەند سەد سوارەیەکی بۆ ((تەڕابلوس)) بە فەرماندەیی ((مرگریت برەندیزی )) نارد

نەیهێشت ((سەلاحەدین )) شاری ((تەڕابلوس )) بگرێت((١٤٠)) دواجار ((جوسیاس))بۆ ڕۆما چوو، لەگەڵ چەند نێردراوێکی سقلیدا، تاکو بۆ ((ئوربانی سێیەم)) بارودۆخی سەلیبیەکان لە شام ڕوون بکاتەوە. پاپا، بەرگەی ئەم کارەساتەی نەگرت لە ١٤ ی شەعبانی ٥٨٣ی کۆچی / ٢٠ تشرینی یەکەمی ١١٨٧ ی زاینی. کۆچی دوایی کرد. جێنشینەکەی (( گریگوری هەشتەم )) دەست بەجێ پەیوەندی بە شای ئینگلتەراو فەرەنساو ئیمپراتۆری ئەلمانیاوە کرد، داوای لێکردن ناکۆکیەکانیان لەبیربەرنەوەو هێزەکانیان بۆ شەڕی موسڵمانەکان بنێرن((١٤١)).

پاپا، نەژیا تا بەری ئەو هەوڵانە ببینێ، دوای دوومانگ کۆچی دوایی کرد و ((کلیمنتی سێیەم)) چووە جێگاکەی، دەستبە جێ پەیوەندی کرد بە ئیمپراتۆری ئەڵمانیاوە)) ((فریدریك بربروسا)) و ڕازی کرد لەلەشکر کێشی سەلیبی بەرەو ڕۆژهەڵات بەشداری بکات. ئەمە لەو کاتەدا بوو کە((جوسیاس)) بۆ فەرەنسا و ئینگلتەرا چووبوو تا چاوی بەهەردوو شاکە بکەوێت، لەگەڵ ((فیلیپ ئۆغستۆس)) و ((هنری دووەم)) کۆبووەوە،لە((جیزورن)) چاوی بە هەردووکیان کەوت، کە دەکەوێتە نێوان نورمەندیا و فەرەنساوە. ڕازی کردن تا ناکۆکیەکانیان فەرامۆش بکەن هانیدان پەیمانی ئاشتبونەوە لەنێوانیاندا گرێ بدەن و بەشداری لە لەشکر کێشی سەلیبی بکەن، لەگەڵ ئەوەشدا خۆیان دوا دەخست و شەڕ لەنێوانیاندا بەرپا بوو. دواجار لە ساڵی ٥٨٥ کۆچی / ١١٨٩ زاینی ((هنری دووەم)) کۆچی کرد و کوڕەکەی ((ریتشاردقلب الاسد)) چووە سەر عەرشی ئینگلتەرا، لەگەڵ شای فەڕەنسادا ئاشت بووەوە، هەردووکیان خۆیان ئامادە کرد تا پێکەوە بەرەو ڕۆژهەڵات بڕۆن ((١٤٢)).

## لەشکرکێشی ئیمپراتۆر فریدریك بربروسا

ئیمپراتۆری ئەلمانی ((فریدریکی یەکەم بربروسا)) کەوتە خۆی، سەرەرای گەورەیی تەمەنی، بریاریدا بەرەو رۆژهەلآت بروات. نامەی بۆ ئەو شا و میرانە نارد کە لەشکرەکەی بەولآتەکانیاندا تێدەپەرێ. ئاگاداری کردنەوە کەوا بەرەو فەلەستین دەروات، داوای یارمەتیان لێدەکات کە رێگای تێپەربوونی بدەن. نامەی بۆ ((بیلا))ی شای مەجەر نووسی، هەروەها بو ((ئیسحاقی دووم ئەنجیلوس)) کە ئیمپراتۆری بیزەنتی بوو، ((قیلج ئەرسەلان)) سولتانی سەلجوقی، هەروەها نامەیەکیشی بۆ ((سەلاحەدین ئەیوبی)) نووسی کە خۆی تیادا هەلدەنا و داوای گەرانەوەی هەموو فەلەستینی لێکرد. نامەکەی ((فریدریك بربروسا)) گەیشتە سولتانی سەلجوقی، لەوکاتەدا خەریکی دابەشکردنی سەلتەنەکەی بوو بەسەر کورەکانیدا، وەلآمی دایەوە، کەوا ئامادەیە یارمەتی بدات، هەروەها (شای مەجەر)یش ئامادەگی خۆی نیشاندا. ئیمپراتۆری بیزەنتی، سیاسەتی دووفاقی نیشاندا، نوێنەری بۆ ئەلمانیا نارد، کەوا هەموو شتێك ئامادەیە بۆ تێپەرینی لەشکرەکەیان لە خاکی بیزەنتیەوە، لە هەمان کاتدا، ترسی خۆی نیشاندا، لەوەی لەگەلّ (سەلاحەدین) دا ببنە هاوپەیمان لە دژی ئیمپراتۆر و سولتانی سەلجوقی. پەیمانی دا، سەلبیبەکان بەخاکی بیزەنتیدا تێناپەرن، ئەگەر (صلاح الدین) جێگا پیرۆزەکانی نەسرانیەکان بخاتە ژێر چاودێری پیاوانی ئاینی ئەرسەدوکی ((١٤٣)) ((سەلاحەدین)) زۆر بە ژیرانە وەلآمیدایەوە، داوای لە ئیمپراتۆر کرد دیلەکانی سەلیبیەکان بەرەللآ بکات و دێرە لاتینیەکان لە فەلەستین بۆ خاوەنەکانیان بگەرێنێتەوە، هەرئەوەندە ((١٤٤)) ((فریدریك بربرۆسا)) لە رەبیعی دووەم ٥٨٥ کۆچی / ئایاری ١١٨٩ ی زاینی لە ئەورووپاوە بەرەو رۆژهەلآت کەوتە رێ. مێژوونووسان، سوپاکەی بە ٢٠٠ هەزار سەرباز داناوە، بەرێگای وشکانیدا، بەسەر مەجەر دا روویکردە قوستەنتینیە ((١٤٥)). کە گەیشتە بەلقان، ئیمپراتۆری بیزەنتی نامەیەکی بۆ ((صلاح الدین)) نارد، لە گەیشتنی شای ئەلّمان ئاگاداری کردەوە، پەیمانی دەداتێ نەهێلّێ تێپەرن. ((١٤٦)) بەلآم ((ئیسحاقی دووەم ئەنجیلۆس)) ناچار و لە ژێر گوشاری رووداوەکاندا رێگای لە شکرکێشیەکەی

ئـەڵمانی دا بەیارمـەتی گەشـتیەکانی بیزەنتیـەکان. ((١٤٧)) لـە دەردەنیـل پەڕینەوە، لە هەمان کاتدا ((صلاح الدین))ی لەمە ئاگادار کردەوە.. کەئیمپراتۆری ئەڵمانی، کەنارەکانی ئاسیای تێپەڕاند، ئـەو ڕێگایـەی گـرت کـە بـەرەو ((لازیـق)) دەڕوات، دوای سی ڕۆژ گەیشت ((١٤٤)). لە ((لازیق))ەوە، بەرەو ڕۆژهەلات ڕویی، هەمان ئەو ڕێگایەی گرت کە ((مانویـل)) بـۆ پایتـەختی سـەلجوقیەکان ((قونیـە)) گرتبووی. کە بە ((میریوکیفالون)) و ئەنتاکیەدا تێدەپەڕی، چـووە ئـەو خاکانـەوە کە لە ژێر دەسەلاتی قیلج ئەرسەلاندا بوون.

قیلج ئەرسەلانی دووەم لە نێوان سەلاحەدین و فریدریك بربروسا دا قیلج ئەرسەلان لـەو کاتـەدا ڕووبـەڕووی گـەلێ ئاسـتەنگ هـاتبوو، لـە لایـەن کوڕەکانیـەوە، کـە موڵکەکانی بەسەریاندا دابەشکرد. سەرەڕای ئەوەش بـە هـۆی ئـەو هاوپەیمانیـەی نێوان هەردوو نەیارانی ((صلاح الدین)) و ((ئیسحاق دووەم ئـەنجیلۆس)) گوشـاری لەسـەر بـوو، وایـدەبینی کـەوا سـەلیبیە ئەڵمانیـەکان چـاکترین هاوپـەیمانن دژی دوژمنی هەردوولایان، بەڵام نەیدەویست، لەبەر چـاو موسـڵمانەکان واخـۆی نیـشان بدات یارمەتی سەلیبیەکان دەدات. بۆیە لـە دەسـتدرێژییەکانی تورکمـان بـۆ سـەر سوپای ئەڵمانی چاوپۆشی دەکرد. هەروەها سـوپاکەی ئـەڵمان ڕووبـەڕووی کـەمی ئالیك و ئازووقەو ئـاو ببونـەوە، دوای ئـەوەی سـەلجوقیەکان دێهـات و بـەروبوومی کشتوکاڵیان سووتاندبوو بۆ ئەوەی سەلیبیەکان سوودی لێ نەبینن. سـەختی ڕێگـا شاخاوییەکانیشی ئاستەنگێکی دیکە بـوو بۆیـان، هـەروەها هەنـدێ لـە هێزەکـانی سەلجوقی، بە دەوری سوپای ئەڵمانیەکاندا دەگەڕان، هەندێکیان دەستگیر دەکـرد و ڕێگایان لەوانە دەبڕی کە بەدوای زەخـیرەدا دەگـەڕان ((١٤٨)) پلانـی سـوڵتانی سـەلجوقی بـۆ تەنگـەتاو کردنـی سـوپای ئـەڵمانی کاریگـەری زۆربـوو. سـەرەڕای ئەوەش، بەردەوام بوون لەبەرەو پێشەوە چوونیان بەرەو (قونیە) لە کاتێکدا قیلج ئەرسـەلانی دووەم لەبەردەمیانـدا خـۆی دەکـشانەوە. لـە ڕەبیعـی دووەمـی ٥٨٦ کۆچی / ئایاری ١١٩٠ی زاینی گەیشتنە ((قونیە)). قـیلج ئەرسـەلانی دووەم خـۆی لە قەلاکەدا قـایمکرد. تـا نەکەوێتـە شـەڕەوە لـە گەڵیانـدا، بـەڵام ((قطـب الـدین مەلکشـا))ی کوڕی بە هێزێکەوە هێرشی کردە سـەر ئەڵمانیـەکان. بـەلام نـەیتوانی

خۆی ڕاگرێ، ناچار کشایەوە و گەڕایەوە (قونیە) ((فریدریك بربروسا)) توانی ڕێگایەك بدۆزێتەوەو بڕواتە ناو شارەکەوە. هێرشی کردو بازاڕەکانی سووتاند ((١٤٩)) ((فریدریك بربروسا)) پێنج ڕۆژ لە قونیە مایەوە، دیارییەکی بۆ سولتانی سەلجوقی نارد و پێی ڕاگەیاند ((ئێمە مەبەستمان ولاتەکەی تۆ نەبووە ناشمانەوێ بەڵکو ئێمە بۆ ((بیت المقدس)) هاتووین))، داوای لێکرد ڕێگا بدات سوپاکەی چی پێویستە بیبەن ((ڕێگای پێ دان، چیان ویست بردیان بۆ ئەو سەفەرەیان)) هەروەها داوای لە ((قطب الدین ملکشا)) کرد ئیتر گوشار نەخاتە سەر سوپاکەی ((١٥٠)) لە نێوان هەردووکیاندا وتووێژ کرا، بەگوێرەی ئەوەی، قیلج ئەرسەلانی دووەم پەیمانی دا ڕێگاکەیان بۆ ولاتی شام بە قیلیقیەدا دەڕۆیشت بپارێزێ و دەلیلیان لەگەڵدا بنێرێ بۆ ڕێ نیشاندانیان، بۆ ئەوەی تورکەکان پەشیمان نەبنەوە لە بەڵێنەکانیان، ئیمپراتۆر چەند بارمتەیەکی داوا کرد. ئەوانیش بیست کەسێکیان وەك بارمتە دانان و بەرەو ئەرمینیای بچووك کەوتنە ڕێ ((١٥١)) هەندێ لە مێژوو نووسانی موسڵمانان، لەوەسفکردنی پەیوەندی دۆستانەو هاوپەیمانی نێوان قیلج ئەرسەلانی دووەم و فریدریك بربروسا، زیادە ڕۆییان کردووە..((ابن شداد)) دەڵێ :قیلج ئەرسەلان وای پیشان دەدا دوژمنیانە، بەلام لە ناخەوەی دوستیان بوو. هەروەها سولتانی سەلجوقی دەلیلی خستە تەکیان، تا بە سەلامەتی بە ولاتەکەیدا تێپەڕن بەرەو ئەرمینیای بچووك ((١٥٢)) هەندێ کەسی دیکە : ئامارە بەو هاوکاریەی نێوان قیلج ئەرسەلانی دووەم و ((سەلاحەدین)) دەکات لەبارەی سوپای ئەڵمانیەوە، ((ابن الاثیر)) دەڵێ ((شا قیلج ئەرسەلان، هەواڵی سوپای ئەڵمانیای دەگەیاندە صلا الدین، و بەڵێنی پێ دەدا نەهێڵێ بە ولاتەکەیدا تێپەڕن، بەلام کاتێ هاتن و تێپەڕین، داوای لێبوردنی کردووە کە نەیتوانیوە بەرگریان بگات ((١٥٠)). مێژوو نووسە ڕۆژئاواییەکانیش، لە بارەی پەیوەندی قیلج ئەرسەلانی دووەم و فریدریك بربروسا، ڕای جیاوازیان هەیە..((رنسیمان)) کاتێ دەڵێ ((ئاشکرایە، قیلج ئەرسەلان، سولتانی سەلجوقی نیازی نەبوو هەرچەندە بەڵێنی دابوو ڕێگا بە سەلیبیەکان بدات بە ولاتەکەیدا تێپەڕن، کە سوپاکەیان دەبینێ، هیچی لە دەست نەهات لەوەی زیاتر بە دەوری

سوپاکەدا دەهات و دەچوو، هەندێ لەوانەی ڕێیان وێڵ دەکرد دەرفاند )) ((١٥٣))
ئـەم دوو رایـە جیـاوازە چـۆن لێکدەدرێتـەوە؟ لـەبارەی هەلـسو کـەوتی قـیلج ئەرسەلانەوە بەرامبەر بە سەلیبیەکانی ئەڵمان؟

## دابەشکردنی سەڵتەنە و ڕەنگدانەوەی لەسەر بارودۆخی گشتی دەوڵەت – مردنی قیلج ئەرسەلانی دووەم

لـە ئـەنادۆل ئاشـتی بەرقـەرار بـوو، بـەهۆی هـەوڵی قـیلج ئەرسـەلانی دووەمـەوە، یـەکڕیزی سیاسـی سـەلجوقیەکان هاتـە دی. سـەردەمی پێـشکەوتنی ئـابووری و رۆشـنبیری هاتـە کایـەوە. بـەلآم ئـەم یەکڕێزییـە زۆری نـەبرد لـێکترازا، ولآت دووچـاری ململانێـی خێزانـەکان بـووەوە، لـەم کاتـەدا مەترسـیەکانی دەرەوەیـان لەسـەر نـەمابوو.. (صـلاح الـدین ئـەیوبی) خـەریکی رووبـەڕوو بوونـەوەی لەشکرکێـشی سـێیەمی سـەلیبیەکان و لـە نـاوبردنی ئیمارەتـە سـەلیبیەکانی ولآتـی شـام بـوو، بیزەنتیـەکانیش بروایـان هێنـا بـەو بارودۆخـە سیاسـیەی ئاسـیای بـچووك دوای ئـەو گـورزەی لەشـەڕی ((میریوکیفـالون)) بـەریان کـەوت، قـیلج ئەرسـەلان، هەسـتی بـە بـێ توانـایی خـۆی و مانـدوو بـوون کـرد، دوای ئـەوەی تووشـی لایـەکی ئیفلـیج بـوو لـە سـاڵی ٥٨٢ کۆچـی / ١١٨٦ی زاینـی. کەوتـە بـیری ئـەوەی سـەڵتەنەکەی بەسـەر کوڕەکانیـدا دابـەش بکـات. سـاڵی ٥٨٥ کۆچـی / ١١٨٩ی زاینـی ئـەو کـارەی ئەنجامـدا، کـە هەڵەیـەکی سیاسی گەورە بوو، دابەشکردنەکە بەم جۆرە بوو :

| | |
|---|---|
| –قطب الدین ملکشا | سیواس واق سرا |
| رکن الدین سلیمان شا | توقات |
| ناصرالدین برکیاروق شا | نیکسار |
| مغیث الدین طغرل شا | بستان |
| نورالدین محمود شا | قەیسەری |

| | |
|---|---|
| معزالدین قیصر شا | مەلتیە |
| محی الدین مسعود شا | ئەنقەرە |
| سنجر شا | هرقلە |
| ارسلان شاه | نکیدە |
| نظام الدین ارغون شا | اماسیە |
| غیاث الدین کیخسرو | قونیە و دەورووبەری و برغلو |

((١٥٤))

شارەکان چیان لە دەورووبەردا بێ، سەر بەو شارە دەبن ((١٥٥))

ئیتر سولتان، هەر بەناو فەرمانڕەوابوو، دەسەلاتی فەرمانڕەوایی نەما، لەم بارودۆخە نەشازەدا، ناکۆکی لە نێو براکاندا پەیدا دەبێ، دواجار، لەنێوان ئەوان و باوکیاندا، هەریەکەو دەیەوێ ملی ئەوەی تر بشکێنێ و لە هەل دەگەڕان دەست بەسەر مولکی ئەوەی دیکا بگرێ. لەناویاندا ((قطب الدین مەلەکشا)) دەرکەوت، کە پرکێشی و ئاواتی سیاسی هەبوو. (قونیە)ی داگیرکرد، باوکی دەست بەسەر کرد، بۆ ئەوەی ژیانی خۆی بپارێزێ لە پیلانی دەورووبەرەکەی، ئەو میرانەی هەواداری باوکی بوون، لێیان رزگار بوو، بەلاّم سکەی پارەو خوتبە هەر بەناوی باوکیەوە مایەوە ((١٥٦)). ((قطب الدین)) دوای ئەوەی جێ پێی خۆی چەسپاند، دەستی درێژ کرد بۆ شاری براکانی، لە (قەیسەری)یەوە دەستی پێکرد، بە هێزێکەوە رۆیشت و ئابلۆقەی دا، باوکیشی لەگەڵ خۆیدا برد، تاکو بە ((نورالدین محمود))ی برای رابگەیەنێ، باوکی رازییە بەم کارە.. ((قیلج ئەرسەلانی دووەم )) هەلی بۆ رەخسا، لە دەستی هەلات، چووە لای ((نورالدین))ی کوڕی، هەردووکیان کەوتنە بەربەرەکانی تەماحی ((قطب الدین)). ناچار ئابلۆقەکەی هەڵگرت و گەڕایەوە قونیە ((١٥٧)) قیلج ئەرسەلان، دواجا زانی، چی هەڵەیەکی گەورەی کردووە کەوا ولاّتەکەی دابەشکردووە، بریاریدا، بیخاتەوە ژێر دەسەلاتی یەك کەس، بۆ ئەمە، کوڕە بچووکەکەی هەڵبژارد ((غیاث الدین کیخسرو)) لە میرەکان و پیاو ماقولاّن بەیعەتی بۆ وەرگرت ((١٥٨))

براکانی ئەم کارەی باوکیان پێ باش نەبوو، یاخی بوون لە باوکیان، باوکیان ناچار بڕیاری شەڕکردنیانی دا تا سەڵتەنەکەی یەکبگرێتەوە. لە (قەیسەر)یەوە دەستی پێکرد، لەگەل ((غیاث الـدین)) دا ئابلۆقەیان دا لەکاتی ئابلۆقەداندا، سوڵتان نەخۆش کەوت، کوڕەکەی ئابلۆقەکەی هەڵگرت و گەڕایەوە قونیە ((١٥٩)) سوڵتان بڕیاریدا ئەگەر چاك بووەوە ((مەلتیە)) لە دەستی ((معزالدین)) وەربگرێتەوە. ((معزالدین)) داوای یارمەتی لە (صلاح الدین ئەیوبی) کرد. زۆر بەگەرمی پێشوازی لێکرد و برازاکەی خۆی، کچی (شا عادل)ی لێ مارە کرد و گەڕایەوە مەلتیە، دوای ئەوەی هانی دا کەوا لە باوکی و براکانی نەترسێ ((١٦٠)) بەمجۆرە، سوڵتان نەیتوانی ((مەلتیە)) بگەڕێنێتەوە، چووە سەر ((سیواس)) و ((ئاق سەرا)) و ئابلۆقەی ئەمەی دوایی دا، بەلام بە هۆی نەخۆشیەکەیەوە نەیتوانی بیگەڕێنێتەوە، زۆری نەبرد، کۆچی دوایی کرد، ((غیاث الـدین)) هەواڵی مردنی باوکی شاردەوە. ئابلۆقەی شاری ((ئاق سەرا))ی کردەوە و گەڕایەوە قونیە. ڕەزامەندی میرەکان و پیاو ماقوڵانی وەرگرت، کەوا دەسەڵات بە دەستەوە بگرێ. ئەوجا هەواڵی مردنی باوکی راگەیاند ((١٦١)) ساڵی ٥٨٨ کۆچی / ١١٩٢ی زاینی دەسەلاتی بە دەستەوە گرت.

## پەراوێزەکانی بەشی حەوتەم

1- اسد رستم،ج٢، ص ١٥٧

2- Ency. of Islam : vol II P 1007

3- Chalan don : p 432

4- Cqmb. hist of IsLam : Vol 1 p 243

5- Michel le syrien : Vol 111 p 346 – 347

6- Greqoire le pretre : p 176

7- Lbid : p 177.

8- ابن القلانسی : ص ٥١٠.

9- Greqoire le pretre : p 177. chalandon : p 432

10- ابن القلانسی : ص ٥١١. RICE : P 61. CAMB. HIST VOL IP 243

ابن القلانسی :ص ٥١١ .11-
Gregoire le pretre : p 178 -12
Michel le syrien : Vol 111 p 314 -13
عمران : ص ٢٠٢ Gregoire le pretre : pp 178 - 180 -14
ابن القلانسی : ص ٥٢٥ — ٥٢٦.15-
Gregoire le pretre : pp 178 - 180 - -16
Gregoire le pretre : pp 181 - 182 -17
Chalandon : p 434. -18
Kinnamos : p 176. -19
GreJoire le pretre : p 186 - chalandon : p 435 -20
٢١- تبنین : شارێکه له چیای ((بنی عامر)) دەڕوانێته بانیاس له نێوان دیمەشق — صور. الحموی : ج٢، ص ١٤.
ولیم الصوری : ج٢، ص ٨٥٩ 22-
Grejoire le pretre : p 186 -23
ولیم الصوری : ص ٨٦٠، ج٢24-
ولیم الصوری : ج ٢ ص ٨٦١.25-
ولیم الصوری : ج٢، ص ٨٦١ — ٨٦٢. رنسیمان : ج٢، ص ٥٦٨26-
ولیم الصوری : ج٢، ص ٨٦٥. ابن العبری : ص ١٧٢.27-
توفیق :ج٢ :ص ١٥٥.28-
ابن القلانسی : ص ٥٤٤.29-
٣٠- هەمان سەرچاوە.
Gregoire le pretre : pp 189 - 190 -31
Kinnamos : p 190. -32
Gregoire le pretre : p 192 -33
Lbid : p 193 -34
Kinnamos : lbid. chalandon : p 459 -35
Lbid : p 191. camb med - hist : Vol 17 p 377 -36
رتسیمان : ج٢، ص ٥٧٥37-
casanoVa p : la namismatigue des Danichmen - dites pp 81 - 85
٣٨ - ابن العمری : ص ١٧٥

-39 michel le syrien : Vol 111 p 321
-40 gregoire le pretre : p 194
-٤١ ولیم الصوری : ج٢، ص ٨٦٦ – ٨٦٧.
-42 Rice : p 70
-43 Gregoire le pretre : p 194
-44 Gregoire le pretre : p 194
-45 Kinnamos : p 199
-46 Camb med hist : Vol 1V p 377
-47 Kinnamos : p 200 chalandar : p 461
-48 Kinnamos : pp 198 - 200 -201
-49 Chalandon : p 461
-50 Kinnamos : p 201
-51 Kinnamos : Lbid pp 204 - 205
ابن العمری : ص ١٥٧ -52
-53 Kinnamos : p 207
اسد رستم : ج٢، ص ٤١٧. رنسیمان : ج٢، ص ٥٧٦ -54
ابن العبری : ص ١٧٥ -55
ابن الاثیر : ج٩، ص ٩١ -56
-٥٧ هەمان سەرچاوە : ابن االعبری : ص ١٧٦ – ١٧٧
-٥٨ تەرندە، درندەی ئێستایە. قەلآیەکە لەناو ولآتی رۆم لـە سـەرووی رووبـاری ((قباقب))ە، الحموی : ج٤، ص ٣٣
ابن العبری، ص ١٧٧ -59
هەمان سەرچاوە : ص ١٨٠. القرمانی، احمد : اخبارالدول : ص ٢٩٢ -60
-٦١ ابن الاثیر : التاریخ الباهر : ص ١٦٠
-٦٢ ابن الاثیر : الکامل فی التاریخ : ج٩، ص ١٠٩
الکروب فی اخبار بنی ایوب : ج١، ١٨٨، ١٩٠، ١٩١
بروانة : تاریخ الزیکین فی الموصل وبلاد الشام : ص ٣٩٤ – ٤٠٠ -63
-٦٤ ابن الاثیر : التاریخ الباهر : ص ١٦٠
-٦٥ ابن العبری : ص ١٨٤
-٦٦ ابن الاثیر : ص ١٦٠

٦٧- هەمان سەرچاوە :

٦٨- قیلج ئەرسەلان بەوە تۆمەتبار دەکرا کە مەزهەبی فەیلەسوفەکانی گرتووە.

- ابن الاثير : ص ١٦٠ - 69١٦١

٧٠- التاريخ الباهر : ص ١٦٠ - ١٦١

ابن الحبرى : ص 71١٨٤-

٧٢- ابن الاثير : ١٦١

٧٣- ابن الحبرى : ص ١٨٦ - ١٨٧

٧٤- هەمان سەرچاوە : ص ١٩٠

٧٥- هەمان سەرچاوە.

توفيق : ص 76١٤٤-

Nicetas : p 158 -77

-78١٤٠ توفيق : ص Lbid : p 63.

Finlay : Vol 111 p 190 -79

Chalandon : pp 598 - 599 -80

٨١- عمران : ص ٣٣١.

٨٢- هەمان سەرچاوە.

Nicetas : p 195 -83

Kinnamos : p 292 -84

Kinnamos : p 292 -85

L bid : p 291 -86

٨٧- عمران : ص ٣٣٣

٨٨- هەمان سەرچاوە.

Chalandon : p 503 -89

Kinnamos : pp 294 - 295 -90

p 378 -91٧Camb. med - hist : Vol 1

Lbid. chalandon : p 503 -92

Diebl.c. hisloire de le enmpire byzantin pl 46 -93

٩٤- عمران : ص ٣٣٤ - ٣٣٥

Lbit : pp 297 - 299 -95

٩٦- رنسيمان : ج٢، ص ٦٦٤

٩٧- عمران : ص ٣٣٧ – ٣٣٨.
Michel le syrien : Vol 111 p 369 -98
Kinnamos : pp 296 - 297 -99
١٠٠- میخائیلی سریانی ژمارەی ئەم سوپایە بە پەنجاهەزار دەخەملێنێ
- ابن العبری: ص ١٩٢ – ١٩٣, 101
Nicetas : p 230 -102
Nicetas. Lbid p 233 -103
Duggan a : the story of the crusa des :p 141. -104
Nicetas : p 234 -105
Nicetas : pp 233 - 234 -106
Lbid : p 234 -107
Nicetas : p 234 - 236 -108
Lbid : p 242 -109
Lbid -110
١١١- دەربارەی شەڕی میریوکیفالون بڕوانە Nicetas : pp 236 - 298.
michel le syrien : Vol 111 p 369. roman Empire : pp 235
238- مێژوو نووسە ئیسلامەکان بەکورتی باسی ئەم شەڕەیان کردووە.
Michel le syrien : Vol 111 p 369 - 372 -112
Nicetas : p 249 -113
١١٤- ((روجر هوفندن)) لە کتێبی ((کتابة التاریخ)) ئاماژەی بۆ ئەم نامەیە
کردووە ج٢، Chalandon : p 422 ١٠١.. بڕوانە
اسدرستم : ج٢، ص ٤٣ 115-
١١٦- عمران : ص ٣٤٩
Michel le syrien : VoL 111 p 372 -117
١١٨- ابن العبری : ص ١٩٣
Michel le syrien : Vol 111 p 384 -119
Wittek p - Rise of ottoman Empire/ p 23 -120
Ecy - of IsLam : Vol 11 p 1007 -121
تەنها مێژوو نووس ((نیکێتاس)) ئەم قۆناغەی نووسیوەتەوە 122-
Chalandon : p 513 -123
Nicetas : p 251 -124
Lbid -125

Nicetas : p 254 -126

Lbid -127

Lbid -128

Lbid : p 257 -129

Ramsay : historical geography of asia minor p 401 -130

١٣١- المقريزي، ابوالعباس احمد، السلوك في معركه دول الملوك : ص١، ص ١٨٥

١٣٢- وليم الصوري : ج٢، ص ١٠٣٢ - ١٠٣٣. اسدرستم، ج٢، ص ١٦٠

Brand. ch. n : the Byzantines and saladin 1185 - 1192 -133

١٣٤- ابن العبري : ص ١٨٤

١٣٥- هەمان سەرچاوە : ص ١٩٤

١٣٦- دوين : شارێکە لە دەوروبەری ((ئەڕان)) لەو پەڕی سنووری ئازەربایجان الحموی : ج٢، ص ٤٩١

١٣٧- ابن الاثير : التاريخ الباهر : ص ١١٩

١٣٨- ابن خلكان : ابو العباسى شمس الدين احمد : وفيات الاعيان وابناء ابناد الزمان : ج ٧، ص ١٣٩ - ١٤٠

139- بڕوانە : تاريخ الايوبيين في مصر وبلاد الشام واقيلم الجزيرة : ص ٢٠ - ٣٩

١٤٠- بڕوانە :تاريخ الايوبيين : ص ١٣١ - ١٧٢

141- الايوبى : الملك المنصور محمد بن عمر شاهنشا : مضمار الحقائق وسر الخلائق : ص ١٨-١٩

ابن الاثير : ج ٩، ص ١٤٨

١٤٢- هەمان سەرچاوەکانی پێشوو

١٤٣- کوك صو : ڕووباری شینة - النهرالازرق - لقێکە لە فوڕات

١٤٤- بڕوانە : ابن الاثير : ج ٩، ص ١٥٠. سبط ابن الجوزي، مراة الزمان : ج ٨، ص ٣٦٠. منجم باشي، ج٢، ص ٥٦١

١٤٥- ابن شداد، بهاء الدين : النوادر السلطانية والمحاسن اليوسفية : ص ٩٨

Grousset : histoire des croisades : Vol 11 p 834 -146

Camb - med - hist : Vol 17 p 310 -147
Estoire d Eracles: Vol 11 pp 119 - 120 -148
١٤٩– يعقوب الڤيترى : تاريخ بيت المقدس، ص ١٥٨
١٥٠– يعقوب الڤيترى : ص ١٥٨ – ١٥٩، رنسيمان : ج٣، ص ٢١ – ٢٢
١٥١– ابن الاثير : ج ٩، ص ٢٠٧. ابوشامة : ج٢، ص ١٥٩ –١٦٠
١٥٢– ابن الاثير : ج ٩، ص ٢٠٧. ابوشامة : ج٢، ص ١٥٩ – ١٦٠
١٥٣– ابن شداد : ص ١٧٨
١٥٤– ابن الاثير : ج ٩، ٢٠٧
VasilicV : Vol 11 pp 445 - 446 -155
Oman : Vol 1 p 249 -156
157– ابوشامة : ج٢، ص ١٥١. ابن واصل : ج٢، ص ٢١٨
١٥٨– ابن الاثير : ج ٩، ص ٢٠٧
١٥٩– هەمان سەرچاوە
١٦٠– هەمان سەرچاوە : ابو شامه : ج٢، ص ١٥٤ – ١٥٦

## بەشی هەشتەم
## غیاث الدین کەیخوسرەو کوڕی قیلج ئەرسەلان
## کەیخوسرەوی یەکەم
## ( جاری یەکەم ) : ٥٨٨ -٥٩٢ کۆچی /١١٩٢ – ١١٩٦ی زاینی

دوای مردنی قیلج ئەرسەلان، ناکۆکی نێوان براکان بەردەوام بوو لەو کاتەدا، سەلجوقیەکان رۆڵی کاریگەرییان لەسەر مەیدانی سیاسی لەدەست دا. ((کەیخوسرەو)) کەوتە ناکۆکی لەگەڵ ((قطب الدین مەلەکشاو رکن الدین سلیمان شا)). یەکەمیان توانی قەیسەری داگیربکات و نورالدین شا بکوژێت ((١)) بەلأم دوای ماوەیەکی کەم نەخۆش کەوت و مرد. دووەم تەماحی کردە موڵکی براکانی. هێرشی کردە سەر سیواس و ئاق سەرا و دەستی بەسەریاندا گرت، بەرەو قونیە رۆیشت ((کەیخوسرەو))ی برای لەوێدا دەرکرد و خۆی دەسەلأتی بە دەستەوە گرت لە ٥٩٣ کۆچی / ١١٩٦ی زاینیدا ((٢)) نازناوی ((سوڵتانی روخێنەر))ی لەخۆی نا ((٣)) بەمجۆرە کەیخوسرەو قۆناغی یەکەمی دەسەلأتی تەواو بوو.

**رکن الدین سلیمان شای کوڕی قیلج ئەرسەلان ٥٩٣ – ٦٠١ کۆچی / ١١٩٦ – ١٢٠٤ی زاینی هەوڵەکانی کەیخوسرەوی یەکەم بۆ بەدەستهێنانەوەی تەختەکەی**

کەیخوسرەو کە تەختەکەی لە دەسچوو دەستەوسان نەوەستا، بەلأم پێویستی بە هێزێکی پێویست هەبوو بۆ گەڕاندنەوەی. بۆیە بڕیاریدا، داوای یارمەتی بکات، لە دوو لاوە کەوتە هەوڵدان لە دەرەوەو لە ناوەوە. سەبارەت بە لایەنی دەرەوە، بۆ ((بستان)) ڕۆیشت و تا لە براکەی ((مغیث الدین طغرل شا)) داوای یارمەتی لێ

بکات، هەرچەندە لەگەڵ کێشەکەیدا بوو، بەڵام هیچ یارمەتیەکی پێشکەش نەکرد، داوای لێکرد لەلای بمێنێتەوەو موڵکەکانیشی بخاتە ژێر دەستی ((٤)) دوای ئەوەی لە ((بستان)) سەرنەکەوت، رویکردە ((مەلتیە)) بۆ یارمەتی لە ((معزالدین قیصرشا)) لەوێش هیچیان بۆ نەکرد، براکەی پێی گوت برواتە لای ((غازی کوری صلاح الدین ئەیوبی)) و داوای یارمەتی لێ بکات. لێرەدا دەبێ بپرسین : براکانی بۆ دەستی یارمەتیان بۆ درێژ نەکرد؟ ئایا، لاوازبوون یاخود بۆ نەریتێکی کۆنی تورك دەگەرێتەوە نەیانویست لەو نەریتە دەرچن، کە کوری گەورە دوای مردنی باوك دەبێ دەسەڵات بە دەستەوە بگرێ.. وادیارە هۆی دووەم لە راستی و واقیعەوە نزیکترە. ئەمە لە مێژووی سەلجوقیەکان لە ئێران و عێراق پەیرەو کراوە، کوری گەورە دوای مردنی باوك ((تەخت و عەرش))ی بەردەکەوێت،هۆی یەکەمیش رەنگە دوور نەبێ، بەهۆی واقعی سیاسی سەڵتەنەتەوە کە لەسەر دابەشکردن و پارچە پارچە بوون دامەزرابوو کە دەبێتە هۆی لاواز بوون.. کە لەناوەوە سەرکەوتنی وەدەست نەهێنا. ((کەیخوسرەو)) بریاریدا داوای یارمەتی لە دەرەوە بکات.. لە ئەرمەنیەکانەوە دەستی پێکرد.. رویکردە لای ئەرمەنیەکان تا داوای یارمەتی لە شا ((لیونی دووەمی گەورە)) بکات ٥٨٦-٦١٦ کۆچی /١١٨٧-١٢١٩ی زاینی، لیون بەگەرمی پێشوازی لێکرد، بەڵام رازی نەبوو یارمەتی بدات، چونکی لەگەل ((بوهیموندی سێیەم)) لە ململانێدا بوو بۆ دەست بەسەرا گرتنی ئەنتاکیە ((٥)) ئەمجا کەیخوسرەو بۆ حەڵەب رۆیشت و لەگەڵ ((غازی)) دا چاویان بەیەك کەوت، داوای یارمەتی بەپەلەی لێکرد، بەڵام وتووێژەکانیان نەگەیشتە هیچ ئەنجامێك، سوڵتانی سەلجوقی لە پای ئەمەدا وڵاتی شامی بەجێهێشت ((٦)) وا دەردەکەوێت، ناکۆکی ناوخۆیی ئەیوبیەکان کە ئەو کاتە لەنێوان ((جێنشینەکانی)) صلاح الدین دا، سەریهەڵدابوو، هۆی بە دەنگەوە نەچوونی ((غازی)) بووبێ کەیارمەتی پێ نەدا، دواجا ئەیوبیەکان گرنگیان بە پەیوەندی سەلجوقیەکان نەدەدا و بەلایانەوە گرنگ نەبوو.. کەیخوسرەو دوای ئەوەی لەشام گەرایەوە، داوای یارمەتی لە ((ئەرتەقبیەکان)) کرد. بۆ ئامەد چوو، لەوێ فەرمانرەواکەی کە زاوای بوو، پێشوازی لێکرد،کێشەکەی بۆ خوشکەکەی

گێڕایەوە، ئەویش پێشنیاری ئەوەی لێ كرد لە ((ئامەد)) بمێنێتەوە چاوەڕێ بكات، بەڵكو بارودۆخەكەی چاك دەبێتەوە. كەیخوسرەو بەمە رازی نەبوو ((٧)). لەپێش كەیخوسرەوا جێگایەك نەمایەوە، لەوەی زیاتر روو لە قوستەنتینە بكات و داوای یارمەتی لە ئیمپراتۆری بیزەنتی ((ئەلكسیوسی سێیەم ئەنجیلۆس)) بكات، چووە شاری ((جاینت)) لە وێوە بە پاپۆڕ بەرەو قوستەنتینیە رۆیشت..((ابن بیبی)) دەڵێ : بایەكی توند لە دەریا هەڵیكرد، پاپۆڕەكەی بەرەو ولاتی ((مەغریب)) برد، لەوێ بووە میوانی ((ئەمیرالمؤمنین محمد كوڕی عبدالمؤمن)) سەرۆكی ((موحدون–یەككگرتووەكان )) ((٨)) كەیخوسرەو ئەمەی بەهەلزانی وكێشەكەی بۆ ((ئەمیرالمؤمنین)) باسكرد، بەلاّم نەیتوانی قەناعەتی پێ بهێنێ تا دەستی یارمەتی بۆ درێژ بكات، لە راستیدا دووری نێوانیان هۆی یارمەتی نەدانی بوو ((٩)) سولّتانی لابراوی سەلجوقی لە مەغریبەوە گەڕایەوە قوستەنتینیە، ئیمپراتۆری بیزەنتی بەگەرمی پێشوازی لێكرد، پێی خۆش بوو داوای یارمەتی لێكردووە. ئەویش ئەمەی بە هەل زانی تا دەست بخاتە كاروباری ئەنادۆڵەوە. بەلاّم بە قۆناغێكی سەختدا تێدەپەڕی ((١٠)) نەیتوانی یارمەتی بدات بەو دەستو بردە... داوای لە كەیخوسرەو كرد، لەیەكێ لەو دورگانە بۆ ماوەیەك دابنیشێ تا بارودۆخەكە ئارام دەبێتەوە، دواجا چۆنی دەوێ ئاوا یارمەتی دەدا. هەروەها رێزی لێگرت، كچی یەكێ لە فەرماندەكانی لێ مارە كرد ئەویش((مانویل ماكروزوموس)) بوو.. كەیخوسرەو لە قوستەنتینیە مایەوە تا ساڵی ٦٠١كۆچی /١٢٠٤ی زاینی، ئەو كاتەی لاتینیەكان هاتنە قوستەنتینیەوە، ئەویشی بەجێ هێشت و چووە یەكێ لە قەلاّكانی نزیك قوستەنتینیە، لەوێ لای مامی مایەوە، تا ئەو كاتەی ((ركن الدين سليمان شا))ی برای كۆچی دوایی كرد ((١١)).

**دەسكەوتەكانی سوڵتان (( ركن الدين سليمان شا )) یەكگرتنەوەی سەڵتەنەتەكە**

پێش هەموو شتێ ((ركن الدين سليمان شا)) گرنگی بە یەككگرتنەوەی ولاّتەكەیدا، هێرشی كردە سەر براكانی و یەكەیەكە دەستی بەسەر موڵكەكانیاندا گرت.. ((نیكسار))ی لە ((ناصرالدين بركياروق شا)) وەرگرتەوە. ((ئەماسیە))ی لەدەستی ((نظام الدين ارغون شا)) وەرگرتنەوە ((١٢)).. ((مەلتیە))شی لە

((مغرالدين قيصرشا)) لە ساڵی ٥٩٧ کۆچی ی /١٢٠٠ ی زاینی دەرکرد. براکەشی بۆ ((رەها)) هەڵات، داڵدەی بە مامی دا ((ملك العادل الايوبى)) ((١٣)) دواجار سوڵتانی سەلجوقی بۆ ئەنقەرە رۆیشت و سێ ساڵ ئابڵوقەی خستە سەر و لەساڵی ((٦٠١ کۆچی / ١٢٠٤ی زاینی، هێنایە ژێر دەسەڵاتی خۆیەوە. ((محی الدين محمود))ی برای، لە بەرامبەر بە دەستەوە دانی شارەکە، مەرجی ئەوە بوو، پاداشتی بداتەوە، ئەویش قەلایەکی لە دەوروبەری سەڵتەنەت پێدا. لە کاتی چوونی بۆ قەلاکە لە دوو کوڕەکەیدا ((رکن الدين سليمان)) چەند کەسێکی ناردو لە ڕێگا کوشتیان. شایانی باسە. سوڵتان دوای ئەو رووداوە بەپێنج رۆژ کۆچی دوایی کرد و هەواڵی کوشتنی براکەی نەبیست ((١٤)). بەمجۆرە ((رکن الدين سليمان)) دەستی بەسەر سەڵتەنەی سەلجوقی دا گرت و بووە بە هێزترین فەرمانڕەوای ئاسیای بچووك و ناوبانگی دەرکرد، بووە پەنای لێقەوماوان و بێ دەسەلاتان.

## شا عەلی داوای یارمەتی لە سوڵتان دەکات

((صلاح الدين ئەیوبی))، لە ژیانی سیاسیدا، ئەو ولاتانەی لە ژێر دەسەلاتیا بوون بەسەر ئەندامانی خێزانەکەیدا دابەشی کرد. ئەوانیش دوای مردنی لە نێوان خۆیاندا دابەشیان کرد، بەلام نە دەسازان، هەریەکەو دەیویست لەوی تر کەمتر وەرنەگرێ و دەسەلاتی ((ئەیوبی))یش بکەوێتە دەست خۆی.. ((نورالدين على))ی کوڕی لە دیمەشق و ناوڕاستی ولاتی شام سەر بەخۆیی خۆی وەرگرت. ((عوسمان)) میسری بەڕێوە دەبرد. ((غازی)) حەلەب و باکووری شامی بەرکەوت.. ((کرك و ئەردەن و جزيرە و دياربەكر)) کەوتە ژێر دەسەلاتی ((سيف الدين ابوبكر)) کە برای بچوکی ((صلاح الدين ايوبى)) بوو ((١٥)) لە کاتی ناکۆکی ناو خێزانەکەدا. ((عادل)) هەندێ شارو قەلای لە ((على)) برای داگیر کرد وەکو ((سروج و راس عين)) ((١٦)) هەروەها ((غازی)) خاوەنی حەلەب، قەلای ((نەجم))ی لێ داگیر کرد ((١٧)) کە مامی هانی دابوو لە ساڵی ٥٩٩ کۆچی / ١٢٠٢ی زاینیدا بۆ ئەوەی چارەسەری ئەم هەڵویستە بکات ((على)) پەیوەندی بە ((رکن الدين سليمان شا))وە کرد، ئامادەیی خۆی نیشاندا کە بێتە ژێر

دەسەلآتیەوە و لە خوتبە دا ناوی بهێنێ و سکە، بە ناوی ئەوەوە لێ بدات. سولتانی سەلجوقی بەدەنگیەوە هات، ((خلعە))ی بۆ نارد و ((علی)) لە بەریکرد و لە ((سمیساط)) خوتبەی بە ناوی ئەوەوە دا و بووە لایەنگری. کە سولتان کۆچی کرد. پەیوەندی سەلجوقیەکان و ئەیوبیەکان لەو سنوورە مایەوە ((١٨))

## بیزەنتیەکان داوای یارمەتی لە سەلجوقیەکان دەکەن

سالی ٦٠٠ کۆچی / ١٢٠٣ی زاینی، لە شکرکێشی چوارەمی سەلیبیەکان لە ژێر سێبەری ناکۆکی ئەرسەدوکس و لاتینیدا، بەرەو قوستەنتینیە کەوتە رێ. ئەمە کێشەیەکی لادان بوو لە ئامانجی سەرەکی شەڕەکانی سەلیبی، توانی بۆ سالی دوایی دەستی بەسەرا بگرێ و، ئیمارەتێکی لاتینی تێدا دامەزرێنێ. ((ابن االعبری)) ئاماژەی بۆ ئەوە دەکات، کەوا بیزەنتیەکان داوای یارمەتیان لە سولتانی سەلجوقی کرد لەکاتی ئەو ململانێیەدا، بەلام نەیتوانیوە یارمەتیان بدات ((١٩)). بیزەنتیەکان دوای ئەوەی قوستەنتینیەیان لە دەست دەرچوو و لەوێ نەمان، سێ ئیمارەتیان لە دوور یەکتر دامەزراند. لەوپەڕی رۆژهەلات، هەردوو نەوەی ئیمپراتۆر ((ئەندرۆنیکۆس کومینن – ئەلکسیۆس و داود دەستیان بەسەر ((ترابزون)) دا گرت و خۆیان تیادا جێگیر کرد و کە نارەکانی دەریای ((رەش)) یشیان بەدەستەوە گرت، لەمەدا ((شاژن تامار)) یارمەتیانی دابوو.. لە رۆژئاوا، ((میخائیل)) کە ئەندامی خێزانی ((ئەنجیلۆس)) بوو، ((ئەبیرۆس))ی داگیرکرد و خێزانێکی بیزەنتی دامەزراند، بەلام گرنگترین ئەو سێ ئیمارەتە و لە هەموویان مەترسیدارتر بوو بۆ سەلجوقیەکان، ئەو ئیمارەتە بوو کە ((ئەننا ئەلکسیۆسی سێیەم و مێردەکەی تیۆدۆر لاسکاریس)) لە نیقیە دایمەزراندبوو، دواجار بووە پایەو شوێنی ئیمپراتۆریەتی بیزەنتی ((٢٠)).

## ناکۆکی نێوان سەلجوقیەکان و ئەرمەنیەکان

سەلجوقیەکان چاویان بڕیبووە ((ئەرمینیای بچووك)) چونکی پردێك بوو بۆ پەڕینەوە بەرەو ولآتی شام، بۆیە شەڕ لە نێوانیاندا نە دەوەستا و هەر بەردەوام بوو.. لە سالی ٥٩٨ کۆچی / ١٢٠١ی زاینی شای ئەرمەن ((لیونی دووەم)) هێرشی

کردە سەر سنووری سەلجوقیەکان. ناکۆکی ناو خێزانەکەیانی بەهەل زانی چەند قەلآیەکی داگیرکرد. ناچار ((رکن الدین سلیمان شا)) هێزێکی ئامادە کرد و هێرشی بۆ ((قیلیقیە)) برد، هەوڵەکانی ((لیونی دووەمی)) تێکدا و لە خاکی سەلجوقی دەریانی کرد. وا دیارە پاشەکشەی ((لیونی دووەم)) لە بەردەم سەلجوقیەکاندا، پەیوەندی بەو ناکۆکییەوە هەیە کە لە نێوان ئەو و سەلیبیەکاندا هەبوو لە بارەی ((ئەنتاکیا))وە ((٢١)).

## رووبەڕوو بوونەوەی سەلجوقیەکان لەگەڵ کورجیەکاندا لە باکوور مردنی رکن الدین سلیمان شا

((رکن الدین)) کەوتە شەڕ کردن لەگەڵ کورجیەکاندا، کە لە سەرەتای ساڵی ٥٩٨ کۆچی / ١٢٠١ی زاینی، هێرشەکانیان بۆ سەر سنوورەکانی ئیسلامی پەرە پێدا و هەڕەشەیان خستبووە سەر رێگای بازرگانی لەگەڵ رۆژهەلآتدا، بەهۆی هێرشی لەسەر یەکەیان بۆ سەر خاکەکانی ((شا علاالدین))ی خاوەنی ((ئەرزنی رۆم)). ئەوەی کورجیەکانی هان دەدا بۆ دەستدرێژی کردن. لاوازی هێزە ئیسلامیەکان بوو لە ناوچەی باکوور، سەرەڕای سەرهەڵدانی شا ژنێکی کورجی بەهێز کە خۆی فەرماندەیی سوپاکانی دەکرد بۆ شەڕی موسڵمانان، بە دوژمنێکی پڕ مەترسی دادەنرێ، ئەویش ((شاژن تامار)) بوو کە ببووە جێنشیی ((جورجی سێیەم)) لە ساڵی ٥٨٠ کۆچی / ١١٨٤ی زاینی ((٢٢)).. سوڵتانی سەلجوقی بە هێزێکی زۆرەوە لە قونیەوە دەرکەوت بەرەو باکوور کەوتە رێ، چەند برایەکیشی کە لە ژیاندا مابوون کەوتنە تەك سوپاکەیەوە.. لەوانە ((مغیث الدین توغرودل شا)) خاوەنی ((بستان)) و زاواکەی ((فخرالدین بهرام شا)) خاوەنی ((ئەرزنجان)) ((٢٣)). هەروەها ((علاالدین)) خاوەنی ((ئەرزنی رۆم)) یش لەگەڵیاندا بوو، بۆیە لە هاتن و بەشداربوونی دوو دڵ بوو، سوڵتانی سەلجوقی زیندانی کردو دەستی بەسەر موڵکەکانیدا گرت ((٢٤)) سوپای سوڵتان بەرەو ولآتی کورجی رۆیشت، چووە ناو ولآتی ئەنجازەوە ((شاژن تامار)) هێزەکانی بۆ بەرەنگاربوونەوەی موسڵمانەکان کۆ کردەوە. چەند شەڕێکیان لە نێواندا بەرپا بوو. بەلآم دواجار

((کورجیەکان)) بەفەرماندەیی ((کەبجاك)) لە نزیك ((شاری گامیش)) سوپای سەلجوقیەکان غەفڵەتگیرکردو بەسەریاندا زاڵبوون، سەلجوقیەکان کشانەوە و ژمارەیەکی زۆر کوژراو دیلیان بە جێهێشت. سوڵتان گەڕایەوە ((ئەرزنی رۆم)) لەوێ ماوەیەك مایەوەو دوایی گەڕایەوە وڵاتەکەی خۆی ((٢٥)). سوڵتانی سەلجوقی بەم شکستە وازی نەهێنا، نیازیکرد جارێکی کە هێرش بەرێت. لەساڵی ٦٠١ کۆچی / ١٢٠٤ی زاینی سوپایەکی ئامادەکرد و بۆ وڵاتی کورجی نارد، بەڵام لەم ماوەیەدا کۆچی دوایی کرد و نیازەکانی نەهاتنە دی ((٢٦)).

## غیاث الدین کەیخوسرەو کوڕی قیلج ئەرسەلان
## کەیخوسرەوی یەکەم (( دووەم جار (( ٦٠١ – ٦٠٨ کۆچی / ١٢٠٤ – ١٢١٢ی زایینی
## - کەیخوسرەو دەسەلات بەدەستەوە دەگرێت -

دوای مردنــی ســوڵتان ((رکــن الــدین ســلیمان شــا)) میرەکــانی ((عزالـدین قـیلج ئەرسەلان))ی کوڕیان کـردە سـوڵتانی سـەلجوقیەکانی رۆم هێـشتا بـاڵق نـەبووبوو ((٢٧)). میرەکان لە بـەڕێوەبردنی وڵاتـدا یارمـەتیان دەدا.. شـاری ((ئەسـپارتە)) یان داگیرکرد. کە قەڵایەکی گرنگە لە باشووری رۆژئـاوای وڵات ((٢٨)). دەوڵـەت و ئیمارەتەکانی دەوروبەر دانیان بە رژێمی تازەدا نا، ئیمپراتۆری بیزەنتی ((تیـودۆر لاسکاریس)) لە فەرمانڕەوا نوێکان لە قونیە نزیـك بـووەوە. چـونکی بەرژەوەنـدی ئەو وایدەخواست سنوورەکانی لەگەڵ سەلجوقیەکاندا دابین بکات، تاکو پێی خۆی لـە ئیمپراتۆرییەتەکەیـدا بـچەسپێنێ، سـەرەڕای ئـەوەش لـەوە ترسـا سـەلیبیەکان هێرش بەرن، دوای ئەوەی قوستەنتینیەیان داگیرکرد ((٢٩)). فـەرمانڕەوا نوێکـان دەســەلاتیان زۆر بەدەســتەوە نەمایــەوە. زۆری نــەبرد نــاکۆکی کەوتــە نێــوان میرەکانەوە، ئەو تورکمانانەی لە ناوچـە سـنووریەکان دادەنیـشتن، لـە دەسـەڵاتی ناوەندی لە قونیە یاخی بوون، داوایان دەکـرد کەیخوسـرەو ببێتـە سـوڵتانی وڵات. ((زەکریا))یان نارد تا لە وڵاتــی بیزەنتیـە بیهێنێتـەوە. چـوونە لای و گۆڕانکارییـە سیاسیەکانیان پێ ڕاگەیاند و نامەی سەرکردەکانی یاخی بوونەکـەیان پـێ گەیانـد ((٣٠)) کەیخوسرەو کەوتە ئارەزووی گەڕانەوەی دەسەلات کە لـە دەسـتی دابـوو، بەدەنگی داواکەیانەوە رۆیشت، لە وڵاتی بیزەنتی دەرچوو و بـەرەو قونیـە کەوتـە رێ. وا دەردەکەوێت، ئیمپراتۆر لە هاتنی ئاگادار نەبوو، کە پەیوەندییەکی تونـدی

لەگەڵ دەسەلاتی قونیەدا هەبوو. بۆیە لە نیقیە ڕێگای لێگرت، کەیخوسرەو هەوڵیدا لە بەرەنگار کردنی بیزەنتی ڕزگاری ببیّ، کەوتە وتو ویّژ لەگەڵ ئیمپراتۆری بیزەنتیدا، گەیشتنە ئەوەی ڕێگای بدا، لەبەرامبەر ئەمەدا، کاتیّ دەسەلاتی بە دەستەوە گرت، هەموو ئەوخاکانەی بیزەنتی بەدەستی سەلجوقیەکانەوە بوو بیگەڕێنێتەوە. تا سنووری قونیە، وەکو ((خوناس و لازیق)).. بۆ مسۆگەر کردنی ئەم ڕێکەوتنە بڕیار درا، کەیخوسرەو هەردوو کوڕەکەی ((عزالدین کەیکاوس و علاءالدین کیقوباد)) وەکو بارمتە لەگەل ((زەکەریا))دا لەلای ئیمپراتۆر بهێڵێتەوە.. ((۳۱)). بەلاّم دواجار، هەردوو کوڕەکەی لەگەڵ زەکەریادا توانیان هەڵبێن و بە باوکیاندا بگەن، کە لەو کاتەدا خەریکی وتوویّژ بوو لەگەڵ هۆزە تورکمانەکاندا، تا یارمەتی بدەن ((۳۲)). بەو جۆرە ئەو ڕێکەوتنەیان لەگەل ئیمپراتۆردا هەڵوەشایەوە و سەلجوقیەکان شارەکانیان نەدایەوە بیزەنتیەکان.. کەیخوسرەو توانی، هۆزەکانی تورکمان لە دەوری خۆی کۆبکاتەوە. بەرەو قونیە بردنی، کەگەیشتن، دانیشتوانەکەی دەروازەکانیان بەڕوویدا گرت، بە بیانووی ئەوەی خیانەت لە قیلج ئەرسەلان ناکەن. ئەویش ئابلۆقەیدا، فەرمانیدا، دارەکان ببڕنەوەو ئاگری تیّ بەردەن و کۆشکەکانی دەوروبەریشی بڕوخێنن ((۳۳)). ئەم کردەوانە، قیلج ئەرسەلانی پیّ سەغڵەت بوو، دەیزانی هیچ شتێك لە بەردەم مامیدا ناتوانیّ ڕاوەستیّ، بۆیە داوای ئاشتبوونەوەی لێکرد و شارەکەی بداتە دەست، بەمەرجیّ هەڵسو کەوتی لەکەڵیا باش بێت، کەیخوسرەو ڕازی بوو، و((توقات))ی پێدا ((۳٤)). کەیخوسرەو، چووە ناو پایتەختەوە و لەسەر ((عەرش)) دانیشت، کاروباری شارەکەی ڕێکخست. مەلتیە دا بە کەیکاوسی کوڕی. موڵکەکانی دانیشمەندییەکانیشی لە سیواسدا بە کەیقوباد و میرەکانی دەوروبەری لە گۆڕانکارییەکان ئاگادار کردەوە ((۳۵)) شاو میرەکانی وڵاتە نزیکەکان پیرۆزباییان لێکرد..

## ئەو کێشانەی روو بە رووی کەیخوسرەو بوونەوە لە سەرەتای ژیانی سیاسییدا

کەیخوسرەو لە سەرەتای ژیانی سیاسیدا چەند کێشەیەك روو بەرووی بوونەوە، دەبوایە بیسەلمێنێ وەکو فەرمانڕەوای دەوڵەتێکی گەورە، چارەیان دەتوانێ بکات.. کێشەی یەکەم، دانیشتوانی پایتەخت خۆشیان نەدەویست، بەهۆی ئەوەی ((قازی ترمەزی)) کوشتبوو، چونکی فەتوای دەرکردبوو نەچنە ژێر دەسەلاتیەوە، چونکی نەسرانیەکان داڵدەیان پێدابوو بەلای ئەواندا دایدەشکاند و ئەو کارانەی دەکرد شەریعەت حەرامی کردوون، دواجار پەشیمان بووەوە لە کوشتنەکەی و خێزانی قازی رازی کردبوو ((٣٦)). کێشەی دووەم، دیاریکردنی پەیوەندی بوو لەگەل ئەیوبیەکاندا لە باکووری ولاتی شام، چونکی هەردوولا هاوسێ بوون، لە سێبەری ناکۆکیە ناوخۆییەکانی ئەرتەقیەکان، ((نظام الدین ئەرتەقی)) خاوەنی قەلای ((زیاد)) لە لایەن ئامۆزاکەیەوە ((ناصرالدین محمود)) خاوەنی ئامەد، هێرشی کرابووە سەر. ئەمەی دوایی چاوی لە قەلای ((زیاد)) بڕیبوو لە دوای مردنی ((سوڵتان رکن الدین سلیمان شا)). دەکرا ئەم کێشەیە لە نێوان هەردوو میرەکە بمایەتەوە، ئەگەر هەریەکەیان داوای یارمەتی لە دەرەکیەوە نەخواستایەن، کە رەهەندێکی هەرێمایەتی پێدابوو کە لە ناکۆکی کۆنی نێوان سەلجوقیەکان و ئەیوبیەکاندا خۆی دەبینیەوە. بۆیە ((نظام الدین ابوبکر)) داوای یارمەتی لە کەیخوسرەو کرد. کەچی ((ناصرالدین محمود)) داوای یارمەتی لە ((عادل ئەیوبی)) کردبوو بە گوێرەی رێکەوتنێکی لەوەوپێش ((٣٧)). ((عادل ئەیوبی)) ئەشرەفی موسا عەلی، کوری بە هێزێکەوە بۆ یارمەتی خاوەنی ئامەد نارد. لە شنگال وجزیرەی ئیبن عومەریشەوە هێزی دیکەیان لەگەڵدا رۆیشت ((٣٨)). بەرەو قەلای ((زیاد)) بەڕێکەوتن، ((نظام الدین)) خۆی لە ناو قەلاکەدا قایم کرد چاوەڕوانی یارمەتی سەلجوقیەکان بوو. ((علی ئەیوبی)) خاوەنی سمیسات خۆی خستە ناو کێشەکەوە. چووە پاڵ خاوەنی قەلای زیاد، کەیخوسرەو رایسپارد بوو یارمەتی ((نظام الدین ابوبکر)) بدات، شەش هەزار سەربازی لەگەڵدا نارد. کە هێزی سەلجوقی گەیشتە مەلتیە، ((ئەشرەف موسا)) و

هاوپەیمانانی لەبەردەم قەلاکە کشانەوە چوونە بیابانێکی نزیك، دواجا بەرەو گۆلی ((سهنین)) رۆیشتن، کە دوو قەلاَی لێبوو، یەکێکیان هی فەرمانڕەوای ئامەد بوو، ئەوەی تریان هی خاوەنی قەلاَی ((زیاد)) بوو. سوپای سەلجوقی لەم کاتەدا گەیشتن چوونە قەلاَی زیاد، نوێنەر لە نێوانیاندا هاتوچۆی دەکرد بۆ چارەسەرکردنی بە رێگای ئاشتیانە، سەلجوقیەکان مەرجیان ئەوە بوو هێزەکانیان بکشێتەوە و قەلاکە بۆ خاوەنی بگەڕێتەوە. ناصرالدین ئەمەی قەبولّ نەبوو، کە وتوویژ درێژەی کێشا بێ ئەوەی ئەنجامی هەبێ هەردوو سوپاکە لێك جیابوونەوە و گەڕانەوە ولاَتی خۆیان، قەلاَی ((زیاد))یش بە دەستی ((ناصرالدین محمود)) خاوەنی ئامەد مایەوە ((٣٩)). کەیخوسرەو کێشەیەکی دیکەی تووشی هاتبوو، پەیوەندی بە بازرگانیەوە هەبوو، ئاشکرایە ئەنادولّ ئاسایشی تیایدا بەر قەرار بووبوو، هەر لە سەردەمی قیلج ئەرسەلانی دووەمەوە. لە تورکیا جولاَنەوەی بازرگانی زیادی کردبوو، بەلاَم دەست بەسەرا گرتنی قوستەنتینیە لەلایەن لاتینەوە، رێگای دەربەندەکانی دەریای رەش و سپی ناوەڕاستی جێگای مەترسی بوو، هەروەها پەیدابوونی ئیمپراتۆریەتی نیقیەی بیزەنتی رێگر بوو لەپێش گەیشتنی سەلجوقی بە دەریای ئیجەی و رۆژئاوای. رێگای دەربەندەکانی دەریای رەش وەکو سامسون و سینوب لە رووی بازرگانی سەلجوقی داخرابوون. بە بەستنی رێگای وشکانی و دەریایی لە بەردەم بازرگانی سەلجوقیدا بازرگانەکان، زیانیان لێکەوت، خەڵکەکەش تووشی زیان بوو بوون، جێگای وتنە، ئەو کاتە ئەنادۆلّ بنکەیەکی جیهانی بازرگانی بوو، بازرگانەکانی ولاَتی روس و قەیحاق و لەوێدا لەگەلّ ئەوانەی شام و عێراق و موسلّ و جزیرە و شوێنەکانی دیکە یەکیان دەگرت سیواس ببووە بنکەیەکی بازرگانی بەناوبانگ ((٤٠)). کەیخوسرەو، ناچار بوو ئەو رێگا بازرگانیانە بکاتەوە، بۆیە هێرشی کردە سەر ترابزون، تا گوشار بخاتە سەر ئیمپراتۆریەتی بینقیە، چونکی بەرژەوەندی ئیمپراتوری بیزەنتی ((تیودۆر لاسکاریس)) لەگەلّ بەرژەوەندی سوڵتانی سەلجوقیدا یەکیاندەگرت بۆ بەرەنگاربوونەوەی لاتین لە قوستەنتینیەدا، هەردوو سەرکردەکە لەسەر ئەوە

ڕێکەوتن ڕێگاکان لەرووی بازرگانی سەلجوقیدا بکەنەوە تا بگەنە دەربەندەکانی دەریای ڕەش ((٤١))،

## فراوانبوونەوەی سەلجوقی لە باشوور – گرتنی ئەنتالیە

گرتنی دەربەندی ئەنتالیەی بەناوبانگ لەسەر کەناری دەریای سپی ناوەڕاست بەکێشەی بازرگانیەوە بە سترایەوە، کەیخوسرەو ویستی دەروازەیەك لەسەر دەریای سپی ناوەڕاست بۆ سەلجوقیەکان دابین بکات، تا بازرگانی بکەوێتە جمو جۆڵ و چالاك بێ، کە لەو کاتەدا خەریك بوو پەرەی دەسەند. لە هەمان کاتدا دەیویست، بیزەنتیە هاوپەیمانەکانی ڕازی بکات لە گوشار خستنە سەر سەلیبیەکان لە قوستەنتنیە کە ئەو دەربەندە گرنگەیان بە دەستەوە بوو لەراستیدا، هەموو سوڵتانە سەلجوقیەکانی پێش کەیخوسرەو، ئارەزووی ئەوەیان دەکرد، ئەنتالیە بگرن، بۆ ئەوەی ڕێگای وشکانی لە بیزەنتیەکان و سەلیبیەکان بگرن، تا پەیوەندی بە ولاتی شام ببڕن. بەلام ئەو هەولانەیان بە فیڕۆ رۆیشت، چونکی ئەباترەکانی بیزەنتی لە هەموو سەردەمەکاندا ئەم دەربەندەیان بەدەستەوە بووە، کە تاقە دەروازەیانە بۆ گەیشتن بە ولاتی شام لە وشکانیەوە.

کەیخوسرەو تەنگەتاو کردنی هەندی بازرگانی ئیسلامی لە لایەن سەلیبیەکانەوە بەهەل زانی، لەسالی ٦٠٣ کۆچی / ١٢٠٦ی زاینی هێرشی کردە سەر ئەو دەربەندە.. کە گەیشتە ئەنتالیە ئابلۆقەی دا و بەمەنجەنیق کەوتە لێدانی، دوو مانگ ئابلۆقە بەردەوام بوو، بەلام ئەنجامی نەبوو ((٤٢)). سەربازگەکەی شارەکە داوای یارمەتیان لە سەلیبیەکان کرد لە قوبرس کەشتیەك سەربازیان بۆ ناردن. کەیخوسرەو وای بە باش زانی سوپاکەی بە ئەبلۆقە دانەوە ماندوو نەکات، لەگەل هەندێ لە هێزەکەیدا کشایەوە، هەندێکیشی هێشتەوە لە نزیك چیاکان کە سنووری سەلجوقیەکان بوو. فەرمانی دا بەردەوام بن لە ئابلۆقەدانی شارەکەو مەهێلن زەخیرەیان بۆ بڕوات ((٤٣)). ئابلۆقەکە درێژەی کێشا، تا دانیشتوانەکەی سەغلەت بوون داوایان لە سەربازگەکەی سەلیبیەکان کرد، دەرچن و بکەونە شەڕ لەگەڵیاندا و ئابلۆقەکە بشکێنن. وایانزانی دانیشتوانی شارەکە بێزاربوون لێیان،

ناکۆکی کەوتە نێوانیانەوە، ئەوجار، دانیشتوانەکە داوای یارمەتیان لە کەیخوسرەو کرد تا لە سەلیبیەکانیان رزگار بکات، لە بەرامبەر ئەوەدا شارەکەی بەدەستەوە دەدەن. جارێکی کە گەڕایەوە و ئابلۆقەی شارەکەی دایەوە و بە مەنجەنیق شارەکەی ئاگردا، کۆمەڵێ لە سەربازانی سەلجوقی، توانیان بەسەر پەرژینەکاندا بچنە ناو شارەوە و دەرگاکانی بکەنەوە، چوونە ناوەوە و دەستیان بەسەرا گرت ((٤٤)). کە بەتەواوی دەستیان بەسەرا گرت، کەیخوسرەو کاروباری شارەکەی رێکخستەوە و نۆژەنیان کردەوە، ((مبارزالدین))ی بە فرمانڕەوای شارەکە دانا، هەروەها، قازی و وتار خوێنێکی بۆ دانا، مزگەوتێکیشی تیادا دروستکرد و بۆ قونیە گەڕایەوە ((٤٥)) بەگرتنی ئەنتالیە، سەلجوقیەکان، بیزەنتیەکانیان لە قیلیقیە دوور خستەوە، هەروەها کەیخوسرەو رێگاکانی دابین کرد و رۆژئاواش دانی پێدانا، کە وڵاتێکی گرنگی بازرگانیە. شارەکانی ئیتالیا پەیمانی بازرگانیان لەگەڵدا بەست و پارەیان دەدایێ لە بەرامبەر بەکارهێنانی رێگاکانیان. بوندقیە لەپێشی هەموویانەوە کەوتە ئاڵو گوڕی بازرگانی لەگەڵیدا ((٤٦)).

## فراوانبوونی سەلجوقی بەرەو ئەرمینیای بچووك

کەیخوسرەو ساڵی ٦٠٥ کۆچی / ١٢٠٨، بڕیاریدا، شریتی رۆخی دەریاکە فراوان بکاتەوە و لە ئەنتالیەوە دەست پێ بکات. ئەرمەنیەکان ئاستەنگی ئەم هەڵوێستەی بوون، چاوەڕێی هەلێکی دەکرد دەست بخاتە کاروباری ئەرمینیای بچووکەوە. ئەو هەلەی بۆ رەخسا، کاتێ ناکۆکی کەوتە نێوان ((لیونی دووەم)) شای ئەرمینیای بچووك و ((بوهیموندی چوارەم))ە مەوە سەبارەت بە میراتگیری ئیمارەتی ((ئەنتاکیا)) وە ((٤٧)). ئەم کێشەیە، بارودۆخی لە باکووری وڵاتی شام تەقاندەوە. ئەوەی شایانی باسە ((بوهیموندی سێیەم)) دوو کوڕی هەبوو، گەورەکەیان ((ریموند)) ئەمیرەیەکی ئەرمەنی ((ئەلیکسی)) خواست لە ساڵی ٥٩٢ کۆچی / ١١٩٥ی زاینیدا، کە کچی ((روبین))ی برای ((لیونی دووەم)) بوو ((٤٨))، وا رێکەوت ((ریموند)) مرد و منداڵێکی لێ بوو کە ((ریموند روبین))بوو. کوڕی دووەمی ((بوهیموندی چوارەم))، کە ئیمارەتی تەڕابلسی بە میراتی بۆ مایەوە لە

## مێژووی سەلجوقیەکان

ساڵی ٥٨٣ کۆچی / ١١٨٧ی زاینیدا ((٤٩)). دوای مردنی ((بوهیموندی سێیەم)) لە ساڵی ٥٩٧ کۆچی / ١٢٠١ی زاینی ((ریموند روبین)) میراتگری شەرعی بوو. بەڵام سەلیبییەکان لە ئەنتاکیە نەیانویست، دەسەڵات بدرێتە دەستی میرێکەوە، دایکی ئەرمەنی بێ و ((لیونی دووەم)) پشتی بگرێت. ((بوهیموندی چوارەم ))یان بانگ کرد، کە مامی ((ریموند روبین))ە، و دەسەڵاتیان دایە دەستی. ئاسایی بوو ((لیونی دووەم)) پشتگیری ((ریموند روبین)) بکات، مەبەستی بوو دەست بەسەر ئەنتاکیەدا بگرێت و تەماحی ئەوەی دەکرد دەسەڵاتی بەسەر دۆڵی ((رووباری عاصی)) دا هەبێ، بەمجۆرە ناکۆکی کەوتە نێوان هەردوو لایانەوە ((٥٠)). ئەو هاوپەیمانیانەی لە نێوان شا و میرەکانی باکووری وڵاتی شام و ئاسیای بچووکدا بەرپابوو، کێشەکەی ئاڵۆز کرد، هەریەکە و لایەنگری ئەو لایەی دەکرد کە لەگەڵ بەرژەوەندیدا دەگونجێ. ((بوهیموندی چوارەم)) لەگەل سەلیبییەکان و بیزەنتیە ئەرسەدوکسەکانی دوژمنانی ئەرمەنیدا، بووە هاوپەیمان. بێجگە لە ((داویە))کان کە لە ناکۆکیەکی بەردەوامدا بوون لەگەڵ ئەرمینیای بچووکدا، لەسەر موڵکایەتی قەڵای ((بغراس)) و قەڵاکانی نزیك سنووری نێوان شام و ئەرمینیای بچووك ((٥١)). ((غازی)) خاوەنی حەڵەب، هاتە ناو ئەم هاوپەیمانیەوە، دوای ئەوەی ((بوهیموندی چوارەم)) پەنای بۆ برد بۆ رزگارکردنی ئەنتاکیە لە دەستی ئەرمەنیەکان. هەروەها دەیویست تۆڵە لە ((لیونی دووەم)) بکاتەوە، کە بەر لەوە هێرشی بۆ حەلەب کرد بوو، لە لایەکی ترەوە ((بوهیموندی چوارەم)) داوای یارمەتی لە کەیخوسرەو کرد ((٥٢)). سوڵتانی سەلجوقی ئەم کێشەیەی بەهەل زانی، خۆی تووشی ئەو ناکۆکیانە کرد بۆ لێدانی ئەرمەنیەکان و فراوانبوون لە قیلیقیە. ((لیونی دووەمیش))، لەگەل ئەسپارتەدا بووە هاوپەیمان.. ئەم کێشەیە بە سێ دەوردا تێپەڕی لە نێوانی ٥٩٧ – ٦١٣ کۆچی / ١٢٠١ – ١٢١٦ی زاینیدا، چەند شەڕێکیش بەرپابوون، پێویست ناکات لێرەدا باس بکرێن، بەڵام ئەوەی بەلای ئێمەوە گرنگە ئەوەی کەیخوسرەو ئەنجامی دا. لەراستیدا سوڵتانی سەلجوقی، لە قوناغی دووەمدا خۆی هاوێشتە ناو کێشەکەوە، کە لە ساڵی ٦٠٠– کۆچی / ١٢٠٤ی زاینی دەستی پێکرد و لە ساڵی ٦٠٦ کۆچی / ١٢٠٨ی زاینی

کۆتایی هات، لەو کاتەی ئەرمینیای بچووکی داگیرکرد و گەیشتە مرعش. ((غازی)) بۆ یارمەتیدانی هێزێکی بە فەرماندەیی ((سیف الدین ابن علم الدین بن جندر)) و ((عزالدین ابیك فطیس))ی نارد. هێزە هاوپەیمانەکە چوونە ناو ئەرمینیای بچووکەوە و چەند قەلآیەکیان گرت، لەوانە ((تبرنوس))ی نزیك مرعش و هەندێکی دیکەشی روخاند ((٥٣)). کە هێرشیان بۆ برد، ((لیونی دووەم)) داوای یارمەتی لە ((عادلی ئەیوبی)) کرد، ئەوکاتە لەگەڵ برازاکەیدا ((ظاهیرغازی)) ناکۆك بوون، هەردوو هاوپەیمانەکە لەگەڵ ((لیونی دووەم))دا پەیمانی ئاشتبوونەوەیان مۆر کرد. کە بەڵێنیدا.

-قەلآی ((بغراس)) بۆ ((داویەکان)) بگەرێنێتەوە.1

-هێرش نەکاتە سەر ئەنتاکیە.2

٣-ئەو سامان و پارەیە بۆ کەیخوسرەو بگەرێنێتەوە، کە لە ژیانی ((رکن الدین سلیمان شا))ی برایدا لەلای دانا بوو ((٥٤))

شەڕی میراتگری ئەنتاکیە ((لیونی دووەمی)) سەرقاڵکردبوو ماوەی بەرەو ئەنادۆڵ چوونی نەبوو. بەلآم رێگای ئەوەی لێ نەگرت ببێتە هەوپەیمانی ((لاسکاریس)) کە دەستی بەهێرش کردن بۆ سەر سەلجوقیەکان کردبوو، چونکی کەیخوسرەو ((دەنزلی))و دۆلی سەرووی رووباری ((میاندەری)) گرتبوو، سەرەرای بەستنی هاوپەیمانی لەگەل ئیمپراتۆری بیزەنتی پێشوو ((ئەلکسیوسی سێیەم)) دا کە داوای تەختی بیزەنتەی دەکرد ((٥٥)).

## پەراوێزەکانی بەشی هەشتەم

١- ابن الاثیر : ج ٩، ص ٢٢٣

٢- ابن بیبی : ص ٧

٣- هەمان سەرچاوە : خواند، امیر : ج٢، ص ٥٣٩

٤- ابن بیبی : ص ٩

٥- Cahen :la syrie du nord : pp 582 -583

٦- ابن الاثیر : ج ٩، ص ٢٦٧. ابن واصل : ج ٣، ص ١٦٦

٧- ابن بیبی : ص ١٢

٨- ابن بیبی : ص ١٣

٩- ابن الاثیر : ج ٩، ص ٢٤٥ - ٢٤٦

١٠- بڕوانە. کلاری، روبرت :فتح القسطنطینیة علی اللاتین رتسیمان : ج ٣، ص ٢١٦ - ٢٢٢

١١- ابن الاثیر : ج ٩، ص ٢٦٣

١٢- هەمان سەرچاوە : ص ٢٢٣

١٣- هەمان سەرچاوە

١٤- ابن الاثیر : ج ٩، ص ٢٢٣. ابن الفرات : ج٥ قسم ١، ص ١٤ -١٥

١٥- العماد الاصفهانی : ص ٦٢٩ - ٦٣٦

١٦- راس العین : شارێکی گەورەیە، لە جزیرە، لەنێوان حەران و نسیبین، الحموی : ج ٣، ص ١٤

١٧- قەڵای نەجم : قەڵایەکی سەختە لەسەر فورات. هەمان سەرچاوە : ج٤، ص ٣٩١

١٨- ابن الاثیر. ج ٩، ص ١٩١

١٩- تاریخ الزمان : ص ٢٤١

٢٠- رنسیمان : ج ٣، ص ٢٢٧ - ٢٢٨

٢١- Cahen : p 601

٢٢- Allen : history of the georjian pp 103 - 108

٢٣- فخرالدین بەهرام شا کچی سوڵتان قیلج ئەرسەلان ژنی بوو، خوشکی سوڵتان ((رکن الدین))ە، منجم باشی : ج ٣، قسم ٣، ص ١٠٢

٢٤- ابن بیبی : ص ٢١

٢٥- ابن بیبی : ص ٢٣

٢٦- هەمان سەرچاوە

٢٧- تەمەنی قیلج ئەرسەلان ئەو دەمە سێ ساڵ بوو. ابن بیبی : ص ٢٢

٢٨- ابن الاثیر : ج ٩، ص ٢٦٥

٢٩- ابن بیبی : ص ٢٢

٣٠- هەمان سەرچاوە : ص ٢٥. ابن الاثیر : ج ٩، ص ٢٦٧

٣١- ابن بیبی : ص ٢٦

٣٢- هەمان سەرچاوە. ص ٢٧

٣٣- هەمان سەرچاوە : ص ٢٨. ابن الاثیر : ج ٩، ص ٢٦٧

٣٤- هەردوو سەرچاوەکەی پێشوو

٣٥- ابن الاثیر : هەمان سەرضاوة : ص ٢٦٨

٣٦- ابن بیبی : ص ٣٦

٣٧- خاوەنی ئامەد، یارمەتی موسای کوڕی عادلی دا لە شەڕیدا لەگەڵ نورالدین ئەرسەلان شا - ئەویش داوای لێکرد یارمەتی بدات لە شەڕی قەڵای ((زیاد)) دا

٣٨- جزیره ابن عومر : لە سەرووی موسڵەوەیە. الحموی : ج ٢، ص ١٣٨

٣٩- ابن الاثیر : ج ٩، ص ٢٦٨. ابن العبری : ص ٢٤٤

٤٠- ابن الاثیر. هەمان سەرچاوە : ص ٢٨٤

٤١- Camb : hist of lsLam : Vol 1 p 245

٤٢- ابن الاثیر : ج ٩، ص ٢٨٨. ابن بیبی : ص ٣٣

٤٣- ابن الاثیر: ج ٩، ص ٢٨٨

٤٤- ابن بیبی، هەمان سەرچاوە ص ٣٤ - ٣٥

٤٥- هەمان سەرچاوە : ص، ٣٥

٤٦- Camb – hist of lsLam : Vol 1 p 245

٤٧- بڕوانە cahen : pp 596 – 635

٤٨- ابن العبری : ص ٢٥٢

٤٩- Grousset : Vol 11 p 264

٥٠- Stefenson : the crusades in the east p 299

٥١- Grousset : Vol 111 p 252

٥٢- ابن الاثیر : ج ٩، ص ٢٨٢

٥٣- ابن واصل : هەمان سەرچاوە : ص ١٨٧

٥٤- ابن العدیم : هەمان سەرچاوە

٥٥- Camb med – hist : Vol 17 p 484
٥٦- Gardner : the la scaris of nicea p 64
٥٧- Camb – med – hist : Vol 17 p 484
٥٨- Lpid fasilief : fol 11 p 515
٥٩- Rice : p 68
٦٠- Gardner : pp 82 – 83
٦١- Fasilief : Vol 11 p 515
٦٢- Fasilief lbicl
٦٣- النوادر السلطانية : ص ١٩١
– الكامل فى التاريخ : ج ٩، ص ٢٠٧ 162
– تاريخ الحروب الصليبية : ج ٣، ٣٨ 163

## بەشی نۆیەم
## عزالدین کەیکاوس کوڕی کەیخوسرەو کەیکاوسی یەکەم – ٦٠٨-٦١٦ کۆچی / ١٢١١ – ١٢١٩ زایینی ناکۆکی خێزان لە وڵاتی ڕۆم

دوای کوشتنی کەیخوسرەوی یەکەم، میرە گەورەکانی سەڵتەنەت کۆبوونەوە بۆ وتوویژ کردن سەبارەی بەجێنشینەکەی. کوڕە گەورەکەی ((رکن الدین کەیکاوس))یان بە سوڵتانی سەلجوقی ڕۆم هەڵبژارد. لەسەر تەخت دانیشت و زەویو زاری بەسەر دەست و پێوەندەکانیدا دابەشکرد. دواجار بڕیاری دا لەمەلتیەوە بۆ قوتیەی پایتەخت بڕوات. کە گەیشتە قەیسەری، ئاگادار بووەوە، کەوا ((علاءالدین))ی برای دەست و پێوەندەکانی کۆکردۆتەوە و بەرەو قونیە ڕۆیشتوە تا دەسەڵاتی بەدەستەوە بگرێت. مەوکبی سوڵتانی لە قەیسەری راوەستا چاوەڕوانی گۆڕانکاریەکانی کرد (١). کەیقوباد کە هەواڵی کوشتنی باوکی پێگەیشت، پەیوەندی بە ((مغیث الدین توغرول شا))ی مامی کرد، کە ئەرزنی ڕۆم بەدەستیەوە بوو. پەیوەندیان باش بوو، لەبارەی دەسەڵاتەوە گفتوگۆیان کرد. لەوێ بڕیاریاندا، کەیقوباد لە شوێنی باوکی دانیشێ و هاوپەیمانی دژی کەیکاوس دامەزرێنن ((٢)). کەیقوباد دەستی کرد بە پەیوەندیکردن لە بارەی پێکهێنانی هاوپەیمانی ناو براو. نامەی بۆ شاو میرەکانی دەورووبەر نارد، داوایان کرد ئەوانیش لەگەڵیاندا بن.. نامەی بۆ ((لیۆنی دووەم))ی شای ئەرمینیای بچووک نارد، شایانی باسە ((لیۆن)) بەدوای هەلدا دەگەڕا تا لەسەر حیسابی سەلجوقیەکان موڵکەکانی فراوان بکاتەوە. داواکەی کەیقوبادی قەبوڵ کرد، بەمەرجێ بڕێ پارەی پێ بدات ((٣)). کەیقوباد، ئیمپراتۆری بیزەنتیشی بۆ لای خۆی ڕاکێشا بەرامبەر بەوە

قەیسەری پێدا.. هەروەها ((ظهیرالدین بروانا)) کە یەکێ لەمیرە هەرە نزیکەکانی کەیکاوس بوو، قەناعەت پێ هێنا ((٤)) هاوپەیمانان لەسەر ئەوە رێکەوتن هێرش بکەنە سەر کەیکاوس، هەریەکەو لە سنووری خۆیەوە و لەیەك کاتدا. تا گوشاری بخەنە سەر و لەسەر تەخت لای بدەن.. ((لیۆنی دووەم)) بە ناوچە سەلجوقیەکانی نزیکی ولآتەکەی هێرشی کرد و دەستی گرت بەسەر ((هەرقلە)) و ((لارندا)) و هەڕەشەی لە قەیسەری کرد ((٥)) ((تیودۆر لاسکاریس)) ناوچەی باشووری رۆژهەلآتی داگیرکرد کە دەکەوێتە سەر دەریای رەش. سەلیبیەکانیش هێرشیان بۆ ئەنتالیە برد لە باشوور و فەرمانڕەوا سەلجوقیەکەیان دەرکرد کە ((مبارزالدین ارتقش)) بوو ((٦)). هەروەها ((توغرول)) هێرشی بۆ ((سیواس)) کرد و ((کەیقوباد))ی براشی هێرشی کردە سەر ((قەیسەری)) ((٧)). بەمجۆرە کەیکاوس لە هەموو لایەکەوە، هەوڵی لابردنیان دا کەوتە بەرەنگاریکردن لە مافی شەرعی خۆی. چووە سەر ((مغیث الدین توغرول شا)) و داواشی لە ئەشرەف موسا ئەیوبی کرد یارمەتی بدات. هێزێکی سەربازی بۆ نارد، مامی لە ئەنجام ترسا، ئابلۆقەی لەسەر سیواس هەڵگرت و گەڕایەوە ئەرزنی رۆم ((٨)) کەیکاوس گەڕایەوە قەیسەری کە لە لایەن کەیقوبادەوە ئابلۆقە درابوو، ئابلۆقەکە زۆر توند بوو، بووبووە مایەی نارەحەتی دانیشتوانەکە، گرانی پەیدابووبوو، نائومێدی و بێزاریش سوڵتانی گرتبووەوە، چونکی ئابلۆقەکە درێژەی کێشا، هەندێ لە لاینگرانی لێی هەڵگەڕانەوە، ئەوکاتە لەگەل هەندێ لە پیاوانی کۆببووەوە، چەند پێشنیارێکیان خستە روو تا لەو تەنگژەیە دەرچن. لەوانە :-

- لە شارەکە دەرچن و بەرەو قونیە برۆن و دەستی بەسەرا بگرن، بە پشتیوانی تورکمانەکانی سنوور..

- هەوڵ بدرێ هاوپەیمانیەکە بلآوە پێ بکەن، ئەوکاتە سەرکەوتن ئاسان دەبێ ((٩)) میر ((جەلالەدین قەیسەر)) فەرمانڕەوای قەیسەری، ئەو پێشنیارەی کرد، کەیکاوس رایسپارد جێ بەجێ بکات.. لە ((لیۆنی دووەمە)) دەستیان پێکرد، داوایان لێکرد لە هاوپەیمانیەکە

- بکشێتەوە، پارەیەکی باشی دەدەنێ،

– دوانزە هەزار (مەد) گەنمی پێ دەدەن کەی کەیکاوس بە تەواوی دەسەلاتی بەدەستەوە گرت.

– پەیمان دەدەن، سولتان هێرش نەکاتە سەر ولاتەکەی، ئەگەر ئەو هێرش نەکاتە سەر خاکی سەلجوقی. ((لیۆنی دووەم)) قەبولی کرد و گەڕایەوە ولاتی خۆی ((١٠)). کەیقوباد هەستی کرد، ئیتر ناتوانێ بەرامبەر براکەی بگرێت، لەگەل هێزەکەیدا بۆ ئەنقەرە کشایەوە. ((١١)). لە ئەنجامی هەلوەشاندنەوەی هاوپەیمانیەکەی کەیقوباد، مەترسی لەسەر کەیکاوس نەما. چوو بۆ ئاق سەرا و لەوێوە بۆ قونیە رۆیشت، لەسەر تەختی سەلجوقی دانیشت و خەلیفەی عەباسی ((ناصرالدین للە)) – ٥٧٥ – ٦٢٢ کۆچی / ١١٨٠ – ١٢٢٥ زاینی، دانی پێداناو ((خەلعەتی ئیمارەتی)) بۆ نارد ((١٢)). سولتان رێزی لە فەرمانڕەوای قەیسەر لێنا و کردیە ((حاجیی)) کۆشکی سولتان ((١٣)). کەیقوباد دانەساکا، بەردەوام بوو لە دوژمنایەتیکردنی سولتان، ئەمە وایکرد ئەمەی دوایی لە دژی براکەی لەشکرکێشیەك بکات لە ئەنقەرە ئابلۆقەی دا و ناچاری کرد خۆی بەدەستەوە بدات شارەکەی بەدەستەوە داو لەبەرامبەر ئەوە دا ژیانی پاراست. سولتانی بۆ قەلای ((مسارا)) دووری خستەوە، سەری خۆی و میرەکانی تاشی بۆ پەنگ کردنیان، دواجار چوو بۆ ((ئەرزنی رۆم)) و لە دەستی مامی (مغیث الدین)) وەریگرتەوە و دواجار کوشتی ((١٤)).

## دەسکەوتەکانی کەیکاوس -گرتنەوەی ئەنتالیە-

دوای ئەوەی بارودۆخی ناوخۆ ئارام بووەوە، کەیکاوس، ئاوڕی بەلای دەرەوە دایەوە. بڕیاریدا دەسەلاتەکەی فراوانتر بکاتەوە. بیگەیەنێتە ئاستی دەولەتە گەورەکان لە رۆژهەلاتی ئیسلامیدا. جارێکی کە ئەنتالیەی گرتەوە. ئەو دەربەندە گرنگەی کە دەکەوێتە کەناری باشووری ئاسیای بچووك لەسەر دەریای سپی ناوەڕاست. سالی ٦١١ کۆچی / ١٢١٤ زاینی، بەفەرماندەیی سوپایەکی گەورەوە بەرەو ئەنتالیە کەوتە رێ، هەر کە گەیشت، ئابلۆقەی دا، دانیشتوانەکەی پەنایان بۆ سەلیبیەکان لە قوبرس برد، ئەوانیش گەمیەك و ژمارەیەکی زۆری سەربازیان

پێدان،بەمە ورەیان بەرز بووەوە ((١٥)) کەیکاوس پلانێکی سەربازی زیرەکانەی دارشت، بووە هۆی سەرکەوتن و گەرانەوەی شارەکە.. هێزەکانی کردە چوار کۆمەڵەوە، هەر کۆمەڵێك فرمانێکی پێدا، کۆمەڵی یەکەم کاریان ئەوە بوو، جمو جۆلی کۆمەڵەکانی دیکە داپۆشن بەوەی بە چرِی تیریان دەوەشان بۆ ئەوەی دوژمن بشڵەژێ و لەکاریان بخات. کاری کۆمەڵی دووەم بەرەو پەرژینەکان بچن و پەیژەی لەسەر دابنێن. کۆمەڵەی سێیەم، بە پەرژینەکاندا سەرکەون و بچنە ناو شارەوە و دەروازەکان بۆ کۆمەڵەی چوارەم بکەنەوە. کە هێزی سەرەکی دەستوەشێن بوو.. بەمجۆرە سوپای سەلجوقی چووە ناو ئەنتالیەوە دوای شەرِی پەرژینەکان. سوڵتان سەرژمێری لە شارەکەن کرد. تا ((باج)) دیاری بکات، فرمانی دا پەرژینەکان چاك بکاتەوە، چونکی بەهۆی شەرِەکەوە لە هەندێ شوێنەوە رووخابوو. هەروەها ((مبارزالدین ئەرتقش))ی لەسەر کارەکەی وەك فەرمانرِەوای شارەکە دانایەوە و گەرِایەوە قونیە ((١٦))

## گرتنی سینوب

گرنگی ((سینوب)) لەوە دایە، دەروازەیەکی دەریاییە بۆ بازرگانی سەلجوقی لەسەر دەریای رِەش. ((ابن بیبی)) بە دوورو درێژی باسی گرتنی ئەم شارەی کردووە. هەندێ لە مێژوو نووسان زۆر بە کورتی لێی دواون ((١٧)). لەساڵی ٦١١ کۆچی / ١٢١٤ زاینی، کەیکاوس سەردانی سیواسی کرد، هەر لەوێدا زانی، کەوا ((ئەلکس کومنین)) فەرمانرِەوای سینوب و ترابزون، هێرشی کردۆتە ناوچە سنووریەکانی سەڵتەنەت.. هەندێ لە قەڵاکانی روخاندووە. تورِەبوو. بەڵام ئەمەی بەهەل زانی تا دەست بە فراوانکردنەوە لە باکوور بکات، بۆ پاراستنی دەربەندی بازرگانی سەلجوقی. سوپایەکی ئامادە کرد، بەرەو شارەکە رۆیشت، لەرِێگا ئاگادار کرایەوە، کەوا فەرمانرِەواکەی بۆ راوکردن دەرچووە، هێزێکی پێنج سەد کەسی لەگەڵدایە. کەوتە چاودێری، لە شوێنی راوکردنەکەی پێی گەیشت، بەسەریا زاڵ بوو و دەستگیری کرد ((١٨)). دواجاریش ئابلۆقەی شارەکەی دا، کەیکاوس داوای لە ((کبیرنەلکس)) کرد یەکێ بنێری دانیشتوانەکەو سەربازگەکە قەناعەت

پێ بهێنێ و خۆیان بە دەستەوە بدەن. فەرمانڕەوای ((سینوب)) رازی بوو، بەلاّم دانیشتوانی شارەکە رازی نەبوون ((ئەگەر شا دیل کرابێت، ئەوا رۆڵەی لایقی ماون، یەکێکی تر دادەنێین و خۆمان بە دەستی ئیسلامەکانەوە نادەین )) ((١٩)). سوڵتان ویستی ماوەیان پێ بدات، نوێنەرێکی نارد تارازیان بکات و خۆیان بە دەستەوە بدەن. دیسان رازی نەبوون. ئەو حەلە، ((کبیرئەلکس)) بەدەست وپێی بەستراوەوە بەدەوری پەرژینەکەدا سووڕاندیانەوە، تا دانیشتوانەکەی ببینن، دوو رێگای لەبەردەم دانان : یان خۆ بەدەستەوە دان یان کوشتنی شا، شا، داوای لە دانیشتوانەکە دەکرد خۆیان بەدەستەوە بدەن بەلاّم بێ سوود بوو. ((٢٠)). بۆ رۆژی دواین، لە شاردا، ئەنجومەنی راوێژکردن لە بارەی خۆ بەدەستەوەدان کەوتنە وتووێژ. بریاری قەبوڵکردنی مەرجی یەکەمیان دا. لە بەرامبەر ئەمەدا شا بگەرێننەوەو لێی خۆشبن ((٢١)). سوڵتان بەمە رازی بوو، چووە شارەکەوە، ((جزیە))ی خستە سەریان کە دەبێ ساڵانە دەهەزار دینار بدەن لەگەڵ پێنج سەد ئەسپ و دوو هەزار سەر مانگا و دە هەزار مەڕ و پەنجا بار شتو مەکی دیکە. هەر کاتێکیش داوای سەربازیان لێکرا ئەوا دەبێ ئامادەبن ((٢٢)). کەیکاوس، کەنیسەی شارەکەی کردە مزگەوت و قازییەکی بۆ دانا لەگەڵ بانگدەرێکدا، هەروەها سەربازگەیەکی تیادا داناو فەرماندەیەکی بۆ دیاریکرد، بۆ پاراستنی کەنارەکانی دەریا.. ئەوجار گەڕایەوە سیواس ((٢٣))بەمجۆرە سوڵتان دەروازەیەکی لەسەر دەریای ڕەش دابین کرد، ئیتر سەلجوقیەکان لەگەڵ دەرەوەدا کەوتنە بازرگانی، لەگەڵ شارەکانی ئیتالیاشدا کەوتە وتوێژی بازرگانی بۆ تازەکردنەوەی پەیمانەکانی پێشوو ((٢٤)). کەیکاوس، نوێنەرێکی بۆ لای خەلیفەی عەباسی نارد، هەواڵی ئەم سەرکەوتنەی پێ راگەیاند لەگەڵ دیاریدا، داواشی لێکرد جل وبەرگی فەتوای بۆ بنێری ((٢٥)).

## فراوانبوونی سەلجوقی لە ئەرمینیای بچووکدا

موسڵمانەکان و بیزەنتییەکان لە ئاسیای بچووکدا هەمیشە چاویان بڕیبووە ناوچەی قیلیقیە، لە سەرەتای سەدەی سیانزەهەم زاینی ئەو ناوچەیە هێنایە دی، دەستیان بەسەر ئەرمینیای بچووکدا گرت، دانیان بەوەدانا کەوا سەر

بەسەلجوقیەکانن بەوەی پارەیان دەدانێ، ((ابن فصل الله العمری)) لەم بارەیەوە دەڵێ : ((لەئەنجامدا ئەرمەنیەکان ملیان بۆ سەلجوقیەکان خەواند و ((٢٦)) ((جزیە))یان دەدا. هەروەها دەڵێ، سەلجوقیەکان ((شەحنە))یان لەسەر ولاتی ئەرمینیا دادەنا، هەروەها موسڵمانەکان، دانیان نەدەنا بە نازناوی ((شا)) کە بەمیری ئەرمەنیەکان دەوترا. سووربوون لەسەر نازناوی ((موتەمەلیك)). مێژوو نووسەکانیان دەلێن ((خاوەنی سیس))یان ((کوڕی لاون – ابن لاون)) یان ((تەکفور – تکفور –)) ئەم نازناوەی دوایی، نازناوێکی گشتی بوو، بەو کەسانەیان دەگوت کە لەسەر تەختی ئەرمینیای بچووك دادەنیشت ((٢٧)). ئەرمەنیەکان بەوە ناسراون، کەوا هەلپەرستن، چەند هەوڵیاندا لەسەر شانی سەلجوقیەکان فراوان ببنەوە بێ سوود بوو، چونکی سەلجوقیەکان، دەوڵەتێکی یەکگرتووی بەهێز بوو.. لەو هەوڵە سەرنەکەوتوانە، ئەو راپەڕینەیان بووە دژی دەسەلاتی سەلجوقی. ئەو هەوڵە ساڵی ٦١٢ کۆچی / ١٢١٦ زاینی لەلایەن ((لیۆنی دووەم))ەوە ئەنجام درا، دوای ئەوەی توانی ئەنتاکیە بخاتە ژێر دەسەلاتیەوە و ((ریموند روبین)) بە فەرمانڕەوای شارەکە دامەزرێنێ، دەستی بە هێرش کردن کردەوە و رازی نەبوو ئیتر ((جزیە)) بداتە سوڵتان بەپێی رێکەوتنەکانی لەوەوپێش، ((باج)) کۆکەرەوەکان، شکایەتیان لەلای سوڵتان کرد، فەرمانیدا لەشکر ئامادە بکەن بۆ تەمێ کردنیان.. بۆ ئەوەی خۆی قایم بکات، هەوڵیدا هاوپەیمانیەك پێکبهێنێ لەگەڵ ئەیوبیەکان و سەلیبیەکاندا، هێشتا هاوپەیمانی لەگەڵ ئەیوبیەکاندا مابوو، داوای لە ((غازی)) کرد، پێکەوە هێرش بکەنە سەر ((لیۆنی دووەم و ئەنتاکیەی لەدەست دەربێنن، هەروەها ((بوهیموندی چوارەم)) پەیوەندی کرد تادەستی یارمەتی درێژ بکات، بەمەرجێ ئەنتاکیە ببێتە هی ئەو ((٢٨)). هاوپەیمانەکان لەسەر ئەوە رێکەوتن، کەیکاوس بڕواتە ناو ولاتی ئەرمەنەوە لەلای ((مرعش))ەوە و ((غازی)) لەلای ((دربساك))ەوە بڕواتە ناو ئەرمینیاوە، ((بوهیموندی چوارەم))یش هێرشی بۆ ئەنتاکیە برد لەگەل هێزێکدا کە لە دیمەشق و حەمما و حمص))ەوە هاتبوون، دەربەندەکانیش لە هێزەکانی ببڕێ ((٢٩)). ((غازی)) دەستی بەخۆئامادەکردن کرد، وەلامی نامەکەی

((کەیکاوس))ی دایەوە، کە ((عبدالرحمن المخجی)) ((٣٠)) هێنابووی. پرسی بە خاوەنی حەڵەب کرد سەبارەت ئەو هەنگاوەی ناویەتی. پێی باش نەبوو، ئامۆژگاری کرد لەگەڵ کەیکاوس کۆ نەبێتەوە زیانی ئەو چاوپێکەوتنەی بۆ گوت. وادیارە کەوا رایگەیاندبوو خاوەنی قونیە بۆ خاکی حەڵەب هێرش دەبات، ئەگەر بتوانی ئەرمینیای بچووك بخاتە ژێر دەسەڵاتیەوە، کە پەرژینێکە لەنێوان موڵکەکانی و نێوان ئیمارەتی حەڵەب. سەری لێ شێوا، نەیدەزانی چی بکات. ئایا قسەی مامی بشکێنێ، یان بەڵێنی خۆی کە دابووی بە کەیکاوس بکشێتەوە. ((٣١)). کەیکاوس، ئاگاداری کردەوە، پەلە بکات و زوو بکەوێتە رێ... ((لیۆنی دووەم)) کەوتە هەوڵدانی ئەو دەورتەقینە کە کەیکاوس بە دەریا سەپاندبووی. داوای لە ((غازی)) کرد تا لەو هاوپەیمانیە دەربچێت، کە ((غازی)) خۆی دواخست و لە حەڵەبەوە دەرنەچوو، کەیکاوس ((قازی)) ئاق سەرای بۆلای نارد، داوای لێکرد، زوو دەربچێت، لەو کاتەی ((قازی)) لەگەڵیدا کۆبووەوە، هەواڵی پێگەیشت، کەوا هێزەکانی سەلجوقی کە لە مرعش بوون، هێرشیان کردۆتە سەر ((بلاط)) ((٣٢)). کە سەر بە حەڵەبە. کۆمەڵێ ئەرمەنی کوشتووە و هەندێکیشی بەدیل گرتووە، ئەوکاتە ئامۆژگارییەکەی مامی بەراست زانی، لە هاوپەیمانیەکە کشایەوە و رازی نەبوو یارمەتی سەلجوقیەکان بدات ((٣٣)). بەڵام کەیکاوس بریاری لەشکرکێشیەکەی دابوو و پەشیمان نەبووەوە. ((لیۆنی دووەم)) کە بەمەی زانی شڵەژا، بەڵام لە بەرەنگاربوونەوەبەولاوە هیچ رێگایەکی لەپێش نەبوو، هێزەکانی کۆکردەوە. کەیکاوس، لەبەرەوپێشەوە چوونیدا، دوو قەڵای ئەرمەنی گرنگی داگیرکرد ((جنجن)) و ((کانجن)) ((٣٤))، دواجا چووە ناو خاکی ئەرمەنییەوە. پێشەنگی هێزەکەی، روو بە رووی هێزێکی ئەرمەنی بە فەرماندەیی ((قوستەنتین)) مامی لیۆن، بووەوە.. دواجار شەڕی گەورە دەستی پێکرد. سەلجوقیەکان تیایدا سەرکەوتن، کەیکاوس، کەوتە تاقیب ((لیۆنی دووەم)) حەوت رۆژ بەناو خاکی ئەرمەندا گەڕا، دواجارگەڕایەوە وڵاتەکەی. ((لیۆنی دووەم)) لە یەکێ قەڵاکاندا خۆی حەشار دابوو و ((قوستەنتینی)) بۆ قەڵای ((ئوئۆ)) نارد تا پارێزگاری لێ بکات ((٣٥)). ((لیۆن)) لەگەڵ میرەکاندا کۆببوەوە، بۆ باسکردنی

ڕووداوو پێشهاتەکان، هەموویان لەسەر ئەو رایە بوون کەوا شەڕی سوپای سەلجوقیان پێ ناکرێت، چاکترین شت خۆ بە دەستەوەدانە. ئەوجار ((لیۆنی دووەم)) نامەیەکی بەم مانایەوە بۆ ((کەیکاوس)) نارد، ئەمەی خستبووە روو، لە بەرامبەر لێ خۆشبوونی :ـ

- چوونە ژێر دەسەلاتی سەلجوقیەوە.
- ((جەزیە)) سالآنە پێنج سەد سوارە لەگەڵ پێویستیەکانیاندا دەخەنە ژێر فەرمانی سوڵتانەوە.
- ئەو پارەیەی لە سەریانەو نەدراوە هەمووی دەدەن.
- تەسلیمکردنی هەر دوو قەلآی ((لۆلۆ)) و ((لۆزاد)) کە لەسەر رێگاکانی قیلیقیەدان ((٣٦)).

سوڵتان بەمە رازی بوو، ((ضیاء الدین قرا ارسلان))ی نارد ((٣٧)) کە ئەو کاتە، میری ((دوات)) بوو، کە رەزامەندی سوڵتانیان پێ رابگەیەنێ چەنێ پارەیان لاماوە وەری بگرێ و شاری ((سیس)) لەژێر دەسەلآتیا بمێنێتەوە ((٣٨)) ((لیۆنی دووەم)) پێشوازی لە نوێنەری سوڵتان کرد، دە هەزار دیناری لە ((خەراج))ی ساڵی رابوردووی پێدا و دە هەزاری ئەو ساڵەش. هەروەها دیاری بۆ ئامادەکرد و گەڕایەوە قەیسەری. سوڵتان فەرمانیدا، ئەو ئەرمەنیانەی زیندانی بوون ئازاد بکرێن و میرەکانی دەوروبەریشی ئاگادار کردەوە کە ناکۆکیان لەگەڵ ئەرمەندا نەما، و رێگاکانیشی لە بەردەم بازرگان و رێبواراندا بکرێتەوە ((٣٩)).

## کەیکاوس بەرەو حەڵەب هەوڵی فراوانبوون دەدات مردنی کەیکاوس

دوای ئەوەی کەیکاوس ئەرمینیای بچووکی خستە ژێر دەستی خۆیەوە، ویستی بەرەو حەڵەب بڕوات و ئیمارەتەکانی بخاتە سەر موڵکەکانی خۆی. ئەو هەلەی ماوەیەك بوو چاوەڕوانی بوو بۆی رەخسا کاتێ ((غازی)) لەساڵی ٦١٣ کۆچی / ١٢١٦ زاینیدا کۆچی دوایی کرد و کوڕەکەی ((غیاث الدین محمد)) کە تەمەنی دووساڵ و چەند مانگێك بوو لەسەر تەختی ئیمارەت بووە جێنشینی باوکی ولەلایەن دایکی ((حنیفە خاتوون)) و ئەتابەگی ((شهاب الدین توغرول))

سەرپەرشتی دەکرا ((٤٠)). ئارەزووی فراوانبوون کەوتە دڵیەوە و بڕیاریدا، حەڵەب بخاتە ژێر دەسەڵاتی خۆیەوە، بەر لەوەی، فەرمانڕەوا نوێکان خۆیان بچەسپێنن بە بیانووی ئەوەی حەڵەب لە ڕۆژگارێکدا لە ژێر دەسەڵاتی باپیرانیاندا بووە ((٤١)) هەندێ لە مێژوو نووسان، باس لە هۆیەکی دیکە دەکەن کە کەیکاوسی هانداوە تا ئیمارەتی حەڵەب بگرێت. کەوا دوو کەس، وا دەردەکەوێت لە پیاوماقوڵانی شارەکە بوون، هانی ((غازی)) یان دەدا لەدژی ڕەعیەتەکە، خەڵکەکە تووشی تەنگانەیەکی زۆر بوون، کە ((غازی)) مرد و ((غیاث الدین)) جێگاکەی گرتەوە، ئەو دوو پیاوەی شار بەدەرکرد، هاتنە لای کەیکاوس و هانی کەیکاوسیان دا بڕوات حەڵەب داگیر بکات، چونکی لەو کاتەدا کەسێکی بەهێز لەسەر دەسەلات نەبوو ((٤٢)). کەیکاوس، ناکۆکی نێوان میرەکانی باکووری وڵاتی شامی بەهەل زانی چونکی خەریکی دابەشکردنی میراتی ((عزالدین مەسعود))ی فەرمانڕەوای موسل بوون کە ساڵی ٦١٥ کۆچی / ١٢١٨ زاینی کۆچی دوایی کردبوو، وەسیەتی کردبوو، دوای خۆی کوڕە گەورەی ((نورالدین ئەرسەلان شا)) جێگای بگرێتەوە کە هێشتا بیست ساڵی تێنەپەڕاندبوو، بەڵام ((بدرالدین لۆلۆ)) سەرپەرشتی بکات.. بەڵام مامی ((عمادالدین)) تەماحی دەسەڵاتی کرد بوو، بە تایبەتی دوای مردنی ((نورالدین ارسلان)) و ((ناصرالدین محمود))ی برای دەسەڵاتی بەڕێوەبرد. هێرشی کردە سەر هەندێ لە قەڵاکانی بەیارمەتی ((مظفرالدین گوك بوری)) فەرمانڕەوای ئەربیل. ((بدرالدین لۆلۆ)) پەنای بۆ ((موسا کوڕی عادل)) برد لە حەڵەب، کەچی ((مظفرالدین گوك بوری)) داوای یارمەتی لە ((کەیکاوس)) و ((ناصرالدین محمود محمدکوڕی قەرا ئەرسەلان ئەرتەقی)) خاوەنی ئامەد و قەلای ((کیفا)) و ((ماردین)) کرد.. هەموو ڕێکەوتن بچنە ژێر ئاڵای کەیکاوسەوە. لە وڵاتەکانی خۆیاندا، بۆ ئەوەی بیسەلمێنن سەر بە ((کەیکاوس)) ن خوتبەیان بەناویەوە دەخوێندەوە ((٤٣)). سوڵتانی سەلجوقی هەلی بۆ ڕەخسا لە پێشیانەوە کەوتە ڕێ، ((ئەشرەف موسا)) خەریکی شەڕکردن بوو لەگەل سەلیبیەکاندا لە ئیمارەتی تەرابلس، هێرشی کردبووە سەر قەلای ((سافیتا)) و قەلای ((کورد)) میرەکانی ئامۆژگاری ئەوان کرد، لەگەڵ ئیمارەتی

حەڵەبدا پەیوەندی تێکنەدا، چونکی لە بەرژەوەندی دەسەلآتدا نییە، بەلآم بە گوێیانی نەکرد و لەسەر قسەی خۆی ڕۆیشت. ناچار میرەکانیش هاتنە سەر ڕاکەی ئەوپێیان گوت، میرێکی ئەیوبیەکان لەگەڵ خۆیدا ببات، تا خەڵکەکە هەست بە گۆڕان نەکەن، ((علی)) فەرمانڕەوای (سمیساط)ی، لەگەڵ خۆیدا هەڵگرت، ئەویش ڕێزی لێنا، چەك و ئەسپی پێشکەشی کرد، هەر دووك ڕێکەوتن بەرەو حەڵەب بڕۆن. لەسەر ئەوەش ڕێکەوتن، ئەوەی کەیکاوس، لە دەورو بەری حەڵەب دەیگرێ بە ((علی)) دەدرێت. ئەوەی لە هەرێمی جزیرە دەستی بەسەردا دەگیرێ وەکو ((حەڕان)) و ((ڕەها)) بە ((کەیکاوس)) دەدرێن ((٤٤)). کەیکاوس میرەکانی دەوروبەری بانگکرد و فەرمانی پێ دان پەلە بکەن رووبکەنە بیابانی ((بستان)) لەوێ یەکدەگرین. ((نصرالدین)) خاوەنی ((مرعش)) یان لەگەڵدا بوو، هەروەها میرەکانی مەلتیە و سیواس و ناوچەکانی ((ئەوج))ی سنوور. بیست ڕۆژ سەرباز لە هەموو سەڵتەنەکەدا کۆ کرایەوە، سوڵتان ئاهەنگی گێڕا، هەر میرێك و دەسنیشانی شارێکیان بۆ کرد، بۆ ئەوەی هانیان بدات ((٤٥)). دواجار ئەنجومەنی شەڕی دامەزراند. بۆ دیاریکردنی چاکترین ڕێگا بۆ حەڵەب، بڕیاریاندا ڕێگای ڕاوەندان – ڕعبان حەلەب بگرنەبەر، چونکی ئەم ڕێگایە سەخت نەبوو ((٤٦)). هەروەها لە ((بەهستا))وە ((طنبغا)) هاتە ناو سوپاکەی سوڵتانەوە دوای ئەوەی لە شارەکە یاخی ببوو (٤٧) سوپای سەلجوقی بەرەو قەلآی ((رعبان)) ڕۆیی و داگیری کرد، کەیکاوس ئەو قەلآیەی بە ((نصرالدین)) خاوەنی مرعش دا، کەچی ((ابن الکبیر)) دەڵێ دایە دەستی ((علی))یەوە بە گوێرەی ریکەوتنەکەیان ((٤٨)). سوپاکە بەرەو پێش ڕۆیشت تا گەیشتە ((تل باشر)) ئابڵوقەی داو گرتی، کەیکاوس نەیدا بە ((علی)) بەڵکو خستیە پاڵ موڵکەکانی خۆیەوە، ((علی)) ئەمەی پێ ناخۆش هات و وتی ((ئەمە یەکەم غەدر)) لەوە ترسا، ئەگەر سوڵتان حەڵەب بۆ خۆی ببات و ئەو بێ بەش بکات، بەمەدا هەوڵدەدا، دەسەلآت لە ئەیوبیەکانەوە بۆ سەلجوقیەکان بگوازێتەوە. بۆیە کەوتە هەوڵی ئەوەی نەهێڵێ بە ئامانج بگات (٤٩) پێشنیاری کرد هێرش بکاتە سەر هەندێ قەلآو شار وەکو ((منبج)) تا ڕێگای پشتەوە مەترسی نەمێنی، بەمە دەیویست هەوڵەکانی پەرش و بلآوبێ و هێزەکەی

لاواز بکات (٥٠) بۆ ئەوەی ڕێگای لێ بگیرێت بۆ ((منبج)) ڕۆیشت و بەبێ شەڕ چووە ناوەوەی و دەستی کردە چاککردنەوەی پەرژینەکانی بۆ خۆ ئامادەکردنی ڕووبەڕوو بوونەوە (٥١). شاری حەڵەب شڵەژا کە هەواڵی هاتنی سوپای سەلجوقیان بیست، چونکی هێزەکانی حەلەب نەیدەتوانی لەگەڵ سوپای سەلجوقیدا ڕووبەڕوو ببنەوە.. هەروەها ((ئەبابگ توغرول)) ترسی ئەوەی لێ نیشت، دانیشتوانی شاری حەڵەب، شارەکە بە دەستەوە بدەن چونکی (علی) لەگەڵ هێزەکەدا بوو، ئەوانیش مەیلیان بەلای ئەودا دەڕوا ((٥٢)) بۆیە داوای لە ((ئەشرەف موسا)) کرد بگاتە هیمدادی خوشکزاکەیەوە، کە لەگەڵ هێزەکەیدا لە ((گۆلی قودس)) دا بوو، خەریکی شەڕی سەلیبیەکان بوو. ئامۆژگاری کرد لەگەڵ خوشکەزاکەیدا هاوکاری بکات بۆ بەرەنگاری سەلجوقیەکان. چونکی سەلجوقیەکان لە حەڵەب ڕاناوەستن، بەڵێنی پێدا بەناوی ئەوەوە خوتبە بخوێنێ و سکەش بەناوی ئەوەوە لێ بدات، لە دەورو بەری حەلەب کوێی بوێ بیداتێ، ((ابن العدیم)) دەڵێ : ئەتابەگ قازی ((زین الدین))ی بۆلای ((عادل ئەیوبی)) نارد، لە دژی کەیکاوس و علی، یارمەتی بدات ((عادل)) نامەی بۆ کوڕەکەی نارد — ئەشرەف موسا — داوای لێ دەکات لەگەڵ هێزەکەیدا بۆ حەڵەب بڕوات و لە جێگاکەی ((اسدالدین شێرکۆ))ی دانا بەرامبەر سەلیبیەکان (٥٣). ((ئەشرەف موسا)) هێزەکەی کۆ کردەوە و بەرەو حەڵەب کەوتە ڕێ. لەگەڵ میر و پیاوماقوڵاندا لە ((مەیدان ئەخزەر)) کۆببوەوە، لەوێوە چووە دۆڵی ((بزاعە)) (٥٤). لەوێدا میری عەرەب ((مانع بن حدیثة)) کە لە عەرەبەکانی (طی) بوو کەوتە تەکیان (٥٤). حەڵبیەکان لە دوو بەرەوە کەوتنە شەڕکردن، سیاسی و سەربازی، لەبەرەی سەربازییەوە ((ئەشرەف موسا)) فەرماندەیی دەکرد. لەمیانی سیاسیەوە، ((شاژن)) خۆی ئەم کارەی بەدەستەوە گرت. تۆوی ناکۆکی خستە نێوان کەیکاوس و ژنەکەیەوە، یەکێکی نارد شارەزای کاروباری ناوخۆی سەلجوقیەکان بوو، بڕواتە لای زۆربەی ئەو میرانەی لەگەڵ سوڵتاندا بوون، وەڵامی نامەیەکی دەسکردی سەختا کە لەلایەن ئەوانەوە بۆ خەڵکی حەڵەب نێردرابوو، هەڵسو کەوتەکانی سوڵتان شەرمەزار دەکات کەوا بەفێڵ هێناونی بۆ وڵاتی شام و

نایانەوێ بەشداری شەڕ بکەن و پەیمان ناشکێنن. وەڵامی نامەکانیش ئەو دان پێدانانەوە بوون لە لایەن حەڵەبیەکانەوە بە نیاز و مەبەستی میرەکانی سەلجوقی، هەندێ دیاریشی لەگەڵدا بوو. نامەهەڵگرەکە هەواڵەکەی بەهۆی یەکێ لە پیاوانیەوە گەیاندە سوڵتان (٥٥). وا رێکەوت پێشەنگی سوپای سەلجوقی لەگەڵ سوپای ئەیوبیدا رووبەڕوو بوونەوە، بە شکست بوونیان کۆتایی هات و فەرماندەکەشی بەدیل گیرا کە سوڵتانی سەلجوقی گەیشتە مەیدانی شەڕەکە لەگەڵ سوپاکەیدا کە چوارده هەزار جەنگاوەر بوون، سەری سوڕما هێزەکەی شکاوە. دوو دڵ بوو لە شەڕکردن و فەرمانی کشانەوەی دا (٥٦) ((ابن الاثیر)) دەڵێ : کەیکاوس ئەو کارەی کرد، چونکی منداڵ بوو کەم ئەزموون بوو لەبارەی شەڕ زانیاری نەبوو )) ((٥٧)) کەیکاوس بۆ ((بستان)) کشایەوە، ((ئەشرەف موسا)) کەوتە دووی لەشکرە شکاوەکە، جار ناجارێ هەندێکی لێیان دەڕفاند، تاگەیشتە ((تل باشر)) لەوێ ئابلۆقەی دا، وگرتی، هەروەها ((رعیان))یشی گرت لەگەڵ ((تل خالد)) و ((برج الرصاص))، دواجار بۆ حەڵەب گەڕایەوە، دوای ئەوەی هەواڵی مردنی باوکی زانی (٥٨). بۆ چەند رۆژێك سوڵتان لە (بستان) مایەوە، مەسەلەی نامەکان شڵەژاند بووی، دڵی لە میرە بێ تاوانەکان پیسکرد. هەرچەندە، بێ ئاگایی خۆیان لەو مەسەلەیە دەربڕی و لێی پاڕانەوە سزایان نەدات لەبەرامبەر کارێك نەیان کردووە، بەڵام سوودی نەبوو، فەرمانی دا بە عەمامەکانی خۆیان بیان بەستنەوە و ئاگری تێ بەردان و ئەو بێ تاوانانەی سووتان (٥٩) وادەردەکەوێ، کەیکاوس، لەو کردارەی پەشیمان بووەوە و لۆمەی میرەکانی دیکەی کرد کە ئامۆژگاریان نەکرد. بڕیاریدا بەردەوام بێ لەشەڕ، تا رێگا لە ئەشرەف بگرێ و نەهێڵێ بگاتە موسڵ، بۆ یارمەتی ((بدرالدین لؤلؤ)) بۆ مەلتیە چوو، خۆی بۆ رووبەڕوو بوونەوە ئامادەکرد. بەڵام نەخۆش کەوت و گەڕایەوە. لەرێگامرد، بەنەخۆشی سیل مرد لە ساڵی ٦١٦ کۆچی / ١٢١٩ زاینی (٦٠). مێژوو نووسی سەلجوقیەکان ((ابن بیبی)) دەڵێ : لە ٤ی شەوالی ساڵی ٦١٧ کۆچی ٢ی کانوونی یەکەمی ١٢٢٠ زاینی کۆچی کردووە، تەنهاش ئەم رای وایە.. وادیارە پشتی بەو کەسە بەستووە کە کێلی قەبرەکەی بینیوە کە لە سیواس کراوە، بەڵام ئاشکرایە

((کێل)) بەستن دوای مردن دروست دەکرێت، ئەو مێـژووە، مێـژووی دروسـتکردنی قەبرەکەیەتی نەك مێژووی مردنەکەی (٦١) ئێمە رای یەکەم پەسەند دەکـەین بـە بەڵگەی ئەوەی کەیقوباد جێنیشنی کـەیکاوس سـاڵی ٦١٦ کۆچـی / ١٢١٩ زاینـی هێرشی کردە سەر ئەرمەنیـەکان وەك لەمـەودوا دەردەکـەوێت. کـەیکاوس هەشـت ساڵ دەسەلآتی بەدەستەوە گرت، دوای مردنی سـەڵتەنەتی بـەهێزی جـێ هێـشت، چـونکی سـوپایەکی بـەهێزی هـەبوو ئـەمن وئاسایـشی بەرقـەرار کـرد بـوو. لـە سـەردەمی ئـەودا کـشتوکاڵ و بازرگـانی بوژانـەوە، کاروپیـشە زۆر بـوون رێگاکـان ئەمین بوون و لەناویاندا ململانێ نەبوو بۆ دەسەلآت بەدەستەوە گرتن.

## پەراوێزەکانی بەشی نۆیەم

١- ابن بیبی : ص ٣٩. الاقسرانی : ص ٣٣. منجم باشی : ج٢، ص ٥٦٣
٢- ابن بیبی : هەمان سەرچاوە، ص ٤٠
٣- منجم باشی : ج ٢ ص ٥٦٣
٤- ابن بیبی : ص ٤٠
٥- Tournebize : histoire de larmenie p 190
٦- هەمان سەرچاوە
٧- ابن بیبی : ص ٥١
٨- ابن واصل : ج ٣، ص ٢١٧
٩- ابن بیبی : ص ٤١. منجم باشی : ج ٢، ص ٥٦٣
١٠- ابن بیبی : ص ٤٢
١١- هەمان سەرچاوە : ص ٤٣ - ٤٤
١٢- ابن واصل : ج ٣ ص ٢١٧
١٣- ابن بیبی : ص ٤٤
١٤- منجم باشی : ج ٢، ص ٥٦٤

١٥- ابن بيبى : ص ٥١

١٦-هەمان سەرچاوە : ص ٥١ - ٥٢

١٧-الاوامر العلائية فى الامور العلائية : ص ٥٤ - ٥٨

١٨- ابن بيبى : ص ٥٤

١٩- ابن بيبى : ص ٥٦

٢٠- هەمان سەرچاوە

٢١- هەمان سەرچاوە

٢٢- هەمان سەرچاوە

٢٣-هەمان سەرچاوە

٢٤- Camb – hist of byzantine empire : Vol 17 prt 1 p 746

٢٥- نويَنەرى سولَتان بۆ لاى خەليفە: شيخ مجدالدين اسحاق بوو ابن بيبى:ص ٥٩

٢٦-الشحانى، كۆى شەحنەيە، پاريَزگاى ئيَستا دەگريَتەوە.

٢٧-التعريف بالمصطلح الشريف : ص ٥٥ - ٥٦.

٢٨-ابن العديم : ج ٢، ص ٦٣٧. ابن واصل : ج ٣ ص ٢٣٤.

٢٩- ابن واصل : هەمان سەرچاوە.

٣٠- ابن واصل : ج ٣ ص ٢٣٤.

٣١- بلاط : شاريَكى كۆنە لە نيَوان مرعش و ئەنتاكيە. الحموى : ج١، ص ٤٧٧

٣٢-ابن واصل : ج ٢، ص ٢٣٥ - ٢٣٦.

٣٣-ابن بيبى : ص ٦٢ .

٣٤-هەمان سەرچاوە. الحموى : ج ٥، ص ٢٦.

٣٥- ابن بيبى : ص ٦٥ - ٦٦.

٣٦-صاحب : نازناوى سەرۆك وەزيرانە.

٣٧- ابن بيبى : ص ٦٥ - ٦٦.

٣٨- هەمان سەرچاوە.

٣٩-ابن العديم : ج ٢ ص ٦٤٠ ابن واصل : ج٣، ص ٢٣٧ - ٢٤٨.

٤٠- ابن بيبى : ص ٧٢.

٤١- ابن الاثیر : ج ٩، ص ٣٢٥
٤٢- ابن واصل : هەمان سەرچاوە
٤٣- ابن بیبی : ص ٧٤
٤٤- هەمان سەرچاوە
٤٥- هەمان سەرچاوە
٤٦- ابن العدیم: ج ٢، ص ٦٤٤ - ٦٤٥
٤٧- الکامل فی التاریخ : ج ٩، ص ٣٢٥
٤٨- هەمان سەرچاوە
٤٩- هەمان سەر چاوە
٥٠- ابن العدیم: ج١، ص ٦٤٥
٥١- بحیرە قدس : نزیکی (حمص)ە درێژییەکەی ١٢ میلە، پانی چوار میلە.
الحموی : ج١، ص ٣٥٢
٥٢- زبدە الحلب : ج ٢ ص ٦٤٤
٥٣- بزاغە : شارێکە سەر بە حەڵەب. الحموی : ج١، ص ٤٠٩
٥٤- ابن العدیم : ج٢ ، ص ٦٤٥
٥٥- ابن بیبی : ص ٧٦ - ٧٧
٥٦- هەمان سەرچاوە : ص ٧٧ - ٨٠
٥٧- الکامل فی التاریخ : ج ٩، ص ٣٢٦
٥٨- هەمان سەرچاوە
٥٩- ابن بیبی : ص ٨٠ - ٨١
٦٠- Cahen : p 627
٦١- ابن الاثیر : ج ٩، ص ٣٢٧

## بەشی دەیەم

## علاء الدین کە یقوباد کوڕی کە یخوسرەو

## کەیقوبادی یەکەم ٦١٦ -٦٢٤ کۆچی / ١٢١٩ – ١٢٢٧ زاینی

### کەیقوباد دەسەلأت بە دەستەوە دەگریٚ

میرەکانی سەڵتەنەت و پیاو ماقوڵانی دوای مردنی کەیکاوس بۆ هەڵبژاردنی جێنشینێك کۆبوونەوە، مردنەکەیان رانەگەیاند تا سوڵتانێکی نویٚ دادەمەزرێنن، وا دەرنەدەکەوت بۆ هەڵبژاردن کەسێك کۆبوونەتەوە، چونکی کەیکاوس کوڕی نەبوو، ببێتە جێنشینی. لە کۆبوونەوەکەدا ناوی چەند کەسێکیان هێنا، لەوانە ((مغیث الدین توغرل شای کوڕی قیلج ئەرسەلان)) بەڕێوەبەری ئەرزنی رۆم ((فەرەیدون)) برا بچووکی سوڵتانی کۆچکردوو )) و ((کەیقوباد)) برای لە چیرۆکێکدا گوایە، کەیکاوس کەیقوبادی لەدوای خۆی داناوە(١) بۆیە لەزیندان ئازادی کرد و میرو پیاو ماقوڵانی سوێند داوە کە بەقسەی بکەن (٢) دوای کۆبوونەوەکەیان، بڕیاریاندا، کەیقوباد هەڵبژێرن، میر ((سیف الدین ئاینەبی جاشنکیر)) (٣) پێشنیاری کرد مژدەی بداتیٚ، چونکی ئەو بۆ زیندان بردی، ئێستاش دەستی دەگریٚ بۆ سەر عەرش (٤). سەرخۆشی لێکرد و ((خەلعەتی)) دەسەلأتی دایە دەست و داوای لیٚ کرد بی بەخشێت، کەیقوباد لێی خۆشبوو (٥). میرو فەرمانڕەواکانی دەوروبەر و خەڵکەکەش ((بەیعەتیان)) پێدا و چووە سەر تەختی سەلجوقی. کەیقوباد ویستی ئەوە بسەلمێنیٚ کە بەهێزترین فەرمانڕەوای سەلجوقیە، ئەوەی لە وانی دیکەی جیا دەکردەوە زۆر زیرەك بوو، خاوەن بەهرە بوو، خۆشنووس و وێنەکێش بوو، دارتاشێکی لێهاتوو بوو، هەروەها ((زین))یشی دروست دەکرد (٦) لە سالأنی دەسەلأتداریدا سەلماندی کە لەبواری کارگێڕی دا

کەم وێنەیە، ئەو ناوچانەی بە هۆی شەڕەکانەوە زیانیان بەر کەوتبوو بوژاندنیەوە، شاری قونیەی جوان و رازاوەتر کرد، شاری سیواسی کردە بنکەیەکی گرنگی بازرگانی و هەرێمی ئەنادۆڵی کردە بازارێکی جیهانی، پیشەسازی پێشکەوت، کارگەی شەکری دامەزراند، تاوانباران لێی دەترسان بەهۆی هەیبەت و سزا گرانەکانیەوە (٧) کەیقوباد، فەرماندەیەکی سەربازی بوو، لە ماوەی دوانزە ساڵدا گەلێ شوێنی هێنایە ژێر دەسەڵاتی خۆیەوە، قەڵای ((عەلانیە)) کە لەدەستی ئەرمەنیەکانی وەرگرتەوە، کردیە بنکەیەکی دەریایی کەم وێنە لەسەر دەریای سپی ناوەڕاست (٨). سوپای سەلجوقی، لەماوەی دەسەڵاتیدا، سەرکەوتنی گەورەی بەدەست هێنا و لە سەردەمی ئەو دەسەڵاتی سەلجوقی لەو پەڕی هێزدا بوو (٩ ).

**فراوانبوونەوەی سەلجوقی بەرەو باشوور - تێکچوونی بارودۆخ لە ئەرمینیای بچووك**

هەر کە کەیقوباد دەسەڵاتی بەدەستەوە گرت، دەسەڵاتی خۆی سەپاند بەسەر هەموو ناوچەی ئاسیای بچووکدا و لەسەر شانی هاوسێکانی لە ئەرمەنی و بیزەنتیەکان دەسەڵاتی خۆی فراوان کردەوە. ئاشکرایە دەسەڵاتی سەلجوقی بەسەر ئەرمینیای بچووکدا لەرێی ئەو پارەیەوە بوو کە سەلجوقیەکان بەسەریاندا سەپاندبووی. هەروەها کە سانێکیشی لە شارەکانیاندا دامەزراندبوو بۆ وەرگرتنی ئەو پارانە.. ئەرمەنیەکان جار نا جارێ رازی نەدەبوون بە بەندەکانی ئەو پەیمانانەی لە نێوانیاندا بەسترا بوو، چونکی لەبارودۆخی سیاسی گۆڕانکاری دەهاتە ئاراوە. کەچی سەلجوقیەکان بەتەمای ئەوە بوون دەسەڵاتی تەواویان بەسەر ئەرمینیای بچووکدا هەبێ. تا خۆی بۆ ئەم لایەنە تەرخان بکات لەگەل ((اشرەف موسی)) پارێزگای جزیرە پەیمانی ئاشتبوونەوەی گرێدا، بە ژن و ژن خواستن ئەو پەیمانە پتەو تر بووەوە. کەیقوباد ((خواند خاتوون))ی خوشکی ئەشرەفی موسای خواست (١٠) دوای ئەوەی کەیقوباد دڵنیا بوو لە ئەیوبیەکان، کەوتە هەوڵی فراوانکردنی دەسەلاتەکەی. شەڕی میراتگری ئەنتاکیاو سەرقاڵی ((لیۆنی دووەم)) بەشەڕی ((بوهیموندی چوارەم))ەوە، کە ئەنتاکیای ساڵی ٦١٦ کۆچی / ١٢١٩ زاینی لەدەستی ((ریمون روبین)) دەرکرد، ئەمانە خستیانە سەر

## مێژووی سەلجوقیەکان

ئەوەی پەل بۆ قیلیقیە بهاوێ لەسەر حیسابی ئەرمەنیەکان. مردنی ((لیۆنی دووەم)) لەو ساڵەدا وایکرد لەوسیاسەتە پەلە بکات، ئەرمینیای بچووک تووشی شەپۆلی نائارامی بوو و بارودۆخی تێکچوو ((١١)). چونکی شای کۆچکردوو، وەسیەتی کرد بوو دوای خۆی ((ئیزابیلا))ی کچی ببێتە جێنشینی، لەهەمان کاتدا، ((ریمون روبین)) تەماحی لە موڵکی ئەرمینیای بچووک کرد، دوای ئەوەی فەرمانڕەوای ئەنتاکیەی لە دەسچوو. هێرشی بۆ قیلیقیە کرد، لەگەل دایکیدا لە تەرسوس مایەوە، چاوەڕێی یارمەتی ئەسپارتەی دەکرد، چونکی پەیوەندیان بەهێز بوو، تاکو پێکەوە هێرش بۆ ئەرمینیای بچووک بەرن. لەراستیدا نەجیبزادەکانی ئەرمینیای بچووک، ئارەزووی شای کۆچ کردویان بەجێ هێنا و کچەکەیان لە جێگای داناو ((ئادەم سید بغراس)) چاودێری و سەرپەرشتی دەکرد. بەلآم، ئادەم، دوای چەند مانگێك کوژرا، ((قوستەنتین)) میری لامبرون و سەرکردەی ((بیت هیوم)) کە هەواداری بیزەنتی بوو، بەسەرپەرشت و چاودێری کچەکەی شا دانرا. ئەمیش هێرشی کردە سەر ((تەرسوس)) و داگیری کرد و ((ریمون روبین)) و ((ئەلیس))ی دایکی بەدیلیانی گرت. زۆری نەبرد ((ریمون)) لە زینداندا مرد. ئیزابیلا دڵنیابوو لە تەخت و تاجەکەی ((١٢)). ئەرمەنیەکان پێویستیان بەوە هەبوو، لەگەل ((ئەنتاکیە)) دا نێوانیان باش بێت، چونکی کەیقوباد تەماحی لە ولآتەکەیان کردبوو، دوای ئەوەی چیای تۆڕۆسی رۆژئاوای گرت و بووبووە جێگای هەڕەشە بۆ ئەرمینیای بچووک، قوستەنتین، پێشنیاری بۆ ((بوهیموندی چوارەم)) کرد کەوا کوڕەکەی ((فبیلیب)) بنێرێ تا ((شاژن))ی ئەرمەنی بخوازێت، بەلآم لەسەر ئەوە سوور بوو کە دەبێ زاوا سەر بە کەنیسەی ئەرمەنی بێت، باوکی لەمەدا بەربەست نەبوو، چونکی پێویستی بە هاوپەیمانی هەبوو لەگەڵ ئەرمەنیەکاندا بۆ بە گژا چوونی کەیقوباد. کە ببوە مایەی هەڕەشە لەسەر سنووری ولآتەکەی. بەمجۆرە بەرژەوەندی هەردووکیانی کۆ کردەوە — ئەرمەنی و سەلیبی— لە ئەنتاکیا بۆ وەستان لە دژی تەماحی سەلجوقیەکان. ئەم هاوپەیمانیە زۆری نەخایاند، چونکی ئەرمەنیەکان ((فیلیب)) یان کوشت، چونکی هەواداری بۆ لاتینیەکان هەبوو، ئەم کارە باوکی تووڕە کرد، لەبەر ئەوەی

نەیدەتوانی تۆڵەی کوڕەکەی بکاتەوە، چونکی لە کەنیسە دابڕا بوو لەسەر دەستی نوێنەری پاپا بیلاجیوس. و پاپا، هۆشیاری بە ((داویە))کان دابوو، کە لە هیچ کارێکدا هاوکاری نەکەن و پەیوەندی لەگەڵدا مەبەستن. ئەسپارتیەکانیش لایەنگری ئەرمەنیەکانیان دەکرد. ناچار بە سوڵتانی سەلجوقیەوە پەیوەندی کرد و هانیدا هێرش بکاتە سەر ئەرمینیای بچووك (١٣)

## گرتنی هەندێ قەلای ئەرمەنی

لەراستیدا سوڵتانی سەلجوقی پێویستی بەهاندانی کەس نەدەکرد تا لەسەر حیسابی ئەرمەنیەکان دەسەلاتی خۆی فراوان بکاتەوە، بارودۆخی نائارامی ئەرمەنیەکانی بەهەل زانی و هێرشی کردە سەر قەلای ((کالونوروس)) ی نزیکی ئەنتالیە، ئەم قەلایە دەیڕوانیە سەر رێگای دەریایی کە باشووری ئاسیای بچووکی بە میسرەوە دەبەستەوە. ئەرمەنیەکان سوودیان لەم قەلای دەبینی و باجیان خستبووە سەر ئەو گەشتییانەی بۆ میسر دەڕۆیی (١٤) ((ابن بیبی)) بە دوورودرێژی باسی گرتنی ئەم قەلایەی کردووە لەگەڵ ملخەواندنی فەرمانڕەواکەی ((کیرفارد)) بۆ دەسەلاتی سەلجوقی. دواجار ژن وژن خواستن کەوتە نێوانیانەوە و پەیوەندیان پتەو بوو، ((کەیقوباد)) یەکێ لە کچەکانی ((کیرفارد))ی خواست و سوڵتان ئیمارەتی ((ئاق شەهر))ی پێ بەخشی، کە سەر بە قونیەیە لەگەڵ چەند دێهاتێکی ئەو دەوروبەرەدا. کەیقوباد، ناوی قەلاکەی گۆڕی و ناوی نا ((قەلای عەلائی)) و کردیە جێگای زستانەی (١٥) هەروەها قەلای ((ئالاری))یشی داگیرکرد، کە ئەو رێگایانەی کەنارەکان کە بۆ قیلیقیە دەڕوا کونترۆڵ دەکرد(١٦).

## پەیدابوونی مەغول لەسەر شانۆی رووداوەکان

لەم کاتەدا، مەغولەکان وەك سێڵ لە ناوەوەی ئاسیاوە کەوتنەڕێ و بوونە جێگای مەترسی و هەڕەشەی ولاتە ئیسلامیەکان. چونکی دەوڵەتی سەلجوقی رۆم لەوکاتەدا بەهێزترین دەوڵەتی ئیسلامی بوون لە رۆژهەلاتدا، هەموو روویان لێکرد بۆ یارمەتیدانیان بۆ راگرتنی هێرشەکانیان، چونکی مەغول پەیوەندییەکی

راستەوخۆی بەم لێکۆلینەوەی ئێمە هەیە، دەبێ بارودۆخی ئەو گەلە بخەینە روو، لەگەڵ ئەو وڵاتە و شارانە دوای دەرچوونیان دەستیان بەسەرا گرت. لەسەرەتای سەدەی حەوتی کۆچیدا / سیانزەهەمی زاینی، رۆژهەلات خۆی بۆ پێشوازی سوپای مەغولی ئامادەکرد، کە لە باکووری رۆژهەلاتی ئاسیاوە بەلێشاو و شەپۆل شەپۆل لەماوەی جیاجیادا دەستیان بەهاتن کردبوو بێگومان کاریگەری هەبوو لەسەر باری سیاسی و ئابووری و ئاینی و رۆشنبیری. مەغولەکان چوون سێڵ دەهاتن دڵیان پڕبوو لە ئارەزووی تۆڵەسەندنەوە لە بەرێوەبەرانی وڵاتە موسڵمانەکان لەلایەکەوە، لەلایەکی تریشەوە بۆ دەسکەوتی مادی، چونکی لە وڵاتی خۆیاندا هەژار و دەستنەرۆ بوون.. ئەو مەغۆلانە کێن؟.. مەغول، کۆمەڵێ هۆزی کۆچەر بوون، لە بەرزاییەکانی مەنغولیا دەژیان لە باکووری بیابانی ((جوبی ))، کە خاکێکی بەرین و بەربڵاوە لە هەندێ شوێنیدا بێ ئاو و وشکە. ئەم هۆزانە لەسەر لق و بەشەکانی رووباری ((عامور)) دەژیان، ئەو خاکەیان داگیرکرد کە دەکەوێتە نێوان کۆلی ((بیکال)) لە رۆژئاوا و چیای ((کنجان)) لە سنووری مەنشوریا لە رۆژهەلات (١٧) ئەم هۆزانە، هەمیشە لەشەڕ و پێکدادانداندا لە هاوسێ ((تەتەر))ەکانیاندا دەژیان، ((کابل خان)) باپیرەی ((یسوکای)) ئەم هۆزانەی کۆکردبوەوە، بەلام دوای مردنی تێکچوون، ئیمپراتۆری چینی باکوور ((ئەلتان خان)) توانی دەسەلاتی بەسەر هەموو ناوچەکەدا بسەپێنێ (١٨). ((یسوکای)) بەشێکی کەمی لەو پەیمانە بەجێ هێشت، بەلام دەسەلاتی و ناوبانگی بەوە دەرکرد کاتێ توانی بەسەر هۆزەکانی ((تاتار))دا زاڵ بێ، سەرەڕای ئەوەش دەستی خستە کاروباری ((خان توغرول))ەوە (١٩)). دواجار هاوپەیمانیەك لە نێوانیاندا پەیدا بوو و بوونە یەك دەست (٢٠) بەلام بەرلەوەی وەکو ((خانی گەورەی مەغول)) جێگیربێت کۆچی دوایی کرد، هەندێ لە ((تاتار)) ژەهراویان کرد. ((تیموجین))ی کوڕە گەورەی ئەو دەمە نۆ ساڵان بوو، رووداوەکەش ساڵی ٥٧٢ کۆچی / ١١٧٦ زاینی روویدا (٢١). ژنەکەی توانی دەسەلاتی ((تیموجین)) لەناو هۆزەکانی باوکیدا دەستەبەر بکات، منداڵی ((تیموجین))یش ئارام نەبوو، بەهۆی هێرشی هۆزەکانی ((تایگوت)) کە دەیانویست زەلیلیان بکەن (٢٢).

((تیموجین)) هەر لە منداڵیەوە نیشانەی زیرەکی و ئازایەتی تیا دەرکەوت. کە تەمەنی گەیشتە حەڤدە ساڵی ناوبانگی پەیدا کرد. بە زیرەکی خۆی توانی گەورە پیاوانی مەغول بۆلای خۆی رابکێشێ، تا بەتەواوی هۆزەکەی خستە ژێر دەسەلاتی خۆیەوە، ئەوکات نیازی کرد هۆزەکانی بیابانی جوبی بخاتە ژێر رکێفی خۆیەوە (٢٣) ئێمە ناکۆکیەکانیان لێرەدا ناخەینە روو، ئەوەی لەمبارەیەوە دەتوانین بیلێین، کەوا تیموجین توانی دانیشتوانی ئاسیای رۆژهەلات کە دەکەوێتە باکووری چینەوە بهێنێتە ژێر ئالای خۆیەوە و لەسەر تەخت دانیشێ ، دوای ئەوەی هۆزەکانی مەغول بە ئیمپراتۆر هەڵیان بژارد. کە ئەمەی بۆ جێ بەجێ بوو ناوی خۆی نا ((جەنگیزخان)) یانی گەورەترین کاربەدەست، یان ئیمپراتۆری جیهان. شاری ((قەرە قۆرم))ی کردە پایتەختی خۆی (٢٤). جەنگیزخان دوای ئەوەی چووە سەر تەخت، دوو ئامانجی لەپێش خۆی دانا :-

یەکەم : بەرەو باشوور دەسەلاتی خۆی فراوان بکاتەوە. لەسەر حیسابی چینی باکوور، بەدووی دوژمنەکانیان بڕوات، کە بەرەو رۆژئاوای مەنگولیا و چین هەلاتبوون. لەو هۆزانە ((قەراخەتای)) کە دەستیان گرتبوو بەسەر ئەو هەرێمانەی ولاتی ((ئیغور)) تا دەگاتە ((دەریای ئارال)). توانی ئیمپراتۆری چین ((وای وانگ)) بشکێنێ و ((پەکین))ی پایتەخت لە ساڵی ٦١٢ کۆچی / ١٢١٥ زاینی داگیر بکات (٢٥)

دووەم : بەرەو رۆژئاوا بڕوات و بەسەر هۆزەکانی ((خەتا - الخطا))دا سەرکەوێت کە هەرێمی ئەو دیو ئاویان داگیرکرد بوو لەسەر سنووری ولاتە ئیسلامیەکان. جەنگیزخان توانی ولاتەکەیان داگیربکات و بەسەر گەورەکەیاندا ((شلوخان)) دا سەرکەوت. ئیتر ولاتە بەرینەکەی کەوتە تەنیشتی دەولەتی خوارزمیەوە (٢٦)

## دەوڵەتی خوارزمی

لێرەدا دەبێ، بەکورتیش بێ ئاوڕ بدەینەوە بۆ لای دامەزراندنی دەوڵەتی خوارزمی و پەیوەندی بە دەوڵەتی مەغولەوە، بەهۆی پەیوەستی مێژوویی ئەم دوو دەوڵەتەوە بە دەوڵەتی سەلجوقی رومەوە. ئەوەی جێی گوتنە، ئەم پەیوەندیەی نێوان ئەم دوو دەوڵەتە هۆیەك بوو بۆ کشانی مەغولی بەرەو رۆژئاوا.

خوارزەمیەکان بۆ ((ئەنوشتەکین)) دەگەڕێنەوە، کە یەکێ بۆ تورکەکانی دەربارەی مەلەك شا سوڵتانی سەلجوقیەکان، ئەو کابرایە ((ساقی)) بوو لە دەرباری. ((محمد))ی کوڕی لەبواری زانست و ئەدەبدا ناوبانگی دەرکرد، یەکێ لە فەرماندەکانی سوڵتان بەناوی ((برکیاروق)) کردی بە فەرمانڕەوای هەرێمی خوارزەم و نازناوی ((خوارزەم شا)) ی (٢٧) پێدا، کە دامەزرێنەری دەوڵەتی خوارزەمیە.. ساڵی ٥٢٢ کۆچی / ١١٢٨ زاینی، هێزی خوارزەمییەکان لە سەردەمی ((ئات سز)) دا دەرکەوت، کە لەگەڵ سوڵتانی سەلجوقیدا ((سنجر)) پێکەوە دەردەچوون، ((مەرو)) و ((نیسابور)) یان گرت (٢٨). دوای ئەوەی لەسەر شانی دەوڵەتی سەلجوقی فراوان بوونەوە، لە ساڵی ٥٥٢ کۆچی / ١١٥٧ زاینیدا دوای مردنی ((سنجر)) دەوڵەتەکەیانی لەناودا. خەلیفەی عەباسی ((ناصرالدین الله)) پەنای بردە بەر ((خوارزەم شا علی تکش)) بۆ لەناوبردنی دەوڵەتی سەلجوقی (٢٩) ئەمە هەلێك بوو بۆ سەرکردەی خوارزەمیەکان تاکو لە رۆژئاوا دەسەلآت پەیدا بکات و دەوڵەتێك قەبارەی سیاسی هەبێ دامەزرێنێ. ((تکش)) لەگەڵ سوڵتانی سەلجوقی توغرول لە نزیکی ((ری)) (٣٠) لە ساڵی ٥٩٠ کۆچی / ١١٩٤ زاینی، رووبەروو بوونەوەی، بەسەریا سەرکەوت و توغرول لەو شەڕەدا کوژرا، ((تکش)) سەرەکەی ((توغرول))ی بۆ خەلیفەی عەباسی نارد (٣١). بەمجۆرە، دەوڵەتی خوارزەمی، جێگای دەوڵەتی سەلجوقی گرتەوە لە عێراق. سەرکردەکانی دەستیان دەخستە کاروباری خەلافەتەوە، تا نیازیان کرد، بەغدا بخەنە ژێر دەسەلآتی خۆیانەوە (٣٢). خەلیفە دەستەوسان نەوەستا، بەهەموو شێوەیەك هەوڵی دەدا، لەرووی تەماحی خوارزەمیەکان راوەستێ، دواجار پەنای بۆ مەغولەکان برد (٣٣).

## بەرەو رۆژئاوا چوونی مەغول

((ابن الاثیر)) ئەو گێڕانەوەیەی لەبارەی کەسایەتی خەلیفەی عەباسی ((ناصرالدین الله)) کردویەتی دەیسەلمێنێ کە دەڵێ :- ((ئەو هۆکارەی عەجەم دەیڵێن راستە کەوا خۆی وایکرد تاتارەکان تەماح لە وڵات بکەن و خۆی نامەی بۆ ناردن، کارەساتی گەورە لەوێدایە کە گوناهە گەورەکان بچووك دەبنەوە )) (٣٤). هەرچی

چۆنیٚ بیٚ، خەلیفەی عەباسی، نامەی بۆ جەنگیزخان نارد کەوا بۆ ولآتـی ئیـسلامی بێت، ئامادەیی خۆی پیشان دا بۆ هێرشکردنە سـەر خوارزەمیـەکان لـە رۆژئـاواوە ئەگەر بێت و ئەو لە رۆژهەلآتەوە هێرش بکات (٣٥). هەرچەند ئەو نامەیە گەیـشتە مەغولەکان، بەلآم هۆکار نەبوو لە هێرشی جەنگیزخان بۆسەر خوارزەمیەکان، لـەو کاتەی نامەکە گەیشت، سـەرۆکی مەغولیـەکان بـەرەو رۆژئـاوا کـشابوو تـا نزیکـی سنووری دەولـەتی خـوارزەمی هـاتبوون. تـوانی، پـەیمانێك لـەبارەی بازرگانیـەوە لەگەلٚ خوارزەمیەکاندا ببەستن، نامەکەی خەلیفە گرنگیـەکی وای نـەبوو لـە لایـان (٣٦). وادیاربوو، کارەسات بـەرێوەبوو، بـەلآم هـۆی سـەرەکی بـۆ ئـەو نوێنەرانـە دەگەرێتەوە کە لەم رۆژانەدا لە بارەیەوە گوێمان لێی دەبیٚ. هـەموو لەسـەر ئـەوە رێکن، هیچ شتێك نەیدەتوانی بەری ئـەو هێرشـەی مـەغول بگـریٚ. بـەلآم تـەماح و چاوچـنۆکی ((عــلاء الــدین محمــد خــوارزەم شــا)) ئـەو رووداوەی ئاسـان کـرد.. هەردوولا گەلیٚ جار رووبەرووی یەکبوونەوە، تا لەگەلٚ یەکتردا ئاشتبوونەوە، بـەلآم خوارزەم شا هەستی بە ئیهانەت کرد کاتیٚ جەنگیزخان لە نامەیەکیدا بـە ((خـان)) نـاوی دەبـات بەسـەر گـەلانی مـەغولی و تورکـەوە ئـەو نامەیـە نـاکۆکی نەخـستە نێوانیانەوە. تەماحی سیاسی خوارزەمیـەکان کـە دەیانەویـست مەغولـەکان لـەناو بەرن، پەیوەندیانی ئالۆز کـرد و کردییـە پەیوەندییـەکی دوژمنانە،تـەماحی زۆرتـر سیاسی بوو جەنگیزخانیش لەوکاتەدا بیری لەوە نەدەکردەوە، جیهـان بخاتـە ژێـر دەسەلآتی خۆیەوە. چونکی خەریکی یەکخستنی هۆزە کۆچـەرییەکان بـوو کـە لـە مەنگولیا بوون. بازرگانی لەگەلٚ گەلانی شارستانیدا بەلای کۆچەرییەوە گرنگیـەکی زۆری هەیــە (٣٧). جــەنگیزخان کــاروانێکی بــۆ رۆژئــاوای ئاسـیای نــارد بــۆ بازرگانیکردن لەگەلٚ بازارەکانی خوارزەمیدا، کە چوارسەد کەس بوون و بە رابەری چـوار بازرگـانی موسـلمان (٣٨)، کەگەیـشتنە شـاری ((ئـوترار)) لەسـەر رووبـاری سـەیحون، کـە لـەناو مـولکی خوارزەمیەکاندایـە، ((ینـال خـان))ی فـەرمانرەوای شارەکە هەموو ئەو بازرگانەی کوشت و مالەکانیانی بـرد (٣٩). قـسەی جیـاواز لـە ئارادایە سەبارەت بەپرسیارێتی سولتان لەم بارەیەوە، لێرەدا ماوەی گێرانـەوەیان نییـە، بـەلآم دەتـوانین بلـێین، رووداوەکـان ئـەوە دەردەخـەن کـەوا بازرگانـەکان

قوربانی چاوچنۆکی والی بوون (٤٠). جەنگیزخان نەیدەتوانی چاوپۆشی لەمە بکات، بەڵام ژیرێتی و لەسەرخۆیی هەنگاوێکی دیکەی پێ هاویشت، نوێنەری بۆ لای خوارزەم شا نارد بۆ نارەزایی دەربڕین و داوای لێکرد فەرمانڕەوای ((ئوترار)) بە دەستەوە بدات، بەڵام سوڵتان رازی نەبوو، بۆیە جەنگ دەبوا روویبدایە (٤١). ساڵی ٦١٥ کۆچی / ١٢١٨ زایینی، جەنگیزخان، سوپایەکی زۆری ئامادەکرد، لە ٢٠٠هەزار جەنگاوەر پێکهاتبوو، بۆ داگیرکردنی وڵاتی موسڵمانەکان. چونکی خوارزەم شا نەیزانی لە کام لاوە سوپای مەغول هێرش دێنێ، سوپاکەی دابەشکرد، بەشی سەرەکی لەقەڵاکان دانا کە لەسەر رووباری سەیحون بوون، بەشەکی دیکەی لە شارە گرنگەکانی هەرێمی ئەو دیو رووبار دانا، وەکو ((بوخارا)) و ((سەحەرقەند)) (٤٢). ئەم دابەشکردنە توانای سوپای خوارزەمی کەمکردەوە، هەرچەند ژمارەیان زۆرتر بوو. سوپای مەغولی راستەوخۆ بەرەو دۆڵی ناوەڕاستی رووباری سەیحون رۆیی، رووبارەکەی تێپەڕاند، بەشێکی بەفەرماندەیی ((جغتای)) و ((ئوکتای)) بوو، کە دوو کوڕی جەنگیزخانن، ئابڵۆقەی شارەکەیان دا، زۆری نەبرد داگیریان کرد، بەشێکی دیکەی سوپاکەی، کە بەفەرماندەیی ((جوجی)) بوو، کوڕە گەورەکەی جەنگیزخان. بە رووبارەکەدا شۆڕ بوەوە و شاری ((جەند))ی گرت، کە قەڵایەکی گرنگیشە لەسەر رووبارەکە، دواجار توانی بچنە ناو شارەکەوە، بەشی سێیەمی سوپاکە، بە فەرماندەیی سێ کەس کە بەناوبانگترین سەرکردەی جەنگیزخان بوون شاری ((بنکت)) و ((خجند)) ە یان گرت، بەمجۆرە جەنگیزخان، رێگاکانی لە سوپای خوارزەمی بڕی، کە لە ((فرغانە)) کۆ ببونەوە. جەنگیزخانیش، لەگەڵ هێزە سەرەکیەکەدا، کە ((تولوی)) کوڕی لەگەڵدا بوو بەرەو ((بوخارا)) رۆیشتن، تا رێگای نێوان سوڵتان و سەربازەکانی دیکەی ببڕێ، ساڵی ٦١٧ کۆچی / ١٢٢٠ زایینی، گەیشتە شارەکەو دەستی بەسەرا گرت، ئەمجا ((سەمەرقەند))ی گرت، نەیهێشت ((علاءالدین محمد خوارزەم شا )) بگاتە شارە ئابڵۆقە دراوەکانی سەر رووباری سەیحون لە رۆژهەڵات. ئەو ساڵە کۆتایی نەهاتبوو جەنگیزخان بەتەواوەتی دەستی بەسەر هەرێمی ئەو دیو رووباری گرتبوو (٤٣). ((علاءالدین محمد خوارزەم شا)) بۆ

خوراسان هەلآت، سوپای مەغولی شوێنی کەوتن بە فەرمانەی ((سبوتای وجبی)) بەلآم توانی خۆی رزگار بکات و بەرەو رۆژئاوا رۆیشت و خۆی گەیاندە ((قەزوین)) لەوێوە بەرەو ((گەیلان)) و ((مازندەران)) رۆیشت. لەوێ دەست وپێوەندەکانی، لەگەڵدا نەمان و بەتەنها مایەوە دوای ئەوەی زانیان هەموو شتێکیان لەدەستچوو ((علاءالدین محمد خوارزەم شا)) لەساڵی ٦١٨ کۆچی / ١٢٢١ زاینی، لەیەکێ لە دوورگە دوورەکانی دەریای قەزوین، کۆچی دوایی کرد. موڵکێکی نادیاری بۆ ((جەلاله دین)) کوری بەجێ هێشت. پایتەختی خوارزەمیش بەر ساڵێك گیرا بوو (٤٤). دوای ئەوەی مەغولەکان دەستیان بەسەر خوارزەم و هەرێمی ئەودیو رووباردا گرت، گورزێکی دیکەیان وەشاند، گەلێ شاری دیکەیان گرت بێ شەرکردن ((ترمز)) و ((بەڵخ)) و ((مەرو)) و ((نیسابور)) و ((نسا)) کەوتنە ژێر دەسەلآتیان (٤٥). جەنگیزخان هەرێمەکانی رۆژئاوای سالی ٦١٩ کۆچی ١٢٢٢ زاینی بەجێ هێشت کەس نەبوو لەرویدا بوەستێ، بەلآم دەسەلآتی مەغۆل لە هەرێمی خوارزەم و ئەو دیو رووبار بەتەواوەتی چەسپابوو (٤٦) ولآتە ئیسلامیەکان فەرمانرەوایەکی بەهێزی تیادا نەمابوو بەرگری لەشارەکان بکات و موسڵمانەکان هێرشی روخێنەری مەغولی بپارێزێ، تەنها یەکێ نەبێ ئەویش کەیقوباد بوو، خەلیفەی عەباسی پەنای بۆ برد، نامەیەکی بە ((محی الدین سبط ابن الجوزی))دا بۆ نارد، داوای هەزار سواری لێکرد تا مەقامی خەلیفە بپارێزن (٤٧). سوڵتانی سەلجوقی بەدەنگییەوە چوو، پێنج هەزار سوارەی بە فەرمانەدەی ((کتلغ شا)) بۆ نارد، بەلآم لەپێش میرەکانیدا ئاماژەی بۆ ئەوە کرد، کەوا خەلیفە دەبێ لەگەڵ مەغولدا وتووێژ بکات بۆ دابینکردنی ئاشتی، چونکی توانای بەرگریکردنی مەغولی نییە، ئەمەش چاکترین رێگایە بۆ مانەوەی خۆی و رزگارکردنی هەرێمە موسلمانەکان لەوێران بوون (٤٨) کە هێزە سەلجوقیەکە گەیشتە موسڵ، مەغولەکان خەریك بوون بەرەو ولآتانی ئیسلامی دەهاتن، خەلیفە نوێنەرێکی بۆ لای فەرماندەکەیانی نارد تیایدا دەڵێ، مەسەلەی مەغول ئەوەندە گەورە نییە و داوای لێکرد بگەرێتەوە بۆ ولآتی خۆی، کتلغ شا گەرایەوە قونیە (٤٩)

## مێژووی سەلجوقیەکان

### فراوانبوونی سەلجوقیەکان بەرەو باکوور

کەیقوباد لەلایەن هەندێ لە میرەکان پیلانیان لە دژی ئەنجامدا، وەکو ((سیف الدین ئاینبی)) و ((زین الدین بشارە امیرالخیل)) (٥٠) و ((مبارزالدین بهرام شا امیر المجلس)) (٥١) و ((بهاء الدین قتلش)). بەمەبەستی ئەوەی لەسەر دەسەلاَت لایبدەن و ((فەرەیدون))ی برای لە جێگاکەی دابنێن. زۆر بەبڕوا بەخۆکردنەوە رووبەرووی ئەو پیلانە بووەوە و بەسەریا سەرکەوت. هەندێك لەوانەی لە پیلانەکە بەشدار بوون کوشتنی و هەندێکیانی بۆ قەلاَی ((زیاد)) دوورخستەوە. لەوێوە چوونە پاڵ ((ئەشرەف موسای بن العادل الایوبی)) خاوەنی جزیرە و میافارقین و خەلات. ئەویش داوای لە سوڵتان کرد لێیان خۆشبێ. ئەشرەف موسا لەگەڵ کەیقوباد دا کاتێ چووە سەر تەخت ئاشت بووەوە (٥٢).

دوای ئەوەی بەسەر پیلانەکەدا سەرکەوت، دەستی کردە فراوانکردنەوەی دەسەلاَتەکەی، ((ابن بیبی)) ئەو رووداوانەی بە دوورودرێژی باس کردووە.. وێنەیەکی روونی پێداوین و نیازی گرنگی سەبارەت بەو رووداوە باس کردووە. ئەمانە لای مێژوو نوسەکانی دیکە نەبینیوە. دوژمنایەتی کەوتبووە نێوان سەلجوقیەکان و خەڵکی باکوور لە ((قەبەجاق)) و ((روس)). ساڵی ٦١٩ کۆچی / ١٢٢٢ زاینی، ئەوانە هێرشیان کردە سەر بازرگانەکانی سەلجوقی لە دەریای رەش، کەلوپەلەکانیان بردبوون، سەلجوقیەکان خێرا وەلاَمیان دانەوە. سوڵتان هێزێکی سەربازی بە فەرماندەیی ((ملك الامراد)) (٥٣) ((حسام الدین جوبان)) ئامادەکرد و فرمانی دا هێرش بکەنە سەر ((سوداك))ی پایتەختی ولاَتی قرم (٥٤). سوڵتانیش چووە قەیسەری و چاوەڕێی ئەنجامی هێرشەکەی دەکرد. سوپای سەلجوقی کەوتە وشکانی و بەرەو پایتەختەکە رۆیشتن، دانیشتوانی شارەکانی کەنار هاتنە ژێر فەرمانیانەوە، بەلاَم لە ناوەوە، ((روس)) و ((قەبجاق)) پێکەوە لەرووی سەلجوقیەکان وەستان، سوپایەکیان کۆکردەوە نزیکەی دەهەزار جەنگاوەر دەبوو، لەگەل ئەوەشدا ترسان بچنە ناو شەڕێکەوە ئەنجامەکەی نادیاربێ. بەرتیلیان دایە فەرماندەی هێزەکەی سەلجوقی تا بکشێتەوە، بەلاَم ئەوەی قەبول نەبوو، کەوتە شەڕ لەگەل هێزە هاوبەشەکەی – روسی – قەبجاقیدا

و بـە سـەریاندا سـەرکەوت، دواجـار هێرشـی بـۆ ((سـوداك)) کـرد. و خـۆی داوە دەستەوە، دانیـشتوانەکەی ئامـادەیی خۆیـان نیـشان دا ((جەزیـە)) بـدەن و کـەل وپەلی بازرگانەکانیش بگەڕێننەوە بەرامبەر پاراستنی ژیانیـان، سـوڵتان رازی بـوو بەمەرجی ئەوەی سرووتە ئیسلامیەکان بـەجێ بهێـنن، سـەلجوقیەکان چـوونە نـاو شارەکەوە،چەند مزگەوتێکیان تیـادا دروسـتکرد، خوتبـە خـوێن و بانگـەدەری بـۆ دانـان، هــەروەها قازییەکیـشی لەوێـدا دانـا، کـوڕی هەنـدێ لـە پیاومــاقوڵانی شارەکەشیان بـە بارمتـە بـرد و هێزێکـی سەربازیـشیان لەشـارەکە دانـا، ئـەوجار گەڕانەوە (٥٥).

## جارێکی کە بەرەو باشوور

لەمەوبـەر رامانگەیانـد کـەوا ئەرمەنیـەکانی قیلیقیـە ((فیلیـب))ی مێـردی شـاژن ((ئیـزابیلا))یـان کوشـت، شـاژن بـۆ سـلوقیە هــەڵات، داوای پاراسـتنی لــە ((ئەستاریەکان)) کرد. ئەرمەنیەکان دەسەڵاتیان دایە دەستی ((قوستەنتین))ەوە، ((بوهیموند))ی باوکی فیلیب ئـەم کـارەی بـە تەحـەددا زانـی، داوای یارمـەتی لـە کەیقوباد کـرد، هـەردووك رێکـەوتن لەیـەك کاتـدا هێـرش بـۆ قیلیقیـە بـەرن (٥٦). کەیقوباد ئەمەی بەهەل زانی، تا دەسەڵاتی خۆی، لەسەر حیسابی ئەرمەنیەکان لە قیلقیە فراوان بکاتەوە، بیانوی ئەوە بوو، کەوا هێرشیان کردۆتـە سـەر کـاروانێکی بازرگـانی، لـە سـاڵی ٦٢٢ کۆچـی / ١٢٢٥ زاینــی، سـوپایەکی بـە فەرمانـدەیی ((امیرمبارزالـدین جـاولی)) ئامـادەکرد و بـۆ ئـەرمینیای بـچووکی نـارد، تـا چـەند قەڵایەك داگیر بکەن، فەرماندەکـەی سـەلجوقی لـە قـەڵای ((جـنجن))ەوە دەسـتی پێکرد، ئابلۆقەیدا، دانیشتوانەکەی هاواریان بو ((قوستەنتین)) برد، لەبـەر ئـەوەی بە کێشەی ناوخۆوە خەریك بوو بوو، داوای یارمەتی لە سەلیبیەکان کرد، هێزێکـی سـەربازیان نـارد، ورەی دانیـشتوانی قەڵاکـەی پـێ بـەرزبووەوە، دواجـا هێزەکـە ویستی ئابلۆقەکە بـشکێنێ، لەگـەڵ سـوپای سـەلجوقیدا کەوتنـە شـەڕەوە، بـەڵام شکان، دانیشتوانەکە ئەمەیان بینی خۆیان بەدەستەوە دا (٥٧). قوستەنتین دوای ئەوە هەستی بە هێزی سەلجوقیەکان کرد و زانی نـاتوانێ لـە رێگایانـدا بوەسـتێ،

بەر لەوەی سەلجوقیەکان بەرەو پایتەختەکەیان بڕوات، نوێنەرێکی بۆلای سولتان نارد، بەلێنی ئەمانەی خوارەوەی پێدا :-

- لە ژێر فەرمانی ئەواندابن
- هەزار سوارەو پێنج سەد کەس دەخەنە ژێر فەرماندەی سولتانەوە.
- ناوی سولتان لەسەر سکەی پارە لێدەدەن
- ((جەزیە)) زیاد دەکەن.

سولتان ئەم بەلێنانەی قوستەنتینی قەبولکرد و داوای لە فەرماندەی لەشکرەکە کرد بگەڕێتەوە بۆ ولات، ئەو قەلایەش دەستی بەسەرا گرتبوو بداتە دەستی ((میر قمرالدین)). ئەوەی شایانی باسە ((میر جاولی)) لەو لەشکرکێشییەدا سی قەلای گرتبوو، بەرادەیەك ویلایەتە سەلجوقیەکانی بەیەکەوە گرێ دەدا (٥٨). لەو کاتەی ((میرمبارزالدین جاولی)) خەریکی دەوروبەری قیلیقیە بوو، سوپایەکی دیکەی سەلجوقی بە فەرماندەیی ((امیرمبارزالدین ارتقش))، هێرشی بۆ کەنارەکانی باشوور دەبرد. سەلیبیەکان ئەوانەی پارێزکاری قەلاکانیان دەکرد خۆیان ئامادەکرد، بەلام لەبەردەم هەر قەلایەکدا شەڕ بەرپا دەبوو، خۆیان رانەدەگرت و هەلدەهاتن، دانیشتوانی قەلاکانیان بۆ رووبەروو بوونەوەی چارەنووسی خۆیان جێ دەهێلا، ناچار داوای پاراستنی ژیانیان دەکرد و خۆیان تەسلیمی سەلجوقیەکان دەکرد. (٥٩). لە ئەنجامی ئەم فراوانبوونەوەی سەلجوقیەکان، بە درێژایی کەناری باشوور تا دەگاتە قیلیقیە، سەر لەنوێ دەسەلاتیان کەوتە سەر ئەرمینیای بچووك، کە تا دەهات کەم دەبووەوە، بووە ویلایەتێك سەر بە دەولەتی سەلجوقی و ((جەزیەیان)) دەدا (٦٠).

## فراوانبوونی سەلجوقی لە هەرێمی جزیرەدا

## -ناکۆکی ناو خێزانی ئەیوبیەکان-

چالاکی سیاسی و سەربازی سەلجوقیەکان، لەسالی ٦٢٣ کۆچی / ١٢٢٦ زاینی بۆ هەرێمی جزیرە گوێزرایەوە. بەردەوامبوونی شەڕ لە باکووری ولاتی شام لە بەرژەوەندی نەسرانیەکاندا بوو کە لەنێوان دوو دراوسێی ئیسلامیدا شەڕ بەردەوام

بــێ. ســەلجوقی رۆم و ئەیوبیــەکان لەحەڵــەب و موســڵ، شــایانی باســە. ئــەو ئاگربەستەی کە ((محمد ئەیوبی)) خاوەنی میسر، لەگەڵ سەلیبیەکاندا گرێدا بۆ ماوەی هەشت ساڵ، لە ٦١٨ – ٦٢٦ کۆچی / ١٢٢١ – ١٢٢٩ زاینی، ئەیوبیەکان لە حەڵەب و موسڵ بەشدار نەبوون (٦١). کاتێ لەساڵی ٦١٨ کۆچی / ١٢٢١ زاینی، مەترسی سەلیبیەکان لەسەر میسر لاچوو، ناکۆکی کەوتە نێوان سێ شای دەوڵەتی ئەیوبیەوە لە کورەکانی ((العادل)) کە ئەمانە بوون :

((الکامل محمد)) خاوەنی میسر، ((المعظم عیسی)) خاوەنی دیمەشق و بیت المقدس و تەبەریە و دەوروبەری، و ((اشرف موسی)) خاوەنی هەرێمی جزیرە و خەلات – خلاط – و میافارقین (٦٢). لە بۆنەیەکدا ((اشرف موسی)) چووە سەردانی ((محمد))ی برای لە میسر، لەو سەفەرەیدا ((المعظم عیسی)) ی برای لەگەڵدا نەبوو، براکەی وایزانی دەروات لەدژی ئەو لەگەڵ براکەیدا رێکدەکەوێت، وا هەستی کرد کە کەوتۆتە ژێر فشاری هەردووکیانەوە، ئەویش دەستی کردە پلان دانان و ئاژاوە نانەوە لە ولاتی شام و هەرێمی جزیرە. هێرشی کردە سەر ((حماە)) و ((حمص)) و لەگەل ((مظفرالدین گوك بوری))دا سەرداری ئەربل، و ((ناصرالدین محمد)) سەرداری ماردین، بووە هاوپەیمان، هەموویان رێکەوتن هێرش بکەنە سەر موڵکەکانی ((اشرف موسی)) لە هەرێمی جزیرە، و لەسەر دابەشکردنی دەستکەوتەکانیانیش رێکەوتن (٦٣)، هەروەها هانی ((غازی)) برای دەدا، کە لە جیاتی ((اشرف موسی)) شاری ((خلاط)) ی بەرێوە دەبرد هانی دەدا یاخی ببێ، بەلام اشرف موسی، توانی یاخیبوونەکە کپ بکاتەوە، ((غازی)) چووە لای ((جلال الدین خوارزەمی)) بێت و دیاربکر بگرێت، ئەم پەیوەندی کردنە بووە هۆی ئەوەی ، ((عیسی)) سەرکردەی خوارزەمیەکان داوای کرد هاوپەیمانیەك ببەسترێ بۆ ئەوەی ((خلاط)) لە دەستی اشرف موسی دەربهێنرێ. ئەمە ((اشرف موسی)) ی تورەکرد و ئەو هاوپەیمانیەی لەگەڵ ((کامل محمد)) دا هەبوو هەڵوەشاندەوە، خاوەنی میسر داوای لە ((المعظم عیسی)) کرد، لە ((حەماە)) دەرچێ، ئەویش ((حەما))ی بە ((نابەدڵی بەجێ هێشت)) ئەوە سەرتای ناکۆکی بوو لەنێوان ((المعظم عیسی)) و براکانی ((کامل محمد)) و ((اشرف موسی))،

بەڵام ((اشرف موسی)) هەوڵیدا ماڵی ئەیوبیەکان یەکبخاتەوە بۆ راوەستان لە بەرامبەر مەترسی خوارزەمی، کە رۆژ لە دوای رۆژ لە زیاد بووندا بوو، ببووە مایەی هەڕەشە لەسەر موڵکەکانی ئەیوبیەکان.. بۆ ئەم مەبەستە، چووە سەردانی براکەی ((المعظم عیسی)) لە دیمەشق، بەڵام ((عیسی)) براکەی گرت و بەری نەدا تاکو بەڵێنی پێدا یارمەتی بدات بۆ گرتنی ((حمص و حماە)) و هێرشی سەر ((کامل محمد)).. ((اشرف موسی)) بەفێڵ وای نیشاندا رازییە، دواجار کە دەرچوو بەڵێنەکەی بەجێ نەهێنا. ((کامل محمد)) پەنای بردە بەر ئیمپراتۆری ئەلمانی ((فردریکی دووەم)). لەولاوە ((عیسی)) داوای یارمەتی لە ((جلال الدین خوارزەمی)) کرد، لەگەڵیا رێکەوت هێرش بکەنە سەر هەردوو براکەی (٦٤).

## جوڵانەوە سەربازیەکان

ساڵی ٦٢٣ی کۆچی / ١٢٢٦ زاینی، ((مظفرالدین گوك بوری)) بەرەو موسڵ کەوتە رێ، بەپێی ئەو پلانەی هاوپەیمانەکان دایانڕشتبوو.. ((جلال الدین خوارزەمی)) لە تەفلیسەوە (٦٥) بەرەو ((خلاط)) کەوتە رێ، بەڵام یاخی بوونی جێگرەکەی لە ((کرمان)) بووە هۆی گەڕانەوەی، دوای ئەوەی هەندێ ناوچەی ((خلاط))ی تالان کرد.. گەڕانەوەی کاری کردە سەر ورەی هاوپەیمانەکانی ((ئیتر ئەوەی لەسەری رێکەوتبوون تێکچوو)).. وا دەردەکەوێت ((مظفر گوك بوری)) بڕیاری دابوو، ئەوەی دەستی پێکردووە تاسەر لەسەری بڕوات. بۆیە بەردەوام بوو لەچوونە پێشەوە و لە نزیکی ((زاب)) سوپاکەی دامەزراند، ((بدرالدین لؤلؤ)) فەرمانڕەوای موسڵ، پەنای بۆ ((اشرف موسی)) برد، کە ئەوکاتە لە ((رقە)) بوو، ((اشرف موسی)) بەهانایەوە چوو، بۆ ئەوەی گوشار لەسەر موسڵ کەم بکاتەوە، هێرشی بۆ ((حەڕان)) و (٦٦) ((دونەیسر)) برد (٦٧)، و داوای لە کەیقوباد کرد هێزەکانی بەرەو ((ئامەد)) ببات و هێرش بکاتە سەر (٦٨). دوای هەڵوەشاندنەوەی هاوپەیمانیەکە، ((مسعود ناصرالدین محمود)) چۆڵ بوونی مەیدانی سیاسی لە فەرمانڕەوایەکی بەهێز و ناکۆکی ناو خێزانی ئەیوبیەکان و سەرقاڵی کەیقوباد بە کەوتنە دوای فراوانبوونی خوارزەمیەکان بەرەو رۆژئاوا، ئەمانەی بەهەل زانی،

بڕیاریدا، ئیمارەتەکەی لە پاشکۆیی سەلجوقیەکان دەرکاو سەربەخۆیی، سکەی بە ناوی خۆیەوە لێدا و لە خوتبەشدا ناوی ئەو دەبرا (٦٩). کەیقوباد کەوتە نیازی ئەوەی بەرەو هەرێمی جزیرە بڕوات، بە دوای بیانوویەك دەگەڕا، هەڵس و کەوتی، پارێزگاری ئامەدی بە تەحەدا داناو دەرچوون لە فەرمانی ئەو، داواکەی ((اشرف موسی)) بووە بیانوویەکی باش، بۆیە سوپایەکی ئامادەکرد، لە مەلتیە کۆ بووەوە، دواجار، کردییە دوو بەشەوە، بەشی یەکەمی سوپاکەی بەرەو قەڵای ((کختا)) (٧٠) ڕۆیشت بە فەرمانی ((امیرمبارزالدین جاولی))، بەشی دووەم بەرەو قەڵای ((جومك ئازاد)) (٧١) بە فەرمانی ((امیر اسدالدین کند سطبل)) بوو. کە ((مبارزالدین جاولی)) گەیشتە قەڵاکە، ئابڵوقەی دا، و بە مەنجەنیق کەوتە لێدانی. پارێزگاری ئامەد، دوای ئەم گۆڕانکاریە سەربازییە هەستی کرد ناتوانێ دوژمنایەتی ((اشرف موسی)) بکات، چووە ژێر ئاڵایەوە، ئیتر شەڕ پێویستی نەکرد، ئەمەی دوایی، نامەیەکی بۆ کەیقوباد نارد، لەوەی ئاگادار کردەوە و داوای لێکرد، ئەوەی دەستی بەسەرا گرتووە بۆ ((ئامەد))ی بگەڕێنێتەوە. بەڵام کەیقوباد، وەڵامی نەدایەوە، وتی ((من وەکیلی ئەشرەف نەبووم تا پێم بڵێ ئەوە بکەو ئەوە مەکە )) (٧٢). لەسەر ئەوە ناکۆکی کەوتە نێوانیانەوە. ئەوکاتە ((اشرف موسی)) هێزێکی سەربازی بۆ یارمەتیدانی ئامەد نارد، کە بە دە هەزار جەنگاوەر مەزەندە دەکرا، بە فەرماندەیی ((عزالدین بن البدر الحموی))، مێژوو نووسان لەسەر ئەوە ڕێکەوتوون، کەوا لەو کاتەدا گەیشت سەلجوقیەکان ئابڵوقەی قەڵای ((کختا)) یان دەدا (٧٣). پارێزگاری ((ئامەد)) هێزێکی ئامادەکرد شەش هەزار جەنگاوەر بوو، چوونە پاڵ هێزەکانی ئەیوبیەوە. هاوپەیمانانیش بەرەو ڕووی هێزەکانی سەلجوقی ڕۆیشتن (٧٤). هەردوولا، کەوتنە شەڕێکی گران، لەئەنجامدا سەلجوقیەکان سەرکەوتنیان بەدەست هێنا، کوڕەکەی (بدر) بەدیل گیرا، دانیشتوانی قەڵاکە داوای ئەمانیان کرد و قەڵاکەیان دایە دەستی ((امیر مبارزالدین جاولی)) (٧٥) بەشی دووەمی سوپاکەی توانی قەڵای ((جمك ئازاد)) وەربگرنەوە دوای ئەوەی ئابڵوقەی داو بە مەنجەنیق لێیدا، کونێکیان لە پەرژینەکە کردەوەو چوونە ژوورەوە (٧٥). ((ابن الاثیر)) دەڵێ :

سەلجوقیەکان قەڵای ((مەنسور)) و ((جمك ئازاد)) یان گرت (٧٦). پارێزگاری ئامەد، دوای ئەم گۆڕانکارییە نێگەتیڤانە، بۆی دەرکەوت ناتوانێ شەڕی سەلجوقیەکان بکات و هاوپەیمانی لەگەل ((اشرف موسی)) دا لە گوشاری سەلجوقیەکان رزگاری ناکات، بۆیە بڕیاریدا، لەگەل کەیقوباد دا ئاشت بێتەوە و بچێتە ژێر دەسەڵاتیەوە، نوێنەرێکی بە دیارییەوە نارد و نامەیەکی لەگەڵدا نارد داوای لێبوردنی لێکرد، کەیقوباد قەبوڵی کرد و لێی خۆش بوو (٧٧).

## فراوانبوونەوەی سەلجوقی لە رۆژهەڵاتدا

هەڵوێستی سیاسی شاو میرەکانی ناوچەکە گۆڕا، لەم ماوەیەدا، بەهۆی سەرلەنوێ دەست تێوەردانی ((جلال الدین خوارزەم شا)) لە کاروباری وڵاتی شام. کەیقوباد دەستی کردە دانانی پلانی پێویست بۆ ئەوەی روو بە رووی بوەستێ بەر لەوەی ئەو هەڕەشە لە وڵاتەکەی بکات. لە دوو لاوە کەوتە خۆوە :

یەکەم : خۆ نزیککردنەوە لە ئەیوبیەکان، بەرژەوەندی وای پێویست دەکرد لەگەڵیاندا هاوکاربێ، ((عزالدین بدر)) زیندانی بوو، ئازادی کرد و دیاری پێداو رێزی لێگرت، دواجار هەنگاوێکی دیکەی هاوێشت، ئەمیرەیەکی ئەیوبی خواست، ((شمس الدین التونبی)) بۆ وڵاتی شام نارد، بۆ خوازبێنی کچی ((عادل ئەیوبی))، ((ابن البدر)) توانی کینەو رقی دڵی میرە ئەیوبیەکان بەرامبەر سەلجوقیەکان بڕەوێنێتەوە، بە ئامادە بوونی شاکانی شام و دیاربەکر و وڵاتی ئەرمەن (٧٨). مارەیان بڕی. بەلام ئەم نزیکبوونەوەیە نەچەسپا، ((اشرف موسی)) هەر ترسی فراوانبوونی سەلجوقیەکان لە وڵاتی شام بەتایبەتی ((خەلات)) لە دڵدا بوو.

دووەم : قەلایەکی زۆری کردە پەرژین بۆ پاراستنی ناوچە سنوورییەکان. ئەم پلانە ئەوەی دەویست ((ئەرزەنجان)) بهێنێتە پاڵ خۆی، لەگەل چەندین قەلای دیکەدا (٧٩). ساڵی ٦٢٢ کۆچی / ١٢٢٥ زاینی، دەستی بەجێبەجێ کردنی پلانەکە کرد هەر دوای ئەوەی شا ((منکو کچی فخرالدین بهرام شا))ی خاوەنی ئەرزنجان و هاوپەیمانی سوڵتانەکانی سەلجوقی، کۆچی دوایی کرد. لەپاش خۆی کوڕەکەی ((علاءالدین داود)) لە جێگاکەی دانیشت، کە چەند گۆڕانکارییەکی لە دەزگاکانی

دەسەلآتدا ئەنجامدا، دەستو پێوەندەکانی باوکی دوور خستەوەو، ئەوانەی خۆی نزیك کردەوە، ((منجم باشی)) لەم بارەیەوە دەڵێ : ((هەر چەند زاناو تێگەیشتوو بوو، بەلآم لە بەڕێوەبردندا گەمژە بوو، هاوڕێتی پیاو خراپانی دەکرد، هاوڕێی خراپ هانی دا میرەکانی باوکی دوور بخاتەوە، زیندانی کردن و مۆڵکەکانیان زەوت کرد و هەندێکیانی کوشت )).. ئەوەی ڕزگاری بوو، پەنای بۆ کەیقوباد برد و کێشەکانیان بۆ بەیان کرد. سوڵتان نامەی بۆ نووسی، فەرمانی دا میرە بەندکراوەکان ئازاد بکات و بۆ پایەی خۆیانیان بگەڕێنێتەوە، بەلآم میر منکوکچی، داواکەی سوڵتانی بەجێ نەگەیاند، بە بیانووی ئەوەی سەرپێچیان کردووە و لەگەڵ دوژمنەکانیدا بوونە بەیەك، سوڵتان بڕوای نەهات، هەڕەشەی بەکارهێنانی هێزی لێکرد، ناچار داواکەی کەیقوبادی جێبەجێ کرد. (٨٠). ئەو میرانەی گەڕاندیانەوە، کەیقوباد ناردنی بۆ ئەزربایجان، بۆ چاودێریکردنی بارو دۆخی ئەوێ، داودشا، ئەمەی پێ ناخۆش بوو، بڕیاریدا بچێتە قەیسەری و سەردانی سوڵتان بکات، تالەم بارەیەوە رای خۆی پێ بڵێت و ئەو لەیەك نەگەیشتنەیان چاك بێتەوە، سوڵتان زۆر بەگەرمی پێشوازی لێکرد، وا دەردەکەوێت، ئەم پێشوازیە دڵنیای نەکرد، هەندێك لە میرەکانی سەلجوقیش لە دژی وەستان و سوڵتانیان لە دژی هان دەدا، بۆیە سەردانەکەی و ئەوەی بۆی چووبوو نەهاتە دی (٨١). بۆ ئەوەی بەرامبەر ئەم هەڵوێستە راوەستێ، داودشا هەوڵی دا هاوپەیمانیەك لە دژی سوڵتان پێکەوە بنێ، کە بریتی بوون لە خۆی و شا ((رکن الدین جهان شا)) ی خاوەنی ئەرزنی رۆم، کە کوڕی ئامۆزای کەیقوبادە، ترسی ئەوەی لە بەرخست، سوڵتان ئەگەر ئەرزنجان بگرێت، پەلاماری ئەرزنی رۆمیش دەدات. هەروەها ((جلال الدين خوارزم شا)) کە هەر بەو ماناوە نامەیەکی بۆ نارد، و ((علاء الدين)) میری کۆچەرییەکان و ((اشرف موسى)) کە ئەم کارەی پەسەند کرد، چونکی دەترسا کەیقوباد شاری ((خەلات)) بگرێت ئەگەر ئەرزنجانی رۆم بگرێت. ئەوکاتە دەبێتە جێگای مەترسی بۆ ئەو، هێزێکی بە فەرماندەی ((حسام الدين علی حماد)) نارد (٨٢). وادەردەکەوێت، هاوپەیمانەکان ڕێکنەکەوتن لەگەڵ کەیقوباد دا شەڕ بەرپا بکەن، چونکی هەریەکە رایەکی هەبوو. ئەمەش لە قازانجی

سەلجوقیەکاندا بوو. هێزەکانی ئەیوبی گەڕایەوە، بەڵام کە گەیشتنە ئەرزنجان، کەیقوباد دەستی هەڵگرت لە داگیرکردنی ((ئەرزنی رۆم)). ئەو میرانەی لە دەوڵەتی منکوکچی بوون وسەر بە سەلجوقیەکان بوون رەخنەیان لە سیاسەتی شاکەیان گرت، ناچاریان کرد، کوڕەکانی بنێرێ و داوای لێبوردن لە سوڵتان بکەن. بەر لەوەی ئەمان بگەنە قەیسەری، کەیقوباد لەگەڵ هێزەکەیدا بەنهێنی گەیشتبووە سنووری ئەرزنجان، تا داود پاشا غەفڵەت گیر بکات. ئەمەی دوایی، لەژێر گوشاری رووداوەکاندا ناچار بوو بڕواتە پێشوازی سوڵتان و لە بەردەمیدا داوای لێبوردن بکات. سوڵتان داواکەی قەبوڵکرد، شاری ئاق شەهری پێشکەش کرد، دواجا چووە ناو ئەرزنجان و شارەکەی بەدەستەوە گرت و پێشکەشی ((غیاث الدین کەیخوسرەو))ی کرد (٨٣). ((ابن الاثیر)) دەڵێ : کەیقوباد داوای سەربازی لە داود کرد، تا لە گەڵیا بڕۆن ئەرزنی رۆم ئابلۆقە بدەن، ئەویشی لەگەڵدابێ، وایکرد، لەگەڵ سەربازەکاندا رۆیشت، کە گەیشتە ئەوێ، گرتی و شاری ئەرزنجانی لێ وەرگرت، دواجا ویستی قەڵاکانیش بگرێت، ((کماخ))ی ئابلۆقەدا، قەڵایەکی سەخت بوو، بۆی نەگیرا، هەڕەشەی لە داود شا کرد، ناچار قەڵاکەی بە دەستەوە دا (٨٤). بەمجۆرە، کەیقوباد، ئەرزنجان و کماخ و هەندێ قەڵای بۆ خۆی برد. کە ئەرزنجانی دایە پاڵ موڵکەکانی خۆیەوە، کەیقوباد بەرەو ئەرزنی رۆم کەوتە رێ، تا ئەویش داگیربکات لەگەڵ قەڵای ((قوغونیە))دا. ((رکن الدین جهان شا)) لە ئەنجامەکەی ترسا، بۆیە دەست بەجێ هاتە ژێر دەسەڵاتیەوە و داوای لێبوردنی لێکرد. کەیقوباد لێبوردنەکەی لێ قەبوڵکرد و لە ئەرزنی روم داینا (٨٥). ((ابن الاثیر)) دەڵێ : کەیقوباد هێرشی نەکردە ئەرزنی رۆم، بەڵکو هەر لە ((ئەرزنجان))ەوە گەڕایەوە، چونکی هێزی شام بە فەرماندەی ((حسام الدین علی حماد)) گەیشتە ئەوێ، هەروەها بیزەنتیەکانیش هێرشیان بۆ بەندەری ((سینوب)) کرد بوو (٨٦). بەهەرحاڵ، کەیقوباد ئەوەندی بەس بوو ((رکن الدین)) داوای لێبوردنی لێکرد. لەسەر ئەرزن داینا گەڕایەوە، هێزێکی بەفەرماندەی ((میر مبارزالدین))ی لەوێدا بەجێهێشت تاکو قەڵای ((قوغونیە))ش داگیر بکات. هۆی گەڕانەوەکەشی ئەوەبوو ((ئەندرۆنیکۆس کومنین)) فەرمانڕەوای ترابزون هێرشی

بۆ بەندەری ((سمسون)) و ((سینوب)) برد بوو. سەلجوقیەکان بۆ وەڵامی هێرشەکانی بیزەنتی، بەپەلە کەیقوباد هێزێکی دەریایی نارد هێرشی کردە سەر کەنارەکانی بیزەنتیە، لە ویلایەتی ((هونی)) و ترابزونی ئابڵوقەدا، خەریك بوو بیگرێ بەڵام بارانێکی زۆر باری، ناچار هێزی سەلجوقی ئابڵوقەکە لا بدەن و بکشێنەوە، بەڵام فەرماندەی فەرماندەکانی بیزەنتی بە دیل گرت، سەرەڕای ئەم سەرکەوتنە، ناچار ((ئەندرۆنیکۆس کومنین)) پەیمان لەگەڵ کەیقوباد نوێ بکاتەوە، دوای ئەوەی زانی کەوا سەلجوقیەکان و خوارزەمیەکان جۆرە رێکەوتنێکیان لە نێواندا هەیە. ئیتر رازی بوون ساڵانە ((جزیە)) بدەن و یارمەتی سەربازی لە کاتی پێویست بە سوڵتان بدەن (٨٧) ((مبارزالدین)) توانی قەڵای ((قوغونیە)) بگرێت، فەرمانڕەواکەی پیاوێکی ژیر بوو ((محمد بهرام)) زانی بەرەنگاری کردن سوودێکی نییە، قەڵاکەی بەدەستەوە دا و لەگەڵ هەرسێ کوڕەکەیدا چوونە لای سوڵتان، بەخششی پێداو رێزی لێگرت، لەجیاتی ئەوە هەندێ قەڵای پێ بەخشی لەوانە ((قیرشهر)) (٨٨). بەمجۆرە کەیقوباد توانی پەرژینێك لەسنووری وڵاتەکەیدا دروست بکات لە هەڕەشەی خوارزەمیەکان وڵاتەکەی بپارێزێ.

## زیندووکردنەوەی دەوڵەتی خوارزمی

((جلال الدین خوارزەم شا)) کە لەشەڕی ((سند)) لە بەرامبەر جەنگیزخان لە ساڵی ٦١٨ کۆچی / ١٢٢١ زاینی (٨٩) شکستی هێنا، بۆ هیند رۆیشت، پەنای وەبەر ((شمس الدین ئالتمش سڵتان دلهی)) برد (٩٠). پەنای پێدا، حەزی کرد کچەکەی پێبدا تا پەیوەندیان بەهێزتر بێت (٩١) بەڵام ((جلال الدین)) پەنای بردە پیلانگێڕان، ((ئالتمش)) گومانی لێکرد (٩٢)، هەروەها لەوەش ترسا کاتێ زانی هێزەکانی مەغول بە دوایدا دەگەڕێن. بۆیە هەوڵی دا لە خۆی دوور بخاتەوە، لەگەڵ میرەکانی هیندا رێکەوتن لە وڵات دەری بکەن. ((جلال الدین)) ناچار بوو، لە هیند دەرچێت، بەرەو کرمان رۆیشت پاشماوەی سوپاکەی باوکی لە دەوری کۆبوونەوە، لەگەڵیاندا ساڵی ٦٢٢ کۆچی / ١٢٢٥ زاینی. لە رووباری سند پەڕینەوە و بەرەو هەرێمە نزیکەکانی دەوڵەتەکەی رۆیشتن (٩٣). کرمان هاتە ژێر

## مێژووی سەلجوقیەکان

ئالآیەوە و ئەبابەکیەکانی فارس پێشوازیان لێکرد. لەشەڕێکدا لە نزیکی ((رەی)) (٩٤) بەسەر ((غیاث الدین)) برایدا سەرکەوت. فەرمانڕەواکانی شارەکان و هەرێمەکان، هاتنە پاڵی، ئەمانە هەندێ لەویلایەتەکانی خوراسان و مازندەران و عێراقی عەجەم، سەربەخۆ بوون، لە دوای ئەوەی جەنگیزخان ولآتە ئیسلامیەکانی بەجێ هێڵا (٩٥). ئەو ساڵە تەواو نەبوو بوو، دەستی بەسەر بەرزاییەکانی فارس و ئازەربایجاندا گرت و ((ئەسفەهان))ی کردە پایتەخت ئەگەر سوڵتانی خوارزەمی توانی بێتی بۆ ماوەیەك، دەست بەسەر هەندێ هەرێمی دەوڵەتی خوارزەمیدا بگرێ، چونکی مەغوڵەکان گوێیان پێ نەدا دوای ئەوەی لە هیند گەڕایەوە، بەتایبەتی خۆیان دوور گرت لە کاروباری رۆژئاوای ئاسیا بەگشتی (٩٦). ساڵی ٦٢٤ کۆچی / ١٢٢٧ زاینی، کە جەنگیزخان مرد، مەغولەکان بە کاروباری ناوخۆی خۆیانەوە خەریك بوون، و خۆیان بۆ هەڵبژاردنی سەرکردەیەك ئامادە دەکرد، هەموو، فەرماندەکان و فەرمانڕەوا و میرەکان بۆ ((قەراقورم)) گەڕابوونەوە، تا بەشداری ئەو رووداوە بکەن، ئەمە هەلی بۆ جلال الدین خوارزەمی رەخساند بوو، بۆ ئەوەی بەرەو رۆژئاوا دەسەلآتی فراوان بکاتەوە (٩٧). لە جیاتی ئەوەی ئەم سەرکردە خوارزەمییە لەو کاتەدا پارێزگاری جیهانی ئیسلامی بکات لە مەترسی مەغولەکان، هێرشی کردە سەر خەلیفەی عەباسی ((ناصرلدین اللە)) و بەغدای داگیر کرد (٩٨). دواجار هێرشی بۆ ئازەربایجان کرد و ((تەبریز))ی گرت، و کردیە بنکەی هێرش بردن بۆ سەر ولآتی ((کرج)) (٩٩). کە موڵکەکانی گەیشتنە هاوشانی خاکی ئەیوبیەکان و سەلجوقیەکانی رۆم، روو بە روو بوونەوەیان مسۆگەر بوو، چونکی رۆحی سیاسی نەبوو، ناکۆکی نێوان میرەکانی ئەیوبی لە ولآتی شام و هەرێمی جزیرە و میسر بە هەل زانی، بۆ ئەوەی دەست بەسەر شاری ((خەلآت)) بگرێت، کە دەکەوێتە کەناری گۆلی ((وان))ەوە، و لەموڵکەکانی ((ئەشرەف موسی)) بوو ساڵی ٦٢٣ کۆچی / ١٢٢٦ زاینی، هێرشی کردە سەر شارەکە، بەڵام نەیتوانی دەستی بەسەرا بگرێت، ناچار ئابڵوقەی دابوو هەڵیگرت (١٠٠). جارێکی کە لە ٦٢٦ کۆچی / ١٢٢٩ زاینی ئابڵوقەی دا و بەزۆر گرتی(١٠١).

## پەیوەندی سەلجوقیەکان بە خوارزمیەکانەوە

((جلال الدين خوارزەم شا)) هەرچەند سەری لە سیاسەت دەرنەدەچوو، بەلاّم هەوڵی دەدا، هاوپەیمانیەکی ئیسلامی لە دژی ئەو دروست نەبێ. کە هەستی بە گوشاری ئەیوبیەکان کرد، دوای ئاشتبوونەوەی نێوان هەردوو برا ((عیسی)) و ((اشرف موسی)) (١٠٢)، هەوڵی دا کەیقوباد بهێنێتە لای خۆی، تاکو هەڵوێستی بە هێز بکات و نەهێڵێ بچێتە پاڵ ئەیوبیەکانەوە.. نامەیەکی بە ((قاضی القضاة)) – مجیرالدین عمر خوارزەمی– دا بۆ نارد، داوای دۆستایەتی لێکرد و پەیمانێك ببەستن هەموو هێزە ئیسلامیەکانی تێدا بێت دژی مەغول (١٠٣). لە سەرەتادا کەیقوباد هیچ ناحەزی و رقێکی بەرامبەر ((جلال الدين)) نەبوو، چونکی کارێکی وای نەکردبوو، لەوەی زیاتر هەڕەشەی لە ((ئەرزنی رۆم)) کردبوو، کە فەرمانڕەواکەی ناحەزی بوو، بەلاّم لە تەماحی ئایندەی دەترسا، لەگەڵ ئەوەشدا رازی بوو، بیرو را لەگەڵ یەکتردا بگۆڕنەوە. وەلاّمی نامەکەی بۆ نارد لەگەڵ ((میر شمس الدين لتونبى جاشنكير و كمال الدين كاميار اسحاق)) قازی ئەرزنجان، بەلاّم لەیەك نەگەیشتن بە هۆی جیاوازی بیروبۆچوون لە نێوانیاندا.. کەیقوباد ئامۆژگاری ((جلال الدين))ی کرد کەوا :–

- ئابڵوقەی سەر شاری خەلات هەڵگرێ.
- شەڕ لەگەڵ ئیسلامەکاندا نەکات.
- توانای سەربازی خۆی روو بکاتە ((ئەڕان)).
- پەیمان لەگەڵ مەغولەکان ببەستێ تا دەستدرێژی نەکاتە سەر جیهانی ئیسلام (١٠٤).

## بەشی یانزەهەم
## غیاث الدین کەیخوسرەو کوڕی کەیقوباد
## کەیخوسرەوی دووەم ٦٣٤ – ٦٤٤ کۆچی / ١٢٣٧ - ١٢٤٦ زاینی کەیخوسرەوی دووەم دەسەلآت بەدەستەوە دەگرێت

مردنی کەیقوباد هۆکارێکی کاریگەر بوو لە دواکەوتنی هێزی دەوڵەتی سەلجوقی رۆم. لاوازی جێنشینەکانی، بەتایبەتی کوڕەکەی ((کەیخوسرەوی دووەم)). کە هیچی وای لە سیاسەت نەدەزانی و دوور بوو لە کاری بەڕێوەبردنی دەوڵەت، ئاگای لە فەرمانڕەوایی کردن نەبوو، هەندێ لە وەزیرەکانیشی دەستیان خستبووە کاروباریەوە و هەوڵیان دەدا لە هەندێ لە میرەکانی دووربخەنەوە.. ئەمە بووە یەکەم نوچدانی دەوڵەت و ولآتی خستە ناو ونگەی ناکۆکی ناوخۆوە و تووشی مەترسی دەرەکی کرد. دوای مردنی کەیقوباد لەناو خێزانی سەلجوقیدا دابەشبوونێکی دوو لایەنە روویدا. هەندێ لە میرەکان لەگەڵ ئەوەدا بوون ((غیاث الدین کەیخوسرەو)) ببێتە جێنشینی باوکی، وەکو ((سعدالدین کوپك)) و((ظهیرالدین کرجی)) و ((تاج الدین بروانا)) (١) و ((جاشنگیر)) و نەسرانیە کرێگرتەکان. کەچی هەندێ لە میرەکانی دیکە لایەنگری ئەمە نەبوون، بیانویان ئەوەبوو کەوا کەیقوباد بەر لەمردنی وەسیەتی کردووە ((عزالدین کەیکاوس)) ببێتە جێنشین، کە کوڕی ((شاژن عادلیە)) بوو، میرەکان پشتیان گرت (٢) ئەو تاخمەی لایەنگری ((کەیخوسرەوی دووەم)) بوون، لە رووی سیاسی و سەربازییەوە بەهێزتر بوون و توانیان پاڵێوراوەکەیان بچەسپێنن. بەمجۆرە ((کەیخوسرەوی دووەم)) دەسەلآتی بەدەستەوە گرت (٣). ((کەیخوسرەوی

دووەم)) قسەخۆش بوو، حەزی لە ئاژەڵ دەکرد، مەی دەخواردەوە، حەزی لە گۆرانی و شیعر بوو. دەوڵەتێکی بەهێزو بەربلاوی بەدەستەوە گرت. کە بریتی بوو لە هەموو ئاسیای بچووك بێجگە لە مەملەکەتی ترابزون لەسەر دەریای رەش و ئەرمینیای بچووك لەسەر دەریای ناوەڕاست. بەلام ئەو دوو مەملەکەتە دانیان بە دەسەلاتی سەلجوقیدا نابوو لەسەردەمی ئەمدا، لاوازبوون دەستی پێکرد، بەهۆی ناکۆکی نێوان خۆیان و سەرهەڵدانی یاخیبوون و شۆڕشی ناوخۆ (٤).

## ئەو ئاستەنگیانەی روو بە رووی کەیخوسرەوی دووەم بووەوە لەسەرەتای ژیانی سیاسیدا

کەیخوسرەوی دووەم لە سەرەتای ژیانی سیاسیدا، چەندین کێشەی هاتە پێش کە پێویستی بە کاری جددی و چارەکردن دەکرد. لەوانە : کێبڕکێی ناو مالی ئەیوبیەکان بۆ نزیکبوونەوە لە سەلجوقیەکان و دەستدرێژی و تەماحی مەغولیەکان لە ئاسیای بچووکدا، ململانێی براکانی و یاخیبوونی خوارزەمیەکان و ئەیوبیەکان لەناو خۆیاندا رێکنەکەوتن لە باکووری شام و هەرێمی جزیرە دوای گەڕانەوەی ((کامل محمد)) بۆ میسر لە سالی ٦٣٣ کۆچی / ١٢٣٥ زاینی ئەم شایە، کاروباری رۆژهەلاتی دایە دەستی کوڕەکەیەوە ((نجم الدین ئەیوب)) وا رێکەوت لەم کاتانەدا خاوەنی حەڵەب کۆچی دوایی کرد، ((کامل)) دەستی کردە دەسەلات فراوانکردن لە ولاتی شام، بەلام ((اشرف موسی)) بەرەنگاری لێکرد. ئەم ناکۆکیە ناوخۆییەی ئەیوبیەکان هەر لەناو خێزانی ئەیوبیدا دەمایەوە، ئەگەر هەر لایەکیان هەولی نەدایە پەنا بۆ کەیقوباد ببات بۆ خۆ بەهێزکردن، ((کامل محمد)) نامەیەکی بۆ سولتانی سەلجوقی نارد، ((حافظ زکی الدین عبدالعظیم المنذری)) نامەکەی گەیاند، کە تیایدا داوای هاوپەیمانی تێدا کرابوو لە دژی ((اشرف موسی)) ئەمیش دانیشتوانی ((حەڵەب))ی رازی کرد لەسەر پلانەکەی رازی ببن، داوای یارمەتی لە کەیقوباد کرد دژی تەماح و نیازی ((کامل محمد)) (٥). بەلام وارێکەوت، کەیقوباد بەر لەوەی چاوی بە نوێنەرەکەی ((کامل)) بکەوێت، کۆچی کرد. لەهەمان کاتدا ((اشرف موسی)) و دانیشتوانی حەڵەب

نامەیەکیان بۆ جێنشینەکەی ناردبوو سەرەخۆشی لێ دەکەن و داوایان لێکردبوو ئەو هاوپەیمانیە کۆنەی نێوانیان زیندووبکەنەوە لە نێوانیاندا لە دژی ((کامل محمد)). کەچی ((کامل محمد)) یەکێ لە میرەکانی بۆ قونیە نارد بۆ سەرەخۆشی مردنی کەیقوباد، هەروەها زێڕی ناردبوو بۆ خێری باوکی و لەگەڵ جل و بەرگ و دیاری تردا (٦). وا دەردەکەوێت، کەیخوسرەو، هەردوولایانی پشتگوێ خست، لەبەر مژوڵی کاروباری ناوخۆ بوو و گرنگی بە مەترسی مەغول دابوو، سەرەڕای وەڵامدانەوەی نامەی مەغولەکان، کە ملکەچی خۆی بۆیان دەرخستبوو، بەلاّم ئەو کێشەیە بیری ووروژاندبوو چونکی مەغول تەماحی سیاسی لە ولاّتە ئیسلامیەکان بەتایبەتی و ئاسیای بچووك بەگشتی هەبوو. بەلاّم تا ئەو دەمە تا رادەیەك مەترسی مەغولەکان لەسەر ئاسیای بچووك دوور بوو، بۆیە سوڵتانی سەلجوقی ماوەی ئەوەی هەبوو بۆ چارەکردنی کێشەکانی دیکە بکەوێتە کار. لەراستیدا کەیخوسرەوی دووەم، لەلایەن ((عزالدین کەیکاوس)) و ((رکن الدین قیلج ئەرسەلان)) و ((عادلیە))ی دایکیانەوە گوشاری خرابووە سەر، خۆ رزگارکردن لەوانە پێویست بوو تا خۆی بەتەنها کاروبار بەڕێوە ببات، بۆ ئەمە ((میر سعدالدین کوبك))ی راسپارد. ئەویش ((شاژنی)) خنکاند و هەردوو براکەشی لە ((برغلو)) زیندانی کرد (٧). هەروەها کەیخوسرەوی دووەم روو بە رووی یاخی بوونی خوارزەمیەکان بووەوە کە ((سعدالدین کوبك)) هانی دابوون، ئەم میرە ویستی خۆی لە سوڵتان نزیك بکاتەوە. بەسوڵتانی راگەیاند، سەرکردەی خوارزەمی ((خیرخان)) دان بە دەسەلاّتی تۆدا نانێ، ترسی ئەوەشم هەیە کە ولاّت بەجێ بهێڵێ هەرچی نهێنی ئەم دەوڵەتە هەیە ئاشکرای دەکات. سوڵتان بە قسەی کرد و لە قەلاّی ((زماند)) زیندانی کرد و لەوێ مایەوە تامرد، دەستوپێوەندەکانی ترسان هەمان کاریان لەگەڵدا ئەنجام بدا، لە ولاّت هەلاّتن و دەستیان کردە هێرشکردن بۆ سەر ناوچە سنووریەکان، هەروەها هێرشیان کردە سەر ((سميساط)) و بەرەو ((سویدا)) رۆیشتن، کەیخوسرەو ناچار کەوتە دوایان تا تەمێیان بکات، ((کمال الدین کامیار))ی بۆ ئەو کارە راسپارد، بە سوپایەکەوە دەرچوو تا گەیشتە مەلتیە، ((مبارزالدین ارتقش))ی نارد بۆ قەلاّی ((زیاد)) تا دووریانی بخاتەوە،

بەلأم خوارزەمیەکان، لە فورات پەڕینەوە بۆ جزیرە، لەوێ پیانا گەیشت و ڕێگای لێ بڕین، نامەیەکیان بۆ نارد نارەزایی خۆیان تێدا دەربڕی سەبارەت بە کوشتنی سەرکردەکەیان، وایان بەباش زانی لەوێ نەمێنن و شوێنێکی ئەمینتر بڕۆن. وادیارە ((ارتقش)) رای ئەوانی بەدڵ نەبوو، بۆیە هەوڵیدا ڕێگایان نەدا لەولأت دەرچن. کەوتە شەڕ لەگەڵیاندا، بەلأم سەرکەوتن و بەدیل گرتیان و میر ((شمس الدین بیرم)) یان کوشت و هێرشیان کردە سەر قەلأی ((زیاد و لەوێوە بەرەو ولأتی شام کەوتنە ڕێ و چوونە لای ((نجم الدین ئەیوب)) ئەویش ناردنی بۆ ((جزریە)) و حەڕان و رقە و رەهای پێدان (٨) لە سەردەمی کەیخوسرەودا بەشێوەیەکی ئاشکرا ناکۆکی لەنێوان میرەکاندا دەرکەوت، کارێکی خراپی کردە سەر توانای دەوڵەت. میر ((سعدالدین کوبك)) ئەو هۆی بەرپا بوونی ناکۆکیەکان بوو، تا خۆی لە سوڵتان نزیك بکاتەوە و مەبەستەکانی بەدی بهێنێ، میرەکانی دوور دەخستەوە.. ((کمال الدین کەمیار))ی بەوە تومەتبار کرد کە کەم تەرخەم بووە و نەیتوانی خوارزەمیەکان بهێنێتە ژێر دەسەلأتی سوڵتانەوە، هەروەها ((شمس الدین تونبی)) کوشت و کەس لێی نەپرسیەوە (٩).

((شمس الدین)) زانی کەوا ((کوبك)) چەند مەترسیدارە لەسەر دەوڵەت ئەگەر ئاوا لەسەر پیلانەکانی بەردەوام بێت، لەمبارەیەوە لەگەل ((کمال الدین کامیار)) کەوتە وتو وێژ، تا سنورێك بۆ ئەم هەڵویستە دابنرێ، وا دیارە ئەمەی دوایی وەکو ((صاحب)) دەرکی بەوە نەکرد کە بەرژەوەندی گشتی لەوەدایە ((کوبك)) لەناو ببرێ و قسەکانی بە هاندان لە قەڵەم دا (١٠). ((کوبك)) دەستی کردە پلان دانان بۆ لەناوبردنی ((میرتاج الدین بروانا)) کە پێی زانی وا پیلانی بۆ دەگێڕن، لە پایتەخت دەرچوو و بۆ ئەنقەرە ڕۆیشت، بەلأم ((کوبك)) وازی نەهێنا، تومەنی ((زینا))ی دایە پاڵ، و فەتوای لە قازی شەرع وەرگرت کە دەبێ ((رەجم — بەردباران بکرێت)) سوڵتانیشی قایلکرد حوکمەکەی بەسەرا بسەپێنرێ. ((تاج الدین)) یان بردە مەیدانێکی گشتی لە ئەنقەرە، بەردبارانیان کرد تا مرد، موڵکەکانیشیان دەستبەسەرا گرت (١١).

## ئاژاوەی باکووری ولاتی شام و هەرێمی جزیرە

لە ساڵی ٦٣٥ کۆچی / ١٢٣٧ زاینی، ئەشرەف موسا لە دیمەشق کۆچی دوایی کرد. وەسیەتی کردبوو دوای خۆی براکەی ((شا الصالح عمادالدین اسماعیل)) جێگەی بگرێتەوە. کە ئەمەی دوایی لە دیمەشق دەسەلاتی بە دەستەوە گرت، ئەو هاوپەیمانیە کۆنەکە کە دژی ((کامل محمد)) بوو لەمیسر جارێکی تر پێکهێنایەوە، هەوڵیدا ((المجاهد اسدالدین شێرکۆ)) بهێنێتە ناو هاوپەیمانیەکەوە، سەرەڕای ((مظفرتقی الدین)) فەرمانڕەوای حەما و حەڵەب (١٢). شاکانی ئەیوبی بەدەنگی بانگەوازەکەی ((اسماعیل))ەوە چوون، بەلام ((مظفر و ناصرداود)) رازی نەبوون، بەلام ((کامل محمد)) توانی ئەم بزوتنەوەیە لەناو بەرێت و ((صالح اسماعیل))ی دوورخستەوەو لە دیمەشق دانیشت (١٣). بەلام ((کامل محمد)) لە ٢٠ رەجەب ساڵی ٦٣٥ کۆچی / ٧ ئازار ١٢٣٨ زاینی کۆچی دوایی کرد. نیشانەی سەرهەڵدانی ناکۆکیەکانی ناو ماڵی ئەیوبیانی دیاری دا و مەترسی شەڕی ناوخۆشی لێ دەکرا، چونکی بارودۆخەکە لە دیمەشق ئاڵۆز بوو بوو، دوای ئەوەی ((اسدالدین شێرکۆ)) کەوتە شەڕەوە لەگەڵ ((مظفرتقی الدین)) و هێرشی کردە سەر ((حماە)).

ساڵی ٦٣٦ کۆچی / ١٢٣٨ زاینی ((نجم الدین ایوب))یش دەستی بەسەر دیمەشقدا گرت، کە بووە هۆی بەرپابوونی ناکۆکی لە ((عادل الصغیر))ی برایدا کە جێنشینی باوکی بوو لە میسر (١٤). هەردوو برا ناکۆکەکە، هەریەکەو داوای یارمەتی لە لایەنی کرد ((عادل)) پەنای بۆ ((اسدالدین شێرکۆ)) برد، کەچی ((صالح نجم الدین ایوب)) داوای یارمەتی لە ((مظفرتقی الدین)) کرد، هەر یەکەیشیان هەندێ خوارزەمی پەڕاگەندەی بۆ لای خۆی راکێشا، کە ئەو کاتە لەئاسیای بچووك و ولاتی شام بلاوببوونەوە.. ((ضیفة خاتوون))یش داوای لە کەیخوسرەو کرد یارمەتی بدات، هێزێکی سەربازی بۆ نارد، هێزە هاوپەیمانەکە دەستیان بەسەر ((معرە)) دا گرت و هێرشی بۆ قەلای ((حمص)) برد بەلام بۆیان نەگیرا (١٥). لە ئەنجامی هاوپەیمانی سەلجوقی – ئەیوبی لەگەڵ مەملەکەتی حەڵەب دا هەردوو لا پەیوەندیان باش بووەوە، ژن و ژنخواستنیش کەوتە نێوانیانەوە.. سوڵتانی سەلجوقی ((غازیە خاتون))ی کچی ((العزیز))ی خواست هەروەها((ناصریوسف))

فەرمانڕەوای حەڵەب ((مەلکە خاتوون))ی خوشکی سوڵتانی خواست. ((صاحب کمال الدین))ی مارەیانی بڕی (١٦). خوارزەمیەکانیشی لەو کاتەدا لە دژی ((صالح نجم الدین ایوب)) راپەرین کاتێ ئابلۆقەی ((رحبە))ی دا بوو لەسەر رێنمایی ((کامل محمد))ی باوکی. کە هەواڵی مردنی باوکی پێگەیشت ئابلۆقەکەی هەڵگرت، خوارزەمیەکان لێی یاخی ببوون و ویستیان دەستگیری بکەن، بۆ سنجار هەڵات، خوارزەمیەکان لە هەرێمی جزیرە بڵاوبوونەوە و دەستیان بە تێکدان و ئاژاوە نانەوە کرد و دانیشتوانەکەیان ئازار دەدا، چەندین قەڵاشیان داگیرکرد، لەوانە ((حەڕان)) بوو (١٧) بەوەشەوە نەوەستان، هێرشیان کردە سەر قەڵای ((جعبر)) و ((بالس)) دانیشتوانەکانی بۆ حەڵەب هەڵهاتن، دوای ئەوەی لەگەڵ ((بدرالدین لۆلۆ)) خاوەنی موسڵ، هاوپەیمانیان پێکهێنا، هێرشیان کردە سەر ((حەڵەب)) بۆ ئەوەی پاساو بۆ ئەم کارانەیان بهێننەوە وتیان، بەفەرمانی ((نجم الدین ایوب)) کردومانە. ئەوەی شایانی باسە، لەساڵی ٦٣٨ کۆچی / ١٢٤١ زاینی، ئەو ساڵەیە کە ئەم رووداوانە روویاندا، هاوپەیمانیەکان لەناو ماڵی ئەیوبیەکاندا گۆڕانی بەسەردا هات، بەهۆی دانانی ((صالح نجم الدین ایوب)) لەسەر تەختی میسر لە دوای باوکی، کە حەڵەب و دیمەشق و حمص رازی نەبوون (١٨).

## فراوانبوونەوەی دەسەڵاتی سەلجوقی لە وڵاتی شام و هەرێمی جزیرە

کەیخوسرەو بەرپابوونی ئاژاوەی لە ناوچەکەدا بەهەل زانی، بڕیاریدا لەسەر حیسابی ((صالح نجم الدین ایوب)) دەسەڵاتی فراوان بکاتەوە. بۆ ئەوەی رێگا لە ((نجم الدین)) بگرێ، ((ناصریوسف)) خاوەنی حەڵەب و لەگەڵ ((ناصرالدین ارتقی)) خاوەنی ماردین و ((مجاهد اسدالدین شێرکۆ))ی خاوەنی حمص، کردنی بە هاوپەیمانی خۆی، بە بەخشش و زەویو زار رازی بوون. یەکەمیان ((سروج)) و ((رها)) پێدا، دووەمیان ((سنجار)) و ((نسیبین)) و سێیەمیان ((عانە)) (١٩). ((ئامەد و سمیساط))ی بۆ خۆی دانان (٢٠). هێزە هاوپەیمانەکە هەر یەکەو بەلای ئەو شوێنەی پێی بەخشراوە کەوتنە رێ، هێزەکانی سەلجوقی هێرشیان کردە سەر ((ئامەد)) و ئابلۆقەیان دا، کە ((توران شای کوڕی صالح نجم الدین)) لەوێدا

بوو، توانی بەرگری بکات و هێزەکانی سەلجوقی ناچار بکات بگەڕێنەوە (٢١)، بەڵام کەیخوسرەوی دووەم توانی ((سمیساط)) بگرێت و هێنایە پاڵ موڵکەکانی (٢٢). هاوپەیمانەکانی شام، پێویستیان کەوتە یارمەتی، بەپەلە داوایان لە کەیخوسرەو کرد، ئەویش سێ هەزار سوارەی لە قەڵای زیاد و مەلتیەوە بە فەرمانەی ((ظهیرالدین ترجمان)) نارد (٢٣). هێرشیان کردە سەر هاوپەیمانانی خوارزەمیەکان لە ((راس العین)) بەسەریاندا سەرکەوتن و بڵاوەیان لێکرد. هەندێکیان بەرەو بەغداد هەڵات و هەندێکیانیش پەنایانی بردە بەر ((شهاب الدین غازی)) خاوەنی ((میافارقین)). فەرمانڕەوای ((زندری)) خۆی بەدەستەوە دا و ئاڵای ((ناصریوسف))ی خاوەنی ((حەڵەب)) یان بەرزکردەوە. هێزەکانی سەلجوقیش گەڕانەوە وڵاتی خۆیان، دوای تەواو بوونی کارەکەیان (٢٤). کەیخوسرەو ناردی بەدوای خوارزەمیەکاندا بۆ شام بگەڕێنەوە، داوای پاراستنی ژیانیان کرد، سوڵتان رازی بوو و گەڕانەوە (٢٥). دواجا سەلجوقیەکان ((ئامەد))یان داگیر کرد (٢٦). بە داگیرکردنی ((ئامەد)) لەلایەن سەلجوقیەکانەوە وڵاتەکەیان فراوان بووەوە و کەیخوسرەوی دووەم بووە بەهێزترین سەرکردەی ئاسیای بچووك و هەرێمی جزیرە و دیمەشق بە ناوی ئەوەو خوتبەی تێدا دەخوێنرا (٢٧). وڵات ئارام بووەوە، ناوچەی جزیرە کپ و ئارام بوو، بەڵام ئەمە زۆری نەخایاند، خوارزەمیەکان جارێکی تر گەڕانەوە سەر وێرانکردن و رێگرتن و تاڵانکردن و کارکردن بۆ میرەکانی ئەیوبیەکان. ئەمجارەیان لەگەڵ ((ئەرتەقیەکان))دا لە ماردین و میافارقین، بوونە هاوپەیمانی، بووە هۆی ناکۆکی و ئاژاوە لە ناوچەکەدا، شەڕ لەگەڵ هێزێکی حەڵەب و هاوپەیمانەکان روویدا لە ساڵی ٦٤٠ کۆچی / ١٢٤٢ زاینیدا، حەڵەب، لەم شەڕەدا سەرکەوت و خوارزەمیەکان بڵاوەیان لێکرد. ((توران شا)) هێرشی کردە سەر ((ئەرتەقیەکان)) لە نسیبین و ماردین، بەرلەوەی بۆ حەڵەب بگەڕێتەوە (٢٨). زۆری نەبرد دیسانەوە خوارزەمیەکان خۆیان کۆ کردەوە و هێرشیان کردە سەر ((راس العین))، زۆریان کوشت و تاڵانیان کرد تا ژنەکانیان بردن. هەروەها بۆ ((خابور)) هێرشیان برد، لە وڵاتی ((جزریە)) چیان کردبوو لێرە خراپتر (٢٩). کەیخوسرەو

ئـەمجارە، هێرشـی کـردە سـەر ((ئەرتەقیـەکان)) لـە ((میافـارقین))ەوە، دەسـتی پێکرد. بۆ ئەمە داوای یارمەتی لە حەڵەب و موسڵ کـرد، ((مظفرغـازی)) خـاوەنی میافارقین، چاودێری گۆڕانکاریە سیاسیەکانی دەکرد. خۆی ئامادەکرد و کەڵکی لە هێزەکـانی خوارزەمیـەکان وەرگـرت، سـەنگەری لـە دەوری شـارەکەدا لێـدا و پەرژینێکی دیکەی دروستکرد و مەنجەنیقی دابەسـت (٣٠). هێزەکـانی سـەلجوقی بـەرەو میافـارقین کەوتـە ڕێ، سـوپای حەڵـەبیش هاتنـە ناویـان، کـە گەیـشتنە شارەکە، ئابلۆقەیان دا، لەبن پەرژینەکانیدا جارنـەجارێ شـەڕ دەسـتی پێـدەکرد، کـە شـەڕ بەتـەواوی گـەرم بـوو و دەسـتی پێکـرد، سـەلجوقیەکان سـەرکەوتن ((مظفرغازی)) ئەسیر گیرا، نامەیەکی بۆ سوڵتان نووسـی، داوای پاراسـتنی ژیـانی لێکرد لەبەرامبەر ئـەوەدا دێتـە ژێـر دەسـەڵاتیەوە (٣١). لـەم کاتـەدا لـە بەغـداوە نامەیەك گەیشت هیوا دەخوازێت کەوا کەیخوسرەو شـەڕ ڕاگـرێ بـەهۆی مەترسـی مەغولەکانەوە کەوا لە پایتـەختی عەباسیەکان نزیـك بوونەتـەوە. باران زۆر بـاری بـوو، هێزەکـەی سـەلجوقی ڕێگـای گـیراوە، بۆیـە شـەڕی وەسـتان و لەگـەڵ ((مظفرغازی))دا ئاشت بوونەوە. هێزەکانیشی گەڕانەوە، سەلجوقیەکان بۆ مەلتیە، هێزەکانی حەڵەب بۆ حەڵەب گەڕانەوە (٣٢). بەمجۆرە هەواڵەکانی کەیخوسرەو بۆ چوونە ناو قوڵایی ڕۆژهەڵات سەرنەکەوت. شەڕی ((میافارقین)) دوا هەوڵدانێك بـوو بـۆ ئـەو مەبەسـتە، لـەوەو دوا خـۆری سـەڵتەنەت بـەرەو ئـاوابوون کـشا، بـەهۆی هۆکـاری دەرەکیـەوە، لـە هـەمووی دیـارتر، هێرشـی مـەغول بـوو، لـە هۆکـارە ناوەکیەکانیش دەزگاکانی دەوڵـەت بـەرەو لـێکترازان و داوەشـاندن دەڕۆیـی. ئـەم شەڕە، لاوازی و بێ توانایی سوڵتانی دەرخست، هەرچـەندە خـۆی وانیـشان دەدا کـە بـەهێزە، ئەمـە دیمەشـقیەکانی هانـدا ئـیتر لـە وتـار خوێندنـدا نـاوی نەبـەن و لەجیاتی ئەو ناوی ((صالح نجم الدين ايوب))یان دەهێنا (٣٣).

## گەیشتنی مەغولیەکان بۆ ئاسیای بچووك

ئەو ناکۆکیـەی لـە هـەرێمی جزیـرەدا لـەنێوان شـاو مـیرە ناوخۆییەکانـدا هـەبوو و شـەڕی بـەردەوام و پەرەسـەندنی ناکۆکیـەکان لـە ئـەنجامی ئەمانـەدا تێکـچوونی یەکریزی ناوچەکە کـاری گـەورەیان هـەبوو بـۆ ڕێگـا خۆشـکردن تـاکو مەغولـەکان

هێرش بکەنە سەر ناوچەکە و بچنە ناو ئاسیای بچووك و دەست بەسەر هەندێ جێگای گرنگی تێدا بگرن. بیانکەنە بنکەی هێرشەکانیان و خۆیان بپارێزن بۆ گرتنی ئەو جێگایانەی لە جیهانی ئسلامیدا هێشتا دەستیان بەسەردا نەگرتبوو. بەتایبەتی عێراق و شام و میسر. پێشتر ئەوەمان رونکردەوە، چۆن مەغولەکان گەیشتنە سنووری سەڵتەنەی سەلجوقی لە دوا دوایی دەسەلاتی کەیقوباد دا.

وادیارە بەوەوە رانەوەستان کەوا سەلجوقی رۆم لەو کاتەدا چوونە ژێر دەسەلاتیانەوە، بەلکو ویستیان بەراستی دەست بەسەر ولاتەکەیاندا بگرن، چونکی شوێنەکەیان بۆ فراوانکردنوەی دەسەلاتەکەیان گەلێ گرنگ بوو، مردنی ((خانی گەورە ئوکتای)) لە ساڵی ٦٤٠ کۆچی / ١٢٤٢ زاینی و بەرپابوونی ئاژاوە و سەر هەلدانی کێشەکان (٣٤). بەهۆی مردنیەوە، کاریگەری وای نەبوو. لەماوەی نێوان مردنی ((ئوکتای)) تا هاتنی ((کیوك)) بۆ سەر تەخت. ((توراکیتا خاتون)) ژنی گەورەی خانی کۆچکردوو دەستی بەسەر کاروباری دەولەتی مەغولیدا گرت (٣٥). ئەم گورانە سیاسیە بووە هۆی دامەزراندنی ((بایجو)) بە فەرماندەی هێزەکانی مەغول لە ((موقان)) و ((ئەران)) لە جێگای ((جرماغون)) کەتووش ئیفلیجی بوو، لە کارە گرنگەکانی ئەم سەرکردە نوێیە، ئەو شەرە بوو کە لەگەل سەلجوقیەکاندا بەرپای کرد و خستیانە ژێر دەسەلاتی مەغولەوە (٣٦).

((بایجو)) لەساڵی ٦٤٠ کۆچی / ١٢٤٢ زاینی، هێرشی کردە سەر ((ئەرزنی رۆم)) دوو مانگ ئابلوقەی دا، بەردەوام ئەو ماوەیە بە مەنجەنیق لێی دەدا. ((سنان الدین یاقوت)) فەرماندەی هێزەکانی سەلجوقی بوو، کە لەسەرەتادا سەرکەوتوو نەبوو، لەگەل هێزەکانی مەغولدا کە سی هەزار سەرباز بوون، لە دەروەوەی پەرژینەکان شەڕ لە نێوانیاندا روویدا. بارانیش پلانەکانی مەغولی دواخست و شارەکە نەگیرا تا لە ناوەوە خیانەت کرا، لە چەند کەسێك ئاسانکاریان بۆ مەغولەکان کرد و هاتنە ژوورەوە، بەرامبەر ئەوە ژیانیان بپارێزن. لە کۆلان و شەقامەکاندا شەڕ بەرپابوو، شەڕەکە شەوێکی خایاند، دواجار مەغولەکان بەسەر شارەکەدا سەرکەوتن، کارەسات دەستی پێکرد، شارەکە تالان کرا، دەستدرێژیان دەکرد سەر ژنەکان و پیاوانیان دەکوشت، ((سنان الدین یاقوت)) و کوڕەکەیان بە

دیل گرت، لەبەرچاوی باوکی کوڕەکەیان کوشت و دواجا باوکیانیشی کوشت، دوای وێرانکردنی شار گەڕانەوە موقان (٣٧).

## شەڕی کوسی داغ ـ (( چیای کەچەڵ )) ـ ٦٤١ کۆچی / ١٢٤٣ زایینی

کەیخوسرەو لەگەڵ پیاوانی دەوڵەتدا سەبارەت بەروودانی کارەساتی ئەو شارە کۆبووەوە، جێگای وتنە، یارمەتی ناردبوو، کەگەیشتنە ((ئەرزنجان)) هەواڵی گرتنی شارەکەیان بیستبوو گەڕابوونەوە... ئەو کۆبوونەوەیە، دوو بڕیاریاندا :

یەکەم : بڕیاریان دا نامەیەکی هەرەشە بۆ ((بایجو)) بنێرن : ((بە وێرانکردنی شارێکمان لە خۆبای مەبن و بڵێن بەسەر سوڵتاندا سەرکەوتووین، گەلێ شارمان هەیە، لە ژمارە نایەن، سەربازمان بێ حەد و حیسابە، لە جێگای خۆت بمێنەوە، چاوەڕێی گەیشتنی ئێمە بکە، دێم شمشێرشم بە دەستەوەیە )) (٣٨).

دووەم : بڕیار درا، داوای یارمەتی لە شا و میرەکانی هەرێمی جزیرە و حەڵەب و ئەرمینیای بچووک بکەن (٣٩). کەیخوسرەو نامەیەکی بۆ ((مظفرغازی)) نارد، داوای لێبووردنی لێدەکا، سەبارەت بەوەی لە ((میافارقین)) روویدا و شاری ((خەلات))ی پێشکەش کرد. لەگەڵ ((صاحب شمس الدین ئەسفەهانی))دا پارەو دیاری بۆ حەڵەب و ئەرمینیای بچووک نارد و داوای یارمەتی لێکردن، هۆشیاری پێدان کەوا مەغولەکان کەس نابوێرن (٤٠) هەروەها داوای یارمەتی لە ((رەها))ش کرد.. بەگوێرەی توانا و هێز و لاوازی پەیوەندی ئەو شا و میرانە لەگەل سەلجوقیەکاندا بەدەنگەوە هاتن. دەسەڵاتدارانی ((رەها)) و ((میافارقین)) بەڵێنی ناردنی یارمەتیان دا، بەڵام خەڵەتانیان و هێزی سەربازیان بۆ نەنارد.. شای ئەرمینیای بچووک پابەندی رێنماییەکانی ژێر دەستەیی بوو، نامەیەکی بۆ سوڵتان نارد لەگەل ((قوستەنتین))ی باوکیدا، بەڵێنی دا یارمەتی بنێرێ.. ((ابن بیبیی)) دەڵێ : کاتێ سوپای سەلجوقی لە ((کوسی داغ)) کۆبببووەوە، هەواڵ گەیشت، کەوا ((تکور)) (٤١) بە سێ هەزار سوارەوە گەیشت. هەندێ لە مێژوو نووسان دەڵێن : ئەرمینیای بچووک و میری میافارقین و حمص، کە بەڵێنیان دابوو یارمەتی سوڵتان بدەن بەڵێنەکانیان بەجێ نەهێنا (٤٢). لەراستیدا ئەرمەنیەکان هێزێکی

سەربازیان نارد، بەلاّم لە شەرەکەدا بەشدار نەبوون، چاوەڕێی ئەنجامی شەڕەکە یان کرد، ئەوانە هەلپەرست بوون، لە هاوشانی سەلجوقیەکان شەڕیان نەدەکرد چونکی دوژمنایەتیەکی کۆنیان لە نێواندا هەبوو. ((صاحب شمس الدین اصفهانی)) لە ولاّتی شام دواکەوت، بەمە هێزەکانی سەلجوقی لە یارمەتی پێویست بێ بەش بوون. بەلاّم هێزێکی شام، کە دوو هەزار سەرباز بوون، هاتنە پالّ سوپای سەلجوقیەوە بە فەرماندەی ((ناصح الدین النارسی)) بوو (٤٣). ژمارەی سوپاکەی سەلجوقی هەشتا هەزار کەس بوون، زۆربەیان سەربازی کرێگرتە بوون ـ مرتزقە ـ لەحەلّبیەکان و یونان و ئەفرەنج و میسرییەکان پێکهاتبوون. کەیخوسرەو بە زێڕ پارەی پێدان، کەچی ژمارەی سوپای مەغول چل هەزار بوون، یەکێکیکە دەلّێ، دە هەزار سەرباز بوون. ((هیشوم الارمنی)) سوپای مەغولی بە سی هەزار سوارەی ئازا دەخەملّێنێ (٤٤). ئەو سوپایە کورج و ئەرمەنیشی تیادا بوو، بۆ ئەوەی تۆلّە لە موسلّمانەکان بکەنەوە، بەلاّم ((بایجو)) زۆربەیانی بۆ ولاّتی خۆیانیان گەڕانەوە، بەر لە دەست پێکردنی شەڕەکە تەنها ئەوانەیان مایەوە کە بڕوایان پێدەکردن (٤٥). سولّتان پلانەکەی وابوو، لە سیواس رابوەستێ، تا یارمەتیەکانی پێ دەگات، بەلاّم هەوالّەکان وایان دەگەیاند کەوا ((بایجو)) بەرەو لایان کەوتۆتە رێ، ئەمە وای لە هەندێ لە لاوان کرد، کە شارەزاییان لە کاروباری شەڕدا نەبوو، بەرەو روویان بڕۆن، تا روو بە روو بنەوە و دەسکەوتیان دەستبکەوێ (٤٦). وا دیارە سولّتان دلّگەرمی گەنجەکان بریوی دا، فەرمانی دا بەرەو ((کوسی داغ)) بڕۆن کە دەکەوێتە نێوان ((ئەرزنی رۆم و ئەرزنجان))، لە دەشتاییەکەیدا لە نزیکی ئاو و لەوەڕگایەك مایەوە (٤٧) کاتێ سوپای سەلجوقی لە کۆسی داغ بوو، سولّتان بە هۆی سیخوڕەکانیەوە ئاگادار کرایەوە کەوا ((بایجو)) گەیشتۆتە بیابانی ((ئاق شەهر)) کە لە دەوروبەری ((ئەرزنجان)) دایە، بەرامبەری سوپای سەلجوقی راوەستان، کەمی ژمارەیان ورەیانی کەم نەکرد، ئەوان راهاتبوون شەڕی قورس بکەن. هەر دوو سوپاکە ئامادەی شەڕکردن بوون. لەم کاتەدا ((مظفرالدین)) بە بێ روخسەت لە ناو سوپای سەلجوقیەکانەوە دەرچوو و هێرشی کردە سەر مەغولەکان، میرەکانی دیکە شلّەژان. داوایان لە سولّتان کرد نەهێلّێ و رایگرێ

(٤٨). دواجــا هەنــدێ شــەڕی ســوك لەنێوانیانــدا بــەرپابوو، ((فــارادولا)) کــە فەرمانەیەکی مەغولی بوو لە بەرامبـەر هێزێکـی سـەلجوقیدا شکستی هێنـا، بـەلام ((ئەکبغا فهرام کرجی)) کە فەرماندەی باڵی چەپی سوپای مـەغول بـوو، بەسـەر باڵی راستی سوپای سـەلجوقیدا سـەربکەوێت و زۆری لـە میرەکـانی کوشـت (٤٩). سەلجوقیەکان، شڵەژان و هەڵەیەکی سەربازیان کرد، کـە بەشـێك لـە سـوپاکەیان، ژمارەیان سێ هەزار سەرباز دەبوو بەبێ پـلان لـە جێگاکـانی خۆیـان دەرچـوون و دەربەنـدە سـەختەکانیان بـڕی و بـەرەو مەغولـەکان رۆیـشتن و بـەرەنگاری یـەك بوونەوە، ((بایجو)) لەم لەپڕ دەرچوونەیانە سەرسام بوو، چاوەڕێی کردن تا نزیـك بوونـەوە و گەیـشتنە تەنگەبـەرێك، ئـەوجا مـەغول هێرشـی کـرد، بـەلام هێـزە سەلجوقیەکە بەرەنگاریان بوونەوە، ((بایجو)) ناچار لـە شـەڕەکە کشایەوە بـەلام هێزەکانی رێکخستەوە و گەڕایـەوە و سـەلجوقیەکانی لـەناوبرد. ((فـارادولا)) لـەو شـەڕەدا کـوژرا، دەڵـێن، سـوڵتان خـۆی کوشـتوویەتی دوای شـەڕەکە لـە تۆڵـەی کورجیەکاندا (٥٠). تاریك داهات سەربازەکان گەڕانەوە جێگاکانی خۆیان، وادیـارە کەیخوسرەو پلانێکی سەربازی سەرکەوتووی دانەنابوو، سەربازگەکەی شڵەژا بـوو، ((ناصح الدين الفارسي)) فەرماندەی هێزەکانی شام لەمەیدانی شـەڕەکە کشایەوە و لۆمەی سوڵتانی کرد کە نەیتوانی شەڕەکە بەباشی بەڕێوە ببات. (٥١). سـوڵتان کەزانی، پێشەنگی سوپاکەی شکستی هێنـا، گریـا، خێزانەکـەی و هەرچـی پـارەو زێـڕی هـەبوو بـۆ ((توقـات)) نـارد، زانـی بـەرەنگاریکردنیان بـێ سـوودە، دواجـار کاروباری دایە دەستی ((میر جاولی جاشنگیر))ەوە، خۆی گۆڕی، بۆ ئەوەی کـەس نەیناسـێت، لەگـەڵ سـێ مـیردا بـۆ توقـات هـەلات. ئـەو سـێ مـیرە : ((فخرالـدین ئەرسەلان دغشی)) و ((خاص اوغوز)) و ((ترکری جاشـنگیر)) بـوون (٥٢). دایکـی وای بەباش زانی پـەنا بباتـە بـەر ئەرمەنیـەکان، لەگـەل کـچەکەیدا بـۆ ئـەرمینیای بچووك رۆیشتن (٥٣). هێزەکانی سەلجوقی، بلاوەیان لێکرد و لەمەیدانی شـەڕەکە هـەلاتن، ((بـایجو)) چـووە چـادرەکەی سـوڵتانەوە و تـالانی کـرد، ئـەمجا کەوتنـە دویـان، مەغولـەکان زێـڕو زیـو و ئەسـپ و هێـستر و مـەڕ و مـالاتێکی زۆریـان دەستکەوت، کە سەلجوقیەکان لە دوای خۆیان بـەجێیان هێـشتبوو (٥٤). سـوپای

## مێژووی سەلجوقیەکان

مەغولی، دوای تالآنکردن، بەرەو سیواس رۆیشتن، ((نجم الدين قير شهرلی)) لەوێدا قازی بوو، بەیانی مەغولیەکانی لەلابوو کە کاتێ مەغولەکان خوارزەمیان داگیرکرد، بۆ سەلامەتی ژیانی ئەوەیان پێدا بوو، کە ((بایجو)) لە شارەکە نزیک بووەوە، قازی دەرچوو پێشوازی لێکرد ((بایجو)) ناسیەوەی، کە بەیانەکەی پێدا، ماچی کرد و خستیە سەر سەری، شارەکەی پێ بەخشی، بەمەرجێ دەروازەکانی ئەرزنجان والآبن، تا سوپاکەی بچنە ناویەوە، سەرەڕای ئەوەش بۆ ماوەی سێ رۆژ تالآنی تێدا کرا (٥٥). دوای ئەوە مەغولەکان بەرەو شاری قەیسەری کەوتنە رێ، کە پاشماوەی هێزەکانی سەلجوقی خۆیان تیادا قایم کرد بوو، ئابلۆقەیان دا، و بە مەنجەنیق ئاگر بارانیان کرد، پەرژینەکان زیانی زۆریان لێکەوت، سەرەرای ئەوەش نەیانتوانی بچنە ژوورەوە. وا دیارە هێزەکانی مەغول ماندوو بوو بوون، ((بایجو)) گرتنی شارەکەی بۆ سالی داهاتوو دواخست (٥٦) بەلأم، هەلوێست گۆڕا، یەکێ لە میرەکان بەناوی ((ابن صاحب کوش)) لەگەڵ ((بایجو))دا رێکەوت شارەکەی بەدەستەوە بدات، خالە لاوازەکانی پێڕاگەیاند، مەغولەکان، گەرانەوە دەستیان کردە لێدانی شوێنە لاوازەکانی پەرژینەکە، سەربازەکان، پەیژەیان بۆ سەر پەرژینەکان دامەزراند و هێزێکیان چووە ناو شارەکەوە، دەرگا و دەروازەکان کرانەوە، شارەکەیان تالآن کرد و دواجار سوتاندیان، دیلەکانیان بەرەو بیابانەکان برد، پیاوەکانیان کوشت و ژنەکانیان لە نێوخۆیاندا دابەشکرد (٥٧).

١-کوردستان و کورد
٢-کورد و ستراتیژی دەولەت
٣-مێژووی کوردستان
٤-کۆمەلەی ژ. ك ئاکۆمار
٥-کورد لە بەلگەنامەکان
٦-عەباسیەکان
٧-سەفەوییەکان
٨-مێژووی مەغول
٩-مێژووی ئەوروپا

**مێژووی سەلجوقیەکان**

١٠-دووساڵ لە کوردستان

١١-مێژووی عێراق

١٢-مێژووی هزری سیاسی

١٣-شیکردنەوەی سیاسی

١٤-فەرهەنگی سیاسی

١٥-خواوەند هزری سیاسی

١٦- دەرونزانی گشتی

١٧فەلسەفە بۆ نەوەی بێهەوڵی

١- سەلجوقیەکان

٢- ئەمەوییەکان

٣- فەلسەفەی مێژوو

٤- مێژووی ئەمریکا

٥- عەرەبی پێش ئیسلام

٦- پێغەمبەر (ص) و خولەفای راشیدین

٧- شۆڕشی شێخ عوبەیدوڵلای نەهری و هەمزاغای مەنگوڕ

٨- فەرهەنگی مێژوو

٩- مێژووی مرۆڤایەتی

١٠-مێژووی ئاینی زەردەشت

## ئەنجامی شەڕی کوسی داغ

هۆی شکست هێنان لەشەڕی (کوسی داغ) بووە جێگای لێکۆڵینەوەو وتووێژی وەزیر (صاحب مهذب الدین) کە لە (ئەماسیە) بوو لەگەڵ (قازی فخرالدین)دا، وەزیر دانی بەوەدا نا کە سوڵتانە گەنجە نەزانەکە هۆی شکستی هێزی سەلجوقیەکان بووە، هەوڵی ئەوەیدا کاری لەمە خراپتر روونەدا، وایان دانا، چاکترین چارەسەرکردن، ئەوەیە لەگەڵ مەغولەکاندا ئاشت ببنەوە، (قازی)یش بەم رایە رازی بوو، هەردووکیان، لەگەڵ (بایجو)دا کۆبوونەوە. وەزیر هەوڵیدا لە رێگای پارەوە دڵی نەرم کاو قایلی بکات، لەسەر ئەوە رێکەوتن کەوا پرسی

فـەرمانڕەوای مـەغول دەکـەن (جرمـاغون) کـە لەناوچـەی ئێـران فـەرمانڕەوایی دەکرد[٥٨] وەفدەکەی سەلجوقی لەگەڵ (جرماغون)دا کۆبووەتەوە، بەئامادەبوونی (بایجو) گەیشتنە سەر ئەم راوبۆچوونانە:

١- دەوڵەتی سەلجوقی بمێنێتەوە، لەبەرامبەر ئەمەدا (جزیە)ی ساڵانە بدات.

٢- (جزیە)کەیان بە چوارسەد هەزار دینار دانا، لەگەڵ ژمارەیەك کۆیلـەو ئەسـپدا. لەشـوێنێکی تـر دەڵـێن: هـەموو رۆژێ هـەزار دینـار و ئەسـپێك وکۆیلەیـەکی پیـاو کەنیزەیەك و تانجیەك.

٣- دەوڵەتی سەلجوقی، باڵیۆزو نوێنەرانی مـەغول میوانـداریان بکـات و دیارییـان پـێ بدات.[٥٩]

- شـەڕی کوسـی داغ قورسـترین کارەسـات بـوو لەمێـژووی سـەلجوقیدا، بـەڵکو بەگەورەترین کارەساتی سەلجوقیەکان دەژمێردرێت، ئاماژەی کۆتایی هاتنی رۆڵی سیاسیان بوو لەناوچەکەدا. ئەو مێژووە ٦٤١ی کۆچـی /١٢٤٣ی زایـینی سـەرەتای پرۆسەیەکی درێژخایەن بوو، مەغولییەکان تەنگیان بە سەلجوقیەکان هەڵچنی بـوو و سەلجوقیەکانیش کەوتبوونە لێژی تا دەوڵەتەکەیان لەناوچوو.

-ئاژاوە وڵاتی رۆمی گرتەوە، پیاوانی دەوڵەت هەریەکـەو لەلایـەك بـوون، سـوڵتان گەڕایەوە قونیە (صاحب شمـس الـدین ئەسـفەهانی) لەحەڵـەب بـوو، خـەریکی کـۆ کردنەوەی کرێگرتەبوو -مرتزقە- کە هـەواڵی کارەسـاتەکەی بیـست وازی هێنـا و گەڕایەوە، لەگەڕانەوەیدا بووە میوانی (شا مەسعود) فـەرمانڕەوای ئامـەد. دواجـار پێکەوە چوونە مەلتیە. هـەر کـە گەیـشت لەگـەڵ سـوڵتاندا کۆبـووەوە، بڕیاریانـدا (مهذب الدین) بە وەزیر دابمـەزرێنن و هـەموو دەسـەڵاتێکی پـێ بـدرێت تـا بتوانـێ کاروباری وڵات و خەڵکەکە رێکخبات.[٦٠]

- هەندێ لەمیرەکان ئەم ئاژاوەیان بەهەل زانی، بەپێی بەرژەوەندییەکانی خۆیـان دەستیان بەهەڵسو کەوت کرد.

(صوباشی رشیدالدین) فەرمانڕەوای مەلتیە، هەرچی خەزینەی سوڵتان بوو لەگـەڵ هەندێ میری تردا، دزیان، دوای دابەشکردنی زێڕو زیوەکان گەڕایەوە حەڵەب.[٦١]

– ئەرمەنیەکان، سەرکەوتنی مەغولیان پێ خۆش بوو، لەمەغولەکان خۆیان نزیککردەوە، ئەو دوو ژنە سەلجوقیانەی پەنایان بۆ هێنابوون، دایانیانە دەستی مەغولەکان، ئەمە ناڕەزاییەکی زۆری پەیدا کرد لەناو شاکان و خەڵکەکەدا.[٦٢]
هەوڵیان دەدا لەژێر دەسەڵاتی سەلجوقیەکان دەرچن. ئەرمەنیەکان نامەیان بۆ (بایجو) نارد ڕێزو تاعەتی خۆیان بۆ مەغولەکان نیشاندا، ساڵی ٦٤٢ی کۆچی/ ١٢٤٤ی زایینی بڵاوکراوەیەکیان پێ گەیشت کەوا تابعی خانی گەورەن[٦٣] دواجار هێرشیان کردە سەر سەلجوقیەکان و قەڵای (براکانا) و چەند قەڵایەکی دیکەیان داگیرکرد و ئیتر (باج)یان بەسەلجوقیەکان نەدا.[٦٤]
(صاحب مهذب الدین) هەندێ کارڕایی کرد بۆ کۆتایی هێنان بە ئاژاوەو ناڕامی کە لە وڵاتدا بەرپا بوو بوو، هەروەها ڕێکخستنی کاروباری بەڕێوەبردن، بڕیاریدا بیابانی قەبقاج بکاتەوەو ئەرمەنیەکان تەمێ بکات بەڵام نەیتوانی بجوڵێتەوە بەر لە چەسپاندنی ئەو پەیمانەی کە لەگەڵ مەغولەکاندا بەستبووی لەلایەن (باطوخان)ەوە،[٦٥] بۆیە (شمس الدین)ی نارد بۆ لای (خان) لەگەڵ (بایجو)دا، (باطوخان) پێشوازی لێکرد و پەیمانەکەی دان پێدانا، دوای ئەوەی بەندێکی تازەی خستە سەری کە دەڵێ: هەر کاتێ مەغول پێویستی بە یارمەتیدان دەبێ سەلجوقیەکان ئامادەی بکەن و بینێرن.[٦٦] کە شمس الدین گەڕایەوە بۆ قونیە، وەزیر (صاحب مهذب الدین) مردبوو، سوڵتان بەوەزیر دایمەزراند و شمشێرێکی پێدا مشتکەکەی زێڕ بوو.[٦٧]
- (صاحب شمس الدین) کشانەوەی هێزەکانی مەغولی لەوڵاتی شام بەهەل زانی،[٦٨] بڕیاریدا شەڕی ئەرمەنیەکان بکات، چونکی ئەرمەنیەکان لەناو خۆیاندا دوو بەرەکی کەوتبووە نێوانیان، بەرەو (طرسوس) کەوتەڕێ لەڕێگای (هرقلە)ەوە، گەیشتە شارەکەو ئابلۆقەیدا، هەندێ لەسوپاکەشی بۆ ناو وڵاتی ئەرمەن نارد، بەڵام نەیتوانی (طرسوس) بگرێ لەبەر ئەم هۆیانە:–
– هەندێ لەمیرەکان ئێرەییان بە (صاحب شمس الدین) دەبرد، ئەگەر شارەکەی بگرتایە ناوبانگی دەردەکرد، بۆیە حەزیان نەکرد شارەکە بگیرێ، ئەمە ئەوە دەگەیەنێ ناکۆکی لەنێوان میرەکاندا لە وڵاتی ڕوم هەبوو.

- لەو کاتانەدا بارانێکی زۆر باری، بەجۆرێ سەربازەکان نەیاندەتوانی لە چادرەکانیان دەرچن.
- لەشکرکێشیەکەی (صاحب شمس الدین اصفهانی) لە وڵاتی ئەرمەندا تا ساڵی ٦٤٤ی کۆچی/ ١٢٤٦ی زایینی بەردەوام بوو، دواجار گەڕایەوە پایتەخت، بینی سوڵتان حەوت رۆژە کۆچی دوایی کردووە.[٦٨]

## مردنی کەیخوسرەوی دووەم

ساڵی ٦٤٤ی کۆچی / ١٢٤٦ی زاینی [٦٩] کەیخوسرەوی دووەم کۆچی دوایی کرد، ژیانێکی پڕ لەکارەسات و ناخۆشی بەسەربرد، خووی بە رابواردن و مەیخواردنەوەدا، لەکاروباری دەوڵەت و بەڕێوەبردنی وڵات دوورکەوتبووەوە، مێژوونووسان بەگەنجێکی زاڵم و کەم ئاوەز ناویان بردووە.[٧٠]

قۆناغی فەرمانڕەوایی کەیخوسرەوی دووەم لەنێوان دوو سەردەمدابوو، لەلایەکەوە دەوڵەتی سەلجوقی زۆر بڵاو بووەوەو گەیشتە پۆپەی دەسەڵات، لەلایەکی ترەوە سەرەتای داهێنران و لەناوچوون بوو دوای هێرشەکانی مەغول.

(مەقریزی) دەڵێ: ئیسماعیل وای دانا بوو لەسەر مەنبەری دیمەشق بەناوی کەیخوسرەو شای رۆمەوە وتاری بخوێنێتەوە، وایکرد و پارەو زێڕی پەخشانەوە، رۆژێکی دیار بوو. نوێنەری روم و پیاوانی دەوڵەت ئامادەبوون و لەمزگەوتەکاندا بەناوی ئەوەوە وتار خوێندرایەوە،[٧١] بەو جۆرە دوو ساڵ بەردەوامی هەبوو، تا ساڵی ٦٤٠ی کۆچی/١١٤٢ی زایین ئیتر ناوی سوڵتانی سەلجوقی نەهێنرا، لەجیاتی ئەو بۆ (نجم الدین ایوب)[٧٢] وتار دەخوێنرایەوە. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە دەوڵەتی سەلجوقی گەیشتبووە رادەیەکی زۆر بەهێز. کەیخوسرەوی دووەم، کچی کاهینی بیزەنتی (بردولیای خواست. (عزالدین) لەو ژنەیە، هەروەها کەنیزەیەکی بیزەنتی دیکەی خواست کورە ناوەڕاستەکەی (رکن الدین قلیج ارسلان) لەکەنیزەکەیە. هەروەها ئەمیرەیەکی کورجی (تامار)ی خواست، کچی شاژن (روسودان) بوو، (ابن العبری) دەڵێ: (کاسولیکۆس و ژمارەیەك کەهەنە لەگەڵ ئەمیرە کورجیەکەدا بوون لەگەڵ داودی برا بچووکیان و دواجاریش بووە ئیسلام.

سوڵتان ژنەکە کورجیەکەی زۆر خۆشدەویست، (علاء الدين كەيقوباد) لەو ژنە بوو، کە لەهەموو کوڕەکانی زۆرتر خۆشدەویست.

## پەراوێزەکانی بەشی پانزەهەم

١. بروانا: وشەیەکی فارسیە لەلای سوڵتان پایەو جێگای خۆی هەیە راوێژکاریش دەگرێتەوە، هەر لەسەردەمی (معاویەی کوڕی ئەبو سوفیان)دا ئەم پلەو پایەیە هەیە، دەسەڵاتی وەك دەسەڵاتی وەزیرەکان بوو.
٢. ئیبن بیبي: ص ٢٠٨
٣. هەمان سەرچاوە: ص ٢٠٩
٤. القرماني: ص ٢٩٤
٥. المقريزي: السلوك: ج١، ص٣٧٧
٦. ابن بيبي: ص ٢٠٩
٧. هەمان سەرچاوەی پێشوو: ل٢١٢
٨. ابن العبري: ص٢٨٣
٩. ابن بيبي: ص٢١١-٢٢٢
١٠. هەمان سەرچاوە: ل٢١٢
١١. هەمان سەرچاوە: ل٢١٢-٢١٤
١٢. المقريزي:ج١، ص٣٨٨
١٣. ابن تغري: ج٦، ص٣٠٠
١٤. المقريزي:ج١، ص٣٨٢-٣٨٤
١٥. هەمان سەرچاوە: ل٢٨٤
١٦. هەمان سەرچاوە: ل٣٨٦
١٧. هەمان سەرچاوە: ل٣٨٥، ابن تغرى ج٦، ص٢٩٩
١٨. المقريزي: ج١، ص٤٠٦-٤٠٧
١٩. عانە: شارێکە لەنێوان رقە و هيت. الحموی: ج٤، ص٧٣
٢٠. المقريزي: ج١، ص٣٨٤
٢١. هەمان سەرچاوە

٢٢. ابن بيبي: ص٢١٥
٢٣. ابن بيبي: ص ٢٢٢
٢٤. ابن بيبي: ص ٢٢٣
٢٥. هەمان سەرچاوە: ل ٢٢٠–٢٢١
٢٦. ابن شداد: الاعلاق الخطيرة: ص ٥٢٤
٢٧. المقريزي: ج١، ص٤٠٩–٤١٠
٢٨. ابن كثير: الحافظ، البداية والنهاية في التاريخ، ج٣، ص١٥٧–١٦٧.
٢٩. هەمان سەرچاوە، المقريزى: ج١، ص٤٠٦.
٣٠. ابن بيبي: ص٢٣١–٢٣٢
٣١. ابن بيبي: هقمان سقرضاوة
٣٢. ابن بيبي: ص٢٣٢–٢٣٣.
٣٣. المقريزي: ج١، ص٤١٥
٣٤. الهمزانى: رشيدالدين فضل الله، جامع التواريخ، تاريخ خلفاء جنكيزخان: ص١٢٢.
٣٥. بڕوانە: الجوينى: هەمان سەرچاوە: ص٢٢٢–٢٢٥
٣٦. منجم باشي: ج٢، ص٥٦٨
٣٧. ابن بيبي: ص٢٣٤–٢٣٦
٣٨. Howorth: vol 111, P44
٣٩. cahen: La syrie du Nord: P 695
٤٠. ابن بيبي: ص٢٣٦
٤١. تكور: نازناوی شاری ئەرمینیای بچووکە
٤٢. ابن بيبي: ص ٢٣٦–٢٣٨
٤٣. هەمان سەرچاوە: ص٢٣٨، ابن العبرى: ص٢٨٦
٤٤. Howorth: vol 111, P45
٤٥. ابن بيبي: ص٢٣٧
٤٦. هەمان سەرچاوە: ل٢٣٨
٤٧. هەمان سەرچاوە: ل٢٧٩
٤٨. Howorth: vol 111, P46

٤٩. ابن بيبي: ص٢٣٩-٢٤٠
٥٠. هەمان سەرچاوە: ص٢٤٠
٥١. هەمان سەرچاوە
٥٢. هەمان سەرچاوە: ل٢٤١-٢٤٦
٥٣. ابن بيبي: ص٢٤١
٥٤. ابن بيبي: هەمان سەرضاوة
٥٥. ابن بيبي: ص٢٤١-٢٤٢
٥٦. ابن بيبي: ص٢٤١-٢٤٢
٥٧. لەگێڕانەوەکەی (رشيدالدين) ئەوە دەردەکەوێت، کەوا (جرماغون) فەرماندەی ئێران بووە. جامع التواريخ، تاريخ خلفاو جنگيزخان: ص٤٩-٥٠
٥٨. ابن بيبي: ص٢٤٢-٢٤٣
٥٩. ابن بيبي: ص٢٤٥-٢٤٦
٦٠. ابن العبري: ص٢٨٨
٦١. ابن العبري: ص٢٨٧
٦٢. Howorth: vol 1, P167
٦٣. ابن بيبي: ص٢٤٩-٢٥٠
٦٤. جەنگيزخان، نازناوی (باطو)ی کوڕی دووەمی جوجی خان، ناوی لێنا (صاين خان)، باگو دوای باوکی بەشی رۆژئاوای ئیمپراتۆری مەغولی بەڕێوەبرد. ناوی وڵاتەکەی بە (قبجاقی رۆژئاوا) ناسراو بوو. کە بنکەکەی دەکەوتە سەر رۆخی دەستەچەپی رووباری ڤۆلگا. (سارای) کردە پایتەخت. (باطو) ئەورووپای داگیرکرد و چووە ناو وڵاتی روسیاو پۆڵەنداو مەجەرو دلماشیا..
٦٥. ابن بيبي: ص٢٤٨. العريني: ص١٧٩
٦٦. ابن بيبي: ص٢٤٩
٦٧. وادیارە ئەو هەموو شەڕە، مەغولیەکانی ماندوو کرد، بۆیە کشانەوەی دوای ئەوەی لەشکریان لە ئەنادۆڵ دانا، ئەو وڵاتانەی باکووری گۆلی (وان)یان گرتبوو بەوە وازیان لەو ناوچانە هێنابوو.
٦٨. ابن بيبي: ص٢٤٩-٢٥٠

٦٩. خواند: امیر: حبیب السیر: ج٢ ص٥٤٠
٧٠. سبط ابن الجوزي: ج٨، ص٧٤٢
٧١. السلوك في معرفة دول الملوك: ج١، ص٤١٠
٧٢. تاريخ الزمان: ص٢٨٣–٢٨٤. ابن بيبي: ص٢١٣

# بەشی دوانزەهەم

## قۆناغی فەرمانڕەوایی هاوبەش ٦٤٤-٦٦٤ی کۆچی / ١٢٤٦-١٢٦٥ی زایینی

## ( عزالدین کەیکاوس: کەیکاوسی دووەم )

## ( رکن الدین قلیج ئەرسەلان: قلیج ئەرسەلانی چوارەم )

## ( علاءالدین کەیقوباد: کەیقوبادی دووەم )

## ( ناکۆکی لەسەر دەسەلات لەولاتی رۆم )

## ( فەرمانڕەوایەیی سێ لایەنی: ٦٤٤-٦٥٥ی کۆچی / ١٢٤٦-١٢٥٧ی زایینی )

میرو پیاوە ناودارەکان، ئەوانەی قسەیان لەولاتدا دەڕۆیی لەوانە (صاحب شمس الدین اصفهانی) و (جلال الدین قرطاي) و (اوغوز) و (اسدالدین روزبە) و (فخرالدین ابوبکر بروانا) لەنێو خۆیاندا دەکەوتنە راوێژکردن بۆ هەڵبژاردنی جێنشینێ بۆ کەیخوسرەوی دووەم. بڕیارياندا کوڕە گەورەکەی (عزالدین کەیکاوس) دامەزرێنن لەسەر تەخت، هەردوو براکەشی (رکن الدین قلیج ئەرسەلان) ببێتە دەستەڕاستی و (علاء الدین کەیقوباد) دەستەچەپی.[1] دەگێڕنەوە کەوا کەیخوسرەوی دووەم، بەر لەمردنی وەسیەتی کردبوو، کوڕە بچووکەکەی (علاء الدین کەیقوباد) لەجیاتی خۆی دابنێن، چونکی (کرجی خاتوون)ی زۆر خۆشدەویست و لەقسەی دەرنەدەچوو) ئەو کاتە تەمەنی حەوت ساڵان بوو، بەڵام (صاحب شمس الدین اصفهانی) زۆر لایەنگری ئەوە بوو کوڕە گەورەکەی بکرێتە جێنشینی، چونکی پەیڕەوی نەریتی کۆنی تورکی بەجێدەهێنا، بەڵام نەیتوانی مافی براکانی پشتگوێ بخات، ئاشکرایە دوا بڕیار بۆ دامەزراندنی سوڵتانێکی نوێ لەسەر وڵاتی رۆم بەدەستی مەغولەکان بوو، چونکی ئەوان وڵاتیان داگیرکردبوو و دەسەلاتیان

دەپاراست،[٢] ئەو گێڕانەوانەی لەبەر دەستن ئەوە دەرناخەن کە مەغۆڵ بەدامەزراندنی کەیکاوسی دووەم رازین. بەڵام لەبارەی رەواییەوە بووە سوڵتان و دەسەڵاتی مەغولیش دانیان پێدانا.
وڵات لەو کاتەی کەیکاوس دەسەڵاتی بەدەستەوە گرت، نائارام و پڕ بوو لە کێشە. میرەکان لەناو خۆیاندا لەسەردەسەڵات بەدەستەوەکرتن ناکۆك بوون،هەریەکەو لەلای خۆیەوە هەوڵی دەدا لە مەغۆڵەکان خۆی نزیك بکاتەوە بۆ وەدەستهێتانی دەستکەوتی سیاسی، هۆزە کوچەرییەکان دەستدرێژیان دەکردە سەر شارو دێهاتەکان، مەغوڵەکانیش هەستیان بەمە کردبوو، داوایان لەحکومەتی ناوەندی کرد سنوورێك بۆ دەستدرێژییەکانیان دابنێ.. کەیکاوسی دووەم، توانی یاخیبوونی کۆچەرییەکان کپ بکاتەوە، بەڵام لەلایەکی ترەوە ئەو یاخیبوونانە سەریان هەڵدەدا، مەغۆلیەکان لەمە نارەحەت بوون.. لەشوێنی تردا بۆ ئەم مەسەلەیە دەگەڕێینەوە.. لەساڵی ٦٤٠ی کۆچی/ ١٢٤٢ی زایینی، خان (ئوکتای) لە قەراقروم کۆچی کرد، میرەکانی مەغۆڵ ناکۆکی کەوتە نێوانیانەوە، کێ لەجێگەکەی دابنیشێ. لەم ماوەیەدا ژنەکەی (توراکیتا خاتون) کارو باری بەدەستەوە گرت، لایەنگری کوڕە گەورەکەی بوو (کیوك) بکرێتە جێنشین، چوار ساڵ هەوڵیدا تا دەوروبەرەکەی رازیکرد، ساڵی ٦٤٤ی کۆچی / ١٢٤٦ی زایین چووە سەر تەختی مەغۆڵ.[٣]

لە رۆژهەڵات و رۆژئاواوە، نوێنەر روویان لە قەراقورم کرد بۆ بەشداریکردن لە ئاهەنگی چوونە سەر تەختی (خانی نوێ) و ملکەچی و دیاری پێشکەش بکەن، (کەیکاوس) بۆ ئاهەنگەکە بانگ کرا بوو، بەڵام داوای لێبوردنی کرد لەترسی غەدری ئەرمەنیەکاندا نەڕۆیشت، بیزەنتیەکانیش چاویان لە موڵکەکانی بڕیبوو، (قلیج ئەرسەلان)ی برای نارد، دەسەڵاتی ئەوەشی پێدا لەگەڵ مەغۆلەکاندا گفتوگۆ بکات بۆ تازەکردنەوەی پەیمانی ئاشتبوونەوە. پەیمانی دابوو جارێك کە سەردانیان بکات.[٤] قلیج ئەرسەلانی چوارەم بەسەرکردایەتی وەفدێك کە چەندین میری تێدابوو بەرەو پایتەختی مەغۆڵ رۆیشت. (کیوك)ی رازی کرد کەوا بەسوڵتانی رۆم دایمەزرێنێت لەبەرامبەر پەیمانێکی تازەدا، کەوا سەلجوقیەکان

سالآنە (ملیۆنێك و دووسەد هەزار بیزەنت) جەزیە بدەن لەگەڵ پێنج سەد کراسی ئاوریشمی بەزێڕ نەخشێنراودا، هەروەها پێنج سەد ئەسپ و ژمارەیەك وشتر و پێنج هەزار سەر مەڕیش. لەگەڵ دیاری بەقەدەر هەموو ئەمانە.[٥]

(قلیج ئەرسەلان) گەڕایەوە وڵات دوای سەردانەکەی تا پایە تازەکەی وەرگرێ. (کیوك) هەزار سواریشی لەگەڵدا نارد، وەزیرێکی بۆ خۆی دانا ئەویش (بهاء الدین ترجمان)بوو.[٦] کە گەیشتەجێ نامەیەکی بۆ کەیکاوس نارد، ئاگاداری کردەوە کەوا بە سوڵتانی سەلجوقی رۆم دامەزراوە، داوای لێ دەکات دانی پێدا بنێ. پارچەیەك سکە دۆزراوەتەوە بەناوی سوڵتانی تازەوە بۆ ساڵی ٦٤٦ی کۆچی / ١٢٤٨ی زایینی دەگەڕێتەوە.[٧]

هەندێك لەمیرەکانی سەڵتەنەت، بەرەنگاری کەیکاوس بوون چونکی بەتەنها فەرمانڕەوایی دەکرد کە (جلال الدین قرطاي) لەسەرووی هەموویانەوە بوو، لەگەڵ (بگلەربەگ یوطاشی)دا رێکەوتن کەوا سێ برا پێکەوە دەسەڵات بکەن و توانی زۆربەی میرەکان بەمە رازی بکات بۆیە بڕیار درا:

- هەر سێ براکە بە سوڵتان دابمەزرێن و لەسەر یەك تەخت دابنیشن.
- سکەی پارەو وتار خوێندن بەناوی هەرسێکیانەوە بێت.[٨]
- هێزە مەغۆلیەکە کە لەگەڵ کەیکاوس دا هاتبوون بگەڕێنەوە وڵاتی خۆیان.[٩]

ئەم چارەسەرکردنە، ئەو میرانەی لایەنگری قلیج ئەرسەلان بوون بەمە رازی نەبوون، بەتایبەتی (میر طرنطاي) کە دەیویست خۆی بەتەنها دەسەڵات بەدەستەوە بگرێت، دەستی کردە کێشەو ئاژاوە نانەوە، تا گەیشتە شەڕ لەنێوان هێزەکانی قلیج ئەرسەلانی چوارەم و هێزەکانی (کەیکاوسی دووەمی) برای. بەڵام قازی (ختنی) میری تەویلە هاتە ناوەوەو بارودۆخەکەی کپ کردەوە. هەردوو براکەی ئاشت کردەوەو بڕیاری لەیادکردنی رابوردویانداو لاپەڕەیەکی نوێیان هەڵدایەوە. ئەو میرانەش بوو بوونە هۆی ئاڵۆزییەکان، بەندکران و هەموویان بەرەو قونیە رۆیشتن.[١٠]

بەهۆی توانای وەزیر (شمس الدین الجوینی اصفهانی) حکومەتە هاوبەشەکە لەنێوان ساڵی ٦٤٧-٦٥٥ی کۆچی /١٢٤٩-١٢٥٧ی زایینی بەردەوام بوو، لەم

ماوەیەدا ناوی هەرسێ براکە لەسەر سکەی پارە لێدراو وتاریش بەناویانەوە دەخوێندرایەوە، تەنها سالی ٦٥٣ی کۆچی / ١٢٥٤ی زایینی نەبێت قلیج ئەرسەلانی چوارەم بەتەنها ناوی خۆی لە قەیسەری دانا، چونکی ئەو کاتە خۆی بەتاکە سولتان دانرا لەلایەن (شمس الدین)ەوە.[١٠]

ئەو سالانەی بەهاویەشی دەسەلات بەرێوە دەچوو، پڕ بوو لەپیلان، میرەکان بەگوێرەی بەرژەوەندییەکانیان دەجولانەوە. لەم ماوەیەدا بوو ئیمپراتۆری بیزەنتی (میخائیلی هەشتەم بالیولوغوس) پەنای بردە بەر کەیکاوسی دووەم، لەدەستی (تیودۆر لاسکاریس) ئیمپراتۆری نیقیە هەلاتبوو. سولتان پێشوازی لێکرد و بەفەرماندەی گشتی سەربازە نەسرانیە بەکرێگرتەکان دامەزرا، ئەمەش لەلایەن چەند میرێکەوە بووە جێگای نارازی بوون و بە نەریتێکی نەگونجاوی سولتانەکانی سەلجوقیان دانا، دواجار دەستێوەردانی خالۆکانی سولتان کە نەسرانی بوون، لەکاروباری سەلتەنەتەکە زیاتر رقیان هەلساند، وایان دانا کە چووەتە سەر دینی دایکی، گومانیان لەبیرو باوەڕی پەیداکردن و وا بلاوبووەوە کەوا ئیمپراتۆری بیزەنتی میخائیلی هەشتەم سەر بە سەلجوقیەکانە.[١١]

سالی ٦٤٩ی کۆچی /١٢٥١ی زایینی (منکوخان) بووە خاقانی مەغۆل، لەهەموو لایەکەوە چوونە پیرۆزبایی کردنی (کەیکاوسی دووەم)یش بانگ کرا، هەرەشەیان لێدا گەر نەیەت، بەلام سولتان زۆر حەزی نەدەکرد بڕوات، نەکو قلیج ئەرسەلانی چوارەم، دەسەلات بەتەنها بەدەستەوە بگرێت.لەلایەکی دیکەشەوە، هەمیشە دەیویست خۆی لەمەغۆل بەدوور بگرێت.[١٢] بەلام کەیکاوس تەماشای کرد دەیەوێ بڕوات چونکی میرەکانیش لەهەڕەشەی مەغۆلەکان دەترسان، بەرەو قەیسەری رۆیشت لەگەل قلیج ئەرسەلانی چوارەم و کەیقوبادی دووەمدا، بۆ ئەوەی لەسەر سەفەرەکە، رێکبکەون، کە گەیشتنە شارەکە کەوتنە رابواردن، بەهاندانی (میر سیف الدین ترکری) میرەکان ویستیان لایبدەن لەسەر دەسەلات، ترسا، بەرەو سیواس رۆیی و دواجار گەڕایەوە قونیە و نەڕۆیی بۆ قەراقورم، لەم کاتانەدا (میر قرطای) کۆچی دوایی کرد ترسی لێ نیشت، چونکی مردنی ئەم میرە، تای تەرازووی فەرمانڕەوایی لاسەنگ دەکات، ئەم مردنە (قرطای) بەهەل

زانی و نەڕۆیی و گەڕایەوە قەیسەری. لەگەڵ براکانیدا کەوتە راوێژکردن، لە گەڵ نامەیەکی لێبوردندا و بەڵێنیدا کەیکاوسی دووەم لە فرسەتێکدا سەردانیان بکات.[١٣] وەفدەکەی قەراقورم سەرەرای سوڵتان کەیقوبادی دووەم پێکهاتبوو لە (سیف الدین طرنطاي) و (شجاع الدین عبدالرحمن) و (مصلح لالا) و (نورالدین عبدالله فیاض) ساڵی ٦٥٣ی کۆچیی/ ١٢٥٥ی زایینی) لەگەڵ دیاری و نامەی لێبوردندا لەرێگای دەریای رەشەوە بەوڵاتی هۆزە زێڕینەکاندا رۆیشتن.[١٤]

کێبڕکێ لەمەیدانی سیاسیدا بەردەوام بوو دوای ئەوەی وەفدەکە لەقەیسەرییەوە بەرو قەراقورم کەوتنەرێ. کەیقوباد نیازی ئەوەبوو بەتەنها دەسەڵات بەدەستەوە بگرێت، ئەندامانی وەفدەکە هانیان و لەگەڵ (باطوخان)دا کە بەوڵاتەکەیدا تێدەپەڕن لەمبارەیەوە وتووێژ بکەن و لەلای خان پشتی بگرێ و ئەمە بە (خاقان) راگەیەنێ.[١٥] قلیج ئەرسەلانی چوارەم لەوە ترسا، ئەندامانی وەفدەکە بارودۆخی وڵات لەبینینی کەیکاوسەوە بۆ خاقان باس بکەن، بۆیە بریاریدا هەندێکیان بگۆڕێ، کەسانێکی هێنا بڕوای پێدەکردن، بەفێڵ (میر شمس الدین وسیف الدین چالیش)ی هێنایە ناو وەفدەکەوە.[١٦] (ابن بیبی) دەڵێ: دایکی کەیقوبادی دووەم و ئەمیر (رشید امیر عارض)یشي هێنایە ناو وەفدەکەوە.[١٧] کەیکاوس بۆ دڵنیایی سیخوڕێکی نارد لەگەڵ یەکێکی دیکەدا بەناوی (مصلح الخادم لالا) تا تیرۆری بکات.[١٨]

بەهەر حاڵ وەفدێك ئەندامەکانی سەر بەسێ هێزبن، ناتوانن لەنێو خۆیاندا رێك بکەون. لەناوسەفەرەکەیاندا، راو بۆچوونیان جیاوا بوو، هەر یەکێکیشیان کێشەی خۆی هەبوو کە نیازی بوو بەمەغوڵەکانی راگەیەنێ. وەکو (صاحب الطغرائي) کە لە (بایجو) وە نزیك بوو، لەسەرەك وەزیری لایان بردبوو و دەیویست بیگەڕێننەوە.[١٩] بەڵام جیاوازییەکانی نێوانیان دوای مردنی کتوپڕی کەیقوبادی دووەم کەم بووەوە.

قسەو رای جیاواز هەیە لەبارەی هۆی مردنەکەیەوە. ابن بیبی دەڵێ: میرەکان هۆی مردنەکەیان نەزانی، کە (خاقان منکو) داوای لێکۆڵینەوەی کرد لەمبارەیەوە کەس بەرپرسیار نەبوو.[٢٠] (اقسرانی) هەردوو براکە تاوانبار دەکات لە کوشتنی

براکەیان (قلیج ئەرسەلانی چوارەم و کەیکاوسی دووەم) کەچی (ابن العبری) هـۆی مردنەکەی بە غەدری ئەو میرانە دادەنێ کە لەگەڵیا بوون.[٢١] ئاشـکرایە، میرەکـان بـەپێی ڕێنماییـەکانی سـوڵتان هەڵسوکەوت دەکـەن، (مـصلح الخـادم) مردنەکـەی ئاشکرا کردبوو کاتێ چووەتە ناو چادرەکەیەوە.[٢٢]

بەهـەرحاڵ، سـەردەمی فـەرمانڕەوایی سـێ قـۆڵی هاوبـەش بـەمردنی کـەیقوبادی دووەم کۆتایی پێهات لەساڵی ٦٥٥ی کۆچی/١٢٥٧ی زایینیدا.

## ( فەرمانڕەوایی دوو قۆڵی ٦٥٥-٦٦٤ی کۆچی/ ١٢٥٧-١٢٦٥ی زایینی )

## ( عزالدین کەیکاوس رکن الدین قلیج ئەرسەلان )

دوای مردنـی کـەیقوبادی دووەم، کەیکاوسـی دووەم و قـلیج ئەرسـەلانی چـوارەم. وڵاتـی ڕۆمیـان بەدەسـتەوە گـرت، هەنـدێ جـار، یەکەیەکـەو هەنـدێ جـاریش بەهاوبەشی فـەرمانڕەواییان دەکـرد، ئەمـەش بـەپێی گـۆڕانی بـارودۆخی سیاسـی ناوەکی و دەرەکی وڵات.

کـارێکی سروشـتی بـوو، لەسـایەی کەشـو هـەوای نـاکۆکی نـاو خێزانـەوە سـاردی بکەوێتە نێوان براکانـەوە. میرەکـان ناکۆکییـان گـەرم دەکـرد، (ابـن العـبری) ئـەو سـاردیەی نێوانیـان بـۆ ئـەوە دەگەڕێنێتـەوە کـەوا کەیکاوسـی دووەم هـەوڵی لەناوبردن و لادانـی قـلیج ئەرسـەلانی چـوارەمی دەدا، تـاخۆی بەتـەنها دەسـەڵات بەدەستەوە بگرێ.[٢٣] کە قلیج ئەرسەلان لەو پیلانە ئاگادار بـووەوە بەجلوبـەرگی ئاشچیبەوە لەگەڵ دەستو پێوەندەکانیدا لـە قونیـەوە بـۆ قەیسـەری چـوو، لـەوێ لەگەڵ هەوادارانیدا کۆببوەوە، بەتایبـەتی لەگـەڵ (صمـصام)دا: کـە فـەرمانڕەوای قەیسەری بـوو، هـەروەها (نـصرالدین کـوڕی سـنان الـدین) فـەرمانڕەوای (دوالـو)، میرەکانیشی لەخۆی کۆکردەوە وەکو (فلك الدین خلیـل) فـەرمانڕەوای (بـستان) و (حسام الدین بیجار).[٢٤]

کەیکاوسی دووەم هـەڵاتنی براکـەی پێنـاخۆش بـوو، هەوڵیـدا بیگەڕێنێتـەوە (مـیر یوگاش)ی ڕاسپارد ئەو کارە ئەنجام بدات، وادیارە میر لەو هەوڵەیدا سـەرنەکەوت، بەڵکو قلیج ئەرسەلان لەئەشکەوتی (ئەکسود) زیندانی کرد. بەری نەدا تا پـەیمانی

لێ وەرگرت لەگەڵیا بێ.[٢٥] کەیکاوسی دووەم بەندکردنی (یوطاشي) زۆر لاگران بوو و لەوەش تورە بوو کە چوّتە پاڵ قلیج ئەرسەلان، بڕیاریدا بکەوێتە شەڕ لەگەڵ براکەیدا، سوپایەکی ئامادەکرد لەپڕ لەبراکەیەوە نامەیەکی پێگەیشت، داوای ئاشتبوونەوەو ڕێکەوتن دەکات، کەیکاوسی دووەم رازی بوو، بەلام بەمەرجێ ولاتی رۆم لەنێوان هەردووکیاندا دابەش بکەن، سیواس و دەلتیە و قەلای زیاد و ئامەد.[٢٦] بۆ قلیج ئەرسەلانی دووەم.

دواجار لەشاری قونیە بەسوپایەکەوە ڕوویکردە (تۆزئاغاج) بۆ روو بەڕووبوونەوە، نامەیەکی بۆ نارد، پێی راگەیاند، بە ئاشتبوونەوە رازییە بەلام بەو مەرجەی ئەو دایناوە. وتو وێژ کەوتە نێوانیان، لەدواییدا لەسەر ئەوە رازی بوون قەیسەری و قیرشهر بخاتە پاڵ ئەو شارانەی دی. لەراستیدا ئەم ڕێکەوتنەی نێوان دوو براکە، راگیرا، چونکی لەهەردوولا سەرکردەو فەرماندەی سوپاکانیان لەسەر جۆری ڕێکەوتنەکە نەسازیان، لەو شەڕەیاندا هێزەکانی (کەیکاوسی دووەم) سەرکەوتنی وەدەست هێنا. قلیج ئەرسەلان هەلات بۆ ئەرمینیای بچووك، بەلام هێزەکانی براکەی دەستگیریان کرد و بۆ قەیسەری گەڕانیانەوە، براکەی پێشوازی لێکرد و لێی خۆشبوو. ڕێگایدا لە (برغلو) دابنیشێ.[٢٧]

کەیکاوسی دووەم، دوای ئەم ڕووداوانە، بەتەنها فەرمانڕەوایی دەکرد. هەندێ گۆڕانی لەپلەو پایەکانی حکومەتدا کرد، ئەوانەی دامەزراند لایەنگری خۆیان دەکرد، دەست وپێوەندی براکەی دوورخستەوە. (عزالدین الرازي) کردە وەزیر وپلەی (بەگلەربەگی)دایە و (یوطاش) (ئەرسەلان دغمش)ی کردە (ئەبابەگ) و (نجیب الدین) ی بۆ باج وەرگرتن دانا.[٢٨] (اشهر عبدالحمید)ی کردە سەرپەرشتیکاری (مەمالیك).[٢٩] و (معین الدین سلیمان بروانا)ی کردە پایەی تەشریفات،[٣٠] (نظام الدین خورشید بروانا)ی کردە پیاو ماقوڵی میللەت.[٣١]

لەم کاتانەدا، مەغۆلەکان گوشاریان لەسەر کەیکاوسی دووەم توندتر کردەوە، پیاوانی (بایجو) بۆ ولاتی رۆم دەهاتن، داوای پارەو زەخیرەیان دەکرد. میرەکان لەمە بێزار بوون، لەگەڵ سولتاندا لەمبارەوە دوان، بڕیارياندا وەفدێك بۆ (تەبرێز) بنێرن و چاویان بە (ئیلخان هولاکو) بکەوێ. ئەوەی شایانی باسە (منکو) برا

بچووکەکەی بۆ بەڕێوەبردنی ئێران دانا بوو کە (هۆلاکۆ)بوو. ئەم پیاوە بەهۆی ئەو پلە تازەیەی، بەرپرسیار بوو لە بەڕێوەبردنی دەوڵەتی سەلجوقی ڕۆم.[٣٢]

وەفدەکەی سەلجوقی بەسەرۆکایەتی (فخرالدین امین داد) بوو. کە لەگەڵ هۆلاکۆدا کۆبووەوە ئەو کارەی خستە بەرچاوی، بەڵێنیدا باری سەر شانی سەڵتەنەت سووك بکاتەوە، لەکاتی گەڕانەوەیدا وەفدەکە (بایجو)ی بینی، بڕیارەکەی هۆلاکۆ یان پێ ڕاگەیاند، بەنارەزایی قەبوڵی کرد، ئاوڕی بەلای (صاحب) دایەوە وتی (لەکۆتاییدا دەبێ هەر بچمە ناو مەملەکەتی ڕۆمەوە، ئەم مەنع کردنەم دەبێتە بەلا بۆ ئێوە).[٣٣]

(بایجو) هەرەشەکانی لەهاوینی ساڵی ٦٥٤ی کۆچی/١٢٥٦ی زایینیدا جێبەجێ کرد، وڵاتی ڕۆمی داگیرکرد، سوڵتان ناچار بوو لە (قلعندە) نەمێنێ و بگەڕێتەوە بۆ قونیە، بۆ ڕاوێژکردن لەگەڵ پیاوانی دەوڵەتدا، بڕیاریاندا، وەفدێك پێکبهێنن بەسەرۆکایەتی (نظام الدین خورشید بروانا) تا لەگەڵیا کۆببێتەوە.

(بایجو) داوای لە کاربەدەستانی سەلجوقی کرد، جێگایەکی بۆ دەستنیشان بکەن تا ئەم زستانەی تیادا بباتەسەر، چونکی هۆلاکۆ لەشوێنەکەی ئەو لە (موقان) دەمێنێتەوە.[٣٤] سوڵتان لەگەڵ میرەکانیدا لەبارەی ئەم داوایە کەوتنە گفتوگۆ، هەندێکیان نارازی بوون، هەندێکیشیان رازی بوون، (عزالدین الرازی) لەگەڵ دەستەی نارازی بواندا بوو، ئەندامانی ئەم دەستەیە لەمەیدانی سیاسیەوە بەهێزتر بوون، رای خۆیان بەسەر سوڵتاندا سەپاند و خۆیان بۆ ڕوو بەڕوو بوونەوەی مسۆگەر لەگەڵ (بایجو)دا ئامادەکرد،[٣٥] ئاشکرایە ئەندامانی ئەو دەستەیە، شارەزاییان لەبواری سیاسەتدا نەبوو، چونکی ئەم بڕیارە، وڵاتی خستە ناو کێشەوە، وڵاتیش بەبەراورد لەگەڵ هێزو توانای (بایجو) لاواز و بێ هێز بوو لەو شەڕەی کە لەنێوان سوپای سەلجوقی و مەغوڵدا ڕوویدا، لەبیابانی (رباط العلائي) لە نزیکی ئەو شوێنەی سوڵتان لەوێ بوو، کە دەکەوێتە نێوان قونیەو ئاق سەراوە، سوپای سەلجوقی شکا، (وەزیر رازی) کوژرا لەگەڵ (میر یوگاش)دا، کەیکاوسی دووەم لەگەڵ ژنەکانی و دەستو پێوەندەکانیدا هەڵاتن، بەرەو سنووری نیقیە ڕۆیشتن، قونیەی پایتەخی لەژێر ڕەحمەتی مەغوڵەکاندا بەجێ هێشت،

ئاژاوەو ئاثارامی کەوتە ناو پایتەخت (میر نظام الدین علي)[٣٦] ئەرکی پاراستن و ئاسایشی شارەکەی خستە ئەستۆی خۆی، (میر ئەرسەلان دوغمش) بۆ (برغلو) رۆیشت، تا لە قەڵاکەیدا خۆی قایم بکات.[٣٧] میرە بەرهەڵستکارەکان ئەم هەڵسوکەوتە سەرە رۆیانەی سوڵتانیان سەرکۆنەکرد، کە وڵاتی بەم دەردە برد، داواکەی (بایجو)یان قەبوڵکرد و وەرزی زستانی لە ویلایەتی (ئاق سەرا) گوزەراند، کە دەکەوێتە دەوروبەری دەسەڵاتی قلیج ئەرسەلان.[٣٨]

وڵات بێ سوڵتان مایەوە، دوای ئەوەی کەیکاوسی دووەم هەڵهات، هەردووك (میر خورشید بروانا) و (محی الدین سلیمان بروا) (قلیج ئەرسەلانی چوارەمیان) هێناو، لەسەر تەختی سولتانی سەلجوقی رۆمیان دانا، بێگومان دوای رازی بوونی (بایجو).. لە ٦٥٥ی کۆچی/ ١٢٥٧ی زایینی بووە سوڵتانی سەلجوقی.[٣٩] سوڵتانی هەڵاتووـ چوە نیقیە و داوای پارمەتی لە (تیودۆر لاسکاریس) کرد، هەروەها نامەیەکیشی بۆ هۆلاکۆ نارد باسی ئەو کارەی (بایجو)ی بۆ کرد. هۆلاکۆ وەڵامی دایەوە پێشنیار دەکات، وڵاتی رۆم لەنێوان دوو براکەدا دابەش بکەن.[٤٠]

(بایجو) ماوەیەك لەمیوانی قلیج ئەرسەلان لە (قزل وێران) مایەوە. دواجار گەڕایەوە جێگاکەی خۆی لە (موقان)، سوڵتانی ناچار کرد کەوا، هەندێ لەپەرژینەکانی قونیە، بروخێنێ تەنها پەرژینی قەڵاکە بهێڵێتەوە چونکی لەدەوری مەزاری سوڵتانەکاندایە.[٤١]

کە کەیکاوس دڵنیا بوو، لە دەرچوونی مەغوڵەکان لەوڵاتی رۆم، ئەوجار گەڕایەوە قەیسەری، براکەی پێشوازی لێکرد، کەوتە گفتوگۆ سەبارەت بە دابەشکردنی دەسەڵات بەپێی پێشنیارەکەی هۆلاکۆ. بەڵام قلیج ئەرسەلانی چوارەم، سوور بوو لەسەر ئەوەی بەتەنها وڵات بەرێوە ببات، داوای لە (بایجو) کرد، هەوڵی بۆ بدات، تا چاوی بە هۆلاکۆ بکەوێت، قلیج ئەرسەلان، لەگەڵ هۆلاکۆدا کۆبووەوەو توانی رازی بکات و بەسوڵتانی هەموو وڵاتی رۆم دایمەزرێنێ، بەڵام کەیکاوسی دووەم چووە (قونیە) و لەسەر تەخت دانیشێت.[٤٢]

کەیکاوسی دووەم سیاسەتی دژ بەمەغوڵ پەیرەو دەکرد، تاخۆی بەهێز بکات، بڕیاریدا سوپایەکی بەهێز لەکرێگرتەکان –مرتزقە– پێکەوە بنێت. (توغرول بلابا)

کەیەکێ بوو لەدەستو پێوەندەکانی بۆ (مەلتیە)ی نارد، تا سوپایەکی کرێگرتە لەکورد و تورکمان پێکەوە بنێت، بەلام لەو ئەرکەیدا سەرنەکەوت، چونکی مەغوڵەکان لەو هەوڵەی ئاگادار بوونەوە. لەلایەکی ترەوە، دانیشتوانی (مەلتیە) بەرەنگاری میری کورد (احمد کوری بلاس)یان کرد، کە لەبەرامبەر یارمەتیدانی بە فەرمانڕەوای شارەکەی دامەزراندبوو.(٤٣) کە سوڵتان هەواڵی ئەو رووداوانەی پێگەیشت، (علی بهادر)ی فەرماندەی سوپاکەی بۆ مەلتیە نارد تا بارودۆخەکە ئارام بکاتەوە. لەترسی زەبر و زەنگ و توندی ئەو فەرماندەیە دانیشتوانەکە پێشوازیان لێکرد.(٤٤)

مەغوڵەکان ویستیان، سوڵتان قلیج ئەرسەلان بگەڕێننەوە بۆ سەر دەسەلات، چونکی سەر بەمەغوڵەکان بوو، سوپایەکیان نارد بۆ جێبەجێکردنی ئەو کارە. (نیکسار)یان گرت و (محی الدین سلیمان بروانا)یان کردە فەرمانڕەوای شارەکە.(٤٥) هەروەها (توقات) ئابلۆقە درا و چوونە ناو (بستان)ەوەو قەلاکانی ئەو دەوروبەرەشیان هەموو گرت. (بایجو) دەستی کرد بە کوشتن و تالانکردن، ژن و منداڵەکانیشی بەدیل گرت. (بایجۆ) دەستی لەکوشتار و تالانی ولاتی رۆم هەڵنەگرت، تاکو هولاکۆ ناردی بەدوایا تا پێکەوە هێرش بکەنە سەر بەغدا.(٤٦)

ساڵی ٦٥٦ی کۆچی/ ١٢٥٨ی زایینی دوای ئەوەی بەغدایان گرت، هولاکۆ، داوای لەهەردوو براکە کرد، (کەیکاوسی دووەم و قلیج ئەرسەلانی چوارەم) بێن و بچنە ژێر دەسەلاتیەوەو دانیش بەوەدا بنێن کە دەسەلاتداری هەموو ولاتی رۆمە. هەردووك هاتن، بڕیاریدا ولاتی رۆم دابەش بکەن، یەکەمیان بەشی رۆژئاوای بەدەستەوە بگرێت، لەسنووری قەیسەرییەوە تا کەناری ئەنتالیەو پایتەختەکەشی (قونیە) بێت. دووەمیان بەشی رۆژهەلاتی پێ بدرێ. لەسیواسەوە تا کەناری سینوب و سەمسون و (توقات) پایتەختەکەی بێ، ئەم بەشەی بەلای مەغوڵەوە گرنگ بوو، چونکی هاوسنوور بوون، لەبەر ئەوە (قلیج ئەرسەلانی چوارەمیان) لەسەر ئەم بەشە دانا چونکی هاوپەیمانیان بوو، تەنها رووباری (قزل ئیرماق) لەنێوانیاندا بوو، فەرمانی بەهەردوو براکە کرد، بۆ (تەبرێز) بڕۆن و خۆیان ئامادە بکەن بۆ یارمەتی پێشکەشکردن بەمەبەستی داگیرکردنی ولاتی شام و میسر،

دواجار لەگەڵیا تا عێراق ڕۆیشتن، بەرلەوەی بۆ ئاسیای بچووك بگەڕێنەوە، هەردوو لایانیش رازی بوون.[٤٧] هۆلاکۆ سوور بوو لەسەر ئەوەی پەیمانێك ببەستن کە لەقلیج ئەرسەلانی چوارەم و هیسومی شای ئەرمینیا پێك بێت، بۆئەوەی ببێتە بەرژێنێك بۆ پارێزگاری باڵی سوپاکەی لەکاتی هێرشی داهاتوو بۆ سەر هەرێمی جزیرەو وڵاتی شام لەلایەکەوە، ئابلۆقەدانی کەیکاوس لەبەشی رۆژئاوای وڵات لەلایەکی ترەوە. هەردوو لە (هرقلە) کۆبوونەوەو لەسەر ئەو پەیمانیان بەست.[٤٨]
لەو کاتەدا ئەستێرەی (ظاهر بیبرس) لەئاسمانی رۆژهەلاتی ئیسلامیدا لەگەشانەوەدا بوو، کەیکاوسی دووەم بەدوای هاوپەیمانێکدا دەگەڕا، لەو باشتر کەسی نەبینیەوە، نامەیەکی بۆ نارد داوای یارمەتی لێکرد، لەبەرامبەر ئەوەدا نیوەی وڵاتەکەی دەداتێ،[٤٩] ئەمە یەکەم پەیوەندی بوو لەنێوان سەلجوقیەکان و (مەمالیکد)دا. (ظاهر بیبرس) بەدەنگیەوە چوو، لەمیانی مەبەستی فراوانبوونەوە بەرەو باکوور و هاوپەیمانی بەستن لەگەڵ مەمالیکی رۆمدا، بۆ راوەستان لەبەردەم مەترسی مەغۆلدا، لەسەر وڵاتی شام و میسر.
هێزێکی سوپایی ئامادەکرد بەفەرماندەی (میر ناصرالدین ئاغلمش) بۆ یارمەتیدانی کەیکاوسی دووەم. بەڵام ئەو هێزە نەگەیشتە وڵاتی شام بەبەڵگەی ئەوەی ناکۆکی نێوان هەردوو براکە چارەسەر نەکراو هەروا مایەوە. کەیکاوسی دووەم (ظاهر بیبرس)ی لەنامەیەکدا ئاگادار کردەوە کەوا گوشاری مەغۆل کەم بۆتەوە، ئاماژەی بۆ رۆڵی هێزی (مەمالیك) تێدا نەکردبوو.[٥٠] کەیکاوسی دووەم چارەی بنەڕەتی کێشەکانی خۆی و براکەی و هاوپەیمانانی لەدەرباری مەغۆل دەبینی، ئەم کێشانەی رووبەڕووی هۆلاکۆ کردەوە. بەڵام ئاواتەکانی نەهاتە دی، چونکی نەیارانی بەدەستوبردتر بوون لە کەیکاوسی دووەم، ئەو پەیوەندیەیان لەگەڵ مەمالیکدا بەهەل زانی، لەقونیە هێرشیان کردە سەری، بێ هودە هەوڵیدا لەگەڵ براکەیدا خۆی بسازێنێ، ناچار لەشار دەرچوو و بەرەو ئەنتالیە رۆیشت. لەوێش دوژمنانی وازیان لێ نەهێنا ناچار لەوێش نەما و بەرەو قوستەنتینیە رۆیشت و بووە میوانی ئیمپراتۆری بیزەنتە (میخائیل بالیولۆغۆس).[٥١] قلیج ئەرسەلانی چوارەم بەتەنها دەسەڵاتی بەدەستەوە گرت، بەڵام بەتەواوی لەژێر فەرمانی

مەغۆلدا دەجولایەوە. وەزیرە بەتواناکەی (المقتدر معین الدین سلیمان) کاروباری دەولەتی بەدەستەوە گرت و بەیارمەتی میرەکانی مەغۆل کارە سیاسیەکانی ئەنجام دەدا.[٥٢] دەستو پێوەندەکانی کەیکاوسی دووەم، نائومێد نەبوون، بەفەرماندەیی (عەلی بهادر) بەردەوامبوون لەبەرەنگاریکردنی (قلیج ئەرسەلانی چوارەم) مەغۆلە هاوپەیمانەکانی هێرشیان بۆ (قونیە) برد، بەلام هیچیان پێنەکرا، (شا ملك) پەیدا بوو وەکوبەرهەلستێکی مەغۆل لە ولاتی رۆمدا، چووە قەلای (کاتاغرا) بەلام بەسەریا زال بوون و کوژرا.[٥٣]

بەمجۆرە قلیج ئەرسەلانی چوارەم کەس نەما لەروویدا بوەستێ بەلام هیچ رۆلێکی سیاسیی دیاری نەبینی، وەزیرەکەی کاروباری گرتبووە دەستەوە ناوی ئەو لەئارادا نەمابوو، تا ئەو سەردەمە، بەسەردەمی (بروانا) ناونرا.[٥٤] (بروانا) زیرەك و فێلباز و تەلەکەباز بوو، کەلکی لەهەموو هەلێك وەردەگرت بۆ بەهێزکردنی دەسەلاتی خۆی، ئەوەبوو سالی ٦٦٤ی کۆچی/١٢٦٥ی زایینی هولاکۆ کۆچی دوایی کرد، (ئەباقا) بووە جێنشینی، نامەی بۆ ویلایەتەکان و ئەو مەملەکەتانە نارد کە لەژێر دەستی مەغۆلدا بوون، لەچوونە سەر تەخت ئاگاداریان دەکاتەوەو داوایان لێدەکات لەئاهەنگی چوونە سەر تەختەکەیدا ئامادەبن، تا پابەند بوونیان بەدەسەلاتی مەغۆلی نوێ بکەنەوەو دیاری خۆیان پێشکەش بکەن.

(قلیج ئەرسەلانی چوارەم)یش لەبانگراوەکان بوو، بەرەو دەرباری مەغۆل کەوتەرێ لەگەل (بروانا)ی وەزیریدا، کاتێ لەگەل سەرکردەی مەغۆل دا کۆبونەوە، وەزیری سەلجوقی داوای لێکرد، پەیمانی پاراستن وپشتگیریکردنی سەلجوقی نوێ بکاتەوە رێگاش بدا ئەو شوێنانەی دەولەتی سەلجوقی لەدەستیداوە لەکاتی ناکۆکی دوو براکەدا بیگەرێننەوە. بەتایبەتی شاری (سینوب) کە (کمناقوس) شای جانیت لەسالی ٦٥٧ی کۆچی/١٢٥٩ی زایینیدا دەستی بەسەرا گرتبوو[٥٥] قلیج ئەرسەلانی چوارەم دوای سەردانەکەی گەرایەوە ولاتی خۆی، بەلام (بروانا) لە دەرباری مەغول مایەوە، وادایار بوو پلانی لابردنی سولتانی دادەنا، بەبەلگەی ئەوەی بەگوێی (ئەباقا)ی چرپاند بوو، کەوا سولتانەکانی سەلجوقی راران و لەسەر بەلێنی خۆیان نامێننەوە، هەروەها رەنگە قلیج ئەرسەلانی دووەم پەیوەندی

نهێنی لەگەڵ (مەمالیك)دا لەمیسر هەبێ، (ئیلخان)ی قەناعەت پێهێنا، کەوا بەجێگری سوڵتان دایمەزرێنێ و رێگای بدا هەرکەسێك لەرێگای وەستا یان گومانی لێکرد لەناوی ببات، رێگایدا کەوا (سینوب) بگەڕێنێتەوە.[٥٦] هەروا‌ش بوو سەلجوقیەکان (سینوب)یان گەڕاندەوەو (غفراس) کە لەوێ فەرمانڕەوا بوو کوشتیان.[٥٧] (بروانا) نامەی بۆ (ئەباقا) نارد کەوا شارەکەی گرتوە، وای پیشاندا ئەو ئەم کارەی ئەنجامداوە، کە هەنگاوێکە بۆ دەست بەسەرا گرتنی دەوڵەتی سەلجوقی، بەمە پایەی لەلای مەغۆل بەرزتر بووەوە، بەڵام سوڵتان کەوتە گومانەوە لێی، ئیتر هەریەکەیان لەژێرەوە هەوڵی دەدا ئەویتریان لەناو ببات.[٥٨]

(بروانا) یەکێکی دانا چاودێری سوڵتان بکات ئەویش (شریف الدین مەسعود هریکی) بوو، کە فەرماندەی سوپای (نکیدە) بوو، هەرچەند سوڵتان بەمەی زانی بەڵام دەسەڵاتی ئەوەی نەبوو لایبدات.[٥٩] سوڵتان لەم هەڵسوکەوتەی وەزیرەکەی زۆری پێ ناخۆش بوو، لای هەندێ کەس درکاندبووی، کەوا بۆ دەرباری مەغۆل دەڕوات تا مەغۆل لەم کارە ئاگادار بکاتەوەو رێگای بدەن لەوەزیری لای بدات.[٦٠]

(بروانا) و (شریف الدین) بەم نیازەی سوڵتانیان زانی، تۆمەتێکیان بۆ سازاند و داوایان لەمەغۆل کرد بێن و لێکۆڵینەوەی لەسەر بکەن، بڕیار دەرچوو بە لەناوبردنی سوڵتان بۆ (ئاق سەرا) بانگهێشت کرا، ئاگای لێ نەبوو چیان بۆ هەڵبەستووەو رێکخستووە، کە لەگەڵ لێکۆڵەرەوە مەغۆلەکان کۆبووەوە، گلەیی ئەوەیان لێکرد کەویستویەتی (بروانا) لەناوبەرێت و لەگەڵ (مەمالیك)ەکاندا نامەیان لەنێواندا هەیە. سوڵتان بەبیستنی ئەم وتە سەرسام بوو، پارێزگاری لەخۆی کردو ئەوانەی بەتۆمەت دانا، بەڵام بڕیاری کوشتنی دەرچوو و رۆژی ٨ی جەمادی یەکەم ساڵی ٦٦٤ی کۆچی/١٢٦٥ی زایینی، ژاریان پێدا دواجار بە ژێی کەوانی تیر خنکاندیان.[٦١]

## کۆتایی کەیکاوسی دووەم

کەیکاوسی دووەم ماوەیەك لەپایتەختی بیزەنتیە مایەوە ئیمپراتۆر شاری (دوبروجا)ی پێ بەخشی، کە دەکەوێتە نێوان روباری دانوب و دەریای رەشەوە. لەگەڵ هۆزی (سەلتق)ی تورکمانیدا و هەندێ خێزانی تورکدا لەو ناوچەیە

جێگیربوون ئەوانە پێشەنگی ئەو تورکمانانەن کە لە ئەورووپادا ماونەوەتەوە. وای دەگێڕنەوە ژمارەی کۆچکردووەکان لەنێوان دەهەزارو دوازدەهەزار کەس دابوون.
وادیارە سولتانی سەلجوقی وەکو پەناهەندەیەك دادەنیشت کەوتە جموجۆڵ لەساڵی ٦٦٢ی کۆچی / ١٢٦٤ی زایین لەپیلانی لەناوبردنی ئیمپراتۆری (بیزەنتی)دا بەشداری دەکا. کە ئیمپراتۆر ئاگادار دەبێتەوە، سولتان سەلجوقی لەدوبروجا دەردەکات و بۆ شاری (ئاینوس) دووری دەخاتەوە کە دەکەوێتە کەناری باشووری ناوچەی (رومەلی) لەگەڵ کوڕەکانیدا لەیەکێ لەقەڵاکان زیندانیان دەکەن لەو پیلانەدا (علی بهادر) کوژرا کە لەگەڵ سولتاندا بوو هەروەها چاوی (میری تەویلە ئوغسلو)یان دەرهێناو دەستو پێوەندەکانی سولتان هەریەکەو بەلایەکدا بڵاوبوونەوە. هەندێکیان بوونە نەسرانی تا ئازارو ئەشکەنجەیان نەدەن، هەندێکیش لەسەر دینی خۆیان مانەوەو گەلێ ئازارو ئەشکەنجە دران.[٦٢]
سولتان قلیج ئەرسەلانی چوارەم ویستی یارمەتی براکەی بدات و لە دیلێتی رزگاری بکات. نامەیەکی بۆ (برکەخان)ی شای هۆزی زێڕین نووسی.[٦٣] داوای لێکرد لەشکرکێشی بۆ سەر موڵکەکانی ئیمپراتۆر ئەنجام بدات بەئامانجی رزگارکردنی کەیکاوسی دووەم، (برکەخان) بەتەمای ئەوەبوو لە وڵاتی ئەنادۆڵ دەسەڵات پەیدا بکات تا پەیوەندی بە (مەمالیك)ەوە بکات لە وڵاتی شام و رێك بکەون دژی (ئیلخانەکانی فارس) و رێگایان لێ ببڕن تا نەگەنە دەریا و پەیوەندی راستەوخۆ لەگەڵ وڵاتانی رۆژئاوادا نەکەن، بۆیە کەوتە هاوکاریکردنی (بیبرس) بۆ یارمەتیدانی کەیکاوسی دووەم.
سوپای مەغۆل لەوڵاتی (قبجاق)ەوە دەرچوو ژمارەیان بیست هەزار جەنگاوەر بوو و روویان کردە خاکی بیزەنتیەکان لەرێگای (دانوب)ەوە. هێزەکانی ئیمپراتۆریەت خۆیان نەگرت، مەغۆل گەیشتە شاری (ئاینوس) و ئابڵۆقەی قەڵاکەیاندا کە سولتانی سەلجوقی تیادا زیندانی کرابوو، شای بولگاریا لەئابڵۆقەدانی قەڵاکەدا یارمەتیدا. ئەمەی دوایی هەمیشە لەگەڵ ئیمپراتۆری بیزەنتیدا (میخائیلی هەشتەم) ناکۆك بوو.

هاوپەیمانان هێزەکانی ئیمپراتۆری بیزەنتیان شکاند. ئەگەر لەمەیدانی شەڕەکەدا هەڵنەهاتایە دەکوژرا، گەرایەوە قوستەنتینیە و (ئاینوس) کەوتە بەر رەحمەتی هێرشبەران. دانیشتوانەکەی ناچار (کەیکاوس)یان بەدەستەوەدا لەجیاتی ئەوە سوپای مەغوّل بکشێتەوە.
سولّتان بۆ ولاّتی (قرم) گوێزرایەوە، (برکەخان) شاری (سوداك)و (سواك)ی پێدا بەڵێنی دامەزراندنی نیمچە دەوڵەتێکی پێداو یەکێ لەکچەکانی لێ مارەکرد. لەوکاتەدا کە لەولاّتی (قرم) بوو کەیکاوسی دووەم هەوڵیدا سوپایەك پێکەوەبنێ، بۆ گەڕانەوەی تەختە داگیرکراوەکەی. بەلاّم کەس بەقسەی نەکرد. وادیارە ژیانی ئەوێیان پێ باش بووەو لەگەڵ خۆشگوزەرانیدا راهاتبێتن. خێزانەکەی کەیکاوسی دووەم، بلاّوەی لێکرد دوو کوڕی لە قوستەنتینیە مانەوە، سێیەمیان لەولاّتی (قرم)بوو، دایکی خۆی کوشت، لە قوستەنتینیە بوو بەنیازێکی خراپ، یەکێ هەواڵی مردنی سولّتانی پێگەیاندبوو.(٦٤) دوور نیە ئیمپراتۆری بیزەنتیە لەو رووداوەدا دەستی هەبوو بێت. (برکەخان) ساڵی ٦٦٧ی کۆچی / ١٢٦٦ی زایینی، کۆچی کرد، (منکوتمر) جێنشینی بوو، سیاسەتی بەرامبەر کەیکاوسی دووەم گۆڕا، گرتی و زیندانی کرد. لەگەڵ مەسعودی کوڕیدا لەسەر دەریای رەش، کەیکاوسی دووەم تاساڵی مردنی ١٢٧٩/٦٧٨ی زایینی بەدەستبەسەری لەوێ مایەوە.(٦٥)

## پەراوێزەکانی بەشی دوانزەهەم

١. ابن بیبی: ص٢٥١

٢. الاقسرایی: ص٣٦

٣. (جوینی) بەدوور و درێژی باسی چوونە سەر تەختی (کیوك) دەکات ج١، ص٢٢٩–٢٣٤

٤. هەمان سەرچاوە: ص٢٣٠

٥. ابن بیبی: ص٢٩١

٦. ابن بیبی: هەمان سەرچاوە: ل٢٦٧

٧. Ency. Of Islam: vol:11 P637

٨. نوبە: وشەیەکی عەرەبیە، چوّتە ناو زمانی فارسیەوە، یانی موّسیقا

٩. ابن بیبی: ص٢٦٢–٢٦٨

١٠. هەمان سەرچاوە: ص٢٦٨–٢٦٩. ابن العبری: ص٢٩١

١١. D'ohssan: vol 111 P92

١٢. ابن بیبی: ص٢٧٨.

١٣. هەمان سەرچاوە: ص٢٧٥. ابن العبری: ص٢٩٥–٢٩٦

١٤. ابن بیبی: ص٢٧٥–٢٧٧

١٥. ابن بیبی: هەمان سەرچاوە: ل٢٧٧

١٦. الاقسرائی: ص٣٨

١٧. Howorth: vol 11 PP89-90

١٨. (الاوامر العلائیە فی الامور العلائیە): ص٢٧٧

١٩. مسامرە الاخیار ومسایرە الاخیار: ص٣٩

٢٠. ابن بیبی: ص٢٧٢–٢٧٤.

٢١. الاوامر العلائیە فی الامور العلائیە: ص٢٩٣

٢٢. مسامرە الاخیار ومسایرە الاخیار: ص٣٩

٢٣. ابن بیبی: ص٢٩٣. ابن العبری: ص٣٠٠

٢٤. هەمان سەرچاوە

٢٥. تاريخ الزمان: ص٣٠٠
٢٦. هەمان سەرچاوە: ل٣٠٠-٣٠١
٢٧. ابن بيبى: هەمان سەرچاوە: ل٢٨٠
٢٨. ابن بيبى: ص٢٧٩-٢٨١
٢٩. ابن بيبى: ص٢٨١-٢٨٢
٣٠. باجگر: پلەیەکی فەرمییە لەدەوڵەتی سەلجوقیدا هەبوو
٣١. سەرپەرشتیکار: فەرمانێکە لەدەوڵەتی سەلجوقی
٣٢. ئەمیرداد: قازی
٣٣. الاقسرائى: ص٤٠.
٣٤. الجوينى: ج٢، ص٢٢٧
٣٥. ابن بيبى: ص٢٨٣-٢٨٤
٣٦. ابن بيبى: ص٢٨٦. الاقسرائى: ص٤١
٣٧. هەمان سەرچاوە: ل٢٨٧، ل٤١-٤٢
٣٨. مامۆستای خانوو: کارمەندە لەدار سەڵتەنەت
٣٩. ابن بيبى: ص٢٨٧
٤٠. الاقسرائى: ص٤٢
٤١. هەمان سەرچاوە: ل٢٨٩
٤٢. هەمان سەرچاوە: ل٢٩٠
٤٣. هەمان سەرچاوە
٤٤. ابن العبرى: ص٣٠٢
٤٥. هەمان سەرچاوە
٤٦. ابن بيبى: ص٢٩٢
٤٧. هەمان سەرچاوە: الهمذاني: ص٢٦٦
٤٨. ابن بيبى: ص٢٩٤. ابن العبرى: ص٣١٤-٣١٥
٤٩. ابن عبدالظاهر: الورض الزاهر: ص١٩١-١٩٢
٥٠. هەمان سەرچاوە: ل١٢٥

٥١. هەمان سەرچاوە: ل١٢٥–١٢٨

٥٢. ابن بیبی: ص٢٩٧

٥٣. Camb-Hist. of Islam: vol 1 P250

٥٤. ابن بیبی: ص٢٩٨.الیونینی: ج٢، ص٥٣٥–٥٣٦

٥٥. Ibid

٥٦. الیونینی: ج٢، ص٣٤٧

٥٧. الیونینی: ج٢، ص٣٤٧

٥٨. هەمان سەرچاوە: ل٣٤٨

٥٩. هەمان سەرچاوە: ل٣٠١

٦٠. ابن بیبی: ص٣٠٢–٣٠٣

٦١. ابن بیبی: ص٢٩٧–٢٩٨

٦٢.برکە خان: سێیەم کوڕی (جوجی خان)ە، سەرۆکی هۆزی زێڕین. بووە ئیسلام، کە بووە سەرۆکی هۆزی زێڕین دەستی کردە بڵاوکردنەوەی ئایینی ئیسلام.

٦٣. بڕوانە: العرینی: المغول: ص٢٥٢

٦٤. ابن بیبی: ص٢٩٨

٦٥. ابن بیبی: هەمان سەرچاوە: ل٣٣٤

الاقسرائي: ص٧٦

## بەشی سیانزەهەم
## دواساڵەکان لەتەمەنی سەڵتەنەدا
## ٦٦٤-٧٠٤ی کۆچی /١٢٦٥-١٣٠٤ی زایینی
## ( غیاث الدین کەیخوسرەو کوڕی قلیج ئەرسەلان: کەیخوسرەوی سێیەم )
## ٦٦٤-٦٨٢ی کۆچی / ١٢٦٥-١٢٨٣ی زایینی

### سەرەتا

دوا ساڵەکانی تەمەنی سەڵتەنە،گۆڕانکارییە سیاسییەکان بەخێرایی روویان دەدا، بەهۆی ناکۆکی دەرەکیەوە لەنێوان مەغۆل و مەمالیکدا، ئەمە کارێکی خراپی کردە سەر بارودۆخی وڵات، چونکی ئەوانەی دەسەڵاتیان بەدەستەوە بوو، لەبارەی سیاسەتی دەرەکیەوە لەناو خۆیاندا بوونە چەند بەشێکەوە، هەروەها ناکۆکییەکانی والیەکانی مەغۆل کاردانەوەی خراپی هەبوو، سیاسەتی ناوەکی سوڵتانەکانیش بارودۆخەکانی ئاڵۆزتر کردبوو، میرەکان توانیبویان رۆڵی سوڵتانەکان کەم بکەنەوەو خۆیان دەستە باڵا بن، هەر لەو کاتانەدا گەلێك یاخیبوون و شۆڕشیش بەرپا بوون، وڵاتی ماندوو کردبوو. دوای کوشتنی سوڵتان (رکن الدین قلیج ئەرسەلانی چوارەم) (بروانا) (غیاث الدین کەیخوسرەوی سێیەم کوڕی سوڵتان) بە سوڵتانی وڵاتی سەلجوقی رۆم دامەزراند، ئەم دامەزراندنەش بە رێکەوتن بوو لەگەڵ (والی مەغۆلی نابشی)دا، ئەو کاتە تەمەنی شەش ساڵان بوو، هەندێ کەس دەڵێن تەمەنی ساڵ و نیوێك بوو. (بروانا) بەهاوکاری لەگەڵ (صاحب فخرالدین) پەروەردەیان کرد و فێری خوێندنیان کرد. دوای دە ساڵ کاروباری بەدەستەوە گرت.[1]

ئەم سوڵتانە هیچ رۆڵێکی گرنگی لەژیانی سیاسی خۆیدا نەبینی، چونکی تەمەنی منداڵ بوو، لەلایەکی ترەوە (بروانا) دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێکدا کێشا بوو. چارەنووسی بەچارەنووسی ئەم وەزیرەوە پەیوەست بوو، گەلێ کێشە لە وڵاتدا روویاندا وەکو شۆرشی قرمانیەکان و شۆرش و یاخیبوونی دیکەش، کە پێویستی بەپیاوی بە توانا و خاوەن ئەزموونی دەویست بۆ خۆراگرتن لە روویاندا. لەسەردەمی کەیخوسرەوی سێیەمدا مەمالیك سەریانهەڵدا کە لەناوچەکەدا بوونە خاوەن هێز و لەگەڵ مەغوڵدا روو بەروو بوونەوە، سەنگی هێزەکانی گۆری لە ناوچەکەدا و وڵاتی رۆم کەوتە ناو گێژاوی ناکۆکی مەغوڵی-مەملوکی.

## فراوانبوونی دەوڵەتی مەغوڵی

(منکوخان) بەگوێرەی ئەونەخشەو پلانەی داینابوو توانی (حەشیشییەکان) لەناو ببات و خەلافەتی عەباسی بروخێنێ و ئەو هەرێمانەی لەژێر دەستیاندابوو لەئێران و وڵاتی شام و میسر دەربهێنێ. (خاقان)ی ناوبراو، هوڵاکۆی برای بۆ ئەنجامدانی ئەو کارە راسپاردبوو دوای ئەوەی هەرێمی ئێران و ویلایەتە رۆژئاواییەکانی پێدا.[٢] مەغوڵ، کەلکیان لە بارودۆخە خراپەکەی ئێران و عێراق و شام و ئاسیای بچووك وەرگرت بۆ ئەنجامدانی پلانەکانیان، هوڵاکۆ توانی دەوڵەتێکی توکمەی مەغوڵ لەئێران دامەزرێنێ، فەرمانرەوا ناوچەییەکان هاتنە ژێر دەسەڵاتیانەوە تەنها (حەشیشییەکان) نەبێت لەقەڵاکانی خۆیان لە (قەهستان)ی نێوان (هەرات) (تیسابور) مانەوە، لەگەڵیاندا کەوتنە شەڕ، دواجار لەوێوە بەرەو بەغدای بنکەی خەلافەتی عەباسی رۆیشت.[٣]

بارودۆخی بەغدا لەو دەمەدا زۆر خراپ بوو، خەلیفەی عەباسی (موستەعسەم) کاروباری وڵاتی بەتوند وەرنەگرتبوو، هەواڵەکانیش وای بەگوێدا دەدا، سوپای مەغوڵ ببەرەو بەغدا دێت، کەچی خۆی بۆ ئامادەنەکرد، وایزانی بەفێڵ و تەڵەکەبازی دەتوانێ خۆی رزگار بکات،[٤] لەراستیدا لەو کاتەدا گەلێ سەرچاوەی هێزی تیادابوو، ناکۆکی سیاسی و مەزهەبی بووە هۆی پەرتبوونیان، ئەوانەی خاوەن دەسەڵات بوو پیلانیان بۆ یەکتر دەچنی، خەلیفەش بێ هێز و بێ توانا

نەیدەتوانی کێشەکان چارەسەر بکات، لەئەنجامی ئەمەدا ناکۆکی کەوتە نێوان (مجاهدالین ئەیبەك دواتدار) کە سوننە مەزهەب بوو، لەگەڵ (مۆیدالدین کوڕی علقمی) وەزیری موستەعسەم کەشیعە مەزهەب بوو. کە ئەمەیان کاریگەرییەکی زۆری هەبوو لەئاڵۆزکردنی بارودۆخەکەو ڕووخانی خەلافەتی عەباسی.[٥]

دانیشتوانی بەغداش، سوننەو شیعە بوون لەگەڵ نەسرانی و یەهودیدا، کە هەموویان لەناو گێژاوێکی ناکۆکیدا بوون، بەتایبەتی لەنێوان تایفەی یەکەم و دووەمدا، هەروەها لە کاروباری سیاسی نەدەگونجان پێکەوە.

وەزیر (ابن علقمی) ئەو ناکۆکیەی نێوان مەزهەبەکان، بەتایبەتی دژی شیعەکان، نامەی بۆ هۆلاکۆ نارد و تەماعی خستەبەری کە بێت بەغدا داگیر بکات.[٦]

لەراستیدا ئەو نامەنووسینانەی نێوانیان، نە ئەو وتووێژانە کە دواتر لەنێوانیاندا ڕوویدا، هۆی هاتنی هۆلاکۆ نەبوون، چونکی داگیرکردنی بەغدا لەسیاسەتی گشتی مەغۆلەکاندا بوو.

لەم بارودۆخە ناسکەدا، هۆلاکۆ داوای لەخەلیفە کرد، سوپایەك بنێرێ تا لەگەڵ مەغۆلدا (حەشیشییەکان) لەناو ببەین. بەڵام (موستەعسەم) دوای ئەوەی لەگەڵ یاریدەرەکانی کەوتە راوێژکردن، رازی نەبوو یارمەتی مەغۆل بدات. بەڵام (ابن العلقمی) ئەم رایەی خەلیفەی بەراست نەزانی.[٧] هولاکۆ، ئەمەی لەدڵ هەڵگرت، کە بەسەر (حەشیشییەکان)دا سەرکەوت، نامەیەکی گلەیی بۆ نارد، هەڕەشەشی لێ دەکات و داوای لێکرد:

١. قەڵاکان بڕوخێنێ و سەنگەرەکان پڕ بکاتەوە و وڵاتیش تەسلیمی کوڕەکەی بکات.

٢. بێت چاوم پێی بکەوێ، یاخود وەزیر (سلێمان شا) بنێرێ. خەلیفە، دیسانەوە داواکانی رەتکردەوە، وەڵامێکی پڕ لە هەڕەشەشی بۆ نارد، وایزانی هولاکۆ بەمە پەشیمان دەبێتەوە یان واز دەهێنێ.

دەبوایە ڕووبەڕووی یەکتر ببنەوە، سوپای مەغۆل، پایتەختی خەلافەتی ئابلۆقەدا، دواجار بەزۆر، لەمانگی سەفەری ساڵی ٦٥٦ی کۆچی / ١٢٥٨ی زایینی بەغدای

وێرانکرد.(٨) خەلیفە خۆی بەپێی خۆی ڕۆیشت و خۆی تەسلیمی مەغوڵەکان کرد، بێ شەرت و قەید، هوڵاکۆش بەڵێنی پاراستنی ژیانیدا.(٩)
ئەم ڕووداوە دڵتەزێنانە بە کوشتنی خەلیفە موستەعسەم و هەردوو کوڕەکەی (ابي العباس احمد و ابي الفضائل عبدالرحمن) کۆتایی هات.. هەروەها کوڕە بچووکەکەی (مبارك) و سێ خوشکی (فاطمة، خديجة و مريم) بەدیل گیران، دواجار (حلة و كوفة و واسط و موسل)یش خۆیان بەدەستەوەدا. لێرەدا ئاماژە بۆ ئەوە دەکەین، کەوا نەسرانیەکان لە ڕۆژهەڵاتدا گرتنی بەغدایان لەلایەن هوڵاکۆ وە بەهەل زانی، ژمارەیکی زۆر لە نەسرانی و ئەرمەنی چونە ناو سوپای هوڵاکۆوە، ئەوانە بە پشتگیری ژنەکەی هوڵاکۆ کە نەسرانی بوو (طوقوز خاتوون) چاودێری کران و گرنگیان پێدرا.[١٠] دواتر مەغوڵ بەرەو وڵاتی شام ڕۆیشتن و شارەکانیان و قەڵاکانیان داگیرکرد.[١١] ڕووبەری دەوڵەتەکەیان بەرین و فراوانتر بوو و بوونە هاوسێی دەوڵەتی (مەمالیك) لە میسر.

## دامەزراندنی دەوڵەتی مەمالیك لەمیسر

کاتێ لێکۆڵێرەوەیەك دەڕوانێتە مێژووی ڕۆژهەڵاتی عەرەبی بەشێوەیەکی گشتی و مێژووی وڵاتی شام و میسر بەتایبەتی، لەنیوەی دووەمی سەدەی سیانزەهەمی زایینییەوە تاکو سەرەتای چاخە نوێیەکان، دەبینێ کاریگەری مەماکی. تورك کە بەرەو ڕۆژئاوای ئاسیا هاتن بەسەریانەوە هەبووە، لەئەنجامی بەزۆر بردن و کڕینەوە، وڵاتی ئەودیو ڕووبار و قەبجاق سەرچاوەیەکی گرنگی هێنانی کۆیلەی سپی تورك بوو. ئەوانە بەردەوام لەدوا سەدەکانی عەباسییەکانەوە بۆ میسر دەهاتن، گۆڕانکارییەکان ماوەی زاڵبوونی سەربازی و سیاسی بۆ ڕەخساندن، نەیان دەتوانی خۆیان دوور بگرن و دەست نەخەنە کاروباری ئیمارەتە ئیسلامیەکانەوە، تاکو ڕێبازێك لە فەرمانڕەواییدا بۆ خۆیان دابنێن و جێ پەنجەیان بەئاشکرا لە مێژووی ناوچەی ڕۆژهەڵاتی عەرەبیدا دیار بێت. (طولونیەکان) لەمیسر بەکاریانیان هێنا، لەدامەزراندنی دامەزراندن و بەردەوامبوونی دەوڵەتەکەیاندا پشتیان پێیان بەست هەر لە ٢٥٤-٢٩٢ی کۆچی / ٨٦٨-٩٠٥ی زایینی لەو

کاتەوە، سەربازی میسر و سەرپەرشتکارانی لەمەمالیکە تورکەکان بوون، دەوڵەتی ئەخشیدی ٣٢٣-٣٥٨ی کۆچی / ٩٣٥-٩٦٩ی زایینی کە لەدوای دەوڵەتی (طولوني)یەوە هاتبوو، لەسەر هەمان رێباز رۆیشتن پشت بەستن بە مەمالیك. کە فاتمیەکان ساڵی ٣٥٨ی کۆچی / ٩٦٩ی زایینی دەستیان بەسەر میسردا گرت، دوای دامەزراندنی دەوڵەتەکەیان لە باکووری ئەفریقیادا، فەرمانڕەواکانیان بە چەند رەگەزێك بەست، یەکێ لەوانە تورکەکان بوون. کە دەوڵەتی ئەیوبی دامەزرا لە میسر لەسەر پاشماوەی دەوڵەتی فاتمی لەساڵی ٦٥٧ی کۆچی / ١١٧١ی زایینێن شا و میرەکانی ئەیوبی ژمارەیەکی زۆریانی لێ کرین، تا هێزی سەربازیان زیادبێ و لەشەڕە ناوخۆییەکانیشدا پشتیان پێ ببەستن. ئەو مەمالیکە تورك و جەرکەسیانە بوونە ئامراز بەدەستیانەوە. ئەو دەستە بالآبوونەی (شا عادل) و (شا کامل) بۆ هێزو توانای ئەوانە دەگەڕێتەوە. کە ناکۆکی لەنێوان بەشەکانی مالآنی ئەیوبیدا زۆرتر بوو و شەڕی خوێناوی کەوتە نێوانیان، دەسەلآتی مەمالیك پەرەیسەند و بوونە ئامرازێك بەدەست شاکانی ئەیوبییەوە بۆ هێشتنەوەو مانەوەی دەسەلآتیان.

بەمجۆرە دەسەلآتی سیاسی مەمالیك پەرەیسەند لە دەوڵەتی ئەیوبیدا، چونکی بروایان بەتوانای سەربازی خۆیان هەبوو، دەستیان کردە خۆ هەڵقورتاندن لەکاروباری ناوخۆی دەوڵەتەوە، لەوانە دەستێوەردانیان لەپیلانی لابردنی (عادلی دووەم) و هێنانی (نجم الدین ئەیوب) لەجێگای ئەو[١٢] ئەمە بووە هۆی ئەوە گرنگی سەربازیان دەرك پێ بکات، ئیتر مەمالیکی زۆرتر کڕی، دوای ئەوەی متمانەی بەخوارزەمیەکان نەما وەکو جاران، دورگەی (روضة)ی لە رووباری نیل کردە تیکەیان و تەلارێکی تیادا دروست کرد. هەروەها قەلآیەکی دروستکرد و لەوێ دانان، ئیتر بەو مەمالیکانە دەیانگوت (مەمالیکی دەریایی) کە بوونە بناغەی دەوڵەتی مەمالیکی یەکەم.[١٣] مەمالیکەکان ساڵی ٦٤٨ی کۆچی / ١٢٥٠ی زایینی کەوتنە گومان لەتوران شا، تا لەو ساڵەدا لە ناویان برد.[١٤]

بە کوشتنی توران شا، دەسەلآتی ئەیوبییەکان لە میسر کۆتایی پێهات، چونکی مەمالیك (شجرە الدر)یان بە سوڵتان دانا، بەحوکمی ئەوەی لەبنەچەی تورك یا

ئەرمەن بوو لە مەمالیکەوە نزیك بوو، ئەو یەکەم کەس بوو لەناو شاکانی تورکی مەمالیکدا فەرمانڕەوایی میسری بەدەستەوە گرت، مەمالیکەکان (عزالدین ئەیبەك)یان کرد وەسی لەسەر تەخت، زۆری نەبرد (شجرە الدر)ی خواست، دواجار میرەکان بەسوڵتان دایان نا.(١٥)

بەمجۆرە دەوڵەتی مەمالیك لەمیسر دامەزرا، هەناسەیەکی خستە دڵی موسڵمانانەوەو تواناو هێزێکی سەربازی گەورەیان بەدەست هێنا توانیان رووبەڕووی مەغۆل را وەستن و پاشماوەی سەلیبییەکان لە رۆژهەڵاتی ئیسلامیدا لەناو بەرن.

## ناکۆکی مەغۆل – مەمالیك لەسەردەمی کەیخوسرەوی سێیەمدا شەڕی (عین جالوت) (١٦)

دەوڵەتی مەمالیك لەسەرەتای ژیانی سیاسیدا گۆڕانکاری ناوخۆیی خێرای بەخۆیەوە بینی، چونکی (شجرە الدر) ئەم خانمە پیلانێکی بۆ کوشتنی مێردەکەی (عزالدین ئەیبەك) رێکخستبوو لە ساڵی ٦٥٦ی کۆچی / ١٢٥٧ی زایینیدا، مەمالیکەکان تۆڵەی کوشتنەکەیان کردەوەو (شجرە الدر)یان لەهەمان ساڵدا کوشت، کوڕەکەی (ئیبیك)یان لەجێگای باوکی دانا، کە ئەو کاتە تەمەنی پانزە ساڵان بوو، و ناویان نا (الملك المنصور – شای سەرکەوتوو).(١٧)

دەوڵەتی مەمالیك لەسایەی فەرمانڕەوایەکی منداڵدا، لاواز بوو.. لەلایەن ئەیوبییەکانەوە گوشاری دەرەکی خرایەسەر، لەو کاتەشدا مەغۆلەکان تەنگیان بە وڵاتی شام هەڵچنیبوو.. ئەم بارودۆخە دەرەکییە بارێکی نائارامی خوڵقاند، پێویستی بەیەکێکی بەهێز هەبوو دەسەڵات بەڕێوە ببات، (قطز) کە میرێکی دیاری مەمالیك بوو هەلی بۆ رەخسا بۆ چوونە سەر تەخت، (مەنسوری) لەمانگی ذي القعدەی ساڵی ٦٥٧ی کۆچی / ١٢٥٩ی زایینی بەیارمەتی چەند میرێك لابراو، خۆی بەسوڵتان دانا.(١٨) لم کاتانەدا، مەغۆل هەوڵیان دەدا بەرەو رۆژئاوا بێن و دەسەڵاتیان فراوانتر بکەنەوە. کارێکی ئاسایی بوو، دوای داگیرکردنی عێراق، هێرش بۆ شام ببەن، هولاکۆ لەکاتی ئابلوقەدانی بەغدادا تیپێکی سەربازی

بەفەرماندەی (ئەریق نوین) نارد و (ئەربل)یان داگیر کرد ئیتر مەغۆل لە ولاتی شام نزیك ببووە.[19]

سالی ٦٥٧ی کۆچی / ١٢٥٩ی زایینی، بەسوپایەکەوە هێرشی برد و دەستی گرت بەسەر باکووری رۆژاوای ولاتی شامدا، کە شاری (میافارقین، نسیبین، حەران، رەها و حارم) کەوتنە ژێر دەسەلاتیەوە، دواجار رووی لەحەلەب کرد لەسالی ٦٥٨ی کۆچیدا داگیری کرد، لەکۆتایی مانگی سەفەر / شوبات (دیمەشق)یش کەوتە ژێر دەسەلاتیەوە.

لە ولاتە ئیسلامیەکاندا و لە رۆژهەلاتی عەرەبیدا، میسر و حیجاز و یەمەن مابوون بکەونە ژێر دەسەلاتی مەغولەوە. لەسالی ٦٥٨ی کۆچی / ١٢٦٠ی زایینی هولاکۆ هێشتا لە ولاتی شام بوو، داوای لە (قطز) کرد خۆی بەدەستەوە بدات.[20] دوای سێ هەفتە لەداگیرکردنی دیمەشق، مەغۆل بەتەواوی ولاتی شام کەوتە ژێر دەسەلاتیەوەو بەرەو فەلەستین رۆیشتن، شەری وایان تووش نەبوو و دایان بەسەر چەند شارێکدا لەوانە: نابلس و خەلیل، بەلام نەچوونە (بیت المقدس).[21]

(قطز) لەگەل میرەکانیدا کەوتە راوێژکردن، بریاریاندا خۆیان بەدەستەوە نەدەن و ئەوانەشی نامەیان هێنابوو کوژران. لەراستیدا بۆ مەمالیك ئاسان نەبوو لەگەل مەغۆلدا رووبەروو ببنەوە، ئەی چی وای کرد ئەو بریارە بدەن؟ هۆلاکۆ، لەوکاتەدا بەپەلە گەرایەوە (قەراقورم) و زۆربەی سوپاکەی کێشایەوە. تەنها لەناوچەکەدا دە هەزار سەربازی هێشتبووەوە لەژێر فەرماندەی (کتبغانوین)دا، لەبەر دوو هۆ هولاکۆ گەرابووەوە:

یەکەم: مردنی خانی گەورە (منکو) کە لەسالی ٦٥٥ی کۆچی / ١٢٥٧ی زایینی کۆچی دوایی کرد، ناکۆکی لەسەر دەسەلات لەنێوان براکانی هۆلاکۆدا نیشانەی دەرکەوتبوو کە (قوبیلای) و (اریق بوغا) بەتەمای خانێتی بوون.

دووەم: مولکەکانی ئێرانی، لەلایەن ئامۆزاکەیەوە (برکە خان)ی سەرۆکی هۆزی زێرین و فەرمانرەوای (قەبجاق) دەست درێژی کرایە سەر. بەتایبەتی، ئەو ببووە موسلمان و هەرەشەی لە هولاکۆ دەکرد، بەهۆی ئەو کوشتارانەی کە بەسەر

موسڵمانانداهێنا بووی و هەزارانی کوشتبوو، هەروەها هێرشی بۆ سەر خەلافەتی عەباسی و کوشتنی خەلیفە.[٢٢]

(کتبغانوین) بەهێزێکی کەمەوە فەرمانڕەوایی وڵاتی شامی دەکرد، ئەمە ڕۆشنایییەکی کەمی بە مەمالیك دابوو، چونکی هێرشی فەلەستینیان، مەمالیکەکانی توڕە کردبوو، فەرماندەی مەغۆلیەکانیش لەنەسرانیەکانەوە نزیك بوو، نەك لەبەر ئەوەی نەسرانی بوو، بەڵکو دەیزانی، هاوپەیمانێتی لەنێوان مەغۆل و نەسرانیدا گرنگیەکی زۆری هەیە، چونکی پێکەوە لە رووی ئیسلامو موسڵمانەکان رادەوەستان.

هەرچەندە (بوهیموندی شەشەم) میری ئەنتاکیە و (هیسوم) شای ئەرمینیا، لەگەڵ (کتبغانوین) لەمبارەیەوە هەمان هەست و بۆچوونیان هەبوو، سەلیبییەکان وەکو بەربەری تەماشای مەغۆلیان دەکرد، هاوکاریکردنی موسڵمانانیان لە مەغۆل پێ باشتر بوو.[٢٣]

(قطز) لەم هەڵوێستانە گەیشت، چونکی (کتبغانوین) نەیدەتوانی سەرکەوتنەکانی مەغۆل بپارێزێ لەرێگەی هاوپەیمانی سەلیبییەکانەوە نەبێت، چونکی سەلیبییەکان هاوپەیمانی مەغۆلیان نەدەکرد، ئەوا فرسەت لە ئارادابو نەك لەبەرامبەریان راوەستن، بەڵکو بەسەریانیشادا سەرکەون.[٢٤]

مەمالیکەکان بڕیاری بەرەنگاربوونەوەیان دا، (قطز) پلانی سەربازی دانا، بەشێوەیەك سەرکەوتن وەدەست بهێنن، کۆمەڵگای میسری بۆ روو بەڕوو بوونەوەی خۆی ئامادە کرد، ناوەوە دڵنیا بوو لێی، ئەو شەڕەشی بەشەڕی مان و نەمان دانا.[٢٥]

پلانەکە ئەوەبوو: فەرماندە (بیبرس البندقداری)[٢٦] بەهێزێکەوە بۆ سووسەکردنی هەڵوێستەکە دەرچێت، لەشەعبانی ٦٥٨ی کۆچی / ١٢٦٠ی زایینی، بەرەو غەززە دەرچوو، لەوێ هێزێکی مەغولی لێ بوو بەفەرماندەی (بیدرا) ئەمەی دوایی، نامەیەکی بۆ (کتبغانوین) نارد کە لەنزیکی بەعلەبەك لەدەشتاییەکەی (بیقاع) بوو، هەواڵی جوڵانەوەی مەمالیکەکانی پێ راگەیاند و داوای یارمەتی لێ کرد.[٢٧]

(بیبرس) لەگەڵ هێزەکەی مەغۆڵدا رووبەڕوو بووەوە. لەغەززە دەریکردن و تا

ڕووباری (عاصی) کەوتە دویان.[٢٨] (کتبغانوین) خۆی ئامادەکرد بەرەو دۆڵی ئەردەن بڕوات، هەواڵی هاتنی مەمالیکی زانی، بەڵام سەرهەڵدانی شۆڕشی ئیسلامەکان لەدیمەشق دوای خست، بەڵام ماوەی بەواندا بەرەو پێشەوە بێن..
(قطز) لە ڕەمەزانی ٦٥٨ی کۆچی / ئابی ١٢٦٠ی زایینی، لەمیسر کەوتەڕێ و بەرەو فەلەستین ڕۆیشت. ڕێگای کەناری دەریای لەبەرگرت، پشتی بەو پەیمانە بەست کە ساڵی ٦٥٢ی کۆچی / ١٢٥٤ی زایینی، کە لەنێوان (شا ناصر یوسف) و (سەلیبیەکانی عەکادا) بەسترا بوو، لە (عەکا) لەوە ئاگادار بوو کەوا (کتبغانوین) لە ئەردەن پەڕیوەتەوەو بەرەو (عین جالوت) هاتووە، ئەمیش بەرەو ڕووباری ئەردەن کەوتەڕێ، (بیبرس البندقداری) پێش ئەو گەیشتە (عین جالوت) دەستی کردە سووکە شەڕ تا (قطز) پێی گەیشت، لەو شەڕەدا کە لەنێوان سوپای ئیسلامی و مەغۆلیدا ڕوویدا، موسڵمانەکان سەرکەوتن، سوپای مەغۆل زۆریان لێ کوژرا. (کتبغانوین) لەو شەڕەدا کوژرا و سوپاکەی هەڵات، شەڕەکە لە ڕۆژی هەینی ٢٦ی ڕەمەزانی/ ٣ی ئەیلول ڕوویدا.[٢٩]

## ئەنجامەکانی شەڕی (عین جالوت)

شەڕی (عین جالوت) بە ڕووداوێکی گرنگ لەمێژوودا دەژمێردرێ، گەلێ ئەنجامی گرنگی لێ کەوتەوە:

- مەغۆل بۆ یەکەمجار لەمێژوویاندا لە ڕۆژهەڵات شکستی هێنا و سوپاکەی تێك و پێك درا. مەمالیکەکان ئەوەیان پووچەڵ کردەوە کەوا مەغۆل شکست ناهێنێ.
- دوای شەڕی (عین جالوت) مەمالیك دەستیان بەسەر وڵاتی شامدا گرت تا دەگاتە ڕووباری فورات، میسر و وڵاتی شامیان یەکخست دوای ئەوەی نەوەکانی سەلاحەدین و ناکۆکییەکانیان وڵاتیان تووشی لاوازی و پارچە پارچە بوون کردبوو.
- ئەو سەرکەوتنەی مەمالیك لە (عین جالوت) ئیسلام و موسڵمانانی لەمەترسییەکی گەورە ڕزگار کرد.

- شەڕی (عين جالوت) سەڵتەنەی مەمالیکەکانی کردە هێزێکی سەرەکی لە ڕۆژهەلاتی عەرەبی ئیسلامیدا بۆ ماوەی دوو سەدە بەهێز مانەوە تا دەوڵەتی خەلافەتی عوسمانی دامەزرا.

- سەرکەوتنەکەی (عين جالوت) ورەی بە موسڵمانانداً، بەتایبەتی موسڵمانانی ئێران کە لە ژێر دەسەڵاتی مەغوڵیدا بوون، هەڵوێستیان بەهێز بووەوەو توانیان لە پێش دەستدرێژییەکانی نەسرانیەکان راوەستن و ئەم سەرکەوتنە، هانیانی دا، داوا لە مەغوڵ بکەن بێنە ناو دینی ئیسلامەوە.

- پەیوەندی لەنێوان فەرمانڕەواکانی مەمالیك و فەرمانڕەوا مەغولە موسڵمانەکان پتەوتر بوو لە ولاتی (قبجاق) هەردوو لا بوونە هاوپەیمان لەدژی خێزانی هولاکۆ لە ئێران.

- ئەم سەرکەوتنەی (عين جالوت) شکستی بە سیاسەتی سەلیبییەکان هێنا لەڕۆژهەلاتی عەرەبیدا، دەیانویست لەگەڵ مەغوڵدا ببنە هاوپەیمان دژی موسڵمانەکان و لەناوبردنی ئیمارەتەکانی سەلیبی لەولاتی شامدا.

کۆتایی (قطز) و دەسەلات بەدەستەوە گرتنی بیبرس لەمیسر

(قطز) دوای یەکخستنی کاروباری ولاتی شام، بۆ قاهیرە گەڕایەوە، مەترسی مەغوڵیش لەئارادا نەمابوو، بەلام ناکۆکی لەنێوان (قطز) و مەمالیکی دەریایی بەفەرماندەی (بیبرس) سەریهەڵدا، ئەمەی دوایی لەهەل دەگەڕا بۆ لەناوبردنی (قطز)، ئەویش لەتوڵەی (ئاقطاي)دا، کە (قطز) لەلایەکەوە لە کوشتنەکەی پەشیمان ببووەوە، کە ئەگەر بەسەر مەغوڵدا سەرکەوت، (حەڵەب) بداتە دەستی ئەوەوە..

(قطز) کەوتە گومان لەفەرماندەکەی، خۆی لێ دەپاراست، مەمالیکی دەریایی هانی (بیبرس)ی دابو بۆ کوشتنی (قطز)[٣٠] لەراستیدا هۆی ناکۆکییەکانی نێوان سەرکردە مەمالیکەکان بۆ دەستکەوت و پارە دەگەڕایەوە، (قطز) دوور بین نەبوو، چونکی دوای (عين جالوت) بیبرس پلەوپایەی لەناو خەڵکیدا بەرزبووەوە..

بیبرس، بڕیاری تۆڵەسەندنەوەی لە (قطز)دا بوو، کاتێ بۆ قاهیرە دەگەڕایەوە لە ١٥ی ذي القعدەی ساڵی ٦٥٨ی کۆچی / ٢٢ی تشرینی یەکەم ساڵی ١٢٦٠ی زایینی، (قطز)ی کوشت و خۆی دەسەڵاتی بەدەستەوە گرت.

## ئەو کارانەی بیبرس لەشام ئەنجامی داوە

(بیبرس) دوو ئامانجی لەپێش خۆی داناو هەوڵی جێبەجێکردنیانی دەدا:

یەکەم: ناوەکی، هەوڵی دەدا دەسەڵاتەکەی بچەسپێنێ.

دووەم: دەرەکی، هەوڵی لەناوبردنی سەلیبییەکانی دەدا و لەوڵاتی شامیان دەربکات و شەڕی ئەرمەنیەکان و سەلیبییەکانی ئەنتاکیە بکات، چونکی ببوونە پاڵپشتی مەغۆل.. دواجار لەسەر حیسابی ئەوانە دەسەڵات و موڵکەکانی فراوان بکاتەوە. لەباکووری وڵاتی شام و ئاسیای بچووکدا و پەیوەندی بە مەغۆلی (قەبجاق)ەوە بکات تا پێکەوە دژی مەغۆل لەئێران دەست بەکارین.

(بیبرس) لەمیسر، کەسی بەرەنگار نەبووەوە، بەڵکو لەلایەن (سنجر حەڵەبیەوە) کە لەدیمەشق جێگری بوو تووشی بەرەنگاری بووەوە بەڵام (بیبرس) هێرشی کردە دیمەشق و بەسەر سوپاکەی (سنجر)دا سەرکەوت و لەساڵی ٦٥٩ی کۆچی / ١٢٦١ی زایینی چووە ناو شارەکەوەو کاروباری شارەکەی ڕێکخستنەوە.[٣٠]

دوای ئەوەی خۆی لەناوەوە چەسپاند، ئاوڕی بۆ دەرەوە دایەوە، ئەو پلانانەی دانابوو بۆ هێرشکردنە سەر سەلیبییەکان لەوڵاتی شام دەستی بەجێ بەجێکردنیان کرد. لەساڵی ٦٦٤ی کۆچی / ١٢٦٥ی زایینی (قەیسەری و یافا و ئەرسوف)ی گرت. هێرشی کردە سەر هەندێ لەقەڵاکانی ئەو دەوروبەرە، لەماوەی دوو ساڵی داهاتوودا (صفر و رملە و تبنین و قلیعات و حلبا و عرقە)شی داگیر کرد.[٣١] ئەو سێ قەڵایەی دوایین پارێزگاری لەباکوور و باکووری ڕۆژهەڵاتی تەرابلسیان دەکرد، گرنگی ئەو سێ قەڵایە لەلایەن مەمالیکەوە هەنگاوێکی گرنگ بوو بۆ گرتنی تەرابلس.

ئەوجار، کەوتە سزادانی ئەرمەنیەکان و سەلیبیەکانی ئەنتاکیە، ئەوەبوو لەسەرەتای ساڵی ٦٦٠ی کۆچی / کۆتایی پاییزی ١٢٦١ی زایینیدا، سوپایەکی

ناردبوو، بۆ گرتنی حەڵەب، دوای ئەوەی میرە مەملوکیەکە یاخی ببوو.. دواجار دەست کرایە هێرشی ئەنتاکیە، بەلام (هیسوم)ی شای ئەرمینیای بچووك، پەنای بۆ هولاکۆ برد، ئەویش هێزێکی سەربازی بۆنارد، لەگەڵ سوپای ئەرمەنیدا لە رزگارکردنی ئەنتاکیە بەشدار بوو.[٣٢] دەسەلاتی مەغۆل لەباکووری رۆژهەلاتی ولاتی شام ئەو هێزەی مابوو ببێتە مایەی ترس بۆ (بیبرس) ناچار پەنای بۆ سیاسەت برد، بۆ چارەکردنی ئەو تەنگو چەڵەمەیەی تووشی دەهات.

لەو کاتانەدا (برکە خان) ئامادەیی خۆی نیشاندا لەگەڵ (بیبرس) هاوپەیمانی پێك بهێنێ. لەئەنجامی ئەمەدا سوڵتان کەیکاوسی دووەم وەکو پێشتریش باسی لێوەکرا، ئازاد کرا. لەو کاتەدا سەرکردەیەکی تورکمان بەناوی (قرمان) لە باشووری رۆژهەلاتی قونیە جێنشین بوو، کە دەتوانرا بکرێتە ئامرازی گوشار ستنە سەر ئەرمەنیەکان.[٣٣] سەرەڕای کێشەکانی لەگەڵ هۆزی زێڕیندا، کە رێگەی لەهێرش کردنە سەر مەمالیکەکان گرت، هولاکۆ هێشتا تواناو هێزێکی وای هەبوو کە نەهێڵێ هێرش بکرێتە سەر هاوپەیمانانی، لەهەمان کاتدا هاوپەیمانی لەگەڵ بێزەنتیەکاندا بەگرنگی دادەنا، چونکی هۆیەك بوو تا تورکەکان ئەنادۆڵ سنووریان بۆ دابنرێت و دەست بەسەریاندا بگرێت. لەگەڵ ئیمپراتۆری بیزەنتیدا (میخائیل) کەوتە گفتوگۆ، لەئەنجامدا (ماریا) کچی ناشەرعی میخائیل، چووە پاڵ ژنەکانی هولاکۆ، بەلام ئەم هەنگاوە جێ بەجێ نەکرا بەهۆی مردنی هولاکۆوە لەساڵی ٦٦٤ی کۆچی / ١٢٦٥ی زاییندا.[٣٤]

مردنی هولاکۆ، هەلێکی باش بوو بۆ مەمالیك، مەغولەکانی ئێرانی لەکاتێکی ناسکدا لاواز کرد، هەروەها کاردانەوەیەکی خراپیشی هەبوو بۆ ئەرمەنیەکان و کورج و سەلیبیەکان. چونکی (طوقوز خاتوني) ژنی تەخت و عەرشی بە (ئاباقا)ی کوڕی راسپارد، بەلام بەفەرمی نەبووە (ئیلخان) تا چوار مانگ دوای کۆچی باوکی، هەروەها مولکەکانیشی دابەش نەکران، لەم کاتانەدا (ئاباقا) لەلایەن ئامۆزاکانیەوە هەڕەشەی لێ دەکرا و تا هێرشیانیش کردە سەری.[٣٥] حکومەتی مەغۆل لەئێران بۆی نەدەکرا دەست بخاتە کاروباری رۆژئاوای ولاتی شامەوە، (بیبرس) کە بوو

بووە مایەی کێشە نانەوە بۆ (ئیلخان) دەیتوانی هێرشەکانی لەدژی سەلیبییەکان دەست پی بکاتەوە بێ ئەوەی ترسی مەغوڵی هەبێ.
(بیبرس) زۆر بەتەنگی ئەوەوە دەهات دەسەڵاتی خۆی لەباکووری وڵاتی شامی بچەسپێنێ تا لەوێوە دەگاتە ئەنادۆڵ. بۆ ئەمە سەلجوقیەکانی رۆمی هێنایە پاڵ خۆی، تا ناوچەکەی بۆ ببێتە پەرژینێك بە رووی مەغوڵە ئیلخانیەکاندا. لەلایەکی دیکەشەوە پەیوەندی بە مەغوڵی قەبجاقەوە بکات. بۆ ئەنجامدانی ئەم سیاسەتەی، (بیبرس) دەستی کردە هێرشکردن بۆ ترابلس و ئەنتاکیە.[٣٦]
ئەرمەنییەکانیش چاوەڕێی ئەو هێرشەیان دەکرد. (هیسوم) ناچار دەرگای وتوێژی لەگەڵ (بیبرس)دا کردەوە. بیبرس، داوای ئەمانەی لەهیسوم دەکرد:
- هیسوم بێتە ژێر دەسەڵاتیەوە.
- جەزیە بدەن.
- رێگای (دروب) لەبەردەم هێزی مەمالیکدا بکرێتەوە.
- یارمەتی خەڵکی بدەن تا بتوانن ئازووقە بکڕن.
هیسوم، ئابڵۆقەی ئابووری خستبووە سەر مەمالیکی میسر. رێگای نەدەدا، دار و ئاسن لەئاسیای بچووکەوە بگاتە میسر[٣٧] بەڵام وتوێژەکان، ئەنجامێکی وایان بەدەستەوە نەدا، رەنگە (هیسوم) ترسی مەغوڵەکانی هەبووبێ، کە هەستی کرد شەڕ روو دەدات و چارەی نییە و هێزەکانیشی ناتوانن بەرگری هێزەکنی مەمالیك بگرن، خۆی گەیاندە (تەبرێز) لەساڵی ٦٦٤ی کۆچی / ١٢٦٦ی زایینی داوای یارمەتی لەمەغوڵ کرد.[٣٨]
لەم کاتەدا مەمالیك بەفەرماندەی (منصوری دووەم) میری حمص هێرشی کردە سەر سوپایەکی ئەرمەنی لە (دروب الشام) بە فەرماندەی کوڕەکانی هیسوم (لیون و سوروس).. لەنزیکی (دربساك) لە ذي القعدەی ساڵی ٦٦٤ی کۆچی / ئابی ١٢٦٦ی زایینی شەڕ لەنێوانیاندا بەرپا بوو، (سوروس) کوژرا و (لیون) بەدیل گرتیان.[٣٩] سوپای مەمالیك بەرەو قیلیقیە رۆیشت. شارەکانی (ئیباس و ئەدەنەو تەرسوس)یان تاڵان کرد، گەیشتنە (سیس) دوای تاڵانکردنی سووتاندیان، دواجار

لەناوچەکە لەمانگی ئەیلولدا کشانەوە، لەگەڵ دەستکەوت و دیلەکاندا چوونە حەڵەب.[٤٠]

(بیبرس) لەمانگی رەمەزانی ساڵی ٦٦٦ی کۆچی /ئایاری ١٢٦٨ی زایینی هێرشی بۆ ئەنتاکیە کرد. لەو کاتەدا (بوهیۆمۆندی شەشەم) فەرمانڕەوای تەرابلس بوو، (سیمون مانسل) پارێزگاری شارەکەی دەکرد، ژمارە سوپاکەیان زۆر نەبوو، نەیانتوانی پەرژینەکان بپارێزن و (سیمون) لەئاستی فەرماندەییدا نەبوو، هێرشێکی سەرکێشانەی کردە سەر سوپای مەمالیك، بەدیل گرتیان، (بیبرس) کردییە بیانووی دەستی و گوشاری پێ خستە سەر سوپاکەی. دواجار، دوای سەرنەکەوتنی وتوێژ، چوونە ناو شارەکەوە.[٤١] کە ئەنتاکیە گیراو ئەرمینیا لاواز کەوت دوای ئەو گورزە کوشندانەی (بیبرس) مەمالیك لە ئەنادۆڵ نزیك بوونەوە.

## سەلجوقییەکان لەنێوان مەغۆڵ و مەمالیکدا

سەلجوقیەکانی رۆم چوونە ناو ئەنادۆڵەوە، بەهۆی گرنگی جێگاکەیانەوە لەناو گێژاوی ناکۆکیەکانی نێوان مەغۆڵ و مەمالیکدا، سیاسەتیان بەپێی گۆڕانی تای تەرازووی هێزەکان دەگۆڕا، هەندێ جار لەگەڵ مەغۆڵەکاندا بوون و یارمەتیان لەوان وەردەگرت و لەریزەکانی ئەواندا شەڕیان دەکرد، لەژێر ئاڵایاندا بوون، هەندێ جاریش لەگەڵ مەمالیکدا بوون، پەنایان بۆ دەبردن تا لەژێر دەسەڵاتی مەغۆڵ رزگاریان بکەن. بەڵام کۆمەڵێ لەمیرەکان ئاڵای بەرەنگاریکردنی بوونی مەغۆڵیان لەوڵات هەڵگرت، لەم لاپەڕەیەدا، ریبازە سیاسییەکانی سەلجوقیەکان لەنێوان مەغۆڵ و مەمالیکدا دەردەخەین:

دوای گرتنی ئەنتاکیە لەلایەن مەمالیکەوە، سەلیبییەکان داوای یارمەتیان لە مەغۆڵ کرد، لەهەمانکاتدا ئەوانەش دەیانڕوانیە جوڵانەوەکانی سوڵتانی مەمالیك لە جزیرەو باکووری شام. لەسەر ئەو داواکردنەی سەلیبییەکان (ئاباقا) فەرمانی دا بە هێزەکانی مەغۆڵ کە لە ئەنادۆڵ بون و (سمغار) فەرماندەیی دەکرد، بەرەو وڵاتی شام بکەونەڕێ.. هەروەها فەرمانی بە (بروانا)ش کرد تێکەڵ ئەو هێزە ببێ،

وەزیـری سـەلجوقی کـە ئـەم فەرمانـەی پێگەیشت لـەدەرباری مـەغوّل لەتـەبرێز دەگەڕایەوە بەیاوەری سولّتان کەیخوسرەوی سێیەم.

دەهەزار جەنگاوەری مەغوّل لەگەڵ هێزێکی سـەلجوقیدا کۆبـووەوە. سـاڵی ٦٧٠ی کۆچی / ١١٧١ی زایـینی، بـەرەو (بستان) کەوتنـەڕێ.. لـەوێوە چـوونە (مـرعش) سیخوڕەکان هەواڵیان پێ گەیاندن، کەوا (بیبرس) لەدیمەشقە.. هێزێکیان نـارد لـە هەزار و پێنج سـەد سـوارە پێکهـاتبوو. تـا سووسـەی دەنـگ و باسـەکان بکـەن و هێرشیش بکەنە سەر حەڵەب. تـا (عینتـاب) و (قستون) ڕۆیـشتن، لـەوێ هێزێکـی تورکمانیـان بـینی لـەنێوان (حـارم) و (ئەنتاکیـە)دا هـەموویان کوشـت و بـەرەو (ئەفامیە) ڕۆیشتن.

هێزەکانی مەمالیك لەناوچەکە کشانەوە، لەبەردەم هێزەکـانی مـەغوّل و گەڕانـەوە دیمەشق، (بیبرس) بەپەلە داوای یارمەتی لەمیسر کـرد. کـە یارمەتیەکـە گەیـشت، بەفەرماندەیی خۆی هێرشی کردە سەر هێزەکەی مەغوّل. بەڵام مەغولەکان زووتـر بیستبوویان هێرش دێنێ، بەرەو باکوور کشابوونەوە. هێزێکی بەفەرماندەیی (مـیر شمس الدین فارقی) بەدوایاندا نارد تا (مەرعش) کەوتە شوێنیان، کەسیان نـەبینی گەڕانـەوە حەڵـەب.[٤٢] (ئاباقـا) چـەند نوێنـەرێکی بـۆ دیمەشـق نـارد، داوای لـە (بیـبرس) کـرد پـەیمانی ئاشـتبوونەوە ببەسـتن، (بیـبرس) ڕازی بـوو، ئـەمیش بـە (ئاباقا)ی ڕاگەیاند کـەوا ئـەو جێگـا ئیـسلامیانەی داگـیر کـردووە بیگەڕێنێتـەوە.. سەرکردە مەغولیەکە بەمـە ڕازی نـەبوو، پێـشنیاری ئـەوەی کـرد هـەر لایـەك چـی لەژێر دەستدایە وەکو خۆی بمێنێتەوە. (بیبرس) ئـەم پێـشنیارەی قـەبوڵ نـەبوو، وتوێژەکانیان سەرنەکەوت، لەئەنجامی هەڵوێستی ڕقی هەردوولا، وڵاتی سـەلجوقی خۆی بۆ شەپۆلێکی دیکەی شەڕ ئامادەکرد.[٤٣]

سیاسەتی (بیبرس) لەسەر ئەوە دامەزرابوو بەرامبەر سەلجوقیەکان، موڵکـەکانیان بخاتە پاڵ موڵکەکانی لە وڵاتی شام و میسر، لەبەر دوو هۆ:

یەکـەم: کـە ئـەو وڵاتانـە کەوتـە ژێـر دەسـتی، دەتـوانی پەیوەنـدی بـە (مـەغولی قەبجاق)ـەوە بکات و ڕێك بکەون چۆن لە ڕووی مەغولی ئێران ڕاوەستن.

دووەم: کەمکردنەوە فشاری مەغوّلی ئیلخانی لەسەر وڵاتی شام.

لەئەنجامی گوشاری مەغۆل لەسەر وڵاتەکەی. (بروانا) بوونی لەگەڵ (ئاباقا) لەگەڵ نوێنەرانی (بیبرس)دا، گلەیی ئەوەی کرد، کەوا (ئاجای) برای و فەرماندە (سمغار) زیادە ڕۆیی دەکەن، (ئاجاری) داوای هەندێ شتی لێ دەکات پێی ناکرێ و هەڕەشە دەکات، (ئاباقا) داوای لێکرد ئەمە بەنهێنی بهێڵێتەوە تا لێی دڵنیا دەبێت، کە گەڕاپەوە وڵاتی خۆی (ئاجای) ڕووی لێ وەگێڕا. ئەوکاتە بە جددی بیری لەوە کردەوە، لەگەڵ (بیبرس)دا هاوکاری یەکتر بکەن، نامەیەکی بۆ نارد، ڕایگەیاند کەوا دێتە ژێر دەسەڵاتیەوە بەرامبەر بەمانەی خوارەوە:

– دان بنێ بە سەربەخۆیی وڵاتی ڕۆمدا و بە سوڵتان کەیخوسرەوی سێیەم وەکو فەرمانڕەوای وڵاتی ڕۆم.

– تیپێکی سەربازی بنێرێ لەوڵات بمێنێتەوە، ئەگەر پێویستی کرد شەڕی مەغۆل بکەن.

بیبرس، ئەمەی پێ باش بوو، حەزی کرد لەگەڵ حکومەتی فەرمی سەلجوقیدا هاوکاری بکات، بەڵام داوای لێبوردنی کرد کەوا ئێستا بەم دەستو بردە ناتوانێ بێ، بەڵام ساڵی داهاتوو دێتە لای.[44]

لەو ماوەیەدا ناکۆکی هەر بەردەوام بوو لەنێوان (بروانا) و فەرماندەی مەغۆل (ئاجای)دا. یەکەم هەوڵی دەدا هەرچی چۆنی دەبێ لەوڵات دەری بکات، ساڵی ٦٧٤ی کۆچی / ١٢٧٥ی زایینی ئەو هەلەی بۆ ڕەخسا، کاتێ (ئاباقا) داوای لە (کەیخوسرەوی سێیەم و وەزیرەکەی) کرد بێتە دەربار، تا لەبارەی کوشتنی سوڵتان (قلیج ئەرسەلانی چوارەمەوە) لێکۆڵینەوەی لەسەر بکەین. بەڵام (بروانا) نەیوێرا دەست بۆ (ئاجای) درێژ بکات، کە ئەندامی وەفدەکە گەیشتنە (سیواس) ئاگاداری کردنەوە، کەوا (ئاجای) لەلایەن پیاوانی (بروانا)ـەوە، سوکایەتی پێکراوەو ئیهانەیان کردووە، بەتایبەتی (ضیاء الدین بن الخطیر) وەزیری سەلجوقی نامەیەکی بۆ (ئاباقا) نارد، کردەوەکانی (ئاجای) بۆ ڕوونکردبووەوە، (ئاجای) نامەیەکی بۆ (ئاباقا) نارد، دیفاع لەخۆی دەکات لەنامەکەدا، کەنامەکەی بینی، نامەیەکی دیکەی بۆ نارد، پێی دەڵێ: هەرچی دەکەی ئازادی و (بروانا) شی دایە دەست داوای لێ دەکات ڕای خۆی دەربارەی بڵێ.. (بروانا) تا خۆی

لەشەڕی دوور بخاتەوە، بەدیاری دڵی دەدایەوە.[٤٥] (بروانا) كۆڵی نەدا، هەمیشە لەپارێزا بوو بۆ دەستوەشاندن، بەڵام زیرەكی و فێڵی بەكار هێنا بۆ گەیشتن بەمەبەست، تۆمەتی ئەوەی دایە پاڵ كەوا لەگەڵ (بیبرس)دا پەیوەندیان هەیە. ئەم دەنگوباسانەی لەوڵاتدا بڵاوكردەوە، تاگەیشتە (ئاباقا) هەموویانی بۆ لێكۆڵینەوەی ئەم تۆمەتە ترسناكە بانگكرد، (بروانا) لەگەڵ خۆیدا ئەو میرانەی برد، كە تووشی گوشار بوو بوون لەلایەن (ئاجای)ەوە، تا گلەیی خۆیان لەپێش (ئیلخان) دا بكەن، دوای ئەوەی گوێی بۆ بیروڕا جیاوازەكان گرت، بڕیاریدا (ئاجای) لای خۆی بمێنێتەوە، حەوت كەسی لەوانەی زوڵمیان كردبوو كوشت.[٤٦] دوای ئەوەی (بروانا) گەیشتە مەبەست، وەفدی سەلجوقی دەربارەی مەغۆلیان بەجێهێشت و گەڕانەوە ئەنادۆڵ. هەر كە گەیشتن لە (ئیلخان)ەوە فەرمانیان پێكرا، لەگەڵ هێزەكانیاندا بڕۆن بۆ (بیرە) و داگیری بكەن.[٤٧]

سوپایەكی هاوبەش (سەلجوقی– مەغۆلی) پێكەوە دەرچوون كە ژمارەیان سی هەزار دەبوو، نیوەی مەغۆل بوون، بەفەرماندەی (نابشی) و (ئەتقطای). ئەو نیوەكەی سەلجوقی بوون، بەفەرماندەی (بروانا) بوو، كە گەیشتنە (بیرە) وەرز زستان بوو، ئابڵۆقەیاندا.[٤٨]

لەو كاتەدا كە لە (بیرە) بوون، (بروانا) گوێ قوڵاغ بوو، دنگو باسی (بیبرس)ی گوێ لێ بێ، بەڵكو لەگەڵیا دەبنە یەك و مەغۆڵەكان لەناو دەبەن، چوار سەد سوارەی مەغۆلی نارد تا دەنگو باسی سوپای مەمالیك بزانن، مەبەستیشی ئەوەبوو، بەڵكو دەكەونە تۆڕی هێزەكانی مەمالیكەوەو لەناویان دەبەن، ئەگەر وابوو و بیبرس نزیك بوو، ئەوا هێرش دەكاتە سەر هێزی مەغۆل، دواجار دەڕواتە لای (بیبرس) تا ئەو بەڵێنەی دابووی بەدی دەهێنێ كە دەسەڵات بەسەر وڵاتی سەلجوقیدا بگرێ و شەڕی مەغۆلەكان بكات. كە هێرەكەی مەغۆل لە فوڕات دەپەڕنەوە بەرەو وڵاتی شام، ئەو سێ كەسە دەبینن كە (بروانا) ناردبوونی بۆ لای (بیبرس). نامەی (بیبرس)یان پێ بوو، بۆ وەزیری سەلجوقی ناردبوو، داوای لێدەكات خۆی بگرێ و هاوكاری مەمالیك بكات. كە ئەو نوێنەرانەیان هێنایە لای فەرماندە مەغولیەكەو نامەكەی بینی، بڕیاری كوشتنی (بروانا)ی دا، بەڵام

سەرکردەیەکی ئەرمەنی بەناوی (سمعان)، داوای لێکرد ئەو هەنگاوە نەهاوێژێ، تاکو نەچنە (بیرە)و خۆیان قایم بکەن پێشنیاری کرد لەشوێنێکی تردا بیکوژێ دوای ئەوەی لەبیرە نامێنن.[٤٩] (ئاقتای) بروانای بانگکرد و ئەو پیاوانەشی روو بەڕوو کردەوە، (ئینکاری کرد) سەرکردە مەغۆلیەکە بەدەم بڕوای پێهێنا، بەلام لەدڵەوە هەڕەشەی لێدەکرد. ئەو نوێنەرانەی کوشت و نامەکەشی بۆ (ئاباقا) نارد.[٥٠]

(بیرە) نەگیرا، بەهۆی بەفر بارینێکی زۆرەوە، ئابلۆقەکەیان هەلگرت و گەڕانەوە ئەنادۆڵ، دوای ئەوەی کەرەستەکانیان لەوێدا سوتاند تا دەستی دوژمن نەکەوێت.[٥١] کاتێ (بیبرس) هەواڵی (بیرە)ی پێگەیشت، بەسوپایەکەوە دەرچوو تا هێرشیان بکاتە سەر، بەلام مەغۆلەکان لەوێ نەمابوون.[٥٢] دوای سەرنەکەوتنی مەغۆل، (بروانا) زۆرتر بەپەرۆشەوە بوو، کارێکی وا بکات (بیبرس) بۆ ولاتی رۆم بێت. هەستی کرد لەگەڵ مەغولەکاندا هیچ پایەو نرخێکی نییە، داوای لەو هەندێ لە میرانە کرد کە وەکو ئەو بیریان دەکردەوە، مەغۆلەکان ببەزێنن و هاوکاری (بیبرس) بکەن. لەوانە _حسام الدین بیجار) بەرپرسی دیاربەکر و (بهادر)ی کوڕی. (شرف الدین مسعود) و (ضیاء الدین محمود) و براکەی و (امین الدین میکایل).. بەلام (میر جلال الدین المستوفی) و (ئەتابەك مجدالدین) لەدژی ئەم رایە وەستان.. بەلام (میر سیف الدین طرنطاي بگلربکی) بێ لایەن وەستاو چووە ماڵی خۆی دانیشت.[٥٣]

(بروانای) نموونەیەکی لەو نووسراوەی پشتگیری ئەوی تێدا بوو بۆ (بیبرس) نارد. وادیارە (بیبرس) هێشتا بەباشی ئامادەی ئەم سەرکێشیە ئەنجام نادیارە نەبوو، چونکی دەیزانی، میرەکانی سەلجوقی لەناو خۆیاندا رێك و تەبا نین، بۆیە داوای لێبووردنی لە (بروانا) کرد، کەوا سەربازەکانی ناتوانن لەم کاتەدا ئەو دەربەندە ببڕن، بەلام لەبەهاردا بەدڵنیاییەوە دێتە ولاتی رۆم.[٥٤]

(ئاباقا) بۆ لێکۆڵینەوە (بروانا)ی بانگکرد سەبارەت بە نامە گۆڕینەوەی لەگەڵ (بیبرس)دا، مکوڕ بوو کە دەبێ بەپەلە ئامادەبێت، بۆ ئەوەی لەم تەنگە تاوییە دەرچێت، لەگەڵ میر (طرنطاي) دا رێکەوت، کەوا لەکاتێکدا لەسەربازگەی

مەغۆلەکانـدا دەبێـت چـەند نامەیـەکی بـۆ دەنێـرێ، گوایـە هێزەکـانی مـەمالیك بەرێگاوەن، ئەگەر زۆر نەیەت ئەوا ولات داگیر دەکەن، کە بروانـا ئـەو نامانـەی بـە ئاباقـا نیـشاندا، فێڵەکـەی بەسـەرا تێپـەڕی ماوەیـدا بگەڕێتـەوە ولات، هـەروەها سوپایەکی مەغۆلیشی لەگەڵدا نارد بە فەرماندەی (توان نـوین) و (تۆغـۆ ئاغـا) بـۆ وەستان لەرووی هێزەکانی بیبرس.[٥٥]

لەم کاتانەدا، ئەو میرانەی سـەر بـە (بیـبرس) بـوون، بـۆ دیمەشـق کۆچـیان کـرد، لەوانـە (مبارزالـدین جاشـنگیر و سـیف الـدین جنـدار وبدرالـدین)ی کـوڕی لەگـەڵ (بیبرس) کۆبونەوە، پێشوازی گـەرمی لێکـردن، هـەر لـەو دەمـەدا، لـەولاتی شـام ئاژاوەی سیاسی و نائارامی بلاو ببووەوە، وەکـو شۆڕشـی (شـرف الـدین مـسعود) هێرشیان دەکردە سەر لەشکرگاکانی مەغۆل، کە لە شارە سەرەکیەکاندا بلاو بـوو بـوون، (مـیر محمـد قرمـان) یارمـەتی شۆڕشـگێڕەکانی دەدا، هێرشـیان کـردە ناوچەکانی کەنار دەریا، تا دەهات (بروانا) هەڵوێستی لەدەست دەردەچوو.[٥٦]

(شرف الدین مـسعود) لەهـەموو ولاتـدا بلاویکـردەوە، کـەوا سـوپای مـەمالیك لـەم نزیکانـە دەگـەن، وەفـدێکی سـەلجوقی چـوونە ولاتـی شـام و لەگـەڵ (بیـبرس) کۆبوونەوە، هانیان دەدا فریا بکەوێ زوو بێت تا ئـەم هەڵوێـستە رزگـار بکـات.[٥٧]

وەکو (بیبرس) گوتووبووی دیارە هێشتا وەختی نەهاتووە، (مـن بـەڵێنم بـە بروانـا داوە لەکۆتایی ئەمساڵدا دێم)[٥٨] یاخی بوونەکـەی (شـرف الـدین مـسعود) ئاشـکرا بوو، ئاژاوە کەوتە ولاتەوەو دەستکرا بە تالان و دژی (شرف الدین مـسعود) ناچـار بـوو لەگـەڵ دەسـتو پێوەندەکانیـدا بـۆ بیابـانی مەشـهەد بـڕوات. کەیخوسـرەوی سێیەم، چووە پاڵ (مسعود)ەوە دروشمی شا (بیـبرس)یـان بـەرزکردەوە، دواجـار هەموویان چوونە (نکیدە) تا لەوێ جێنشین بن، بەلام مەغۆلـەکان توانیـان (شـرف الدین) بگرن و بردیان بۆ سەربازگەکەی مـەغول بـۆ دادگـاییکردنی، کەیخوسـرەوی سێیەم و هەندێ لەمیرەکانیش لەوێ ئامادەبوون.[٥٩]

لەدیوانی (ئاباقا) دادگا دامەزرا، مەغولەکان داوایان لە سوڵتان کرد روونی بکاتەوە لەبەرچـی دەیـەوێ بـچێتە پـاڵ مـەمالیك، وەلامـی دایـەوە (مـن منـداڵ بـووم و

نەمدەزانی کامە راستە کامە هەڵەیە.. کە بینیم گەورە پیاوانی دەوڵەتەکەم وادەکەن، ترسام، بمدەن بەدەستەوە بۆیە رازی بووم..).
دواجار (سیف الدین طرنطاي) و (مجدالدین ئەتابەك و جلال الدین المستوفی)یان هێنا. (ئاباقا) لێی پرسین لەبەرچی لەمەغول هەڵگەڕانەوە، وتیان: (شرف الدین مسعود) فەرمانی پێداین و هەڕەشەی لێکردین، ترساین بمانکوژێ.. دواجار (شرف الدین مسعود)یان هێنا، تۆمەتی یاخی بوون لە مەغوڵەکانیان دایەپاڵ، فەرمانی کوشتنیان بۆ دەرکرد و ژمارەیەك لەمیرەکانیان ئازاد کرد.[٦٠]

## بیبرس ئەنادۆڵ داگیر دەکات

### سەرەتا

ساڵی ٦٧٤ی کۆچی /١١٧٥ی زایینی، بیبرس وا بەهێز بوو، دەیتوانی وڵاتی رۆم بهێنێتە ناو دەوڵەتەکەیەوە، بارودۆخی سیاسی لەبار بوو، سوڵتانی سەلجوقی کەیخوسرەوی سێیەم هێشتا منداڵ بوو، (بروانا) کە فەرمانڕەوای راستەقینەی وڵات بوو، سەرەڕای ئەو هەموو هەوڵەتی، نەیتوانی بارودۆخی داڕوخاوی ناوخۆ رابگرێ و ئاژاوەی ناو وڵات و شۆڕشەکان دامرکێنێ، هەروەها نەیتوانی کاروباری ئیمارەتەکان بەباشی بەڕێوە ببات، بەتایبەتی (ئیمارەتی قرمانیەکان) ئیلخانەکانیش نەیاندەتوانی بەتەواوی پارێزگاری لەسەڵتەنەی سەلجوقیەکان بکەن، بەهۆی یاخی بوون و راپەڕینەکان کەدژی دەسەڵات ئەنجامیان دەدا، سەربازگە بەهێزەکانی مەغوڵیش نەیاندەتوانی چارەیەك بۆ ئەم بارودۆخە بکەن.
ئەرمەنیەکانیش لە قیلیقیە لاواز بوو بوون بەهۆی هێرشەکانی مەمالیك کە هەر لە ٦٦٤ی کۆچی / ١٢٦٥ی زایینیەوە بەردەوام بوو. سەلیبیەکانیش، لەچەند ئیمارەتێکدا سەری خۆیان کز کردبوو، (بیبرس) توانی لەیەکیان دوور بخاتەوەو، یەکە یەکە هێرشیان بکاتە سەر، تا توانی زۆربەی شارەکانی کەناری دەریا بگەڕێنێتەوە سەرەڕای هەندێ لەقەڵاکانی ناوەوە، ئەوەشی مابووەوە لاواز ببوون لەگەڵ حکومەتی (عەکا)دا ئاگربەستی مۆرکرد لەساڵی ٦٧٠ی کۆچی / ١٢٧٢ی

زاییبنی بۆ ماوەی دەساڵ و دە مانگ و دەسەعات،بەمەبەستی ئەوەی رۆژئـاوا ئـیتر دەست وەرنەداتە کاروباری رۆژهەڵاتەوە.

## شەڕی بستان

(بیبرس) بەسوپایەکی گەورەوە رۆژی پێنج شەممە ٢٠ی رەمـەزانی ٦٧٥ی کۆچـی / کۆتایی شوباتی ١٢٧٧ب زاییبنی لەقاهیرەوە بەرەو دیمەشـق دەرچـوو، ئـەو مـیر سەلجوقیانەشی لەگەڵدا بوو کە پێشتر پەنایان بۆ هێنـابوو، لـەرۆژی سـێ شـەممە ١٧ی شـەواڵ / ٢٤ی ئـازار، گەیـشتە دیمەشـق، لـەوێوە بـۆ حەڵـەب رۆیـشت، جێگرەکەی (میر سیف الدین علی مجلی) بۆ (ساجور) نارد.[٦١] تـا لەگـەڵ هێزێکـدا لە فورات بمێنێتەوە تاکو نەهێڵێ مەغۆڵەکان بۆ وڵاتی شام بپەڕنەوە، لـەو کاتـەی کە لە ئەنادۆڵ دەبێ.[٦٢]

لەحەڵەبەوە بۆ (حیلان) دواجار بۆ (عینتاب) رۆیی لەوێشەوە بۆ (مەرج) و (دیباج) و (کینـوک).[٦٣] دواجـا لـە رووبـاری شـین پەڕیـەوەو بەدەربەندەکانـدا تێپـەڕی و گەیشتە دەشتاییەکان، پێشەنگی هێزەکەی، کـە بەفەرمانـدەی (مـیر سـنقر) بـوو، لەگەڵ پێشەنگی هێزێکی مەغۆڵدا، کە سێ هەزار کەس بـوون رووبـەڕوو بوونـەوەن هێزەکەی مەغۆلی شکان و زۆریشی لـێ بەدیل گرتن.[٦٤]

ئەرمەنییەکان لە قیلیقیتە یەکەم کەس بوون زانیان کەوا هێزەکانی مەمالیك بەرەو ئەنادۆڵ دەڕۆن، شا لیونی سێیەم (ئاباقا)ی لەهاتنیان ئاگادار کردەوە.

(بروانا) لەبازنەی بەرژەوەندیەکانی خۆی کەوتە کارکردن، نامەیەکی بـۆ سـەرکردە مەغۆڵەکان نارد، قسەکانی (لیـونی) بەدرۆخـستەوە و مەغۆڵـەکانی دڵنیـا کـردەوە لەبارەی بارودۆخی سیاسی و سەربازی لەوڵاتدا (ئیلخان)بڕوای پێکرد.

وادیـارە دەنگـو باسـی هێزەکـانی مـەمالیك گەیـشتە (ئاباقـا) بڕیاریـدا رووبـەڕووی هەڵوێستەکە ببێتەوە، پلانـی رووبـەڕوو بونـەوەی مـەمالیکی دارشـت، کـە لـە دوو بەش پێکهاتبوو:

یەکەم: ویستی لەدەرچوونی (بیـبرس) سـوود وەرگـرێ تـا هێرشـی بـۆ بـەرێت بـۆ هـەڵگرتنی گوشـار لەسـەر هێزەکـانی لەئـەنادۆڵ، هێزێکـی نـارد لـە عەرەبـەکانی (خەفاجە) پێکهاتبوو بۆ لابردنی سەربازەکانی مەمالیك لەرێگەکان.

دووەم: فەرمانی بۆ هێزەکانی مەغۆل و سەلجوقی دەرکرد بەرەو (بستان) بڕۆن، بۆ شەڕی مەمالیك.(٦٥) کورجەکان بە سێ هەزار جەنگاوەر لەم شەڕەدا بەشداربوون.

لەگەڵ ئەم هەموو خۆ ئامادەکردنەدا، (ئاباقا) ئامانجەکانی نەهێنایە دی.. چونکی هێزەکانی مەمالیك کە لەسەر رووباری فورات بوون، عەرەبەکانی (خەفاجە)یان شکاند، بەمە (بیبرس هەوڵەکانی (ئاباقا)ی پوچەڵ کردەوەو خۆی بۆ وڵاتی ئەنادۆڵ تەرخان کرد، لەولاشەوە لەشام دڵنیابوو. هەردوو هێزی مەغۆل-سەلجوقی، بەفەرماندەی دوو فەرماندەی مەغۆلی (تووان نوین و تۆغۆ ئاغا) لەگەڵ (بروانا) دا، لە رێگای (بستان)ەوە، گەیشتنە چیاکان کە دەڕواننە بیابانی هونی. لەرێگای سیخورەکانەوە، هەواڵ گەیشتە فەرماندەکان، کەوا سوپای مەمالیك، سبەی دەگەنە ئەم ئاقارانە.. لەچیاکان شۆڕ بوونەوەو هاتنە رۆخی رووباری (جەیحان) هێزەکانیان بەسەر یانزە بەشدا دابەشکرد، هەر بەشێکی لەهەزار جەنگاوەر زیاتر بو، سوارەکانی مەغۆلیش بەجیا سەربازەکانی سەلجوقیەکانیان جیا کردەوە، چونکی گومانیان لەتوانای شەڕکردنیان هەبوو، لەوەش دەترسان، نەکو لەگەڵ بیبرس رێکەوتبێتن.(٦٦)

بۆ بەیانیەکەی، هێزەکانی مەمالیك گەیشتنە چیاکە (بیبرس) سەربازی دوژمنی بینی خۆیان ئامادە کردوە، ئەویش کەوتە خۆ ئامادەکردن و رێکخستنی سەربازەکان.

رۆژی هەینی ١٠ی ذي القعدة ٦٧٥ي کۆچی / ١٦ی نیسان ١٢٧٧ی زایینی لەرۆژێکی ساردا شەڕ دەستی پێکرد، لەپێشدا سوپای مەغۆلی هاتە پێشەوە. دوورە شەڕو تیر هاویشتن دەستی پێکرد. (بیبرس) هانی سەربازەکانی دەدا (جیهاد) دژی بت پەرستەکان بکەن، تێکئاڵان و رووبەڕوو بوونەوە، باڵی چەپی هێزەکەی مەغۆل، چوونە گیان ناوەڕاستی سوپای مەمالیك ئەمجار هێرشیان کردە سەر باڵی راست، (بیبرس) خۆی کەوتە شەڕەوە، ئاوڕی دایەوەن بینی وا باڵی چەپی سوپاکەی گوشاری باڵی راستی مەغولەکانی کەوتۆتە سەر، لەشکاندندا بوون، ژمارەیەك سوارەی پێ گەیاندن، لە قۆناغێکی شەڕەکەدا باڵی راستی

مەمالیك، هێزێکی مەغوڵیان لەناو برد، مەغۆڵەکان لەئەسپەکانیان دابەزین و شەڕی مان و نەمانیان دەکرد.. زۆریان لێ کوژرا.
(تووان و تۆغۆ) لەسەر یەکە هێرشیان دەکرد، ریزەکانی (مەمالیك) یان پەرش و بڵاوکرد، بەڵام دواجار زاڵ بوونەوە. هێزە هاوپەیمانەکە، ماندووبوونی پێوە دیار بوو، یەکە یەکە هەڵدەهاتن شەڕەکە بەشکانیهێزە هاوپەیمانەکە کۆتایی هات. شەش هەزار کەس لە مەغولەکان کوژران، لەناو کوژراوەکاندا، هەردوو فەرماندەکەش کوژرابوون و زۆریانیشی بەدیل لێ گرت. لە کورجەکان، هەزار سوارەیان لێ کوژرا لەگەڵ ژمارەیەك لەمیرەکانی سەلجوقیدا.(٦٧)
مەمالیك، سوپای مەغۆلیان تالان کرد، دیلەکانیان کوشت. بەگوێرەی ئەو زانیاریانەی (ابن العبری): بروانا، بەر لەدەستپێکردنی شەڕەکە، گۆشت و مەی، پێدابوون، سەریان گەرم بوو بوو، نەیاندەتوانی خۆیان لەسەر ئەسپەکانیان راگرن، کە کاری کردە سەر ئەنجامی شەڕەکە.(٦٨)
(بروانا) کە بینی چی بەسەر سوپای مەغۆلیدا هاتووە، هەڵات (بیبرس) چووە ناو سەربازگەکەی مەغۆلەکان، ئەو میرانەی دیل کرابوون، هەموویانی ئازاد کرد، (میر سنقر)ی بە هێزێکەوە نارد، تا بکەوێتە دووی هەڵهاتووەکان، دواجار بۆ قەیسەری رۆیشت، فەرمانی دا کڕین و فرۆشتن بەسکەی (ظاهري) بکرێت.(٦٩)

## دوای شەڕی بستان

هەندێ لەشارەکانی رۆم، هاتنە ژێر دەسەڵاتی (بیبرس)ەوە، وەکو (لارندا و دوالو).. دانیشتوانەکەی پێشوازیان لێکرد، لەنزیکی شاری دوالۆ لەبیابانی مەشهەد چادری هەڵدا، دانیشتوان لەهەموو چین و توێژەکانەوە بۆ پیرۆزبایی سەرکەوتنی بۆلای دەهاتن. سەلجوقیەکان بە گۆرانی و سەماو بەزم و رەزمەوە ویستیان پیرۆزبایی لێ بکەن، بەڵام رازی نەبوو، چونکی هەڵوێستەکە هی سوپاسگوزاری بوو نەك گۆرانی وتن. دوای ئەویە ئەو شارانەی گرتبوو کاروباری بەڕێوەبردنی تیا رێکخست، نامەی بۆ کوڕەکانی (قرمان) نووسی کە میرەکانی تورکمان بوون،

دیاری بۆ ناردن، دوجا چووە قەیسەری و لەسەر تەختی سەلجوقی دانیشت، وتار بەناوی ئەوەوە خوێندرایەوەو بەناوی ئەویشەوە سکەیان لێدا.(٧٠)

(بروانا) نامەی پیرۆزبایی بۆ (بیبرس) نارد بەبۆنەی چوونە سەر تەختی، نامەی بۆ نارد ئامادە بێ تا کاروباری وڵاتی بداتە دەست، داوای کرد پانزە رۆژ مۆڵەتی بدات، پلانی دانابوو پەنا بۆ مەغۆڵەکان ببات، دەیویست هەردوولا ماندوو بن، تا مەیدان بۆ سەلجوقیەکان چۆڵ بێت. شایانی باسە (بروانا) سیاسەتی دیار و یەك لای نەبوو، بەهەر حاڵ نامەی بۆ (ئاباقا) نووسی داوای لێ دەکات بەپەلە یارمەتی بۆ بنێرێ.(٧١)

بیبرس، دە رۆژ لە قەیسەری مایەوەن ئاگادار کرایەوە، کەوا وەزیری سەلجوقی نامەی بۆ (ئاباقا) ناردووە، لەترسا لەشارەکە چووە دەرەوە، چونکی سوپاکەی ماندوو بوو بوون و زەخیرەیان کەم بوو، ئالیکیان نەمابوو، زۆربەی ئەسپەکانیان تۆپی بوون. بەم حاڵەوە نەیدەتوانی بەرەنگاریان ببێتەوە. لە (قیرلو) چاوەڕێی کرد. نامەیەکی لە (برونا)ەوە پێ گەیشت داوای لێ دەکا چاوەڕێی بکات، وادیاربوو دەیویست دوای بخات، تا سوپای مەغۆلی دەگەن، بەڵام بیبرس لەو زیرەکتر بوو، وەڵامی دایەوە، کەوا (سەلجوقیەکان بەڵێن و مەرجەکانیان بەجێ نەهێنا، کە لەسەر عەرشی سەلجوقی دانیشت تا بەفەرمانڕەواکانی سەلجوقی رابگەیەنێ هیچ شتێ لەبەرامبەری نابێتە کۆسپ ئەگەر بیەوێ. نێوان ئەو و رۆمەکانیش حەوت رۆژ رێیە. ئەو بەهەنگاوێك دایدەنا، هەر کاتێ بیەوێ ئەو رێگایە دەبڕێ) دواجار گەڕایەوە دیمەشق.(٧٢) لەراستیدا (بیبرس) ئامانجەکانی بەدی نەهێنا کەدەیویست وڵاتی رۆم بێتە ژێر دەسەڵاتیەوەو پەیوەندی بە مەغۆلی (قەبجاق) بکات، رەنگە بارودۆخی سیاسی و سەربازی و جوگرافی لەتوانای ئەو بەهێزتر بووبێ، بۆیە گەڕایەوە وڵاتی خۆی. (بروانا) کە گەیشتە (توقات) لەگەڵ کەیخوسرەوی سێیەمدا، نامەیەکی بە (میر سیف الدین ئەربەکی) دا نارد بۆ دەربارەی مەغۆلی ئیلخان، داوای لێدەکات کارێك بکات تا وڵات نەکەوێتە ژێر دەستی مەمالیکەوە.(٧٣)

کە (ئیلخان) دەنگو باسی کارەساتەکەی پێگەیشت کەچی بەسەر هێزەکەیدا هاتووە. زۆر تورە بوو، خۆی بە سوپایەکی پەنجا هەزارییەوە لە تەبرێزەوە بەرەو وڵاتی شام کەوتەڕێ تا سنوورێك بۆ (بیبرس) دابنێ، گەیشتە سنووری ئازەربایجان لەو کاتەشدا لە ئەنادۆڵ شۆڕش بەرپا بوو بوو، هەموو لایەك ئاژاوە گرتبوویەوە، تا (قەرمانیەکان) قونیەی پایتەختیان داگیر کرد، دواجا لە ڕێگەی (دفرکی)یەوە، بەرەو بستان ڕۆیشت، لەوێ چووە ناو پاشماوەی سوپای سەلجوقیەوەو (ئەرکان دەولە)ش هاتە پاڵی.. کە گەیشت و شوێنی شەڕەکەی بینی، کوژراوەکان زۆربەیان مەغوڵ بوون، زۆری پێ ناخۆش بوو. دواجا چووە جێگای سوپاکەی مەمالیك، کە ژمارەیانی زانی چەند بوون، (بروانا)ی بەتۆمەتبار لەقەڵەم دا، چونکی ڕاستی هێزی مەمالیکی پێ ڕانەگەیاندووە. بەڵام بروانا، ئەمەی ڕەتکردەوە، گوایە ئاگای نەبووە، تا هاتونەتە ناو وڵاتەوە. بەڵام (ئاباقا) بڕوای پێنەکرد پێی گوت: (ڕاستیان گوتووە لەگەڵ ئەوانەی میسردا شتێکت لەژێر سەردایە).[٧٤]

(ئاباقا) نامەیەکی بۆ (بیبرس) نارد، داوای لێدەکا بگەڕێتەوەو ڕوو بەڕوو ببنەوە، لەهەمانکاتدا هەندێ لە هێزەکەی نارد بۆ سووسەکردن لەناو خاکی شامدا، بەڵام نەیانتوانی زۆر بچنە قوڵایی، کە هێزەکە گەڕایەوە، سەرکردەی مەغوڵیان ئاگادار کردەوە کەوا: هێزەکانی مەمالیك هێرش دەکەنە سەر هێزەکان کە لەپێشەوەن و دەگەڕێتەوە قەڵاکان.[٧٥] (ئیلخان) بڕیاری شەڕی یەکلاکەرەوەی دا، بەڵام زانی ئەگەر (بیبرس) دەسپێشخەر بێت، ئەوان مەغوڵی ئێران هەڵوێستی باش نابێت، بەڵام هێزەکاین ماندوو بوون، ئەسپەکانیان زۆری تۆپی بوون ئەوجا بڕیاریدا دەست لە داگیرکردنی وڵاتی شام هەڵگرێ و بۆ قەیسەری بگەڕێتەوە. تاڵانی کرد و لە دانیشتوانەکەی تۆڵەی سەند، گەلێ قازی و فەقیهی کوشت هەروەها کۆشکەکەی (بروانا)ی سوتاند،[٧٦] دواجار گرتی و براکەی (کنغرطاي) کردە والی وڵاتی ڕۆم و گەڕایەوە. لەم کاتەدا ئەو نوێنەرانەی بۆلای (بیبرس) ناردبوو گەڕانەوە. پێیان ڕاگەیاند کەوا لەوێ بیستویانە، لەشکرکێشیەکەی (بیبرس) بەهاندانی (بروانا) بووە، هەروەها، هەندێ نامەی نێوان (بروانا) و(بیبرس)یان

دەسکەوتبوو، ئیتر بواری ئەوە نەمابوو لەژیاندا بیهێڵێتەوە دوای ئەوەی ئەو تۆمەتانە لەسەری چەسپا.[٧٧]

لە (ئولوداغ) لەبەرامبەر ئەنجومەنێکدا تاوانبار کرا، دوای ئەوەی سێ تۆمەتیان دایە پاڵ:

١. لەبەردەم دوژمن هەڵاتووە.

٢. ئاباقای لەهێرشی مەمالیك ئاگادار نەکردۆتەوە.

٣. دوای شەڕەکە نەهاتۆتە لای ئیلخان.

ئاباقا، فەرمانی دایە هەندێ سەرکردەی مەغوڵ و کوشتیان.[٧٨] مەغوڵ دوای ئەوەی (بروانا)یان کوشت، دەستیان بەسەر وڵاتی رۆمدا گرت، خۆیان بەڕێوەیان دەبرد، فەرمانبەرەکانیان لە مەغۆلیەکان دانا، دەسەڵاتی سەڵتەنەت لاواز بوو، ئیلخان (شمس الدین)ی نارد تا کاروباری وڵات رێکبخات و بەڕێوەی ببات.[٧٩] کەیخوسرەو کەوتە دامرکاندنەوەی ئەو شۆڕشانەی بەرپا بوو بوون لە وڵاتدا، لەگەڵ (قرمانیەکان)دا کەوتە شەڕ، شۆڕشەکەی (جمری)یان دامرکاندەوە، بەڵام والیەکان یاخی بوون و خۆیان کەوتنە بەڕێوەبردنی ویلایەتەکانی خۆیان.

## مردنی کەیخوسرەوی سێیەم

کەیکاوسی دووەم بەر لە مردنی، کوڕە گەورەکەی (مەسعود)ی کرد جێنشینی خۆی، باوکی ئامۆژگاری کردبوو، یارمەتی مەغۆڵەکان بدات، تا موڵکەکانی باو باپیرانی دەگەڕێنێتەوە. (فرامرز)ی برای ناکۆك بوو لەگەڵیا.[٨٠] لە دەریای رەش پەڕییەوەو هاتە (قەستەمونی)، دواجار بەنهێنی بۆ (ئەماسیە) رۆیشت، تاکو تورکمانەکان هان بدات، بەڵام گرتیان و گەڕانیانەوە بۆ قەستەمونی و لەقەڵاکەیدا زیندانیان کرد.[٨١] مەسعود لەساڵی ٦٧٩ی کۆچی / ١٢٨٠ی زایینی چووە (سینوب) لەگەڵ مەغۆڵەکاندا کۆبووەوە، داوای کرد چاوی بە (ئیلخان) بکەوێت، (ئاباقا)ی بینی، شاری سیواس و ئەرزن و ئەرزنجانی پێ بەخشی، کە لەدەرەوەی موڵکەکان کەیخوسرەوی سێیەم خۆی فەرمانڕەوایی دەکرد.[٨٢] (ئاباقا) هەمان شێوازی (هولاکۆ)ی دەگرت، بۆ دابەشکردنی دەسەڵاتی رۆم، تا بەئاسانی

دەستیان بەسەرا بگرێت، بەڵام کەیخوسرەوی سێیەم ئەم دابەشکردنەی قەبوڵ نەبوو، ساڵی ٦٨٠ی کۆچی / ١٢٨١ی زایینی چووە ئەرزنجان.[٨٣]
لەساڵی ١٢٨٢ی زاییندا (ئاباقا) مرد، ئەحمەد تکوداری برای جێگاکەی گرتەوە. مەغوڵەکان ویستیان ئەو کەسانە لەناو بەرن کە یارمەتی (میر کنغرگای)یان دا لەیاخی بوونیدا، لەوانە کەیخوسرەوی سێیەم بوو، ئاشکرایە سوڵتانی ناوبراو پەیوەندی پتەوی هەبوو لەگەڵ میری مەغوڵدا، کاتێ لەگەڵ ئیلخان ئەحمەد دا میرە مەغولیەکە سەرنەکەوت دەبوایە کەیخوسرەو جەزای خۆی وەربگرتایە، بۆ ئەمە مەسعود بڕیاریدا لەناوی ببات، دەرمانێکی ژاراوی پێدا ساڵی ٦٨٢ی کۆچی / ١٢٨٣ی زایین بەو ژارە مرد.[٨٤]

### غیاث الدین مسعود کوڕی عزالدین کەیکاوسی دووەم

### مەسعودی دووەم

جاری یەکەم: ٦٨٠-٦٩٦ی کۆچی / ١٢٨١-١٢٩٦ی زایینی / کەشو هەوا بۆ مەسعودی دووەم لەبار بوو، دەسەڵات کەوتە دەستی کەوتە فەرمانڕەواییکردنی دەوڵەتی سەلجوقی ڕۆم، بەڵام براکەی (رکن الدین قلیج ئەرسەلان) رکەبەری دەکرد، لەو کاتەی مەغوڵەکان خەریکی کاروباری ناوخۆی خۆیان بوون دوای مردنی (ئیلخان ئارگۆن) لەساڵی ٦٩٠ی کۆچی / ١٢٩١ی زایینی، لە دژی براکەی (رکن الدین) بەیارمەتی تورکمانەکان شۆڕشی بەرپا کرد کە مەغولەکان کاروباریان ڕێکخستەوە (ئیلخان کیغاتو) هێرشی کردە سەر وڵاتی ڕۆم، لەدژی دەسەڵاتی ناوەند.. سوپای سەلجوقیش لەگەڵ مەغوڵەکاندا بوون، دوای شەڕو پێکدادان، هاوپەیمانەکان، توانیان شۆڕشەکە لەناو بەرن و (رکن الدین)یش کوژرا.[٨٥]

### علاء الدین کەیقوباد کوڕی فرامرز کوڕی مەسعودی دووەم : کەیقوبادی سێیەم

پلەی سوڵتانی بەتاڵ بوو، ئیلخان غازان، بەتەگبیری وەزیری مەغوڵی (صدرالدین خالدی)، (علاء الدین کەیقوبادی کوڕی فرامرز) بە سوڵتانی سەلجوقی دانرا. کەیقوبادی سێیەم لەسەر بەشێك لە وڵاتی ڕۆم ساڵی ٦٨٢ی کۆچی / ١٢٨٣ی

زایینی فەرمانڕەوا بوو، بەپێی سیاسەتی مەغوّل لەدابەشکردنی ولآت و لەیەککاتدا لە سولّتانێ زیاتریان دادەنا.[٨٦]

لەسەردەمی ئەودا، ڕووداوی گرنگ روویان نەدا، تەنها یاخی بوونەکەش (سولمیش) نەبێ.. هەر خەریکی ڕابواردن بوو، جەوری زۆر دەکرد، ژیانی لەسەر ئەوە دانا.[٨٧]

## غیاث الدین مسعود عزالدین، کەیکاوس: مەسعودی دووەم بۆ جاری دووەم: ٧٠١-٧٠٤ی کۆچی / ١٣٠١-١٣٠٤ زایینی

دوای کوشتنی کەیقوبادی سێیەم، ئیلخان غازان مەسعودی دووەمی بۆ جاری دووەم بەسولّتان دامەزراند. وەزیرەکەشی (صاحب علاء الدین) بوو.[٨٨] لەساڵی ٧٠٣ی کۆچی / ١٣٠٣ی زایینی سولّتان تووشی ئیفلیجی بوو، نەیدەتوانی قسە بکاو بجووڵێ. ساڵێك مایەوەو کۆچی دوایی کرد.[٨٩] ولآت کەوتە ناو دەریای ئاژاوەو ولآت پارچە پارچە بوو، دە ئیمارەتی تورکمانی دامەزارن، مەغوّلیەکان دەسەلآتیان لە ولآت زۆربوو فەرمانڕەوایەکی مەغوّلیان دانا (جمری ئاغا) و ئەو ولآتی بەڕێوە دەبرد بارودۆخ وا مایەوە تا ئیمارەتی عوسمانی پەیدا بوو.

## پەراوێزەکانی بەشی سیانزەهەم

١. ابن بیبی: ص ٣٠٢-٣٠٣. الاقسرائی: ص٨٧

٢. رشید الدین: جامع التواریخ، ص١٣٨.

٣. رشید الدین: ص١٦٦، ١٦٨، ١٧٠، ١٧٢، ١٧٤. ابن العبری: ص٣٠١-٣٠٢

٤. ابن طباطبا: محمد بن علي المعروف بابن الطقاطقا، الفخري في الاداب السلطانية والدول الاسلامية، ص٣٣٣.

٥. صفا، ذبیح الله: تاریخ ادبیات در ایران: ج٢، ص١٢٠.

٦. ابن كثیر: ج١٣، ص٢٠١

٧. بڕوانە دەقی نامەکە لە (فتح بغداد المنسوبة الى نصيرالدين الطوسي) والملحقة بكتاب تاریخ قاهر العالم للجويني: ج٢، ص٣٦٢

٨. رشيد الدين: ص٢٦٧-٢٦٨

٩. بڕوانە ئەو تاوانانەی مەغوڵەکان لەبەغدا: ابن کپیر: ج١٣، ص٢٠٣

١٠. الصياد: ص٢١٣

١١. ابن كثير: ج١٣، ص٢٠٥

١٢. رنسيمان: ج٣، ص٥٢٢

١٣. بڕوانە: تاريخ المماليك فى مصر وبلاد الشام، ص٧٠-٧٣

١٤. بڕوانە: تاريخ الايوبيين فى مصر وبلاد الشام: ص٣٥٣

١٥. بڕوانە: تاريخ المماليك: ص٢٦-٢٧

١٦. بڕوانە: تاريخ الايوبيين: ص٢٨٧-٢٩٠

١٧. بڕوانە: تاريخ المماليك: ص٣٥-٣٦

١٨. بڕوانە: تاريخ المماليك: ص٣٥-٣٦، ٤٣-٤٥

١٩. عين جالوت: شارێکە لەنێوان بيسان و نابلس: الحموى: ص١٧٧ ج٤

٢٠. بڕوانە: تاريخ المماليك: ص٥١-٥٢

٢١. هەمان سەرچاوە: ل٥٩-٦٠

٢٢. ابن العبرى: ص٣٠٨-٣٠٩

٢٣. بڕوانە: تاريخ المماليك: ص٧٠-٢٣

٢٤. بڕوانە دەقی نامەکە لە لای المقريزى: ج١، ص ٥١٤

٢٥. العبينى: بدرالدين محمود: عقد الجمان فى تاريخ اهل الزمان: ج١، ص٢٣٢

٢٦. رشيد الدين: ص٢١١

٢٧. Grousset: L'Empire des steppes: P437

٢٨. الصياد: ص٣٠٥

٢٩. بڕوانە: تاريخ المماليك: ص ٧٥-٧٦

٣٠. البندقدارى: دەگەڕێتەوە بۆ (بندقدار) وشەیەکی فارسیە، بەم ناوەوە ناونرا (بيبرس بندقدارى) چونکی کۆیلەی میر (ئایدکین بندقدار) بوو کە سەر بە تورکی قەبجاقە، دواجار چووە لای (نجم الدين ايوب) و بووە کۆیلەی ئەو.. کە هاتە شام میری (حەما) کری، بەڵام زۆر زیرەك بوو.

٣١. رشيد الدين: ص٣١٢
٣٢. لەبارەی شەڕی (عين جالوت)ـەوە، بڕوانە: ابن كثير: ج١٣، ص٢٢٠–٢٢٢
٣٣. النويرى: ج١٩، ص٤٧٧–٤٧٨
٣٤. ابو الفداء الملك المؤيد عمادالدين اسماعيل: المختصر في اخبار البشر: ج٢، ص٣٢٠
٣٥. ابن عبدالظاهر: ص٢٣٠–٢٣٩
٣٦. ابن عبدالظاهر: ص١٣٢–١٣٣
٣٧. Cahen: Ls syrie du nord: P711
٣٨. ابن العبرى: ص٣٣٤.
٣٩. بڕوانە: الشرق الاسلامى فى عهد المغول الايلخانيين: ص٤٢–٤٣
٤٠. رنسيمان: ج٣، ص٥٤٩–٥٥٠
٤١. بڕوانە: تاريخ المماليك: ص١٢٤–١٢٦
٤٢. ابن العبرى: ص٣٢٥
٤٣. ابن عبدالظاهر: ص٢٦٩–٢٧١
٤٤. هەمان سەرچاوە: ص٢٧١
٤٥. ابن عجدالظاهر: ص٣٠٧–٣٠٩
٤٦. البونينى: ج٢، ص٤٥٧، ٤٦٧–٤٦٨
٤٧. ابن شداد، عزالدين محمد.. تاريخ الملك الظاهر: ص٣٤–٣٥
٤٨. ابن شداد: ص٧٩
٤٩. البونينى: ج٣، ص١١٢–١١٣
٥٠. ابن شداد: ص١٢٣–١٢٤
٥١. هەمان سەرچاوە: ص١٢٤–١٢٥
٥٢. هەمان سەرچاوە: ص١٢٥
٥٣. ابن شداد: ص١٢٦
٥٤. هەمان سەرچاوە: ابو الفدا: ج٢، ص٣٤٠
٥٥. البونينى: ج٣، ص١١٦

٥٦. ابن شداد: ص١٢٧
٥٧. البونینی: ج٢ن ص١١٦-١١٧
٥٨. ابن شداد: ص١٢٨-١٢٩
٥٩. البونینی: ج٣، ص١٦٥
٦٠. ابن شداد: ص١٥٤-١٥٥
٦١. ابن بیبی: ص٣١٣
٦٢. ابن شداد: ص١٦٠
٦٣. ابن شداد: ص١٦٢
٦٤. ابن بیبی: ص٣١٤-٣١٦
٦٧. الساجور: ناوی رووبارێکە لە منبج الحموی: ج٣، ص١٧٠
٦٨. المقریزی: ج٢، ص٩٧
٦٩. کینوك: رووداوی سوور...
٧٠. ابن عبدالظاهر ص٤٥٣، ٤٥٦-٤٥٨
٧١. ابن العبری: ص٣٣٥
٧٢. ابن عبدالظاهر: ص٤٥٦
٧٣. ابن عبدالظاهر: ص٤٥٦-٤٦٢
٧٤. تاریخ الزمان: ص٣٢٥
٧٥. ابن عبدالظاهر: ص٤٦٢
٧٦. ابن عبدالظاهر: ص٤٦٢-٤٦٧
٧٧. ابن عبدالظاهر: ص٤٦٨
٧٨. ابن بیبی: ص٣١٧-٣١٨
٧٩. ابن بیبی: ص٣١٨
٨٠. البونینی: ج٢، ص١٨٥-١٨٦
٨١. هەمان سەرچاوە: ص١٨٦
٨٢. هەمان سەرچاوە: ابن شداد: ص١٨٣
٨٣. ابن بیبی: ص٣١٩

٨٤. الاداغ: شارێکە لەباکوری ئازەربایجان

٨٥. ابن العبری: ص٣٣٦

٨٦. ابن بیبی: ص٣٢٩

٨٧. ناوی فرامرز لەلای ابن بیبی هاتووە: ص٣٣٤

٨٨. هەمان سەرچاوە

٨٩. ابن بیبی: ص٣٣٤–٣٣٧

## بەشی چواردەهەم
## هۆکارەکانی نەمانی سەڵتەنەتی سەلجوقی رۆم

**سەرەتا:**

ئەگەر هەندێ تیۆری کۆمەڵایەتی وەکو تەمەنی مرۆ، تەمەنیش بەدەوڵەت دەدەن و دەڵێن وڵاتانیش پیر دەبن بەهۆی تێپەڕبوونی زەمەنەوە سروشتی نەوەکانی دەگۆڕی.[1] بەڵام دەوڵەتەکان بەنوێبوونەوەی پیاوانی نوێ دەبنەوە، هەرچەندە پیاوانی بەهێز بمێننەوە ئەوا دەوڵەتیش بەهێز دەمێنێتەوە، ئەگەر لاواز بوون، ئەوا دەوڵەتیش لاواز دەبێت، تا بەنەمانیان ئەویش لەناو دەچێت و نامێنێ، بۆ ئەوەی لەناو دڵی کەسانێکی دیکەدا بژی کە بۆ ژیان کاردەکەن، دەوڵەت کاتێ دەمرێ، کاتێ خاوەنەکەی ئەگەر بۆ هەموو کۆتاییەك هۆکار هەبێ، ئەوا ئەو هۆیانەی وایکرد دەوڵەتی سەلجوقی رۆم لاواز بێت و دواجار نەمێنێ دوو بەشن:

- ناوەکی: خۆی لە ناکۆکی سوڵتانەکان و ناکۆکی میرەکان و گەندەڵی بەڕێوەبردن و شۆڕشی ناوخۆدا دەبینێتەوە.
- دەرەکی: کە بریتییە لەداگیرکردنی وڵات لەلایەن مەغوڵ و ناکۆکییەکانی مەغوڵ و دوژمنەکانیان لەلایەك، لەلایەکی دیکەوە ناکۆکی نێوان خۆیان.

### هۆکارە ناوەکییەکان ناکۆکی سوڵتانەکان

سەڵتەنەتی سەلجوقی رۆم لەکاتێکدا سەریهەڵدا، سەلجوقیەکان بەشێوەیەکی گشتی دەستیان بەسەر فارس و عێراق کرماندا گرتبوو، بەرەبەرە بەهێز دەبوو، لەسەر حیسابی هاوسێکانی بەتایبەتی بیزەنتیەکان. سوڵتانەکان لەسەرەتای ژیانی دەوڵەتدا هەوڵیاندا بوونی خۆیان لەو ناوچانە بسەلمێنن کە هێزەکانی

دیکەشی لێبوو، دوای ئەوە دەوڵەت تەواو پەرەیسەند، دەسەڵاتی بەسەر بەشی زۆری ئاسیای بچووکدا سەپاند لەگەڵ هەندێ هەرێمی جزیرەو ئەرمینیا.
تا لەسەردەمێکدا بووە گەورەترین هێزی سەربازی و سیاسی لەناوچەی رۆژهەلاتدا.
ئەوەی مێژووی سەڵتەنەتی سەلجوقی رۆم بخوێنێتەوە، پێویستی بەوە دەکات لەبەرامبەر درێژی سەردەمەکەدا راوەستێت بە بەراورد لەگەڵ سەردەمەکانی دەوڵەتی سەلجوقی دیکە لە رۆژهەلاتی ئیسلامیدا.[٢] لە راستیدا سەڵتەنەتی سەلجوقی رۆم، گوڵە گەنمێکی شین بوو لەگەڵ بادا دەهات و دەچوو و نەدەشکایەوە. شەڕی سەلیبیەکانیان کرد، سەرەڕای زیانەکانی بەلام دیسانەوە خۆی دەگرتەوە، هەروەها روو بەڕووی بیزەنتیەکان راوەستا، نەیانتوانی لە ریشە هەڵیکێشن، لەگەڵ مەغولی بەهێزدا بۆی نەکرا، چوونە ژێر دەسەلاتیانەوە، ئەوە هۆیەك بوو لەدرێژ کردنەوەی تەمەنیان، ئەمە سیفەتێکی سەلاتینەکان بوو کە دەیانزانی سیاسەت بکەن.
بەلام ناکۆکی ناو خێزانی سوڵتانەکان، بۆ چوونە سەر تەخت و ئەو شەڕە خوێناویانەی لەنێوانیاندا بەرپا بوو، بووە هۆی لاوازکردنی سەڵتەنەت. لە راستیدا ئەو لێکترازانەی لە لەشی سەڵتەنەتدا سەریهەڵدا لە مردنی سوڵتان قلیج ئەرسەلانی دووەمەوە لەساڵی ٥٨٨ی کۆچی / ١١٩٢ی زایینی، پەیدا بوو بەلام زۆر کاری نەکردە سەر دەوڵەت، چونکی هێشتا بەهێز بوو.. لە بەشەکانی لەمەو پێشدا، باسی بارودۆخی سوڵتانەکان و ناکۆکیەکانمان کرد، پێویست بە دووبارە کردنەوە ناکات. بەلام دەمەوێ، ئاماژە بۆ ئەوە بیەم رۆژ لەدوای رۆژ ئەو لێکترازانە روونتر دەردەکەوت، تا لە رۆژەکانی دواییدا بە تەواوەتی دەرکەوت و لەژێر زەبری مەغوڵەکاندا بەتەواوەتی روخا..

## ناکۆکی میرەکان:

بە لەوەی بکەومە باسکردنی رووداوەکانی ناکۆکی میرەکان، ئاماژە بۆ ئەو کارە هاوبەشەی هەریەك لە (ابن بیبی) و (اقسرانی) بکەم چونکی هەردووکیان لەناو رووداوەکاندا ژیان، بەو پێیەی دوو کارمەندی حکومەت بوون. بەپێی کارەکەیان،

ئەوەی روویدەدا لەناو دەزگای حكومەتدا ئاگایان لێ بوو. شایەتی ئەو دووانە گرنگی خۆیان هەیە.

هەر لەساڵی ٦١٦ی كۆچی / ١٢١٩ی زایینیەوە، دەسەڵاتی میرەكان لەناو سەڵتەنەی سەلجوقیدا دەركەوت، بەتایبەتی لەدوای مردنی سوڵتان كەیكاوسی یەكەم، لەو كاتەوە خۆیان هەڵدەقورتان لە هەڵبژاردنی سوڵتانەكان و دەستیان هەبوو لە لادانیان، پێشتر رۆڵی سیاسی ئەوتۆیان نەبوو، لەوەی زیاتر سوڵتان رێی پێدەدان. بێگومان ئەم دەركەوتنەیان لەسەر شانۆی رووداوەكان، ئەنجامێكی سروشتی بوو چونكی سوڵتانەكان لاواز بوون، خەریكی رابواردنی خۆیان بوو بوون و كاروباری دەسەلاتیان دابووە دەستی میرەكان. لەساڵی ٦١٦ی كۆچی / ١٢١٩ی زایینی، میرەكان كەیقوبادی یەكەمیان بە سوڵتان هەڵبژارد و ئەمیان لە (مغیث الدین توغرل شای كوڕی قلیج ئەرسەلان) بە باشتریان دەزانی، هەروەها پشتیان لە برا بچووكەكەشی كرد (فەرەیدون).[3] ئەوەی جێگای سەرنجە، لە سەر هەڵبژاردنی كەیقوبادی یەكەم رێك نەكەوت دوای راوێكردنێكی زۆر بەنا دڵ رازی بوون، چونكی نیاز وابوو كەسانی دیكە دابنرێ.

كەیقوبادی یەكەم بەهێز بوو، رێگای نەدەدایە میرەكان دەست لەكاروباری وەردەن، بۆ ئەملاو ئەولا دەیناردن، تاكو نەكەونە بیری پیلانگێڕانەوە. سەرەڕای ئەوەش هەندێكیان هەوڵیان دا لە فەرمانی دەرچن، بەلام توانی تەمێیان بكات.

هەروەها سوڵتان كەیخوسرەوی دووەم خۆی بەسەر میرەكاندا سەپاند، هەڕەشەی لەوانە كرد كە نارەزا بوون، چوونە سەر تەختی سوڵتان كەیخوسرەو بە ئارەزووی میرەكان نەبوو، هەروەها كەیقوبادی یەكەمیش وەسیەتی كردبوو كوڕەكەی (عزالدین) ببێتە جێنشینی.[4] نەهامەتی سەڵتەنەتی سەلجوقی دەستی پێكرد، لەسەردەمی ئەم سوڵتانەوە، یەكەم گورز لەلایەن خوارزەمیەكانەوە لێیان درا. كە بەسیاسەتی كەیخوسرەوی دووەم رازی نەبوون و هاوكاریان نەدەكرد، وڵاتیان بەجێ هێشت و چوونە شام، سوڵتان ویستی بەزۆر بیانگێڕێتەوە بەلام سەرنەكەوت. ئەم رووداوە زەمینەی بۆ ناكۆكی خۆشكرد لەنێوان پیاوانی دەسەلاتدا. (سعدالدین كوبك) سوڵتانی هان دەدا لەدژی خوارزەمیەكان، بۆ ئەوەی

خۆی دیار بکەوێت، دواجا رەخنەی لە (میر کمال الدین کامیا) فەرماندەی هێزی سوپا دەگرت کەوا نەیتوانیوە خوارزەمیەکان بگەڕێنێتەوە. پلانێکی دانا بۆ سوود وەرگرتن لەناکۆکی ناوەکی نێوان میرەکان و لەناوبردنی ئەوانەی بەهێزن تاکو دەسەلات بەدەستی خۆیەوە بمێنێتەوە. لەپێشدا خۆی لە سولتان نزیک کردەوە، توانی ئەموستیلەکەی سولتانی دەست بکەوێت.. دواجا یەکە یەکە میرەکانی لەناودا (میر شمس الدین توبنی) یەکەم قوربانی دەستی ئەو بوو، کەسیش نەیوێرا لێی بپرسێ بۆ و لەبەرچی وایکرد.[٥] بەلام لەنێوان میرەکاندا چپە چپ پەیدابوو لەبارەی ئەم کردەوەوە (صاحب شمس الدین محمد اصفهانی) بە میر کامیاری گوت: (ئەگەر فریای ئەم کارە نەکەوین، ئەوا کاری خراپتر دەکاو، دەستی بەکەسانی دیکەش دەگات).[٦] لە راستیدا لەنێوان (صاحب) و (کامیار)، دا ساردییەك هەبوو چونکی یەکەمیان لەمەجلیسی سولتاندا بەخراپە باسی دووەمی کردبوو کامیارئەو وتانەی (صاحب)ی بەنانەوەی ئاژاوە دانا.[٧]

(کوبك) ئەم جارە رویکردە لای (میر تاج الدین بروانا) بەهەموو شێوەیەك هەولی لەناوبردنی دەدا، کە ئەمەی دوایی پێی زانی، پایتەختی بەجێهێشت و بۆ ئەنقەرە چوو.[٨] لەوێش وازی لێ نەهێنا، سیخورەکانی بۆیان گێرابووە، کەوا (تاج الدین) لەگەڵ ژنە گۆرانی بێژێکدا لەژنانی قەلای زیاد، دەستی تێکەڵ کردوە، هەولی دا (فەتوا)یەکی بۆ دەرکات. فەتواکەیان خستە بەردەم سولتان، کە لەو کاتەدا سەرخۆش بوو، داوایان لە سولتان کردبوو، لە سەر خوکمدانەکەی رازی بێ، سولتان رازی بوو، (تاج الدین بروانا) یان (رەجم) کرد و مرد ماڵەکەشیان دەستی بەسەرا گیرا.[٩]

(کوبك) دوای ئەم رووداوە، دەسەلاتی زۆرتر بوو، ناوی لەسەلتەنەتەکەدا دەرکرد، میرەکان بە فەرمانی ئەو دەجولانەوە، بەلام هەندێکیان، گوێیان پێ نەدەدا، بۆ ئەوەی ساردیان بکاتەوە، دەینـاردن بۆ هێرش کردن.. خۆشی دەرۆیشت. (سمیساط) و هەندێ قەلای داگیر کرد.[١٠] بەلام دەستی لەو کردەوانەی خۆی هەلنەگرت، تۆمەتی دایە پاڵ (میر حسام الدین قیمری) گوایە تاوانی ئەنجامداوە، لەکۆشکی سەلتەنەتدا لە مەلتیە زیندانی کرد، مووچەیەکی مانگانەی بۆ بڕییەوە

تا ژیانی پێ بباتە سەر، ئەوجار گەڕایەوە قونیە و (کمال الدین کامیار)ی کوشت.[11]

لە راستیدا سوڵتان کوشتنی میرەکانی پێ ناخۆش بوو، بەڵام کەوتبووە ژێر کاریگەری ئەم میرەوە. تا گەیشتە ئەوەی بەچەکەوە دەهاتە لای سوڵتان، سوڵتان لە رۆحی خۆی دەترسا. دەستی کردە پلان دانان بۆ لەناوبردنی، لە دواییدا (قراجە حارس) فەرمانڕەوای سیواسی راسپارد و کوشتی.[12] سەرەڕای ئەم ململانێیە لەنێو میرەکاندا لەسەر دەسەڵات، بارودۆخی سەڵتەنەت ئارام و چەسپاو بوو. بەڵام سەرەتای لاواز بوون لەگەڵ پەیدا بوونی بزووتنەوەی (بابائی) و داگیرکردنی مەغۆل، دەستی پێکرد. ئەمە زیاتر سوڵتانەکانی لاواز کرد و میرەکان دەستڕۆیشتووتر بوون، کێبڕکێیان بوو کێ دەسەڵاتی زۆرتری بەردەکەوێت، کێ پارەی زۆرتر پێکەوە دەنێت و زەویو زاری زۆرتری دەبێت.. بەرژەوەندی دەوڵەت مەبەستیان نەبوو، ئیرەیی یەکێ لەو هۆیانە بوو کە ئابلۆقە لەسەر (تەرسوس) لابرا.. چۆن میرەکانی ئەم شارە دەگرن و (صاحب) ئەم دەسکەوتە بۆخۆی دەبات.[13]

ئیتر هەریەکەو پیلانی دژی ئەویتر رێکدەخست، تا لایبەرێ و خۆی جێگاکەی بگرێتەوە. سەڵتەنەت شەپۆلی تیرۆری سیاسی بەخۆیەوە بینی کە کارێکی خراپی کردە سەر توانای دەوڵەت.[14] ئەمە هەندێ وێنەی ناکۆکیەکانی میرەکانە، کە بارودۆخی گشتی سەڵتەنەتی سەلجوقی دەردەخات کە لەچی ئاژاوەو نا ئارامیەکی سیاسیدا بووە و وڵات چەند لاواز بووە، لەکەشو هەوایەکی ئاوادا کە پڕ بوو لەپیلانگێڕان و خیانەت غەدر، ئیتر سەلجوقیەکان دەستیان لە داگیرکردنی شوێنەکانی دیکە هەڵگرت، کە ئەمەش هۆیەك بوو بۆ نەمانی سەڵتەنەتی سەلجوقی.

### گەندەڵی بەڕێوەبردن

وڵاتی رۆم لە دوا رۆژەکانیدا، میر و وەزیرەکانی ئاوڕیان لە کاروباری وڵات نەدەدایەوە و خەریکی چاوچنۆکی و خۆ پەرستی و بەرژەوەندی تایبەتی خۆیان بوون.. بەم هەڵسو کەوتانەیان وڵاتیان ماندوو کردبوو، باری دانیشتوانیان بە (باج)

گران کردبوو.. (اقسرائی) ئەو گەندەڵیانەی تۆمار کردووە کە لەناو دەزگاکانی دەوڵەتدا بڵاوببووەوە، ئەو رووداوانەی لەنزیکەوە بینیوە، هەرچی بینیوە تۆماری کردووە. ساڵی ٦٨٥ی کۆچی / ١٢٨٦ی زایینی، مەغولەکان (فخرالدین قزوینی)یان بەسەرك وەزیران دامەزران، (مجیرالدین امیر شا)یان کردە جێگری سەڵتەنەت، بەڵێنیان دا (جەزیە)کی زۆر بدەن.. سەردەمی ئەو دووانە، بەتوند و تیژی ناسراوە، (باج)یان خستە سەر دانیشتوان، دەستیان بەسەر موڵکی تایبەتدا دەرگرت، تاکو ئەو پارەیە بۆ مەغوڵەکان دابین بکەن. ئەوەی زیاتر بارودۆخەکەی خراپتر کرد، براکەی خۆی دانا پارەو ماڵ کۆ بکاتەوە کە (جمال الدین) بوو. هەروەها برایەکی دیکەی لە وەزیفەی (بروانکی) دانا، خەڵکەکەی لێ بێزار بوو، هەرچەند دەیانزانی کارێکی ناڕەوایە، بەڵام بەردەوامبوون لەسیاسەتی ئابووری ناڕەوا.[١٥]

بەهۆی ئەو بارودۆخە داڕوخاوەوە، مەغوڵەکان وڵاتیان کردە دوو بەشەوە لە رووی بەڕێوەبردنەوە. (وەزیر صاحب فخرالدین قزوین)یان لەسەر ئەو بەشە دانا کە کەیکاوسی دووەم فەرمانڕەوایی دەکرد، کە لە قەیسەرییەوە تا سنووری ویلایەتی (اوج)ی گرتبووەوە، میرێکی مەغوڵ بەناوی (ایجی) یارمەتیدەری بوو، (مجیرالدین امیر شا) لەسەر ئەو بەشە دانرا کە لە ژێر دەسەڵاتی (قلیج ئەرسەلان) بوو کە (لە سیواسەوە تا ویلایەتی قەستەمونە و کەنارەکانی سینوب)ی لەژێر دەستیا بوو، لێکۆڵێرەوەی سوپای مەغوڵ (تولادای) یارمەتی دەدا.[١٦] وا دەردەکەوێت (مجیرالدین امیر شا) کارەکانی بەباشی بەڕێوە دەبرد، بەڵام (فخرالدین قزوینی) سیاسەتی توندی بەکار دەبرد، دەستو پێوەندەکانی بە ئارەزووی خۆیان لەدەزگای دەوڵەت کاریان بەڕێوە دەبرد.. ئاژاوەی لێ پەیدا بوو، دانیشتوان هەستیان بە ئەمن و ئاسایش نەدەکرد، خەڵکەکە بێ ئومێد بوون و چاوەڕێی چاکبوونەوەی بارودۆخەکەیان نەدەکرد.[١٧]

ئەو دووانە دوو ساڵ بەو جۆرە مانەوە، دواجار (سعد الدولە) وەزیری (ئیلخان ئەرغون) لای بردن، لەجێگاکەیاندا کوڕەکانی (قەلاون)ی دانا لەگەڵ (صاحب شمس الدین احمد) دا. ئەمانیش لەوانی پێشوو چاکتر نەبوون، خەڵکی ناڕەزا بوو

و چاوەڕێی ڕزگاربوونیان دەکرد. (سمخان) کە فەرمانڕەوایەکی مەغۆلی بوو هەوڵیدا سنوورێك بۆ ئەمە دابنێ، بەڵام نەیتوانی، کار وامایەوە تا مردنی ئیلخان و کوشتنی وەزیرەکەی.[18]

هەر گۆڕانێك لەکاربەدەستانی مەغۆل ڕوویبدایە، کەسانێکیش لەولاتی سەلجوقیەکان دەگۆڕان. لەساڵی ٦٩٦ی کۆچی / ١٢٩٦ی زایینیدا، (ئیلخان غازان (معین الدین محمد)ی بەپایەو پلەی (بروانکی) دامەزراند، (جمال الدین محمد)یش بووە وەزیر، هەروەها (کمال الدین تفلیسی) بەجێگری سەڵتەنەت و والی ئەماسیە دانران، ئەم میرانە، پلەو پایەکانیان بۆ بەرژەوەندی خۆیان بەکار دەبرد، (باج)یان دەخستە سەر دانیشتوان و موڵکیان زەوت دەکرد، و بێ توانایی و لاوازیان لە بەڕێوەبردنی کاروباری دەوڵەتدا دەرکەوت[19]

مەغۆلەکان هەستیان بە هەڵسو کەوتی نارەوای ئەو میرانە کرد، لێکۆڵێرەوەیان نارد تا بزانن چیان هەیە، لەناوچەی (ئاوچی) لە بیابانی قونیە بۆ ئەم مەبەستە دانیشتن. (اقسرانی) دەڵێ: مەغۆل داوای لێکردن ئەو چوار میرە چیان هەیە بەیانی کەن، وا ڕێکەوت ئەو شەوە، بایەکی توند هەڵیکرد، چادرەکانی هەڵکەند، هەرچی کاغەزیش لەبەردەستیان دا بوو بابردی، بۆیە نەیانتوانی لێپێچینەوەیان لەگەڵدا بکەن، وازیان هێنا، اقسرانی دەڵێ ئەگەر ئەو کاغەزانە لەبەر دەست بان، هەموویان سزا دەدران، بەو جۆرە ڕزگاریان بوو.[20]

ساڵی ٦٩٩ی کۆچی / ١٢٩٩ی زایینی وەزیرێکی مەغۆلی (نظام الدین یحیی) کەوتە ناو دەوڵەتی سەلجوقی بۆ (باج) کۆکردنەوە.[21] دوو وەزیری مەغۆلی، ئەو بڕە پارەیەیان دیاریکردبوو کە دەبوایە لەدانیشتوانەکانی کۆبکەنەوە. ئەوانە جەورێکی زۆریان کرد بە بیانووی پارەی باج وەرگرتنەوە. کەیقوبادی سێیەم، نەیتوانی ڕێگەیان لێ بگرێت. هەموو شارەکانی سەلجوقی کەوتنە بەر تالان و بەزۆر پارە وەرگرتنەوە.[22] سەلجوقیەکان، نامەیان بۆ مەغۆلەکان نووسی، شکایەتی ئەو کردەوە نارەوایەی وەزیرەکەیان کرد، لێکۆڵینەوەی لەسەر کرا، دوایی بەدەستی کوڕەکانی (عبدالرحمن مستوفی) کوژرا، چونکی کاتی خۆی باوکیانی کوشتبوو.[23]

دوای لەناوبردنی شۆڕشەکەی (سولمیش) کەیقوبادی سێیەم بەهێزتر بوو، مەغۆڵەکانیش، یارمەتیان دا بۆ ڕێکخستنەوەی کاروباری وڵات لەبارەی ئابووری و بەڕێوەبردنەوە. بەڵام وڵاتی ڕۆم، ببوە جێگای جەورو دەستدرێژی کردن بەهۆی ئەو ئاژاوەی وڵاتی گرتبووەوە، کردەوەکانی ئەم سوڵتانەش لەوانی دیکە کەمتر نەبوو.[٢٤]

## شۆڕشە ناوخۆییەکان

### بزووتنەوەی بابائی

شۆڕشە ناوخۆییەکان دەوڵەتی سەلجوقی زیاتر لێکترازان هەرچەند بە ڕواڵەت پێشکەوتنی پێوە دیار بوو.

یەکەم شۆڕش لەساڵی ٦٣٨ی کۆچی / ١٢٤٠ی زایینی بەرپا بوو، لەسەردەمی سوڵتان کەیخوسرەوی دووەمدا بوو، لەناوچەی (کفرسوود و مرعش) کۆچەرە تورکمانەکان بەو شۆڕشە هەڵسان، ئەم جوڵانەوەیە لە تواناکانی دەوڵەتی کەمکردەوەو ڕێگای فراوانبوونی دەسەڵاتی لێ گرتن، کەیخوسرەو زۆر بە زەحمەتی توانی بەسەریا زاڵ بێ.

بەر لەوەی باسی لەم جوڵانەوەیە بکەین و کاریگەرییەکانی راڤە بکەین دەبێ هۆکاری بەرپابوونی روون بکەینەوە.

کۆچکردنی تورك بۆ ئاسیای بچووك، لەبنەڕەتدا هەستکردنی ئەم رەگەزە بوو کە پێویستی بە هێز هەیە تا بتوانن نیشتەجێ بن. لەئەنجامی هێرشەکانی مەغۆڵ و خوارزەمیەکان، هۆزە تورکمانەکان روویان کردە وڵاتی سەلجوقیەکانی ڕۆم، لە راستیدا بەردەوام لەو کاتەوە سەلجوقیەکان وڵاتی ئەنادۆڵیان داگیرکرد ئەوانە بە لێشاو روویان لەم ناوچانە کردبوو، بەڵام هێرشی مەغۆڵەکان ئەو کۆچکردنەی پەرە پێداو زیادی کرد.

لەناو کۆچبەراندا ڕێژەیەکی بەرز لادێی و شارنشینیان تێدابوو، هەروەها ژمارەیەکی باشی بازرگان و دەوڵەمەند و بیرمەند و هونەرمەند و دەروێشیان لەگەڵدا بوو.[٢٥] لەم کاتە ناسکەدا، (جلال الدین رۆمی) سەردانی وڵاتی ئەنادۆڵی

کـرد و لــە سـیواس نیـشتەجێ بـوو، دواجـار چـووە قونیـە.[٢٦] شـێوازێکی ئوروستوکراتیانەی لەپێکهێنانی ڕێبازەکەیدا بەکار دەهێنا، هەروەها هانی خـەڵکی دەدا بـۆ فێربـوونی پیـشە،[٢٧] ئەمـە هـەمان سیاسـەتی سـەلجوقیەکان بـوو بـۆ نیشتەجێ بـوون و ڕاگـرتنی هێـرش بـۆ سـەر بیزەنتیـەکان، ئەمە بۆشاییەکی لـە کۆمەڵگای تورکمانیدا بەجێ هێڵا، کە لەناوچە شاخاویەکان دەژیـان و پێویـستیان بەفراوانبوونــەوە هــەبوو تــا لــەو ناوچــە هەژارانــە دەرچــن. بــەڵام ســۆفیەکی دەوروبــەری حەڵــەب، گیــانی داگیرکــردن و ئــارەزووی فراوانبوونــەوەی لــەدڵی تورکمانەکاندا چاند، لەژێر دروشمی شۆڕش لەدژی جەوری سوڵتان کەیخوسـرەوی دووەمـدا، ئــەم بزووتنەوەیــە بـووە هـۆی پەیـدابوونی (فرقەیـەکی سـۆفی) دیکـە بەتایبەتی (بەکتاشی).[٢٨]

دەبێ لێرەدا ئاماژە بۆ ئەوە بکەین، کەوا سەرچـاوەکانی ئـەم سـەردەمە لـەبارەی ئەم بزووتنەوەوە، لێکۆڵەرەوان دەیگێڕنەوە بۆ (بابا اسحق کفرسودی تورکمانی).. ابن عبری دەڵێ: لەساڵی ٦٣٨ی کۆچیدا پیاوێکی تورکمانی لەئەماسـیە پەیـدابوو، داوای پێغەمبەری دەکرد، دەیگوت مـن پەیامبـەری خـوام، نـاوی خـۆی نـا (بابـا)، موریدێکی هەبوو بەناوی (اسحاق) جلو بەرگی شێخایەتی پۆشی و بـۆ دەوروبـەری ڕۆم ناردی، گەیشتە (سمیساط) دەعوای خۆی بەناوی (بابا) ئاشکرا کرد.[٢٩]

(قرمـانی) شـێخی تەریقەتەکـەی بـە (بابـا الیـاس)[٣٠] ناونـا، بـەڵام سەرچـاوەکانی دیکە، لەوانە (ابن بیبی) دەڵێ: بابا اسحاق سەرۆکی بزوتنەوەکە بوو، (بابا الیاس) شەریکی بوو، دوای کوشتنی (اسحاق) ئەو مایەوە.[٣١] (بابا) هەوادارانی فێرکردبوو بڵێن (لا اله الا الله البابا رسول الله).[٣٢]

بەهەر حاڵ، فەرماندەی ئەم شۆڕشە تورکمانیە، سۆفیەکی خوراسـانی بـوو، دوای ئەوەی جەنگیزخان وڵاتەکەی داگیرکر لـەوێوە کۆچـی کردبـوو، ناوبـانگی لـەوڵاتی (ڕۆم)دا لەســاڵی ٦٣٨ی کۆچــی / ١٢٤١ی زایــین،[٣٣] بڵاوبــووەوە، ســەرۆکی بزوتنەوەکە ناوی (بابا) یان (بابا رسـول الله)ی لـە خۆنـا،[٣٤] کـە نـاوی (نبـووەت) ئــەوەمان بـیر دەخاتــەوە، کـەوا (نبـووە – النبـوە)بابـائی، بـەمانای مەبەسـتە شەریعەتیەکەی نەبوو، سـەرەڕای ئـەوەش، ئـەم بیرۆکەیەلـە وڵاتـی ئەنادوڵدا لـەو

کاتەدا دەزانراو ناسراوبوو، جەلالەدین رۆمی، کە لەدواوەوەی (صدرالدین القونوی) نوێژی دەکرد، ئاماژەی بۆ کرد وتی: (ئەوەی لەدواوەی ئیمامێکی تەقی و خواپەرستەوە نوێژ بکات، وەکو ئەوە وایە لەپشتی پێغەمبەرێکەوە نوێژی کردبێ)،[٣٥] ئەوەی ئەمە دەسەلمێنێ وتەی ئەو مێژوونووسانەیە کە دەڵێن: (بابائیەکان، وایان دادەنا کەوا پەیڕەوی خولەفای راشدین دەکەن..
هەندێك لەوانەی زیادە رۆییان دەکرد، دانیان بەوەدا ناوە کەوا بابا، پێغەمبەری خوایەو دروشمی (لااله الا الله البابا رسول الله)یان هەڵگرتبوو.[٣٦] (فواد کوبرلو) دەڵێ: (بابا خۆی بە ئەمیرلموئمنین) ناونا.[٣٧]
ئەم بزوتنەوەیە کەشو هەوای سۆفیگەری بەسەریا زاڵ ببوو، دوای ئەوە بووە سەرەتایەك بۆ سەرهەڵدانی بزوتنەوەی سۆفیگەری لەئێراندا.[٣٨] شەپۆلی (بەکتاشی) و بزوتنەوەی کۆچەری و هەراتیقە (الهراطقة) لە ئەنادۆڵ تاکو سەدەی حەڤدەهەمی زاینی، دامەزراندنی دەوڵەتی سەفەوی لەئێراندا بەردەوام بوو، ئەم بزوتنەوەیە لەو ناوچانەدا دەرکەوت کە (بەیالیسەکان - البیالصة) تیایدا دەژیان.[٣٩] پێشتر گوتمان، دامەزرێنەرەکەی سۆفی بوو، رێگای جیهادی لەبەرگرتبوو، لەپێشدا خەریکی وەدەستهێنانی زانیاری و زانست بوو، شارەزایی لەفێڵ و تەڵەکەبازی پەیداکرد، توانی بیر و هۆشی تورکمانەکان داگیر بکات و بە ئارەزووی خۆی هەڵیانسوڕێنێ، بیر و بۆچوون و بیروڕا کۆمەڵایەتیەکانی خستبووە قاڵبێکی نموونەییەوە، ژیانێکی میسالی و نموونەیی لەبەرچاویان دامەزراندبوو و بەڵێنی جێبەجێکردنی پێدابوون لەژێر فەرمانڕەوایی رۆحانی خۆیدا.[٤٠] تورکە نەخوێندەوارەکانی هەڵخەڵەتاندبوو فەتوای ناڕاستی دەدا و حەماسەتی ئاینیانی دەوروژاند، لەبەر چاویان دەگریا، جلو بەرگی کۆن و شڕۆڵیشی خەڵکی پێ لەخشتە دەبرد، هەروا لاوازی و بێ توناییەکەشی گوایە هی رۆژووگرتن و خواپەرستیەتی.[٤١] خۆی وا نیشان دەدا زۆر ئیماندار و لەخواترسە، سەدەقەی وەرنەدەگرت، رازی بوو بە خواردنێکی سادەو کەم، بەجۆرێ کاریگەری هەبوو، پرس و رایان پێ دەکرد، هەرچیەکیان هەبوایە پرسی ئەویان دەکرد، تا لەرێگای دوعاو نوشتەوە، ژن و مێردی دەسازاند و ئاشتی دەکردنەوە.[٤٢] تورکمانەکانیش

بەسەرکردەی خۆیانیان دادەنا، سەرکردەیەك دەمێك بوو چاوەڕێی یەکێکی ئاوا بوون، لەسیفەتی مرۆیی هەندێجار دەریاندەکرد و بەرگی رزگاکەریان لەبەردەکرد و بەو چاوە دەیانڕوانی پێدا، بۆیە کە کوشتیان دەستو پێوەندەکانی دانەکەوتن و وازیان نەهێنا، بەکۆتایی ژیانی ئەو بلاوەیان لێ نەکرد، بەڵکو کردیانە سونبولێکی وا لەدەوری کۆبوونەوە.[٤٣]

کە بینی خەڵکەکە، بەو جۆرە پابەندی بوونە، لە پڕ، خۆی لەچاو ونکرد، تا زیاتر پەرۆشی ببن و پابەندی بن، دواجار لە پرێکدا لەیەکێ لە دێکانی ئەماسیە دەرکەوتەوە، وەکو پەیامبەرانی پێشوو، دەستی کردە کاری (شوانی)[٤٤] دواجار، جێگایەکی تەریکی لاچەپی بۆخۆی دیاریکرد و لەوێ بەتەنها دەژیا، وای پیشان دەدا کە خەریکی تاعەت و خواپەرستیە،[٤٥] هەوادارانیشی لە دەرەوە بۆ شوێنەکانی تر دەنارد، تا بیروراکانی بلاو بکەنەوە. گەیشتە ئەوەی داوایان لە خوارزەمیەکان کرد پەیرەوی بیر و بۆچوونەکانی بکەن.[٤٦]

بزوتنەوەکەی لایەنی ئابووری پشتگوێ نەخستبوو، ڕێگای بەدەستو پێوەندەکانی دابوو، کەوا مافی ئەوەیان هەیە سوود لەتالانی و دەستکەوتەکانی وەربگرن، بەو پێیەی مافێکی سەرکەوتوانە.[٤٧]

وا دەردەکەوێت، بزوتنەوەی (بابائی) لە وڵاتی سەلجوقیدا برەوی هەبوو و خەڵکێکی زۆر لایەنگری دەکرد، بە بەڵگەی ئەوەی، لەهەموو لایەکی ئەو وڵاتە بلاوببوەوە، دانیشتوان بێ جیاوازی چوو بوونە سەر بیروراکانی..

سوپای سەلجوقی، تووشی ئاستەنگیەکی زۆر هات، تا توانی لەناوی بەرێت. چونکی لەناو سەربازەکاندا بلاو بوو بوەوە، هەندێجار وابووە، لەدژی پەیرەوانی نەدەچوونە شەڕەوە، پروپاگەندەش بلاو دەبووەوە کەوا ئەمانە لەناو نابرێن و دەمێننەوە.. بۆیە حکومەت کرێگرتە نەسرانیەکانی بەکارهێنا بۆ گژاچوون و شەڕکردنیان.[٤٨] بۆ سەلماندنی ئەو پەیوەندییە بەتینەی نێوان (بابائیەکان) و (خوارزەمیەکان) هێزێکی گەورە کە سوارەی و پیادە پێکهاتبوو و رقیان لەدەسەلاتی سەلجوقی بو، چوونە پاڵ خوارزەمیەکان لەساڵی ٦٣٦ی کۆچی / ١٢٣٨ی زاینی، لە فەرماندەی دودی ئۆغلۆ.[٤٩] (بابا ئیسحاق) زۆر لەسەرخۆ بووە،

لەبواری سیاسەتدا کارامە بوو، ڕێگای بەدەست و پێوەندەکانی نەداوە شۆڕش بکەن، تا ئەو کاتەی هێزەکانی سەلجوقی هەموویان لەناوچەکانی ڕۆژهەلاتدا بەکاروبارەوە خەریکبوون زانیویەتی چ کاتێ لەبار و گونجاوە بۆ هەلگیرساندنی شۆڕش، ئەو شەڕە یەك لەدوای یەکانە، وایکردووە ڕێژەی باج زیاد بکرێت و باری ئابووری خراپ بوو، بەڕێوەبردنی کاروباری ولات خراپ بوو، هەموو توێژ و چینەکانیش ڕقیان لەدەسەلاتی سەلجوقی بوو.[٥٠]

کە (بابا ئیسحاق) زانی بارودۆخەکە لەبارە، یەکێکی بو (کفرسود) نارد، یەکێکی دیکە بۆ (مرعش) تاکو هۆزەکان هان بدەن و ئامادە بکەن، ڕۆژی هەلگیرساندنی شۆڕشی بۆ دیاریکردن، فەرمانی دا ئەوەی بەدەنگ شۆڕشەکەیانەوە نەچێ بیکوژن.[٥١] تورکمانەکان، پێویستیان بە هاندان نەبوو، خۆیان بۆ شۆڕش ئامادەبون، ڕۆژی دیاریکراو (بابا ئیسحاق) بەزمان کەوتە دژایەتی سولتان کەیخوسرەوەوە، کردەوە ناپەسەندەکانی ئاشکرا کرد، کەوا لەڕادە بەدەر خەریکی ڕابواردنە، ئەم هێرشە، ئاماژە بوو بۆ دەستپێکردنی شۆڕش. تورکمانەکان، هێرشیان کردە سەر شار و دێهاتەکان، بۆ تالانی و دەسکەوت لەلایەکی تریشەوە بۆ بەهەشت بەدەستهێنان، لەهەموو سەلتەنەتەکە بلاوبوونەوە هەر کەسێ نارەزایی بەرامبەریان دەربڕی کوشتیان.

لەپێشدان (میر مظفرالدین علي شیر) بەرامبەریان ڕاوەستا بەلام نەیتوانی خۆی ڕابگرێت، بۆ مەلتیە هەلهات، لەوێ هێزێکی لە کوردەکان و فرمانیەکان پێکهێنا و دووبارە لەگەلیاندا کەوتە شەڕەوەن دیسانەوە هێزەکەی شکستی هێنا.[٥٢]

بابائیەکان، ورەیان بەم سەرکەوتنانە بەرز بووەوە، بەرەو سیواس ڕۆیشتنن لەوێ دانیشتوانەکە بەرامبەریان ڕاوەستا، دواجار بۆ تۆقات و ئەماسیە ڕۆیشتن، تورکمانەکان چوونە پالیان و دەستیان کردە خراپەکاری لەناوچەکەدا، دانیشتوانی ئەو ناوچانە چ نەسرانی یا موسلمانەکان وەکو یەك تووشی ئازار و خراپەکانیان بوونەوە.

دوای ئەم دەستدرێژیانەی بابائیەکان، حکومەتی ناوەندی کەوتەخۆی، کەیخوسرەوی دووەم پلانێکی سەربازی دانا توانی بەسەریاندا سەرکەوێت، ئەم

پلانە (ئەرمەغان شا) فەرماندەی سوپای ئەماسیە ئەنجامی دا، (بابا ئیسحاق)ی ئابلۆقەداو دەستگیری کرد و کوشتی، ئەوەی لێیان رزگاری بوو، وازی لێ نەهێنان دوایان کەوت، لەشەڕێکدا لەگەڵ هەڵاتوەکاندا فەرماندەی ئەماسیە شەهید بوو، دوای ئەمە بابائیەکان توندو تیژتر رەفتاریان کرد، هێرشیان کردە سەر ئەماسی و ئابلۆقەیان دا.[٥٣]

سوپای ئەرمەغان نەیتوانی سنوورێکیان بۆ دابنێ، ناچار کەیخوسرەوی دووەم سوپایەکی دیکەی ئامادە کرد، کە لە شەست هەزار پێکهاتبوو، هەزار سوارەی نەسرانی بەکرێگرتەشیان لەگەڵدا بوو، ئەو سوپایە سێ لە فەرماندە بەناوبانگەکانی بەڕێوەیان دەبرد (بهرام شا جاندار) و (ابن کورجی) و (فرکخلای ئەفرەنجی)... بوون.

ئەم سوپایە بەفەرماندەیی ئەو سێ کەسە، لە ئەرزنی رۆمەوە بەرەو قەیسەری کەوتەڕێ، لەولاشەوە شەش هەزار بابائی کۆبوونەوە، لەبیابانی مالیا لە ویلایەتی قیرشهر[٥٤] خۆیان ئامادەکرد، دواجار لەبەرامبەر یەك راوەستان و کەوتنە شەڕێکی سەختەوە، نەسرانیەکانی سوپای سەلجوقی گرانی شەڕەکەیان کەوتبووە سەرشان، لەئەنجامدا (خوارجەکان) شکستیان هێنا، چوار هەزار کەسیان لێ کوژرا، ئەوەی مایەوە لەسەربازەکان چوونە ناو خێزانەکانیانەوە، هێزەکانی سەلجوقی ئابلۆقەیانی دا، کە سوڵتان گەیشتە مەیدانی شەڕەکە، هەموو شتێك کۆتایی پێ هاتبوو.[٥٥]

بەمجۆرە شەڕی بابائیەکانی بە شکست هێنانیان کۆتایی پێهات. ئامانجەکانیان بەدی نەهات، هەرچەندە هەندێ سەرکەوتنیان بەدەست هێنا...

شتێکی ئەوتۆ لەلایەن بیر و بۆچوونی ئەم بزووتنەوەیە نازانرێت. بەڵام هەندێ لە لێکۆڵێرەوان دەڵێن لە (تەشەیجی باتنی)یەوە هەڵقوڵاوە کە (بابا ئیسحاق) لە خوراسانەوە کاتێ لەدەست مەغوڵەکان هەڵهات گەیاندبوویە وڵاتی رۆم.[٥٦]

لەو کاتەشدا حەڵەب و دەوروبەرەکەی بیروباوەڕی (ئیسماعیلی) تیایدا دەرکەوتبوو، کە لە مەزهەبی فاتیمی شیعەوە سەرچاوە گرتبوو و پڕ بوو لە هەوادارانی ئیسماعیلی و شیعە توندڕەوەکان[٥٧] بەڕادەیەك (ملك الافضل ایوبي)

لە فەرمانڕەوای سمیساط بوو، ئەو شارەی کە جێگە و شوێنی (بابا ئیسحاق) بوو، بە (شیعە) ناسرابوو.[٥٨]

هەرچۆنێ بێ ئەوا هەموو لایەك لەسەر ئەوە رێکەوتوون کەوا بزوتنەوەی بابائی پەیوەندی بەتینی بە شیعە بوونەوە هەبوو.[٥٩]

بۆیە ئەم دەعوەیە، لە کرۆکدا شیعەیەتی و بەڕواڵەتیش سۆفیانە بوو، کە لەو دەمەدا لەناو کۆمەڵگای تورکیدا و کۆمەڵگای ئیسلامیدا بڵاو بوو بووەوە، بەو پێیەی هەقی رەوای خەلافەتیەو شێوەیەکی نمونەییە بۆ موسڵمان و سەرکردە.[٦٠]

ئەوەی شایانی وتنە، مەبەستی راستەقینەی ئەم بزوتنەوەیە بۆ بەدیهێنانی مەبەستێکی سیاسی بوو، ئەویش بەرزکردنەوەی پایەی تورکمان و چەسپاندنیان لە کۆمەڵگای نوێدا، دوای ئەوەی مەغوڵ، وڵاتەکەیانی داگیرکرد، هەروەها مەبەستیان دامەزراندنی دەوڵەتێك بوو کە سەرکردە رۆحیەکانی بەڕێوەی ببەن، وادیارە ئەو تورکمانانەی کە سەرچاوەکان باسیان دەکات کەوا جلو بەرگ رەشن و فێسی سوور لەسەر دەنێن و لەرووی کۆمەڵایەتیەوە نموونەیی تورکمانەکانن کە لایەنگری قرمانیەکانیان دەگرت لەسەردەمی دەسەڵاتی مەغوڵدا، لەگەڵیاندا بەشداریان کرد بۆ دەست بەسەرا گرتنی قونیە و دامەزراندنی دەوڵەتێك بۆ خۆیان.[٦١] سەرچاوە مێژووییەکان، باس لەوە دەکەن کەوا (نور الصوفی) یەکێك بوو لە هەوادارانی (بابا الیاس) دوای شکستهێنانی بزوتنەوەی بابائی، توانی خۆی لەسوڵتانی سەلجوقی کەیقوبادی دووەم، بە دینداری و سۆفییەتی خۆی نزیك بکات کە سۆفیگەرییەی لە (بابا ئیسحاق و الیاس) فێر ببوو، سوڵتانی سەلجوقی، خوشکەکەی خۆی پێدا و لەسەر ئیمارەتی (لارندا) داینا،[٦٢] قرمان، کە کوڕی (نور الصوفی) بوو ئەو خەونە کۆنەیەی هێنایەدی، توانی دەوڵەتیکی سەربەخۆ دامەزرێنێ بەناوی دەوڵەتی (قرمانی)یەوە.. ئەوە، درێژەو ئەنجامی ئەو بزوتنەوە تورکمانیە بوو، کە سەرەڕای کوشتنی سەرکردەو گەورەکانیان کۆتایی پێ نەهات.

دەبێ ئەوەش بوترێ کەوا نائارامی و بژێوی ئاینی و سیاسی و ئابووری هۆکاری بنەڕەتی بوون بۆ ئەوەی خەڵکەکە ئەو داوایەی بەدڵ بێ و بەڕاستی بزانن.

## شۆڕشی (ئال الخطیر)

ئەگەر شۆڕشی بابائی بەرگی سۆفیگەری پۆشی و بارودۆخی ئابوری و کۆمەڵایەتی بۆ بەدیهێنانی ئامانجە سیاسیەکانی بەکارهێنا و سوودی لێ وەرگرتن، ئەوا شۆڕشی (ئال الخطیر) بەئاشکرا رەنگو بۆیەکی سیاسی هەبوو، شۆڕشێ بوو لەدژی داگیر کردنی مەغوڵ، ئاشکرایە بەشی رۆژهەڵاتی ئاسیای بچووك ملیان بۆ فەرمانڕەوایی مەغول کەچ کردبوو، بەرەنگار بوونەوەی مەغول لە قوڵایی ئەنادۆل سەریهەڵدابوو، موسڵمانە سوننەکانیش کە بت پەرستی مەغوڵیان پێ گران بوو کەوتنە هاوشان نەسرانیەکانی ئاسیای بچووك، سەرەڕای تورکمانەکان کە جێگا و لەوەڕگاکانیان هەڕەشەی داگیرکردنیان لێ دەکرا، ئەمانیش کەوتنە بەرەی بەربەرەکانی مەغولەوە. هەروەها کۆمەڵانی تورکمان لەلایەنەکانی تریش کەوتبوونە رووبەڕوو بوونەوە لەگەڵ مەغوڵەکاندا، ناچار بوون بەرەو رۆژئاوا کۆچ بکەن بەڵام ئەو لایەن و تاخمانەی بەرژەوەندیان لەشەڕکردنی مەغوڵدا بوو، هاوپەیمانیەکیان لەنێوان خۆیاندا نەبەست، بۆیە بەلاوازی مانەوەو دواجاریش سەرکەوتنیان بەدەست نەهێنا.

ئەم شۆڕشە دوو برا سەرکردایەتیان کرد، بەهۆی لێهاتوویی سیاسیانەوە توانیان بەرەیەکی دژ بە رژێمی سوڵتان کەیخوسرەوی سێیەم و وەزیرەکەی (بروانا) پێکبهێنن و بەرەنگاری مەغوڵەکان بکەن کە دەوڵەتیان خستبووە ژێر رکێفی خۆیانەوە. براگەورەکەیان (شرف الدين مسعود ابن خطير) لەسەردەمی سوڵتان قلیج ئەرسەلانی چوارەم دەرکەوت، کە فەرماندەیی سوپایان پێ راسپارد بوو، ئازایەتی نواند و سیستەمی سەربازی سەلجوقی گۆڕانکاری تێدا کرد. سوڵتان لەبەر ئەوە رێی لێ ناو ویلایەتی (نكيدە)ی پێدا.[٦٣] لەسەردەمی سوڵتان کەیخوسرەوی سێیەمیش هەر لەو پلەو پایەیەی خۆی مایەوە.[٦٤]

برا بچووکەکەی (ضیاءالدین) نوێنەری (بروانا) بوو، زۆر جار کاری قورس و مەترسی پێ رادەسپارد.[٦٥] هەردوو براکە، لەسەرەتای ژیانی سیاسیاندا لەدەوروبەری سەرکردایەتی (بروانا) کاریان دەکرد، لەهەمان کاتدا (شرف الدين) خەریکی خۆ ئامادەکردن بوون قەڵای (نكيدە)ی سەختتر دەکرد و چەك و

ئازووقەی تیادا عەمبار دەکرد، بەمەبەستی شۆڕش بەرپاکردنن لەدژی مەغۆڵ.. کە چاوی لە (حسام الدین بێچار کوردی) دەگرت، کە فەرمانڕەوای دیاربەکر بوو و یەکەم کەس بوو دژی مەغۆڵ شۆڕشی بەرپا کرد.

وا دیارە لەنێوان ئەو دوو پیاوەدا پەیوەندی هەبووە، بۆ ڕێکخستنی کاروباری شۆڕش بەرپاکردن. ئەمە ئەوە دەگەیەنێ کەوا هەڵوێستی میرەکان سەبارەت بەسیاسەتی گشتی دەوڵەت گۆڕانکاری بەسەردا هات.(٦٦)

لەساڵی ٦٧٥ی کۆچی / ١٢٧٦ی زاینی، شەرەفەدین چوونی (بروانا) بۆ سەربازگەی مەغۆڵی بەهەل زانی، جاڕی شۆڕشی دا لەدژی مەغۆڵەکان، بۆ ئەوەی هەڵوێستی بەهێز بێ، سوڵتانی ناچار کرد، لایەنگری بکات و قەیسەرییەوە بۆ (نکیدە)ی هێنا، کەبنکەی بەرگریکردن بوو، (بروانا) دوو فەرمانداری ڕاسپارد، بەرەو ڕووی ڕاوەستن، بەڵام هیچیان پێ نەکرا، ئەو دووانەش (تاج الدین کیوی و سنان الدین ارسلان دوغمش) بوون.. لەپێکداداندا هەردووکیان کوژران.(٦٧) (شرف الدین) براکەی خۆی (ضیاءالدین) بۆ وڵاتی شام نارد، تا لەگەڵ (بیبرس) کۆببێتەوەو بارودۆخە تازەکەی بۆ ڕوون بکاتەوە، هەروەها داوای یارمەتیشی لێ بکات، لەهەمانکاتدا داوای کرد لە قرمانیەکان و تورکمانەکانی ئەو دەوروبەرەی تا یارمەتی بدەن.(٦٨)

هەندێ لەمیرە دوورخراوەکانی چوونە پاڵیان لەوانە: (میر شمس الدین کنجە) کە لەمیریەتی دەریانکردبوو و دەست خستنە ناو کاروباری گشتیان لێ قەدەغە کردبوو، (اقسرانی) لەو بڕوایەدایە، دەستێکی باڵای لەم ئاژاوەگێڕییەدا هەبووە، هەر ئەو ڕێنمایی (شرف الدین)ی دەکرد و پەیوەندی بە مەمالیکەوە کرد.(٦٩)

(نەکیدە) بنکەی کۆبوونەوەی هێزە هاوپەیمانەکان بوو، (شرف الدین) بەیارمەتیەکانی تورکمانەکان و قرمانیەکان لەخۆبایی بوو، هەرچەندە بارودۆخەکە نەگەیی بوو، بۆ شۆڕش لەبار نەبوو، جاڕی شۆڕشی دا، بێگومان مەمالیکەکان یارمەتیان داو هاوبەش بوون لەگەڵیا، بەڵام هێزەکانی مەمالیك کە لە وڵاتی شامەوە بۆ (بستان) نێررا، بۆ پاڵپشتی شۆڕشگێڕان هێزێکی مەغول بەرەنگاریان بوونەوە، گەڕانەوە.(٧٠) (شرف الدین) نەیتوانی لەبەرامبە مەغول خۆی ڕابگرێت

دەستگیریان کرد، بردیان بۆ جێگای حەسانەوەکەی (کنغرطاي) لە (دلوجە) دوای لێپرسینەوە کوشتیان.. براکەشی (ضیاءالدین) لەشەڕی (بستان) دواتر کوژرا.[٧١]

## ئەنجامەکانی شەڕی (ئال الخەطیر)

– شۆڕشی (ئال الخە طیر) سەرنەکەوت، ڕەنگە پەلەکردنی (شرف الدین) هۆیەکی گەورەبێ بۆ سەرنەکەوتنی.. بۆ سەرکەوتنی بزوتنەوەی شۆڕشگێڕانە پێویستی بە دوو شت هەیە:

ناوەکی: کە ڕای گشتی دەبێ ئامادە بکرێت و سەرکردەی لێهاتووی بۆ دەستنیشان بکرێت..

دەرەکی: کە پێویستە یارمەتی وڵاتانی دۆست و دەوروبەر دابین بکرێت، (شرف الدین) توانی پشتگیری ناوەکی بەدەست بهێنێ، بەڵام لەبواری دەرەکییەوە سەرکەوتوو نەبوو. ڕاستە (بیبرس) دەیویست یارمەتی شۆڕشگێڕان بدات بەڵام (شرف ادین) کاروباری نێوانیان ڕێکبخات.

– شۆڕشی (ئال الخە طیر) هۆزەکانی تورکمانی هاندا و دەستیان کردە بەرگری مەغۆل و شۆڕ دژی دەسەڵات، بەبەڵگەی ئەوەی چەند شۆڕشێك سەریانهەڵدا، هەندێکیان سەرکەوتنی وەدەست هینا، وەکو شۆڕشی قرمانیەکان.

– شۆڕشی (ئال الخەطیر) دەربڕینی هەستێکی نیشتمانی بوو لەدژی داگیرکردنی مەغۆلەکان تەقیەوە، هەروەها شۆڕشێك بوو دژی دەسەڵات کە بەو داگیرکردنە ڕازی بوو بوو، ئەمە لەو وتوێژەدا دەبیینین کە لەنێوانی بەرهەڵستکەران و مەمالیکدا ڕویدا، داوای ئەو مەرجەیان لە (بیبرس) کرد، لەبریپشتگیری کردنی دەبێ دان بە ڕەوایی دەسەڵاتی ناوەندی سەلجوقی بکات، لەسەرووی هەموویەوە سوڵتان.. چونکی ئامادە نەبوون داگیرکەرێك بەداگیرکەرێکی دیکە بگۆڕنەوە.

## شۆڕشی قرمانی و ئاژاوەگێڕی جمری

ئەمەوییەکان و عەباسیەکان، بەهۆی ململانێی بەردەوامیان بەگەڵ بیزەنتیەکاندا، هێزی تایبەتیان لەناوچە سنووریەکان دادەنا بۆ بەرپەرچدانەوەی هێرشەکانی بیزەنتی، سەلجوقیەکان، لەسەدەی دوانزەی زاینیدا هەمان شتیان دووبارە

کردەوە، هێزی تایبەتیان لەسنورەکانی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوای وڵاتەکەیان دانا، لەمەشدا پشتیان بە تورکمانەکان بەستبوو.
یەکێ لەو هێزە گرنگانە لەسەدەی سیانزەمی زایینیدا، ئەو هێزە بوو لەسەر کەنارەکانی دەریای سپی ناوەڕاستیان دانابوو، لەو شوێنەی کە سنووری ئەرمینیای بچووك و دەسەڵاتی سەلجوقیەانی جیا دەکردەوە. بەتایبەتی لەنزیکی هەندێ لەبەندەرەکان، وەکو (ئەنتالیە و عەلایا) بەڵام لەهەمووی گرنگتر ئەو هێزە بوو کە لە ڕۆژئاوای ئەنادۆڵ لەسەر سنووری بیزەنتە دانرابوو دەوڵەتی سەلجوقی هەندێ فەرماندەی دادەمەزراند بۆ پارێزگاریکردنی ناوچە کەنارییەکان و هەندێ لەمیرەکانی کەنارەکانی دەخستە ژێر فەرمانی ئەو فەرماندانەوە، هەروەها وا ڕاهاتبوون نازناوی (ئوج بەگی) یانی فەرمانڕەوای سنووری، دەدایە سەرۆك هۆزەکان، کەهەندێ لە هۆزە بچووکەکانیش دەهاتنە ژێر دەسەڵاتی ئەو سەرەك هۆزانەوە، سەرۆکێکی بۆیان دادەمەزرێنرا، یا چەند سەرۆکێك، هەریەکەو نازناوی (ئوج ئەمیری) یان دەدایە، کە بە مانای میری سنوور دێ.[٧٢]
سەرچاوەکان، ناوی هەندێ لەو خێزانانەو فەرمانڕەوایانە سنوور دێنێ و باسیان دەکات، بەناوبانگترینیان (محەمەد بەگ) کە لەسەردەمانێکدا دەسەڵاتی بەسەر هەموو ئەو هۆزانەی کەناری دەریادا هەبوو کە لەناوچەی ئەنتالیا و سنووری باشووری ڕۆژئاوا دابوون، لەسەر ڕووباری مندریس.[٧٣] میرەکانی سنوور هەڵوێستێکی دوژمنانەیان بەرامبەر مەغۆل هەبوو، بەلام لایەنگری مەمالیکیان دەکرد، هەروەها سوودیان لەلاوازی ئیدارەی ناوەندی وەرگرت لەدوای مردنی میرەکانی سنوور هەڵوێستێکی دوژمنانەیان بەرامبەر مەغول هەبوو، بەڵام لایەنگری مەمالیکیان دەکرد. هەروەها سوودیان لەلاوازی ئیدارەی ناوەندی وەرگرت لەدوای مردنی سوڵتان کەیخوسرەوی دووەم تا خۆیان بەهێز بکەن، ماوەیان بۆ ڕەخسا، داوای سەربەخۆیی بکەن (صاحب اقا) و (محمد بگ قرمانی) لەو میرانە بوون کە داوای سەربەخۆییان دەکرد.
قرمانیەکان ژیانی سیاسی خۆیان وەکو بزوتنەوەیەکی دژ بە مەغۆلی داگیرکەر دەستپێکرد، تا توانیان ئیمارەتێکی سەربەخۆ لەسەدەی چواردەهەمی زایینی

دامەزرێنن، لەساڵی ٧٣٦ی کۆچی / ١٣٣٥زاینی لەقونیە جێگیر بوون، کە بەهێزترین ئیمارەت بوون لەدوای روخانی دەوڵەتی سەلجوقی دامەزرا، بانگەشەی ئەوەیان دەکرد کە جێنشین و میراتگری دەوڵەتی سەلجوقین.(٧٤) ئەم هۆزە، دەچنە سەر سەرکردەکەیان کە (قرمان) بوو، ئەمیش جێنشینی باوکی بوو کە (نوره الصوفي)بوو. لەباشووری رۆژهەڵاتی قونیە نیشتەجێ بوو بوون، کاتی خۆی سەلجوقیەکان وەکو گوشارێك بۆ سەر ئەرمینیای بچووك لە قیلیقیە دایانابوون.(٧٥)
(ابن بيبي) دەڵێ: باوکی قرمانیەکان لە خەڵوز فرۆشەکانی تورکمان بوو لەوڵاتی ئەرمەنی، کە بە (فخرالدين) دەناسرا و لەچیای (لارندا)ەوە خەڵوزی دەهێنا.(٧٦)
(قرمان) هەر لەسەردەمی (بایجو)ەوە ناوبانگی دەرکرد، چونکی بەردەوام هێرشی دەکردە سەر کاروانە بازرگانیەکان و رێگای دەبڕی، لەپێشدا پیادەڕۆ بوو، بەڵام لەئەنجامی دزی و دەسکەوتەکانیەوە بووە سوارە.(٧٧)
(قرمان) لەو قۆناغەدا، بیری لەسەربەخۆیی و جیابوونەوە نەدەکرد لەدەوڵەتی سەلجوقی، نیازی ئەوەش نەبوو بەرەنگاری مەغوڵەکان ببێتەوە، بەبەڵگەی ئەوەی، چووە ژێر فەرمانی سوڵتان قلیج ئەرسەلانی چوارەمەوە.(٧٨) سوڵتان بەمیری ویلایەتی ئەرمینیا دایمەزراند، کە بەهێز بوو، کەوتە بیرکردنەوە لە شۆڕش و سەربەخۆیی، بەتایبەتی وڵات بەقۆناغێکی نائارام و ئاژاوەدا تێدەپەڕی. بەڵام سوڵتان ئەو خەونەی نەهێڵا بێتەدی و ساڵی ٦٥٩ی کۆچی / ١٢٦١ی زاینی لەناوی برد، کاتێ لەدارستانێکدا خۆی شاردبووەوە، هێزەکانی سەلجوقی ئاگریان لەدارستانەکە بەردا لەناو دارستانەکەدا سوتا.(٧٩) براکەی (بونسون) و یاریدەرەکەی (زين الحاج) نەیانتوانی خۆیان لەبەر هێزی سەلجوقیدا رابگرن و پێیان نەکرا دووبارە هێزێکی قرمانی پێکەوە بنێن. هەردووکیان بەدیل گیران و لەدەروازەی قەڵای قونیە هەڵواسران. کوڕەکانی (قرمان) لەقەڵای (کاولە) بەند کران، بەڵام دواجار (بروانا) ئازادی کردن، علی بەگ مایەوە لەقەیسەرییە زینداینی بوو.(٨٠) کە شۆڕشی (ئال الخه طير) بەرپا بوو، قرمانیەکان پشتگیریان کرد، (شرف الدين) پاداشتی ئەو یارمەتیەیان دایەوەو (محمد بەگ)ی کردە والی ئەرمینیا، کە شۆڕشیان لەناوبرد (محمد بەگ) لەدژی دەسەڵات بەردەوامی بە

شۆڕش دا، یاخی بوو لە (باج)دان، (بدرالدین ابراهیم قاضي الختني) فەرمانڕەوای پێشووی ئەرمینیا، هێرشی کردە سەری، بەیارمەتی مەغۆڵ، بەلام سەرنەکەوت و هەلات خۆی گەیاندە یەکێ لە قەلاکانی ویلایەتی ئەرمەنی..

قرمانیەکان، دەسکەوتیان، لەم شەڕەدا زۆر بوو و دەستیان بەسەر ویلایەتەکەدا گرت.[81] (بروانا) هەوڵێکی دیکەی دا بۆ لەناو بردنیان، ئەو هێزە بەفەرماندەیی (میکایل) بوو تووشی شکست هات، بەلام توانیان ئەو ئابلوقەیە بشکێنن کە خرابووە سەر (بدرالدین).[82] ئاژاوە هەموو لایەکی ولاتی گرتەوە، دوای ئەم هەوڵە سەرنەکەوتوانە.. تورکمانەکان دەستیان کردە هێرشکردنە سەر کاروانە بازرگانیەکان، یاخی بوونی قرمانیەکان ببووە مایەی کارەسات و وێرانکاری. زۆرێك لە میر و فەرماندەکان لەو روو بەڕوو بونەوانەدا لەناوچون، (قونیە) کەسی وای تێدا نەما پارێزگاری لێ بکات. (محمد بەگ) کەوتە نیازی ئەوەی بڕواتە ناو شارەکەوە.. تا بزووتنەوەکەی سیفەتێکی شەرعی وەرگرێ، هەولی دا سولتان بۆلای خۆی راکێشێ، یان پەیوەندی بەیەکێ لە کوڕەکانیەوە بکات، تا بیکاتە سولتان و لەسەر تەختی سەلجوقی دانیشێ[83] لەم کاتەدا، یەکێك بەناوی (جمری)یەوە دەرکەوت، کە کابرایەکی رێگر و لەسەردزی و جەردەیی دەژیا، بەهۆزەکاندا دەگەڕا و دەیگوت: من کوڕی کەیکاوسی دووەمم. (محمد بەگ) پەیوەندی پێوەکرد. هەردووك پێکەوە هێرشیان بۆ قونیە برد.ئابلۆقەی شارەکەیاندا و توانیان بچنە ناو شارەکەوە.. تورکمان دەستی کردە تالانی. (جمری) لەسەر تەخت دانیشت و محمد بەگ دانی پێدا نا، کە سولتانی سەلجوقیە.. بەناوی ئەوەوە وتار دەخوێندراو سکەشیان بەناوی ئەوەوە لێدا، خەلکەکەش ناچار چوونە ژێر بار.[84]

(جمری) وەکو سولتانێك فەرمانڕەوایی دەکرد، فەرمانی بۆ ویلایەتەکان دەنارد، زمانی تورکی کردە زمانی کاروباری دەولەت و لەدایەرەکاندا دەبوایە بکار بهێنرایە، (محمد بەگ)ی بەوەزیر دامەزراند، هەروەها کچەکەی سولتان قلیج ئەرسەلانی چوارەمی خواست، ئەمجارە خۆی ئامادەکرد بۆ بەگژاچوونی کوڕانی

(صاحب فخرالدین) کە لە (ئاق شەهر) یاخی ببوون، توانی بەسەریاندا زاڵ بێ و یاخی بوونەکەیان دامرکێنێ.[85]

دواجار شۆڕشگێڕان روویان کردە شاری (قەرا حەسار) هێرشیان کرد سەر شارەکە بەڵام نەیانتوانی بچنە ناو شارەکەوە، (جمری) دەستی کردە پلانداناں بۆ بەگژاچوونی مەغۆل، بەڵام سەربازی بۆ کۆ نەکرایەوە، پاشگەز بووەوە.[86] بەڵام مەغولەکان دەستیان لەیەخەی نەکردەوە، لە قونیە هێرشیان هێنا ناچاریان کرد لەشارەکە دەرچێ، کە مەغۆڵەکان رۆیشتن، دووبارە گەڕایەوە، بەڵام دانیشتوانەکەی بەرگرییان کردو نەیانهێشت بێتە ناو شارەکەوە، هەندێ وێرانکاری لەو ناوەدا ئەنجامدا و بەرەو ویلایەتی ئەرمەن رۆیشت.[87] لەئەنجامی بڵاو بوونەوەی ئاژاوەو کاری گێرە شێوێنی، و لاوازی میری مەغول (کنغرطاي) کەنەیتوانی ئارامی بۆ شارەکە بگەڕێنێتەوە، ساڵی ٦٧٦ی کۆچی / ١٢٧٧ی زایینی، (ئیلخان ئاباقا) وەزیرەکەی بەسوپایەکەوە نارد (شمس الدین جوینی) تا شۆڕشەکە دامرکێنێ و ئارامی بخاتە ناوچەکەوە.[88]

ئەم سوپایە لەرێگای (لارندا) ەوە بەرەو کەنار کەوتەڕێ، توانی زۆر لە تورکمانە یاخی بووەکان دەستگیر بکات، بەڵام بەهۆی هاتنی وەرزی زستان کارە سەربازییەکانی راگرت. (جوینی) روویکردە (کازوفا) لەناوچەی تۆقات، تا زستانەکە لەوێ بەسەر بەرێت و هێزێکی مەغۆلی لەوێ خستە ژێر دەسەڵاتی سوڵتان کەیخوسرەوی سێیەم و وەزیرەکەیەوە (صاحب فخرالدین) و بەرەو قونیە رۆیشتن.[89] سوڵتان دەستی بەهێرشکردن کرەوە لەوەرزی بەهاردا بەیامەتی هێزەکانی مەغۆل، لەشەڕێکدا کە لەبیابانی (مردن)دا روویدا توانی بەسەریاندا زاڵ بێت، لەم شەڕەدا، محمد بەگ و براکەی کوژران،[90] سوڵتان ئەم سەرکەوتنەی بەهەل زانی، بەردەوامی بەهێرشەکانی دا، (جمری) لە (قەرا حەسار)دا بوو، شەڕو پێکدادان لەنێوانیاندا روویدا، هیزەکانی سوڵتان سەرکەوتن، (جمری) بەدیل گیرا، پێستیان گرو لە کایان پڕکرد و بە وڵاتدا دەیانگێڕا تا ببێتە پەند بۆ کەسانێك کە دەیانەوێ یاخی بن.[91]

سـولّتان دوای ئـەم سەرکەوتنە،چـووە (برغلـوّ)، لەگـەڵ دانیـشتوانی (لازیـق) و (خونـاس) کۆبـووەوە، دانیـشتوانەکەش، (علـی بـەگ)ی مـیری (ئـوج)یـان بەدەستەوەدا، کە لەو کاتەی دەوڵەت شەڕی یاخی بوانی دەکرد، ئـەویش جاڕی یاخیبوونی خۆیدا، سولّتان لە قەراحەسار، زیندانی کرد، بەڵام دواجار هەر لەترسدا لە زینداندا کۆچی دوایی کرد.[92] بارودۆخەکە بەدەرکـەوتنی کۆمـەڵێکی دیکـەی شۆڕشگێڕ ئالّۆزتر بوو، شاری (کوتاهیە)یان کردە بنکـەی خۆیـان، ئـەم تاخمـەش بزوتنەوەی (کرمانیەکان) بوون.

کرمانی – یان – قرمانی، هەر لەساڵی ٦٨٦ی کۆچی / ١٢٨٧ی زاینیەوە چـەندین جار بەهاوبەشی سەلجوقیەکان – مەغوّل هێرشیان دەکردە سەریان، ناچار بـوون لـەکاتی سـەغلەتیاندا، لەگـەڵ مەغوّلەکانـدا خۆیـان بـسازێنن، بـەو جـۆرە بەردەوامبوون، تا لەناوچوونی دەولّەتی سەلجوقی، ئـەوجار لەناوچـەکانی خۆیانـدا جۆرە سەربەخۆییەکیان پەیدا کرد و (قونیە)یـان کـردە پایتـەختی خۆیـان. سـاڵی ٧٠٣ی کۆچـی / ١٣٠٣ی زایـنی، لـەوڵاتی رۆم، یـاخی بوویـەکی دیکـە پەیـدا بـوو، ئەویش (ولد جاهی) بوو.. لەنێوان (نکیدە) و (ئاقسەرا)یدا ئاڵای یاخی بوونیان لـە دژی دەوڵـەت هـەڵکرد. حکومـەتی ناوەنـد نـەیتوانی، سـنوورێك بـۆ کـاروکردەوەو یاخی بوونەکەیان دابنێت.[93]

ئەم یاخی بوون و شۆڕشانە، دەوڵەتی مانـدوو دەکـرد،، بـواری نـەدەدا بەدەوڵـەت ئاوڕ لە کاروباری دەرەکی بداتەوە، کە مەغوّل کەڵکی لـەو بارودۆخـە وەردەگـرت، بێگومان لەئەنجامدا ئەم شۆڕشانە یەکێ لە هۆکانی نەمانی دەوڵەتی سەلجوقی.

## ململانێی بیانی لەسەر خاکی رۆم گەندەڵی مەغوّل

ململانێی بیانی لە وڵاتی ئەنادۆڵ، بەشـێکی دیکـەی هـۆی لەناوچـوونی دەسـەڵاتی سـەلجوقی بـوو، ئـەم ململانێیانـە دەکرێنـە دوو بەشـەوە، ململانێـی مـەغوّل – مەمالیك، کە لەبەشەکانی پێشوودا باسمان لێـوەکرد، ململانێـی مـەغولی نـاوەکی، کە لەم چەند دێرانەدا باسی لێوە دەکەین.

وڵاتی سەلجوقیەکان دوای شەڕی (کوسی داغ) کەوتە ژێر دەسەلاتی مەغولەوە. بەڵام لەبەر ئەوەی دوور بوو لە دەسەلاتی ئیمپراتۆریەتی مەغۆڵەوە، دەسەڵاتی ناوەندی سەلجوقی هەرمایەوەو لەناو نەچوو بەتەواوەتی، دەزگاکانی دەوڵەت و بەڕێوەبردن و کارگێڕی هەر بەدەست سەلجوقیەکانەوە مایەوە.

تەنها ئەوە بوو خۆیان سوڵتانەکانیان دادەمەزراند. وەزیر و فەرمانڕەوای ویلایەتەکانیش هەر لەلایەن خۆیانەوە دەستنیشان دەکرا، مانەوەی بارودۆخی بەڕێوەبردن وەکو خۆی سیاسەتێکی نوێی مەغۆل نەبوو، بەڵکو لەسیاسەتی بنەڕەتی ئەوان بوو، هەمیشە خەریکی کاروباری سەربازی بوون و ئەوەندە خەمی بەڕێوەبردنی مەدەنیان بەلاوە گرنگ نەبوو، دابوویانە دەستی دانیشتوانی ئەو وڵاتانەوە کە داگیریان دەکرد، بەڵام فەرمانڕەوای سەربازیان دادەمەزراند، تا سەرپەرشتی سیاسەتی باڵای وڵاتەکە بکەن و سەربازگەیان دادەمەزراند.[٩٤]

بەڵام وا روویدا ئەم سیاسەتەیان گۆڕانکاری بەسەردا بێت، مەغۆل دوای کوشتنی (بروانا) و تێکچوونی بارودۆخی ئەنادۆڵ بەرەبەرە بەڕێوەبردنی وڵاتیان بەدەستەوە گرت، لەدوا دوایی سەردەمی دەوڵەتی سەلجوقیدا کاری ئیداریان بەدەستەوە گرت..

ساڵی ٦٤٠ی کۆچی / ١٢٤٢ی زایینی، (بایجو) بە فەرمانڕەوای ئازەربایجان و عێراق دامەزرا لەجیاتی (جرماغون) ئەم پیاوە تا ساڵی ٦٥٤ی کۆچی / ١٢٥٤ی زایینی[٩٥] لەسەر کارەکەی مایەوە، ئەم فەرماندەیە سەرەکی سەلجوقیەکانی کرد و سەربەخۆیی سەلجوقیەکانی نەهێشت[٩٦]

(بایجو) لەماوەی حوکمڕانیدا، دەسکەوت و دارایی وڵاتی هێنایە سەر سفر، کە بووە مایەی لاوازبوونی دەوڵەتی سەلجوقی، هەموو ساڵێ پیاوانی خۆی بۆ ئەنادۆڵ دەنارد، داوای پارەو دیاری دەکرد، بەجۆرێ هەستیان کرد ئەگەر کار بەم جۆرە بەردەوام بێ، ئەوا بارودۆخی دارایی وڵات بەرەو خراپتر دەڕوات، دوای وتووێژ لەنێوان سوڵتان و پیاوانی دەوڵەتدا بڕیاریاندا، ئەم حاڵەتە بەهولاکۆ رابگەیەنن، هولاکۆ، لەم مەسەلەیەی کۆڵیەوەو نا رازی بوو، ئەمە بووە مایەی دڵ خۆشیان، بۆیە لەگەڕانەوەیاندا (بایجو)یان ئاگادار کردەوە کە (خاقان) بڕیاری لەمبارەوە

دەرکردووە بەڵام ئەمەی پێ ناخۆش بوو، بڕیاریدا بە زووترین کات، بۆی بلوێ ئەوا دەچێتە ناو وڵاتی رۆمەوە.[٩٧]

زۆری نەخایاند (بایجۆ) رویکردە وڵاتی سەلجوقی، بەبیانووی ئەوەی زستان لەوێ رادەبوێرێ.. داوای لە کاربەدەستان کرد جێگایەکی بۆ تەرخان بکەن تا زستانەکەی تیادا بەسەر بەرێ.[٩٨] لەگەرمەی ناکۆکی نێوان هەردوو برا (کەیکاوسی دووەم) و (قلیج ئەرسەلانی چوارەم)، بایجۆ، لایەنگری (قلیج)ی کرد.. کە بڕیار درا وڵاتی لەنێوانیاندا دابەش بکرێت، مەلتیە کەوتە بەشی (قلیج)ەوە فەرمانڕەوای شارەکە (بهادر) شارەکەی بەدەستەوە نەدا، (بایجۆ) بەزۆر چوە ناو شارەکەوەو دانیشتوانەکەی ناچار کرد کە بچنە ژێر ئاڵای (قلیج ئەرسەلانی چوارەمەوە)[٩٩] لەساڵی ٦٦٤ی کۆچی / ١٢٦٥ی زاینی هوڵاکۆ مرد، کە دامەزرێنەری ئیلخانی ئێران بوو، (ئاباقا)ی کوڕی بووە جێنشینی، (تودان نوین) و (تۆغۆ ئاغا) بە فەرماندەی هێزەکانی مەغول لە وڵاتی رۆم دامەزراند، کە لەشەڕێکدا دەکوژرێن (سمغار) دواتر (کهورتای) دامەزراند لە جێگاکەیاندا.[١٠٠] کە (بیبرس) لەساڵی ٦٦٥ی کۆچی / ١٢٦٦ی زاینی، هێرشی کردە سەر ئەرمینیای بچووک، شای ئەرمینیا (هیسوم) خۆی گەیاندە فەرماندەی هێزەکانی مەغول لە وڵاتی رۆم کەناوی (نایشی) بوو، داوای یارمەتی لێکرد بۆ بەرپەرچدانەوە هێرشەکانی مەمالیك.[١٠١] لەساڵی ٦٨٥ی کۆچی / ١٢٨٨ی زاینی (ئیلخان ئارغون) دکتۆرێکی یەهودی بەناوی (سعد الدولە) بە وەزیری دارایی دامەزراند، کردییە گەورە راوێژکاری خۆی. ئەم وەزیرە زۆر فێڵباز و زیرەك و لێهاتوو بوو، (ئیلخان) رێگای پێدا بۆ ئەوەی کاروباری دارایی وڵات چاك بکات. (سعد الدولە) ئەمەی بەهەل زانی، یەهودیەکانی لەسەر کاروباری سەرەکی دەوڵەت دامەزراند، خزمەکانی راسپارد تا (باج) کۆبکەنەوە، سەرەڕای ئەوەی (خوراسان) و (ئەنادۆڵ) لەژێر دەسەڵاتی ئەودا نەبوون، چونکی موڵکی (میر غازان) و (کیغاتو بوون)،[١٠٢] بەڵام وڵاتی رۆم لە دەمارگرژی و رق و کینەی قورتار نەبوو، میرەکانی دەبوغزان و سوکایەتی پێدە کردن، پیاوە بەهێزەکانی دوو دەخستەوە وەکو (فخرالدین القزوینی) و (مجبر الدین شا) چونکی بە نەیاری خۆی دادەنان و دەترسا جێگەکەی

بگرنەوە.. کوڕەکانی (قەلاون) و (صاحب شمس الدین) لە حکومەتی سەلجوقی ڕۆم دامەزراند.[١٠٣]

کوڕەکانی (قەلاون) خەڵکەکەیان ئازار دەدا، وەزیر و میرەکانی بەچاوی سوك تەماشا دەکرد. تا خەڵکەکە ناڕەزاییان دەربڕی و دانیشتوانەکە نائومێدی باڵی بەسەریاندا کێشا.. (سمغار) هەوڵیدا سنوورێك بۆ ئەم بارودۆخە دابنێ، بەڵام هیچی پێ نەکرا.. ئەم مۆتەکەیە لەسەر وڵات و خەڵکەکە لانەچوو تا دوای کوشتنی (سعد الدوله) لەساڵی ٦٩٠ی کۆچی / ١٢٩١ی زاینی و (کیغاتو) چووە سەر تەختی مەغۆل لەجیاتی (ئەرغۆن).[١٠٤]

لێرەدا هەر ئەوەندە لە هەڵسو کەوتە نائاساییەکانی فەرمانڕەواو فەرماندەکانی مەغۆل دەخەینەڕوو کە کاردانەوەیەکی خراپی هەبوو بۆ سەر بارودۆخی وڵات.

## ململانێی مەغۆلی ناوەکی لەوڵاتی ڕۆمدا

ململانێیە ناوەکیەکانی نێوان فەرمانڕەواکان مەغۆل لەوڵاتی ڕۆمدا ڕۆڵێکی دیاری هەبوو لەپاشەکشێی دەسەڵاتی سەلجوقی و لاوازکردنی و دواجاریش لەناوچوونی لەساڵی ٦٩٠ی کۆچی / ١٢٩١ی زاینی (کیغاتو) بە حاکمی گشتی مەغۆلی لەئاسیای بچووك هەڵبژێررا و کرایە (ئیلخان) دوای مردنی (ئەرغون) ئەو دەمە لەئەنادۆڵ بوو، دواجار بۆ (ئالاداغ) گواستیەوە، لەم سەفەرەیدا سوڵتان و مەسعودی دووەمی، لەگەڵدا بوو.[١٠٥] (بایدۆ) بەدامەزراندنی ناڕەزابو، بەڵام میرەکانی (تومانات) لایەنگری بوون، لەوانە (توفاجار) بوو.. دواجار (کیغاتو) چووە ئەنادۆڵ، بۆ پاراستنی ئەمن و ئاسایش، دوای ئەو زنجیرە هێرشانەی تورکمانەکان دژی سەربازگەکانی مەغۆل ئەنجامیاندا، (توفاجار) ئەمەی بەهەل زانی، وای بڵاو کردەوە کە سوپاکەی، بەدەستی شۆڕشگێڕەکان تێکشکاوە، ئەمە بووە هۆی، ئاژاوە لەناو مەغۆلدا، بۆ کۆتاییهێنان بەو پڕوپاگەندەیە (کیغاتو) بەهێزێکەوە ڕۆیشت و (توفاجار)ی دەستگیر کرد. بۆ (ئەرزەن)ی ڕۆمی نارد، بەڵام دواجار ویستی بۆلای خۆی رایبکێشێ لێیخۆش بوو و کردیە فەرمانڕەوای ئەنادۆڵ و دیاربەکرو هەرچیش بکات کەس لێی نەپرسێتەوە.[١٠٦]

(بایدو) بە ئیلخان، هەڵبژێردرا، لەساڵی ٦٩٤ی کۆچی / ١٢٩٤ی زاینی دوای کوشتنی (کیغاتو)، (توفاجار) لەسەر وڵاتی سەلجوقی رۆم دامەزرێنرا، (صدرالدین زنجانی) کرایە یاریدەدەری وەزیر لەجێگای وەزیری لابراو (جمال الدین)[١٠٧] ئەمیش لایەنگری (غازان)ی دەگرت و لەدەسەڵاتی (بایدو) یاخی بوو، بەهەلی زانی بۆ گەڕانەوەی پلەو پایەی لەوەو پێشی (غازان)ی رازی کرد، هێنایە پاڵ خۆی، لەو شەڕەدا کە لەنێوان هەردوو لادا رویدا، هێزەکانی غازان بەفەرماندەیی (کتلغ شا) کە لەبنەچە ئەرمەنی بوو، سەرکەوتنی وەدەست هێنا، لەسەر تەختی (ئیلخانێتی) دانیشت و بایدۆ کوژرا.[١٠٨]

می (غازان) چووە سەر تەختی ئیلخانێتی ئێران، ئیلخانێتیەکە چووە دۆخێکی نوێوە، ئەویش بەهۆی تواناو لێهاتووی وەزیرەکەی (رشید الدین فضل الله الهمداني) یەوە،.[١٠٩] بەدەستهێنانی ئەم پایە لەلایەن (رشید الدین)ەوە، دوای کوشتنی وەزیر (خالدی زنجایی)یەوە بوو.[١١٠] (غازان)، (توفاجاری) فەرماندەی لە خۆ نزیك کردەوە، پلەو پایەیەکی بەرزی پێدا، بەڵام نێوانیان بە تەواوی چاك نەبوو، چونکی (توفاجار) لەسەر بارێك نەدەما، بۆیە لەکاری بەڕێوەبردنی ناوەندی دوری خستەوەو بەفەرماندەی هێزەکانی مەغۆل لە ئەنادۆڵ دایمەزراند. هەرچەندە دووری خستبووەوە، بەڵام هەر لێی ئەمین نەبوو، بۆیە بەهۆی (خورمانجی) لەناویدا.[١١١] (بالتو تابسین)ی کوڕی هۆلاکۆ، کە فەرماندەیەکی مەغۆل بوو، کوشتنی (توفاجار)ی بەهەل زانی، لەساڵی٦٩٥کۆچی/١٢٩٥زاینی لە دەسەڵاتی (غازان) یاخی بوو، ئەوەی ئاشکرایە ئەم فەرماندەیە،، لەسەرەدەمی (ئەرغون)ەوە لە وڵاتی رۆم خزمەتی کردووە، دوای مردنی (سمغار) بەهێز بوو، قرمانیەکان پشتگیری بوون، چونکی هەردوو لایان یەك ئامانجیان هەبوو[١١٢] (غازان) لەساڵی داهاتوودا (کتلغ شا)ی بە سوپایەکەوە بۆ وڵاتی رۆم نارد، تا شۆڕشەکەیان لەناو بەرێت، لەدەستی ئەماسیە روو بەڕوو بوونەوەو بەسەریا سەرکەوت، یەکێ لە یاریدەدەرانی راسپارد بەناوی (سولمیش افاك بایجو) بکەوێتە دووی و دەستگیری بکات، سوڵتان مەسعودی دووەم یارمەتی (بالتو)ی دەدا لەم شەڕەدا، کە (کتلغ شا) سەرکەوت سوڵتانی سەلجوقی داوای لێبوردنی لێکرد.

(سولمیش) بەیارمەتی فەرماندە (عرب سمغار) توانی (بالتو) بگرێت و بۆ تـەبرێزی بنێرێ، لەوێ لەمەیدانێکی گشتیدا هەڵواسرا.[113] (غـازان) دوای کوشـتنی (بـالتو) دووکەسی بەفەرماندەی گشتی هێزەکانی مەغوَل دامەزراند کە ئەمانە بوون: (کیور تیمور) و (تاینجار) بەلاَم لەلایەنی سەربازییەوە دەبێ لەژێر فـەرمانی (سـولمش)دا بن، کە فەرماندەی گشتی ناوچەکە بوو.[114]

(غازان) نەیتوانی لە تەبریزەوە هێزێکی مەغوَلی بنێرێ لەبەر سەختی رێگاو بانەکە (کیـور) و (تاینجـار)ی راسپارد، روو بـەرووی ببنـەوە. بـەلاَم سـولمش لـەپڕ دای بەسەریاندا هەردوو کیانی کوشت و بووە فەرمانڕەوای گشتی و هەموو کاروبارەکان کەوتنــە ژێــر دەســتی. ولاَتــی رۆمــی، لەبــەڕێوەبردنی ناوەنــدی دابــڕی و جــاڕی سەربەخۆیی ولاَتی رۆمی دا، فەرمانڕەوای بۆ دەوروبـەر دامەزرانـد و فـەرمانی بـۆ دەرکردن سیاسەتی خۆی بۆیان ئاشکرا کرد.[115] بـەلاَم سیواس، بـەرەنگاریکرد و خۆی راگرت، ئەویش بۆ ماوەی مانگێ ئابلۆقەیدا، بەلاَم سوودی نەبوو.[116]

(غازان) کە زستان تەواو بوو، سوپایەکی سی و پێنج هەزاری بـۆ ولاَتـی رۆم نـارد، بەفەرماندەیی (کتلغ شا) تا سولمش. بهێنێتە ژێر دەسـەلاَتی خۆیـەوە. لـەبیابانی ئەرزنجان لە ئاق شەهر، هەردوو سوپاکە بەرامبـەر یـەك راوەسـتان، لـە سـەربازی مەغوَل ترسان، زۆربەیان کشانەوە. تـەنها پێنجسەد کەسـیان مایـەوە. بـەلاَم وای بەبەرژەوەند زانی بکشێتەوە. بەرەو (بهسنا) کە لەسەر سنووری ولاَتـی شـامدایە، رۆیـشت.. ئـەو کاتـە لـەژێر دەسـەلاَتی مەمالیکدا بـوو، یـەکێ لـە فەرمانـدەکانی (مخلص الدین رۆمی) بۆ لای سولَتانی مەمالیك نارد ئەو کاتە (ناصر محمد قلاوون) سـولَتان بـوو.. داوای یارمــەتی لێکـرد.. سـولَتانی مـەمالیك بەدەنگیـەوە چـوو، فەرمانی دا، پێنج هەزار سوارە ئامادە بکەن لـە حمـص، ئەوەنـدەی دیکەشـی لـە حەما، کە سوپاکە ئامادە بـوو لـەپڕ، سـولمش گەیـشتە دیمەشـق، دواجـار بـەرەو قاهیرە رۆیـشت، لەگـەڵ سـولَتانی مـەمالیك کۆبـووەوە، وا دیـارە، نەگەیـشتبوونە ئەنجام، دوو رێگایان لەپێش دانا: یان لەقاهیرە بمێنێتەوە یان لەدیمەشـق، یـاخود بگەڕێتەوە ولاَتی خۆی. داوای لە سولَتان کرد، هێزێکی سەربازی بخاتـە تـەکی تـا بۆ ولاَتی رۆم بڕوا و خێزانەکـەی بهێنـێ، سـولَتان بەمـە رازی بـوو، بـەرەو حەڵـەب

کەوتنەڕێ، میر (بکتمر الحلبي) یشی لەگەڵدا بوو، دەنگو باس وا بڵاو بووەوە، کەوا هێزێکی گەورەی لەگەڵدایە، تورکمانەکان و قرمانیەکان، چوونە پاڵی کە زانیان، ژمارەی سوپاکەی کەمە، لەدەوری نەمان و خۆیان لێ دوور خستەوە، مەغۆڵەکان بەدیل گرتیان، بۆ سەربازگەیەکی مەغۆلیان برد لەوێ کوشتیان(١١٧) لەساڵی ٧٠٤ی کۆچی / ١٣٠٤ی زاینی بارودۆخی وڵاتی سەلجوقی رۆم تێکچوو، بەتایبەتی دوای کۆچی دوایی، سوڵتان مەسعودی دووەم. مەغول، فەرمانڕەوایەکی نوێیان دانا ئەویش (ئاغا جری) بوو، (لاکوشی) یان بە وەزیری دامەزراند. (ئیرنجین) بە مە رازی نەبوو، لەگەڵ (ئاغا جری)دا روو بەڕوو بوونەوە، ململانێیەکی سەخت کەوتە نێوانیانەوە، بە قازانجی (ئیرنجین) کۆتایی هات(١١٨) دوای ئەوە، چەندین فەرمانڕەوای مەغۆڵ، فەرمانڕەوایی وڵاتی رۆمیان بەدەستەوە گرت، هەموویان نموونەی چاوچنۆکی بوون.. کەوتە ململانێ بۆ وەدەستهێنانی دەسەڵات. داگیر کردنی وڵاتی سەلجوقی لەلایەن مەغۆڵەوەو ئەو ململانێیەی نێوانیان زیانێکی زۆری لێ کەوتەوە. سەرەڕای وێرانکاری فەرماندەکانی مەغۆڵ خەزێنەکانی وڵاتیان تاڵانکرد، ئابووری وڵاتیان تێکشکان، پلەو پایەی دەوڵەت بەپارە دەفرۆشرا، میللەت کەوتە ژێر(باج)ی گرانەوە، ئەوانەی کۆکردنەوەی (باج)یان پێ راسپێرابوو، جەوریان لە دانیشتوانەکە دەکرد زەبر و زەنگیان بەکار دەهێنا، داگیرکردنی وڵات کارەساتێك بوو بۆ وڵات و دانیشتوانەکەی.

## مێژووی سەلجوقیەکان

### ـ پاشکۆ
### ـ ناوی سوڵتانەکانی سەلجوقی رۆم و ماوەی فەرمانڕەواییان

– سلێمان کوری قتلمش ٤٧٠–٤٧٩ی کۆچی – ١٠٧٧–١٠٨٦ی زاینی

– قلیج ئەرسەلان داود کوڕی سلێمان قلیج ئەرسەلانی یەکەم

٤٨٥–٥٠٠ ی کۆچی /١٠٩٢–١١٠٧ی زاینی

– مەلەکشا کوڕی قلیج ئەرسەلان

٥٠٢–٥١٠ی کۆچی / ١١٠٩–١١١٦ی زاینی

– رکن الدین مەسعود کوڕی قلیج ئەرسەلان مەسعودی یەکەم

٥١٠–٥٥٠ی کۆچی / ١١١٦–١١٥٥ی زاینی

– عزالدین قلیج ئەرسەلان مەسعود قلیج ئەرسەلانی دووەم

٥٥٠–٥٨٨ی کۆچی / ١١٥٥–١١٩٢زاینی

– غیاث الدین کەیخوسرەو قلیج ئەرسەلان جاری یەکەم

٥٨٨–٥٩٣ی کۆچی / ١١٩٢–١١٩٦زاینی

– رکن الدین سلیمان شا کوڕی قلیج ئەرسەلان

٥٩٣–٦٠١ی کۆچی / ١١٩٦–١٢٠٤ی زاینی

– عزالدین قلیج ئەرسەلان کوڕی رکن الدین سلیمان شا قلیج ئەرسەلانی سێیەم

٦٠١ی کۆچی / ١٢٠٤ی زاینی

– غیاث الدین کەیخوسرەو کوڕی قلیج ئەرسەلان جاری دووەم

٦٠١–٦٠٨ی کۆچی / ١٢٠٤–١٢١٢ی زاینی

– عزالدین کەیکاوس کوڕی کەیخوسرەو کەیکاوسی یەکەم

٦٠٨–٦١٦ی کۆچی / ١٢١٢–١٢١٩ی زاینی

– علاء الدین کەیقوباد کوڕی کەیخوسرەو کەیقوبادی یەکەم

٦١٦–٦٣٤ی کۆچی / ١٢١٩–١٢٣٧ی زاینی

– غیاث الدین کەیخوسرەو کوڕی کەیقوبادی کەیخوسرەوی دووەم

٦٣٤–٦٤٤ی کۆچی / ١٢٣٧–١٢٤٦ی زاینی

– عزالدین کەیکاوس کوڕی کەیخوسرەو کەیکاوسی دووەم
٦٤٤–٦٧٨ی کۆچی / ١٢٤٦–١٢٧٩ی زاینی
– رکن الدین قلیج ئەرسەلان کەیخوسرەو قلیج ئەرسەلانی چوارەم
٦٤٤–٦٦٤ی کۆچی ١٢٤٦–١٢٦٥ی زاینی
– علاءالدین کەیقوباد کوڕی کەیخوسرەو کەیقوبادی دووەم
٦٤٤–٦٥٥ی کۆچی / ١٢٤٦–١٢٥٧ی زاینی
– غیاث الدین کەیخوسرەو کوڕی رکن الدین قلیج ئەرسەلان کەیخوسرەوی سێیەم
٦٦٤–٦٨٢ی کۆچی / ١٢٦٥–١٢٨٣ی زاینی
– غیاث الدین مسعود کوڕی عزالدین کەیکاوسی دووەم مەسعودی دووەم: بۆ جاری یەکەم ٦٨٠–٦٩٦ی کۆچی / ١٢٨١–١٢٩٦ی زاینی
– علاءالدین کەیقوباد کوڕی فرامرز کوڕی کەیکاوسی دووەم کەیقوبادی سێیەم
٦٩٦–٧٠١ی کۆچی / ١٢٩٦–١٣٠١ی زاینی
– غیاث الدین مەسعود کوڕی عزالدین کەیکاوسی دووەم مەسعودی دووەم: بۆ جاری دووەم ٧٠١–٧٠٤ی کۆچی / ١٣٠١–١٣٠٤ی زاینی

## پەراوێزی بەشی چواردەهەم

١. ابن خلدون عبدالرحمن بن محمد: المقدمة: ج٢، ص٦٥٥–٦٥٧
٢. بڕوانە: الخضري، محمد بك: محاضرات تاريخ الامم الاسلامية، الدولـة العباسـية، ص٤١٨–٤٢٠
٣. ابن بيبي: ص٨٣–٨٤
٤. هەمان سەرچاوە: ص٢٠٨–٢٠٩
٥. هەمان سەرچاوە: ل٢٠٩–٢١٢
٦. ابن بيبي: ص٢١٢
٧. هەمان سەرچاوە: ص٢١١–٢١٢
٨. هەمان سەرچاوە: ل٢١٢
٩. هەمان سەرچاوە: ل٢١٣–٢١٤
١٠. هەمان سەرچاوە: ل٢١٥–٢١٦
١١. هەمان سەرچاوە: ل٢١٦–٢١٧
١٢. ابن بيبي: ص٢١٧–٢١٩
١٣. هەمان سەرچاوە: ص٢٤٩
١٤. هەمان سەرچاوە: ل٢٤٩–٢٥٣–٢٧٧–٣٠٦–٣٠٨
١٥. الاقسرائي: ص١٤٦–١٥٣
١٦. هەمان سەرچاوە: ل١٥٣–١٥٤
١٧. هەمان سەرچاوە: ل١٥٤
١٨. هەمان سەرچاوە: ل١٥٥–١٥٦
١٩. الاقسرائي: ص١٦٣–١٦٤
٢٠. هەمان سەرچاوە: ل٢٠٩–٢١٠
٢١. الاقسرائي: ص٢٣٠–٢٣١
٢٢. ابن منظور: لسان العرب، ج١١، ص٤٧٧

٢٣. الاقسرائي: ص٢٥٨-٢٦٨

٢٤. هەمان سەرچاوە: ل٢٧٥-٢٧٦

٢٥. هەمان سەرچاوە: ل٢٧٩-٢٨٣

٢٦. کوبرلو، فؤاد: قيام الدولة العثمانية، ص٧٢

٢٧. Brown: Literary History of Persia vol 11 P518

٢٨. جلال الدين رومي: دەیگەڕێننەوە بۆ عەلی کوڕی ئەبی تالیب.. بڕوانە Huart saint des deruiches vol p60

٢٩. الشيبي، كامل مصطفى: الصلة بين التصوف والتشيع، ج٢، ص٣٣٢

٣٠. تاريخ الزمان: ص٢٨٥

٣١. اخبار الدول: ص٢٩٣

٣٢. ابن بيبى: ص٢٢٧...کوپرلو:امليك متصوفلر هامش،ص ٢٣٣

٣٣. المقريزي: ج١، ص٤٠٩

٣٤. ابن بيبي: ص٢٣٠

٣٥. کۆپرلۆ: هامش، ص ٢٣٣

٣٦. الجامي: نفحات الانس، ص٥

٣٧. سبط ابن الجوزي: مرآة الزمان، ج٨، ص٧٧٣

٣٨. ايلك متصوفلر: ص٢٣٣

٣٩. الشبيبي: ج٢، ص٣٣٠

٤٠. (البيالصه) کۆمەڵێکی نەسرانی ڕۆژهەڵاتین، بڕوایان بەخێر و شەڕ هەیە

٤١. ابن بيبي: ص٢٢٧

٤٢. هەمان سەرچاوە: ٢٢٧-٢٢٨

٤٣ هەمان سەرچاوە: ل٢٢٨

٤٤. هەمان سەرچاوە:

٤٥. ابن بيبي: ص٢٢٧

٤٦. هەمان سەرچاوە: ل٢٢٨

٤٧. هەمان سەرچاوە:

٤٨. الشبيبي: ج٢، ص٢٣١
٤٩. ابن العبري: ص٢٨٦
٥٠. کوپرلوّ: قيام الدولة العثمانية: ص٨٤
٥١. کوپرلو: قيام الدولة العثمانية: ص٨٤
٥٢. ابن بيبي: ص٢٢٨
٥٣. هەمان سەرچاوە: ل٢٢٩
٥٤. هەمان سەرچاوە: ص٢٢٩-٢٣٠. ابن العبرى: ص٢٨١
٥٥. ابن بيبي: هەمان سەرچاوە: ل٢٣٠
٥٦. هەمان سەرچاوە: ابن العبرى: ص٢٨٦
٥٧. Wittek: P31
٥٨. الشبيبي: ج٢، ص٣٣٥
٥٩. ابن كثير: ج٣، ص١٠٨
٦٠. الشبيبي: ج٢، ص٣٢٥
٦١. کوپرلوّ: ص٨٤
٦٢. القرماني: ص٢٩٣، Wittek: P37
٦٣. الشبيبي: ج٢، ص٣٦
٦٤. وشەی (خطير) نازناوی شاكانە، يانی پايەبەرز. القلقشندی: ج٦، ص٨١
٦٥. الاقسرائي: ص٧٤
٦٦. هەمان سەرچاوە: ص ٩٧
٦٧. هەمان سەرچاوە:
٦٨. هەمان سەرچاوە: ل١٠٠
٦٩. هەمان سەرچاوە: ل٣١١-٣١٢
٧٠. ابن بيبي: ص٣١٣. الاقسرائي: ص١٠١-١٠٢
٧١. هەمان سەرچاوە: ص٣١٤. ص١٠٢
٧٢. الاقسراي: ص١٠٢-١٠٤
٧٣. هەمان سەرچاوە: ل١٠٤

٧٤. کوپرلۆ: ص١٢٨-١٢٩

٧٥. هەمان سەرچاوە: ص١٣٣. الاقسرائی: ص٧٤

٧٦. Camb Hist of islam: vol 1 P252

٧٧. Cahen: P711

٧٨. الاوامر العلائية في الامور العلائية: ص٣٢١

٧٩. ابن بيبي: ص٣٢١-٣٢٢

٨٠. هەمان سەرچاوە. ص٣٢٢

٨١. لين ثول ستافلي: تاريخ الدول الاسلامية ومعجم الاسرات الحاكمة: ج٢، ص٤١٥

٨٢. ابن بيبي: ص٣٢٢. الاقسرائي: ص٧١-٧٢

٨٣. ibid

٨٤. ابن بيبي: ص٣٢٢

٨٥. الاقسرائي: هەمان سەرچاوە. ص ١١٢

٨٦. هەمان سەرچاوە: ص١٢٢

٨٧. هەمان سەرچاوە: ص١٢٣-١٢٤

٨٨. ابن بيبي: ص٣٢٦

٨٩. ابن بيبي: ص٣٢٦-٣٢٨

٩٠. هەمان سەرچاوە: ل٣٢٨-٣٢٩

٩١. ابن بيبي: ل٣٢٩

٩٢. هەمان سەرچاوە: ل٣٢٩-٣٣٠

٩٣. ابن بيبي: ص٣٣٠

٩٤. هەمان سەرچاوە: ل٣٣٢-٣٣٣

٩٥. ابن بيبيى ص٣٣٣-٣٣٤. الاقسرائي: ص١٣٣

٩٦. الاقسرائي: ص٢٩٤-٢٩٥

٩٧. حمدي: حافظ: الدولة الخوارزمية والمغول: ص٢٣٨

٩٨. Howorth: vol 111 P43

٩٩. ابن بيبي: ص٢٤٣-٢٤٤

١٠٠. هەمان سەرچاوە: ص٢٨٣–٢٨٤
١٠١. هەمان سەرچاوە: ص٢٨٥
١٠٢. ابن العبري: ص٣٠٤
١٠٣. Howorth: vol 111 P219
١٠٤. ibid: P225
١٠٥. برتولد، شبولر: العالم الاسلامي في العصر المغولي: ص٧٠
١٠٦. الاقسرائي: ص١٥٦
١٠٧. هەمان سەرچاوە: ل١٦٣. شبولر: ص٧١
١٠٨. الاقسرائي: ص١٦٨
١٠٩. هەمان سەرچاوە: ص١٦٨– ١٧٠
١١٠. Howorth: ibid P384
١١١. الصياد: مؤرخ المغول الكبير/ ص٦٩
١١٢. هەمان سەرچاوە: ص٨٤
١١٣. هەمان سەرچاوە: ibid: P399
١١٤. الاقسرائي: ص١٨٩
١١٥. D'ohsson: vol IV P168-169
١١٦. الاقسرائي: ص٢٠١
١١٧. Howorth: vol 111 P427
١١٨. الاقسرائي: ص٢٤٠

## سەرچاوەکان

## سەرچاوە عەرەبیەکان

أ- ابن الاثیرن ابو الحسن عزالدین.. المعروف بالجزري.
- الكامل في التاريخ- دار الكتاب العربي، بيروت، ط١، ١٩٧٢.
- التاريخ الباهر في الدولة الاتابكية بالموصل- تحقيق: عبدالقادر طليمات - القاهرة.
- ابن تغري بردي. جمال الدين ابو المحاسن يوسف.
- النجوم الزاهرة في ملوك مصر والقاهرة - - دار الكتب المصرية: ١٩٣٦
-ابن الجوزي: شمس الدين يوسف بن قزاوغلي المعروق بالسيط.
- مراة الزمان في تاريخ الاعيان ج٨ تحقيق: دائرة المعارف الاسلامية.
- مجموعة مؤرخي الحروب الصليبية: المؤرخون الشرقيون، ج٣.
- ابن حوقل، ابو القاسم النصيبي.
- كتاب صورة الارض - منشورات دار مكتبة الحياة، بيروت ١٩٩٢
- ابن خلدون، عبدالرحمن بن محمد الحضرمي..
- العبر و ديوان المبتدأ والخبر.. المعروف بتاريخ ابن خلدون: دار الكتاب اللبناني.
- ابن خلكان، ابو العباس احمد.
- وفيات الاعيان وابناء الزمان، تحقيق: احسان عباس، دار صادر، بيروت.
- ابن شداد، بهاءالدين يوسف.
- النوادر السلطانية والمحاسن اليوسفية - القاهرة ١٩٦٢.
- ابن شداد، عزالدين محمد بن علي بن ابراهيم.

# پێرست

## بەشی یەکەم



## بـەشی دووەم



## بەشی سێیەم



## بەشی چوارەم

## بەشی پێنجەم



## بەشی شەشەم



## بەشی حەوتەم



## بەشی هەشتەم



## بەشی نۆیەم

# SALJUKEYAKAN




کاتێ توێژەرێك لە مێژووی ئاسیای بچووك دەکۆڵێتەوە، دەبینێ تاچ ڕادەیەك ئەم مێژووە لە چاخەکانی کۆن و ناوەڕاستدا جولانەوەی گەلانی کۆچەری و شارستانی لەناو ئاسیا و ئەوروپادا کاری تێکردووە، لە هەمان کاتدا ئەوەش دەبینێ چۆن ئەو وڵاتانە گەشاونەتەوە یاخود تووشی ئاستەنگ هاتووە لە دوای هەر شەپۆلێکی نوێی داگیرکەران، بەڵام ئەم باسە لە بەرەنگاربوونەوەو ڕووبەڕوو بوونەوەی ئەو شەپۆلانە نادوێ کە لەسەدە جیاجیاکاندا بۆ ئەو وڵاتە هاتون، بەڵام تەنها هەندێ لە ڕووداوەکانی دوای سەرهەڵدانی ئیسلام دەکاتە مەبەست.




دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی
ڕۆژهەلات